# مامجەلال

## دیداری تەمەن لە لاوێتییەوە بۆ کۆشکی کۆماری



## بەشی دووەم

گفتوگۆیەکی فراوانی هەمەلایەن


**ئامادەکردنی: سەلاح رەشید**

**ناوەرۆک** | **لاپەڕە**

### هەکاری



### هەڵهاتنی سەرکردایەتی کۆمەڵە



### لە گەرمەی شۆڕشدا



### گفتوگۆ

**ڕاپەڕین و گەڕانەوە بۆ گفتوگۆ**



**گەڕانەوەی یەکێتی بەڕوی دنیای دەرەوە**



**داگیرکردنی کوێت، وەک سەرەتایەک بۆ ڕاپەڕین**



**یەکێتی و ڕێکخستنی نێوماڵی خۆی**



**هەڵبژاردن لە کوردستان**

## یەکەم شەڕی ناوخۆ



## ڕێککەوتننامەی واشنتۆنی یەکێتی و پارتی



## کۆنگرە و بارودۆخی ناو یەکێتی

**یەکێتی و هێزە کوردی و عێراقیەکان**



**کوردی پارچەکانی تر**



**یەکێتی و وڵاتانی دراوسێ و فەلەستین**



**ڕزگارکردنی عێراق**



**مام جەلال و هەندێ پرسیاری گشتی**

# سکرتێری کۆمەڵە

*** سەبارەت بە خۆتان، چ پۆستێکتان هەبو لە ناو کۆمەڵەدا، ئەندامی سەرکردایەتیان بون؟**

– بەراستی، من هەستمدەکرد ئەو برادەرانە، بەوشێوەیە کاردەکەن کە خۆیان دەیانەوێت، من خۆم لە سەرەتادا بۆئەوە نەچوبوم کە ببم بە سەرکردەی کۆمەڵە، یاخود کاری سەرکردایەتی بگرمە ئەستۆم، نەچوبوم ببمە سکرتێری ئەو رێکخستنە، چوبوم دەوری هەوێن ببینم و هەوڵ بدەم، هەمو ئەو تاقم و دەستانەی ئەو بیروڕایانەیان هەیە کۆیانبکەمەوە، ئەویش پاش ئەوەی دەخەملێن و رێکخراوەکە دروستدەبێت، ئەیدەمەوە دەست خۆیان. من بە حوکومی تەکوینی مێژویی و فکریی و دەوریی خۆم لە بزوتنەوەی کوردی و پەیوەندی کوردی و کوردستانی و عەرەبی و ناوخۆدا، ئەو کارەم بە ئاسان نەئەهاتە بەرچاو و سڵم لەوە دەکردەوە دەستی بۆبەرم.

من وام پێباش بو، وەک پشتیوان و راوێژکار و لایەنگریی ئەوان بمێنمەوە، نەک وەک بەرێوەبەر و هەڵسورێنەری کاروبارەکانیان.

قەناعەتیشم نەبو هەربیم بە سکرتێر، لەبەرئەوە ساڵی ۱۹۷۳ شەهابی شێخ نوریم بانگکرد بۆ دەرەوەی وڵات بۆئەوەی دەربارەی چۆنێتی کارکردن و شێوەی بەرێوەبردنی کارەکان گفتوگۆ بکەین. پێشنیازەکانم نوسی کەوا من ئیتر ئیستقالەم کردوە و لەسکرتاریەتی کۆمەڵە نابم، بەڵام من لەگەڵتان دەبم و پشتیوانیتان لێدەکەم و وەک جاران هاوکارتانم.

*** وەک سکرتێر، یاخود وەک ئەندام مایتەوە؟ هەڵوێستی ئەندامانی تر چی بون؟**

– شەهاب و برادەرانی تر پێیان خۆش نەبو، من واز لە کۆمەڵە بهێنم کە ئەو گەڕایەوە کوردستان، بڕیاریان دابو ئیستقالەکەی من قبوڵ نەکەن، من لەسەر وازهێنانی خۆم سوربوم، بەڵام هەر لەگەڵیان مامەوە و هەر پشتیوانیان بوم

و بەکەسیشم نەگوت کە دەرچوم، یا ئیستقالەم داوە، بەڵکو هەروا مابوومەوە لەگەڵیاندا.

*** کە ویستت واز لە سکرتێری بهێنیت، کەست دەستنیشانکرد، یان پێشنیازی کەسی ترت نەکرد یاخود خۆت بیرت لە کەسی تر نەکردبۆوە بۆئەوەی ببێت بە سکرتێری کۆمەڵە؟**

- بەڵی بیرم کردبۆوە، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ نەوشیروان مستەفا، هەوڵم دا، تەشویقی بکەم کە دەورێکی باش ببینێ، چونکە ڕاستیەکەی من لەناو ئەو برادەرانەی لەناو کۆمەڵە کاریاندەکرد، پێم وابو نەوشیروان، هوشیارترینیان بو پێموابو کە ئەو گەنجێکی هەڵکەوتو، زیرەک، کوڕی باش و عەقڵی باشە و چاک دەنوسێ، لە پاشان پێموابو کوردپەروەرێکی ڕەسەنە، واتا ڕەسەنییەکی هەبو لە کوردپەروەریدا، بیروباوەڕ و تێوری و فەلسەفەی بەکاردەهێنا، بۆ خزمەتی جەماوەری کورد و کوردستان و کوردایەتی و خەباتی میللەتی کورد و رزگارکردنی جوتیار و رەنجدەرانی کوردستان. وەک ئەوجۆرە مارکسیانە نەبو کە هەڵواسرابێت بە جوڵانەوەی شیوعیەوە، بە قسە و بیروباوەر دابرابێت لە جەماوەر. ئەوانە ڕەسەن نین کە پەل و ڕیشەکەیان هەڵدەکەندرێ و هەڵدەواسرێ بە دارەکانی ترەوە، ئەوانە هەڵواسراوەکانن، نەوشیروان لەو کەسانەیە کە هەڵواسراو نییە، لەو کەسانەیە، ڕەگ و ڕیشەی داکوتراوە لەناو کۆمەڵی کوردوەواریدا و بیروباوەری مارکس لینینی و سۆشیالیست و هەمو ئەو بیروباوەڕانە، بۆ خزمەتکردن و رزگارکردنی جەماوەری خەڵکی کوردستان و رەنجدەران و کرێکاران و جوتیاران و خەڵکی زۆرلێکراو بەکاردەهێنێت.

هەرچەندە، دیارە هەندێ سەرنجم لەسەر نەوشیروان هەبو کە هێشتا نەخەملّیبو، ئینفعالاتی هەبو، زوبەزو ئەو ئینفیعالاتەی تەوازونەکەی لێ تێکدەدا لە هەڵسەنگاندن و نرخاندن و هەڵسەنگاندنی هەڤاڵانی تردا، بەلام بە موقارەنە لەگەڵ هەڤاڵەکانی تر، هەتا لەگەڵ شەهاب و ئەو برادەرانەی تردا، لای من لە هەمویان لە پێشتربو، بەڵام ئەو خۆی دورگرتبو.

من شەهابم بەلاوە لە هەمو ئەوانەی مابونەوە پێباشتربو، شەهاب لەڕوی تیۆرییەوە لە هەمویان باشترنەبو، بەڵام لە روی شەخسیەت و لە روی ئیشکردن و تەجروبە و خۆراگرتن و قارەمانی و فیداکارییەوە لە هەمویان لە پێشتربو، ئەوەبو زوش قبوڵی کرد کە وازبێنێ لەکار و ئیشی ئاشکرا و خۆی تەرخانکرد بۆ کاری نهێنی.

بێجگە لەو، لەناو برادەرانی تردا، من پێم باشبو، ئەو پێش بخرێت، هەروەها لە ناویاندا کۆمەڵێک کەسانی لێهاتوی تێیدابو، وەک بەکر حوسێن ، گەنجێکی زۆر هۆشیاربو، عەقڵی زۆر چاکبو، بیرکردنەوەی زۆرباشبو، خوێندەوارێک و نوسەرێکی زۆر باشیش بو، بەڵام بەداخەوە خۆی شەخسێکی تەمبەڵ و سستبو، حەزی لەوە نەدەکرد ژیانی خۆی تەرخان بکات بۆ سیاسەت، دەیویست ژیان و گوزەران و سیاسەت پێکەوەبکات و سیاسەتیش نەک بەو توندو و تیژی و بەو فیداکاریەی کە پێویستە بیکات، بەڵکو بەشێوەیەک کە، لە دەرەجە دودا بێت، لەبەرئەوە بەداخەوە خۆی دور خستەوە لەسەرکردایەتی کۆمەڵە، من پێموابو کە دەبوایە لەسەرکردایەتی کۆمەڵە بمایایەوە و کاری بکردایە، بەڵام بەداخەوە نەیکرد.

جەعفەر عەبدولواحید، بەلای منەوە ئەندامێکی زۆر چاک و باشبو، هیچ کەم و کوریەکی ئەو تۆی پێوە دیارنەبو، هەم لەروی خوێندەواریەوە زۆرباش گەشەی کردبو، عەرەبی و کوردی و ئینگلیزی باش دەزانی، کتێبی زۆر دەخوێندەوە، ئەو نوسینانەی کە تێنەگیشتایە دەیپرسی، جگە لەوەش پیاوێکی ئازا و بەجەرگبو، لە شۆرشی پێشودا گەیشتبوە پلەی سەر لق، لە پێشمەرگایەتیدا پیاوێکی قارەمان و باوەڕبەخۆبو.

باوەری بە کۆمەڵە هەبو، بەڵام دیارە شەخسیەتی شەهاب زاڵتربو، من پێم وابو ئەو دەبوایە جێگری شەهاب بوایە، بۆ ئەوەی نەوەک شەهاب شتێکی لێ بێت.

فەرەیدون عەبدولقادر، گەنجێکی هوشیار و عەقڵی باشبو، نوسینی باشبو، زۆر چالاکبو، وەک پیاوێکی فیداکاروابو، بەڵام دو کەموکوڕی دیاری هەبو، یەکێکیان هەڵپە هەڵپ و پەلە پەلەکەربو، دوەمیشیان زۆر حەزی لە خۆنیشاندان و خۆدەرخستن و خۆ ئاشکراکردن بو، من خۆم ئەو خاسیەتانەم پێ باش نەبو، پیاو لێی دەترسا لە دوا رۆژدا زیان بەخۆی، بە شۆرش و بە خەبات و کۆمەڵە بگەیەنێت.

لەو ماوەیەی کە لە دەرەوە بوم، جەعفەریش هات بۆلام، ئەو هات بۆ سوریا و لوبنان زۆر باسوخواستمان کرد و راسپاردەی زۆرم دایە بۆ برادەرانی ناوەوە.

بەم جۆرە من پەیوەندیم لەگەڵ کۆمەڵە نەپچرا، هەرچەندە من لە سکرتاریەتی کۆمەڵە وازمهێنا و برادەران قبوڵیان نەکردبو، بەڵام من سوربوم لەسەر وازهێنانەکەی خۆم.

کاتێ شۆرشی کوردستان لە ١٩٧٤ دا بەرەو هەڵگیرساندنەوە دەچو، لەگەڵ

برادەرانی کۆمەڵە قسەمکردبو کە گرنگە هەمومان پشتیوانی خەباتی ئەو شۆرشە بکەین و دژی حکومەت بوەستین، بەڵام هەڵوێستێکی جیاوازمان هەبێت، مەوقفێکمان هەبێت کە لە هەندێ هەڵوێستدا دیاربێت، واتا جیانەبین لە شۆرش، بەڵکو بچینەناویەوە، بەڵام نەتوێینەوە لەناویدا.

# رۆڵی کۆمەڵە لە شۆرشی ١٩٧٤ دا

*** ئایا ئەندام و دۆستانی کۆمەڵە، وەک پێویست توانیان رۆڵی دیار و تایبەتی خۆیان لەناو شۆرشی ١٩٧٤-١٩٧٥ دا ببینن؟**

– ئەو سیاسەتەی، ئەو برادەرانە گرتبویان، دیارە سیاسەتێکی زۆر وردو و زیرەکانەبو، کاری زۆری دەویست بۆ جێبەجێکردنی، چونکە وا بەئاسانی پەیرەو نەدەکرا، بەداخەوە، پێموابو سەرکردایەتی کۆمەڵە نەیتوانی ئەو سیاسەتە وردە پەیرەو بکات، پێموابو لەژێر کاریگەریی پەلەپەلی فەرەیدون و حەزکردنی برادەران بۆئەوەی، بچنە دەرەوە و رزگاریان بێت لە خۆشاردنەوەی ناوشارەکان، هەمویان چون بۆناو شۆرش و تێکەڵاوبون لەگەڵ شۆرشەکە و بەکاری زۆر بچوک رازیبون، وەک ئەوەی یەکێک لەوێ موحاسیب بێت و یەکێکی تر لەوێ فەرمانبەر بێت!

کاتی خۆی ئێمە بریارمان وابو کە ئەم برادەرانە بچنە ناو شۆرش و کاری تێیدابکەن، بەڵام خۆیان بە (موتەمەیز) بهێڵنەوە و لە شۆرشەکەدا بەشداربن و هاوشۆرشگێر و خەباتگێر و هاوکاربن، بەڵام هەڵوێستی جیاواز وەرگرن و دیار و جیابن و خسوسیاتی تایبەتی خۆیان هەبێت و خەڵک هەست بەو جیاوازیە بکات. بەتایبەتی ئەوکاتە سیاسەتی خۆبەستنەوەی شۆرشی کوردستان بە ئێران و ئەمەریکا و ئیسرائیلەوە سیاسەتێک بو کە ئینسانی مارکسی لینینی نەی ئەتوانی دژی نەوەستێ و پەسەندی بکات و بەرگری لێبکات، بەڵام چونکە خەباتەکەش خەباتێکی جەماهیری بو، کۆمەڵانی خەڵکی زۆر لێیکۆبونەوە و بەرگری لە میللەتی کورد دەکرد، نەشدەکرا لەو بزوتنەوەیە جیابیتەوە و بکەویتە دژی، بەڵکو پێویست بو لە ناویدا بمێنیتەوە، بۆ ئەوەی لەسەر ئەساسی ئەو بەمبدەئەی کە ئێمە خۆمان پێشتر دەستنیشانمان کردبو (الوحدة و الصراع) یەکێتی

و ململانێ کاری سیاسی دەستنیشان بکەین، یەکێتی لەکار و کردەوەدا و ململانێی سیاسی لەکاری تیۆری و سیاسی و پەیوەندیەکانی دەرەوەدا.

پێموابو، برادەران نەیانتوانی شارەزایانە ئەو سیاسەتە جێبەجێبکەن، جگە لەوە، بەڕاستی لەو ماوەیەدا پەیوەندی لە نێوانمان کزبو، زۆر ئاگاداری یەکتری نەبوین. لەپاشان بەرەئی من ئەوبرادەرانەی وڵات، ئەوکاتەی مەلا مستەفا بریاریدا وازبهێنێت، هەڵەیەکی مێژوییانکرد، ئەویش ئەوەبو کە بڕیارياندا بگەڕێنەوە بۆناو دەسەڵاتی رژێم و تەواوبونی شۆرشیان قبوڵکرد، هەتا تەنانەت پرسێکیان بەمن نەکرد و ڕانەوەستان لەسەرئەوەی رەئی من بزانن، هەتا تەنانەت گوێشیان نەدایە ئەوەی، بۆچونی من بزانن کە خۆم لایەنی بەرگری و بەربەرەکانی بوم و بە رادیۆ بڵاومکردەوە و خەڵک زانی کە بۆچونم چۆنە و خەڵکم ناردەوە بۆناو کوردستان!.[1] شەهاب لەروی تیۆریەوە بەڕاستی زۆر بەهێز نەبو، لەبەرئەوە کەوتبونە ژێرکاریگەریی گوتەیەکی ناراستەوە کە ناکۆکی سەرەکی لەگەڵ ئیمپریالیزمە، لەبەرئەوەی ناکۆکی لەگەڵ حکومەتی بەعس دەشێ هێمن بکرێتەوە، سیاسەتی هاوکاریی و ململانێی لەگەڵ بکرێت و دروشمی روخاندنی رژێمیان بەلاوەنابو.[2]

*** واتا کۆمەڵە نەیویست دوای هەرەس لەگەڵ حکومەت گفتوگۆبکرێت؟**

– بەڵێ، تەنانەت لە نامەیەکدا کە بۆمنیان نوسیبو، دەڵێن هەمو خەڵک چاوی لە تۆیە، تۆش نەبێت هەوڵ بدەیت لەگەڵ حکومەت گفتوگۆبکەیت، بەڵکو چارەسەرێک بۆئەو وەزعە بدۆزیتەوە.

*** بۆچی تۆ بەپەلە نەگەڕایتەوە بۆ کوردستان؟**

– کارەساتی ئاشبەتاڵ زۆر کاری تێکردم، سیاسەتی ڕاستی ئەو سەردەمە ئەوەبو کە برادەرانی کۆمەڵە لەشاخ بمێننەوە و بنێرن بەدوای مندا و منیش بچمەوە و ئێمە لەوێ درێژە بە شۆرش بدەین، تەنانەت هەتا ئەگەر ژمارەیەکی کەمیش بین.

پێموایە ئەگەر ئەوان ئەو رۆژە ئەوەیان بکردایە و لەدوای منیان بناردایە و من بگەڕابمایەوە، ئەوکاتە دەمانتوانی کەسانی وەک عەلی عەسکەری و سەدان و هەزاران پیاوانی تریش، کە دەیانویست بەرگری بکەن، کۆبکەینەوە و شۆرشەکە درێژەی پێبدەین، بەڵام ئەوانیش بەلایەکی ترداچون و گەڕانەوە و ئاشبەتاڵیان بە رێگایەکی راست زانی و چونەوە ناوشارەکان.[3]

ئەو هەڵوێستەی ئەو برادەرانە، مەسەلەی ناکۆکی سەرەکی هێنایەکایەوە، ئەوکارە هەم هەڵەیەکی مێژویی بو، هەم بوبەهۆی نانەوەی ناکۆکی و ناتەبایی لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا.

# پەیوەندی لە نێوان کۆمەڵە لە وڵات و یەکێتی لە دەرەوە

*** پەیوەندی نێوانی ئێوە لە دەرەوە و ئەوان لە وڵات چۆن دروستبو، رایەڵەکانی پەیوەندیتان چی بون؟**

– لەکاتێکدا کە ئێمە خەریکی دروستکردنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوین، پەیوەندیم بە برادەرانی وڵاتەوەکرد، کە ئەوان نوێنەریان بنێرن بۆلام، ئەوەبو فەرەیدونیان (فەریدون عەبدولقادر) نارد، فەرەیدونم لە بەرلین بینی، لەوکاتەدا کۆنگرەی کۆمەڵەی خوێنکارانی کورد هەبو لە بەرلین، بە دورودرێژ تێمگەیاند کە یەکێتی چیە و چۆنە و باڵەکانی چۆنن و دەوری کۆمەڵە چۆنە لە ناوەوە.[٤]

من رەئیموابو دەوری کۆمەڵە ئەوەیە، ببێتە هەوێنی ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەشێک لەو بیروڕایانەم لە بڵاوکراوەیەکی ناوخۆدا باسکردبو بەناوی (یەکێتی نیشتمانی بۆچی؟)، کاتی خۆی ئارام لە کوردستان بڵاویکردەوە، باسم لەوەکردبو چۆن لەناو یەکێتیدا کاربکەین، ئەوکاتە من ئەو بۆچونانەم بەنامە بۆ ئارام نارد، دوای ئەوەی بو بە لێپرسراو، بە بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیی و بەناوی سەرکردایەتی خۆیانەوە بڵاویکردبۆوە.

من پێم وابو کۆمەڵە وەک زەردێنەی هێلکەکە وابو، پێویستی بە سپێنە و توێژەکەهەبو، ئەگەر بتەوێت تەنها زەردێنەکەی دەربێنیت، ئەوا رەنگە هێلکەکە بشکێت و سودی نەمێنێت، بەڵام ئەگەر هێلکەکە بەساغی بنێتەوە، ئەگەری ئەوە هەیە سبەینێ لەبەر مریشکێ ببێتە جوجەڵە، بۆیە پێموابو پێویستە کۆمەڵە لەناو یەکێتی نیشتمانیدا ئیشبکات، دەورێکی چالاک ببینێت و بە چالاکی و بە کردەوە وردە و وردە جێی خۆی بکاتەوە.

بریاڕبو کە لە هێڵی گشتی ناو یەکێتی نیشتمانیدا، خەڵک کۆبکاتەوە، ئێمە سیاسەتەکەمان بەو شێوەیەبو کە لەناو یەکێتی نیشتمانیدا، جەماوەری فراوان دروستبکەین، لەناویاندا کۆمەڵە هەبێت و مافی تەنزیمی و کاری سیاسی و ئایدۆلۆژی تایبەتی خۆی هەبێت، بتوانێ ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ بکات و

بیروڕای خۆی بە جەماوەر بگەیەنێت.

ئەو قسانەم هەمو بۆ فەریدون لە بەرلین کرد، تێمگەیاند و هەندێ شتی تریشم پێگوت، دوای ئەوەی کە ئەنوەر زۆراب چوبۆوە بۆ بەغدا بۆ سەر کارەکەی، یەکێک لە بزوتنەوەی ئیشتراکی عەرەبی، ئیعترافی لەسەرکردبو ئەنوەریش خۆی شاردبوەوە، من بە فەرەیدون عەبدولقادرم وت، ئەنوەر بکەن بە کادیر و مەیەڵن بچێتەوە سەر ئیشەکەی خۆی، ئەگینا ئەیگرن، ئەگەر لای ئێوە جێی نابێتەوە بینێرن بۆ دەرەوەی وڵات بۆلای من، ئێمە ژیان و گوزەرانی بۆ دابین دەکەین، منیش هەندێک پارەم دایە و گوتم لەمەودوا لەسەر پارە، کارەکانتان پەک مەخەن و پارەتان بۆ دەنێرین.

بەداخەوە، تا فەرەیدون چوبۆوە، شەهاب رێگای بە ئەنوەر دابو، بگەڕێتەوە سەرکارەکەی خۆی، وتبوی ئەوە مانگێک تێپەریوە و تۆ هیچت لەسەر نییە و کەس لێت ناپرسێتەوە، بۆیە مەترسی نییە.

تومەز ئەو هێمنیە سیاسەتی حکومەت بو، ئەوەبو یەکسەر گرتیان، دوای تەعزیبێکی زۆر ئیعترافی کردبو لەسەر هەندێک برادەر[٥] ئەو برادەرانەی کە ئیعترافی لەسەرکردبون، هەندێکیان گیران و هەندێکیان ناچار خۆیان شاردەوە، هەندێ لەوانەی کە گیران ئیعترافیانکرد، سێ کەسیان هاتنە شام بە رێگایەکی قاچاخ یەکێکیان ئیبراهیم عەزۆ بو، ئەوی تریان فەرهاد شاکەلی بو کە بەڕاستی فەرهاد شاکەلی لە رێگا زۆر مەوقیفی بێهێزی نیشاندابو کە هاتن بۆ شام لەوێ گرتمانە خۆمان و هاوکاریمان کردن.[٦]

## هەڵهاتنی سەرکردایەتی کۆمەڵە بۆ ئێران

*** ئایا هەڵهاتنی سەرکردایەتی کۆمەڵە بۆ ئێران، لە ئەنجامی گرتنی ئەنوەر زۆرابدا بو، یان هۆکاری تری هەبو؟**

– پاش ماوەیەک، زانیمان کە چی قەوماوە، بەرەئی من شەهاب هەڵەی دوەمی گەورەی خۆی کرد، ئەویش ئەوەبو کە بریارپیدا بچێتە ئێران و لە ئێرانەوە بێت بۆلای

ئێمه، به‌ڵام هاتنه‌که‌یان باش رێک نه‌خستبو، پێویست بو ئه‌وان ماوه‌یه‌ک له شاره‌کاندا بمانایه‌وه و په‌یوه‌ندیان له‌گه‌ڵ مندا بکردایه، من ده‌متوانی هه‌م رێگای ئێرانیان بۆ ته‌ئمین بکه‌م و هه‌م له بادینانه‌وه ئه‌مانتوانی بیانهێنین بۆ شام.[٧]

ئه‌وه‌بو، به په‌له‌په‌ل هه‌موویان چون بۆ ئێران، به‌دوای ئه‌وانیشدا هه‌ندێ براده‌ری تریش، پێش خرابون، وه‌ک ئاوات عه‌بدولغه‌فور و ئه‌رسه‌لان بایز و عه‌لی بچکۆل، ئه‌وانیش چون بۆ ئیران.[٨]

ئێران له‌وێ گرتنی، پاشنه‌وه‌ی ماوه‌یه‌ک له زیندانه‌کانیدا هێشتیانه‌وه، به‌پێی رێکه‌وتننامه‌ی جه‌زائیر، ئه‌و براده‌رانه‌یان ته‌سلیمی حکومه‌تی عێراق کرده‌وه.[٩]

حکومه‌تی شای جه‌لاد، به ته‌سلیم کردنه‌وه‌ی شه‌هاب و هاورێکانی، دوباره دوژمنایه‌تی خۆی بۆ جوڵانه‌وه‌ی پێشکه‌وتنخوازی خه‌ڵکی کوردستان ده‌رخسته‌وه، ئه‌و هه‌ڤاڵانه‌ی که له پێنجوینه‌وه ته‌سلیمکرانه‌وه، هێنران بۆ سلێمانی و پاشان بران بۆ به‌غدا.

*** دوای ئه‌م هه‌مو گرفت و راودونان و سه‌رکوتکردنه، کۆمه‌ڵه که‌ی و چۆن گه‌شه‌یکرد؟**

- کۆمه‌ڵه له ١٩٧٨دا ناوی خۆی گۆڕی بۆ (کۆمه‌ڵه‌ی ره‌نجده‌رانی کوردستان)، واتا ناوه‌که‌ی له کۆمه‌ڵه‌ی مارکسی لینینی کوردستانه‌وه گۆری بۆ کۆمه‌ڵه‌ی ره‌نجده‌رانی کوردستان، به‌و هه‌نگاوه کۆمه‌ڵه گه‌شه کردنێکی تری به‌خۆیه‌وه‌بینی، ئه‌ویش بریتی بو له ئیعلانکردنی سه‌ربه‌خۆیی فکری کۆمه‌ڵه، له مه‌رکه‌زه ده‌ولییه‌کانی جوڵانه‌وه‌ی مارکسی دنیا. کۆمه‌ڵه بو به کۆمه‌ڵه‌یه‌کی مارکسی لینینی سه‌ربه‌خۆ، سه‌ر به هیچ کام له چین، ئه‌لبانیا، مۆسکۆ و یۆگۆسلاڤیا نه‌بێت، به‌ڵکو سه‌ر به بیروباوه‌ڕی مارکسیزم - لینینیزم بێت.[١٠]

هه‌روه‌ها له‌هه‌مان کۆبوونه‌وه‌دا، بڕیاردرا، که ئه‌و وشانه‌ی له دژی هه‌ندێک له وڵاتانی سۆسیالیستی به‌کارئه‌هات، بۆ نمونه به سۆڤێت ده‌وترا سۆسیال ئیمپریالیزم، ئه‌وه نه‌مێنێت و جوڵانه‌وه‌ی کرێکاران و مارکسی و کۆمۆنیستی دنیا وه‌کو هه‌مو جوڵانه‌وه‌یه‌کی تر وه‌ربگیرێت که ده‌ستپێکیان هه‌بوه و گه‌شه‌یانکردوه و گۆڕانیان به‌سه‌رداهاتوه.

هه‌ندێک وڵات به‌ره‌و سۆسیالیزم ده‌چن، یاخود سه‌ره‌تایه‌کن له دیموکراتی شه‌عبیدا، ئه‌بێ ئه‌وانه وه‌ک خۆی ببینرێن، ئه‌و وڵاتانه‌ی گۆڕانیان به‌سه‌ردا هاتوه و له زۆر بواردا به‌ره‌و چاکی گه‌شه‌یانکردوه و له هه‌ندێ بواری تردا به‌ره‌و خراپی هاتون، بۆ نمونه له وڵاتانی سۆسیالیستی جاران زۆر لادان هه‌بوه، هه‌ربۆیه به ئاسانی هه‌ره‌سیان هێنا. به‌ڵام سۆسیالیست وه‌کو واقیعێک هه‌یه و جوڵانه‌وه‌یه‌کی گه‌وره‌یه، کاتی خۆی

باڵێکی بۆتە سۆسیال دیموکرات و باڵێکی تری بۆتە مارکسی لینینی و باڵە مارکسیە لینینیەکەی ئەوەی بەسەرهات کە بینیمان.

لەبەرئەوە، ناکرێ مادەم هەندێک لەو حیزبانە، لە بناغە تیۆریەکەیان لایانداوە، یان کەم و کورتیان تێکەوتوە، یا بیرۆکراسییان بەسەردا زاڵبوە، یان رژێمەکەیان بە هیچ جۆرێک سۆسیالیست نەبو و رەفتارەکەشیان سۆسیالیستانە نەبوە، ئەوە رەتیان کەینەوە. پێویست بو خۆمان لە هەندێ وشە رزگاربکەین، لەوانە ریڤیوینیزم، لە جیاتی ئەوەی هەوڵی شیتەڵکردنەوەیەکی قوڵ و راستەقینە و هەمەلایەنە بدەین و کەموکوریيەکان نیشانبدەین و باسی گۆرانکاییەکان بکەین.

وەکو چۆن ئاینی ئیسلام و مەسیحی چەندین بۆچون و رێگا و تاقمی جیاوازی لێ پەیدابوە و زۆرجاریش سەرەتاکان و مەبادیئەکان و بیروباوەرەکانی ئیسلام یا مەسیحی جێبەجێنەکراوە، بەڵام بەناوی ئیسلام و مەسیحی هەمیشە دەمێنێتەوە، بەوجۆرەش جولانەوەی کرێکاری و مارکسی لینینی ئەبێ بە چاوێکی نزیک لەمەوە وەربگیرێت.

هەروەها لەهەمان کۆبوونەوەدا بریاردرا، کۆمەڵە زۆر گوێ نەداتە شەکلیات و بەرگ و پۆشش، بەڵکو گوێ بداتە ناوەرۆک و جەوهەر و خاڵە سەرەکی و بنەرەتییەکان.

لەراستیدا نەوشیروانیش دەورێکی تایبەتی و دیاری هەبو، کە بیروباوەری کرابۆوە و بە جورئەتەوە بۆچونەکانی خۆی، لەسەر پێویستی سەربەخۆیی بون لە پەکین و مۆسکۆ و لەسەر گەندەڵ بونی هەندێک لە حیزبە شیوعیەکان و گەندەڵ بونی هەندێک لەدەوڵەتەکانی کە پێیان دەوترێ سۆسیالیست، دەرئەبری.

## پەراوێزەکان:

١-(خالە شەهاب، لەگەڵ شەهیدان فەتاح ئاغا و نوری حەمەعەلی، خەریکبو لە بەرگریدا بەشداریبکەن،.. لە سەرەتادا ڕازیبون، بەڵام دواتر پاشگەزبونەوە، بەمەش کۆبونەوەکە، "کۆبونەوەی کادیرانی کۆمەڵە لە گوندی کێلێ" لە ڕۆژئاوای پێنجوین، دەربارەی بەرگری و بەردەوامبون لە خەباتی چەکداری، یان گەڕانەوە بۆ شارەکانی کوردستان، ئەم ئەنجامە. ئێستا دەم و دەس بەرگری چەکداری ناکرێ)، (ڕەوتی چەپ لە باشووری کوردستان. ل. ٦٦).

٢- فەریدون عەبدولقادر، دەربارەی بڕیاری بەرهەڵستی نەکردن لە دوای ڕێکەوتنی ئازار دەڵێت: (کۆبونەوەیەکمان لە کێلێی کرد و ژمارەیەکی زۆری کادیرەکانی خۆمانمان بانگهێشت کرد بۆ ئەو کۆبونەوەیە، ڕەنگە ژمارەکەم بە بیر نەمابێت، بەڵام زیاتر لە ٢٧ کادیر بەشداریکرد. کاك شەهاب و سەرکردایەتی و هەموو برادەران لەوێ وتوویژ لەسەر بەرهەڵستیکردن کرا، دەنگێکی تازە پەیدابو، کە ئێستا دۆخێکی خراپە بۆ بەرهەڵستی کردن، بریار نەدرا بەرهەڵستی نەکرێت، بڕیاردرا کە ئێستا بەرهەڵستی خراپە). (کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین. ناوەندی مێژووی (ی.ن.ك.) سلێمانی ٢٠١٢ – ل. ١٠٧).

٣- (هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵە، وا بیریان کردۆتەوە، ئیمپریالیزم ناکۆکی سەرەکییە و حکومەتی عێراق ناکۆکی لاوەکیە، بە بەڵگەی ئەوەی حکومەت چاکسازیی کشتوکاڵی ئەنجامدەدات و نەوتی خۆماڵیکردوە. هەروەها پەیوەنی باشی لەگەڵ هەر یەك لە یەکێتی سۆڤێت و چیندا هەیە). (ڕەوتی چەپ لە باشوری کوردستان. ل. ٦٩).

٤- لە ١٩٧٥/٨/١٤ فەریدون عەبدولقادر وەك نوێنەری کۆمەڵە چاوی بە مام جەلال کەوت لە بەرلین، بە مەبەستی پەیوەندی بەستن لە نێوان یەکێتی لە دەرەوەی وڵات و کۆمەڵە لە ناوەوە..

٥- دەبارەی گرتنی ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە و ئیعتیراف کردنیان، مەلا بەختیار دەڵێ: (دوای گرتنی دەیان هاوڕێی کۆمەڵە لە هەولێر و کەرکوك و سلێمانی، یەك یەك و پۆل پۆل گرتنی هاوڕێیان لە خۆڕانەبووە، بەڵکو سەرەنجامی خۆڕانەگریی چەندین هاوڕێی کۆمەڵە لە سەرکردایەتیەوە بۆ شانەکانی خوارەوەبوە، کاتێك ئەو کەسانە دانیان بە بونی کۆمەڵە ناوە، بە ئەندامێتی خۆیان. تەنانەت هەشیانە ڕووبەڕوو لەتەك هەندێ لە هاوڕێ خۆڕاگرەکان دانیشتون و زمانیان لێداوون). (چۆن چەپێك و کام مێژووی کۆمەڵە؟. مەلا بەختیار - ل. ٢٤٠).

٦- (کادیرێکی بزوتنەوەی سۆسیالیستی عەرەبی، کە ئەندامی "تجمع الوطني العراقي" دەبێت، بەناوی ستار شەعلان، لە نیسانی ١٩٧٥ بە سودفە دەگیرێت و دوایی ئیعتیراف لەسەر لێپرسراوەکەیان دەکات لە بەغدا، بەناوی وەلید زەنون، کە هاورێی ئەنوەر زۆراب دەبێت و بەیەکەوە لە کارگەیەکی کارتۆن کاردەکەن و هاورێی سیاسی یەکتریش دەبن و لە رێگای وەلید زەنونەوە پۆست و نامە و بڵاوکراوەی هێزەکانی موعارەزە و کۆمەڵەش دەگاتە ئەنوەر زۆراب. دوای ئیعتیراف کردنیان، ئەنجامەکەی ئەبێتە هۆی گرتنی ئەنوەر زۆراب کە نامەی ئەو لای وەلید زەنون ئەدۆزنەوە). (کوانوی بەرگری - بیرەوەریەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب و هاورێکانیدا - عەلی بچکۆل. ل ١٩).

٧- هادی حەمە رەشید، کە بە هادیە سور ناسراوە، دەربارەی رۆشتنی شەهید شەهاب و هاورێکانی بەم جۆرە باس دەکات: (لە هاوینی ١٩٧٥ دا کاک شەهابم بینیی و گوتی: هادی فریامان کەوە، وەزعمان زۆر خراپە و بچۆ بۆ بەسرە، لەبەر خاتری من بچۆ، خەیاتێکی لێیە ناوی (عەبد)ە، هەورامییە لە بەسرای کۆنە. پێی بڵێ: شەهاب و چوار کەس ئەیانەوێت بچن بۆ (ابو زەبی). بزانە چی پێدەکرێت. دیارە کاک شەهاب پێشتر لە بەسرا بوە و خەڵکی ناسیوە... بەپەلە رۆیشتم و بە ناونیشانەکە دوکانەکەم دۆزیەوە... منیش قسەکانی کاک شەهابم بۆ عەبد گێرایەوە. وتی: سبەینێ ئەمکاتە سەر بەرەوە.. کە چومەوە زۆر پیاوانە وتی: نەك چوار کەس، ئەتوانم هەژدە کەست بە بەلەم بو بپەڕێنمەوە. یەکسەر گەڕامەوە و چومە لای جەمال ئاغا، هەواڵی ئەوەم بیست کە بەرەو ئێران رۆیشتون، بەداخەوە هەواڵەکەی منی پێ نەگەیشت). (کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو راپەڕین. ل. ٢٣٤).

٨- (بە رۆشتنی شەهاب شێخ نووری و هاورێکانی کاریگەریی لەسەر پاشماوەی رێکخستنەکان زۆر دەبێت. ئەگەر بزانین لە سلێمانی دەنگی ناڕەزایی لە بەرانبەریان بەرز دەبێتەوە و تۆمەتباریان دەکەن بەوەی رێکخستنەکانیان بەجێ هێشتوە).(ڕەوتی چەپ لە باشووری کوردستان. ل. ٧٧).

٩- لە ١٩٧٥/٩/٢٣ دا، شەهابی شێخ نوری، جەعفەر عەبدولواحید،، عومەری سەید علی، ئاوات عبدولغەفور، فەریدون عبدولقادر، ئەرسەلان بایز، عەلی محەمەد قادر — عەلی بچکۆل- بەرەو ئێران رۆیشتن و لەوێ گیران و لە ١٩٧٦/١/١دا تەسلیمی رژێمی عێراق کرانەوە.

١٠- کۆمەڵە لە کۆبونەوەیەکدا کە ٢٧ کادیر ئامادەی بون، لە ١٩٧٨/١١/٥ لە گوندی شێنێ بەسترا، بریاریدا کە ناوی کۆمەڵە مارکسی لینینی بگۆڕێت بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و سەرکردایەتیەکی نوێ هەڵبژێرا و نەوشیروان مستەفا وەك سکرتێری کۆمەڵە دەستنیشانکرا و هێڵە گشتیە سیاسیەکان رونکرانەوە.

# سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی

*** با کەمێک بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای یەکێتی نیشتمانی کوردستان و چۆن دامەزرا و هۆکار و پاڵنەرەکانی دروستبونی چی بون؟**

– لە ناوەڕاستی حەفتاو پێنج، واتا لە دامەزراندنییەوە دەستپێدەکەم، ئێستا هەندێ مەسەلەت بۆ باسدەکەم کە هێشتا بڵاونەکراونەتەوە[1] هەروەها باسی دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و کارەساتی هەرەسهێنانت بۆدەکەم کە لەناو خەڵک بە (ئاش بەتاڵ) ناوئەبرا، بە کارەساتێکی سامناک و ناخۆش دەژمێررێت و زۆر تەئسیری تێکردین، بەڵام کاردانەوەی فیعلی یەکەممان ئەوەبو کە ئێمە ئەبێت بەرگری بکەین و درێژە بە خەبات بدەین.

من پێش ئەوەش، بڕیاری درێژەدانم بە خەبات دابو، لەچەند چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەگەریدا باسی ئەوەمکردبو کە دەگەڕێمەوە بۆ کوردستان، بە ئومێدی ئەوەی کە هەواڵی گەڕانەوەم کاربکاتە سەر ئەو برادەرانەی کوردستان کە دەیانەوێت بەرگریی بکەن.

*** هەڵوێستی ئێوە چی بو، دوای بیستنی ڕێکەوتنامەی ٦ ی مارتی ١٩٧٥؟**

– لە سەرەتای هەرەسدا باس لەوەدەکرا، عەلی عەسکەری و برادەرانی کۆمەڵە، وا خەریکن خۆیان سازئەدەن، بۆیە منیش وام هەستدەکرد، ئەگەر ئەوان ببیستن من دەگەڕێمەوە، ڕەنگە نەختێک بکەونەخۆیان.

لە ٢٧ مارتی ١٩٧٥ دا هێرۆی خێزانم ناردەوە بۆ کوردستان، هێرۆ گەیشتەوە، تەلەفۆنی بۆکردم و گوتی: "هەمو شتێک تەواوبوە و بڕاوەتەوە". ئەگینا من بە تەمابوم لە ٢٩ ی مانگدا بگەڕێمەوە، نەمدەزانی کەوا شۆڕش وابەزویی کۆتایی دێت و هەرەس دەهێنێت.

لە تەعلیقێکمدا گوتم: "ئەگەر سەد هەزار کۆتر لە شاخەکانی کوردستان بەرەڵڵابکەیت، بە پێنج مانگ کۆناکرێنەوە، یاخود ئەگەر سەد هەزار ئاسک لە

شاخەکانی کوردستان بڵاوبیێتەوە، بە شەش مانگ ناگیرێن! چۆن وا زو ئەو هەمو خەڵکە بەو پەلە پەلە بڵاوەیان لێکرد"؟.

بەڕاستی ئینسان سەری سوڕدەما، لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە بریارمان دا و گوتمان: "باشە مادام ئێستا زەمینەی خەباتی چەکداری نەماوە، ئەوا ئێمە درێژە بە خەباتی سیاسی ئەدەین".

من دڵم بە نەوشیروان زۆرخۆشبو، نەوشیروان لە ڤیەننا بو، دڵم بە عومەر شێخ موس و کەمال فوئاد خۆشبو، لە ستۆکهۆڵم و بەرلین بون، گوتم ئەوان دەخەینەگەڕ، هەروەها لە تەنیشت خۆشم چاومگێڕا، دوکتۆر فوئادی مەلا مەعسوم، کە پێکەوە لە لیژنەیەکدابوین و لەکاتی شۆڕشدا لە قاهیرە بەیەکەوە کارماندەکرد، سەیرمکرد ئەویش ورەی زۆر بەرزە.

لەوکاتەدا دکتۆر خدری برای دکتۆر فواد هاتەلامان و ئەویش ئامادەیی خۆی نیشاندا بۆ کارکردن لەگەڵماندا. لەگەڵ عەزیزی شێخ رەزا قسەمکرد، ئەو ئامادەیی تێیدانەبو کە درێژە بە خەبات بدات، بەڕاستی هەوڵمدا جەماعەتێ کۆبکەمەوە کە زوربەیان دەموچاوی نوێ بن، لە لێپرسراوانی کۆن نەبن، گەنج بن، قابیلییەت و ئیمکانییەتی درێژە پێدانی خەباتیان تێدابێت.

*** سڵت نەدەکردەوە کە بۆییەی جەلالیەت لە رێکخستنە تازەکە بدرێت؟**

– لە سەرەتاوە هەوڵمدا سیغەی جەلالی و مەلاییی لە یەکێتیەوە دوربێت، واتا سیغەیەکی هاوبەش بێت کە هەمو لایەک بگرێتەوە، هەر لەبەرئەوەش هەوڵمدا عادل موراد و دکتۆر فواد قانع بکەم کە بێنە ناو ئەو رێکخستنە تازەیەوە، لەبەرئەوەی ئەوان خەتی کۆنی (مەلایی) بون، هەتا هەوڵم لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم دا کە هاتبو بۆ شام، هەرچەندە نەم دەویست لە سەرکردایەتیدا بێت، بەڵام دەمانویست لەگەڵماندا بێت.

دکتۆر فواد، ئامادەیی زۆری تێیدابو، ئێمە کەوتینەگەڕ لەگەڵ ئەو جەماعەتانەی تریش کە لە شام بون، وردە وردە خەڵک هاتن بۆلامان بۆ شام. من لەگەڵ نوری شاوەیس قسەمکرد، هەر بە نیازی ئەوەی، پشتیوانیمان بکات، ئەویش زۆر ئامادەیی نیشاندا.

لە بێروت دانیشتنێکمان بە ئامادەبونی یەکێک لە کوڕەکانی ئەنجامدا، لەوێ زۆر گازندە و ناڕەزایی و گلەیی هەبو لە مەلا مستەفا و باسی زەمانی خۆمانی کرد و ئاخ و داخی هەڵڕشت، کە ئێمە چۆن بوین و ئەوانە چۆن بون، ئەوە

یەکەمجاربو بەو سەراحەتەوە قسەی دەکرد، هەتا رەخنەی لە خۆشی دەگرت، کە چۆن وای کردوە.

من هەوڵم لەگەڵ خەڵکی زۆر جیاوازدا، رایانبکێشم بۆناو یەکێتی، یان بۆ هاوکاریکردن، بۆنمونە قسەم لەگەڵ خەسرەو تۆفیق کرد و هەوڵم لەگەڵ حیلمی عەلی شەریفدا، هەندێکیان زۆر هاندەرنەبون، بەڵام خوا هەقە خەسرەو تۆفیق زۆر تەشویقی کردم و گوتی: "بریا هەر وەختی خۆشی لە پەنجاو حەوت بە قسەی تۆمانبکردایە و کوردستانی بوینایە، تۆ هەر دەتگوت: پێویستە هەمو کوردستان یەک حیزبی هەبێت ئەگەر یەک حیزبی هەبوایە، ئێستا حاڵمان وای لێ نەئەهات".

من دڵنیا بوم کە برادەرانی کۆمەڵە لە ناوەوە ئامادەئەبن هاوکاریمان بکەن، هەروەها کۆمەڵێک کوردی دەرەوەشمان لەگەڵ بون، ئەو لاوانەبون کە هاتبون بۆ دەرەوە و پەیوەندیشم کردبو لەگەڵ هەندێکیاندا و ئامادەیی خۆیان نیشاندابو، لە دیوی ئێرانەوە شەمسەدین موفتی ئامادەیی زۆری نیشاندا، یارمەتیمان بدات و خەڵکیشمان بۆ بنێرێت.

ئیتر بریارمان دا دەست بکەین بە ئیشکردن و خۆئامادەکردن، پێشئەوەی سەر لەنوێ حیزبێک یا بزوتنەوەیەکی گەورە دروست بکەین، پێویست بو لە دەرەوەش هەوڵ بدەین دۆست پەیداکەین.

*** رۆڵی حکومەتی سوریا و ئەو عێراقیانەی لە سوریا نیشتەجێ بون، چۆن بون بەرامبەر بە دامەزراندنی یەکێتی نیشتیمانی؟**

- من سورییەکانم قانع کردبو، ئامادەبون یارمەتیمان بدەن، هەروەها ئەوکاتە رێکخستنێکی عێراقی لە دیمشق هەبو بەناوی (التجمع الوطني العراقي)، ئەوانیش بەڵێنیان دابو، یارمەتیمان بدەن، لیبیەکانم دیت و ئەوانیش گوتیان ئامادەی هاوکارین، هەروەها قسەم لەگەڵ سۆڤێتیەکانکرد و وەک بۆم باسکردیت بە دزیەوە دەعوەتیانکردم بۆ مۆسکۆ.

لە مانگی نیساندا دەستمانکرد بە خۆئامادەکردن و چالاکی، کۆمەڵێک برادەر لە شام کۆبوبونەوە، لەوانە عەبدولرەزاق فەیلی، عادل موراد، دکتۆر فوئاد مەعسوم، هەروەها خەڵک وردە وردە دەهاتن بۆلامان.

بریارماندا کە ئەم چوارە و نەوشیروان مستەفا و کمال فوئاد و عومەر شێخ موسیش لە ئەوروپاوە بێن و ببین بە یەک کۆمیتە، من دو گەنجی کەشم لە بیربو

ئەوانیش بخەینە لیژنەکەوە، بریتی بون لە ئازاد خۆشناو، ناویشم تەرشیح کرد، بەڵام برادەران رازی نەبون، ئەوەی تریان عەزیزی شێخ رەزا بو کە نەخۆی کردی و نە برادەرانیش ڕازی بون.

*** کەواتە ئەو ٧ کەسە بون بە کۆمیتەی دامەزرێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان؟**

– بەڵێ ، لیژنەکە لەنێوان ئەو حەوت برادەرەدا مایەوە، لە شام دانیشتین و مسۆدەی بەیانی یەکەمی دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانمان ئامادەکرد، ئەو برادەرانە نوسینەکەیان بەمن سپارد، لە رۆژی ٢٢ی مایسی ١٩٧٥ لە چاپخانەی (طلیطلة) لێی کۆبوینەوە و بڕیارمان لەسەر بڵاوکردنەوەیدا.

*** کەواتە رۆژی دامەزراندنی یەکێتی ١ /١٩٧٥/٦ نیە، بەڵکو ١٩٧٥/٥/٢٢ ە؟**

– ئەگەر راستت دەوێ رۆژی دامەزراندنی راستەقینەی یەکێتی ٢٢ی مایسە، نەوەک ١ی حوزەیران، چونکە یەکەم بەیانی دامەزراندن لەوێ نوسراو و بڵاوکرایەوە، ئێمە پرسیشمان بە برادەرانی ئەوروپا کرد، ئەوانیش پێیان خۆشبو، بەیانەکەمان نوسی و من دوایی بەیانەکەم لەگەڵ خۆم برد بۆ ئەوروپا و هەندێک تەعدیلاتی بچوکی لەلایەن برادەرانەوە تێیداکرا.

نەوشیروان مستەفا، لە نەمسا خۆشحاڵی خۆی بۆ دامەزراندنی یەکێتی دەربری و ئامادەیی خۆیشی نیشاندا کە کاری تێیدابکات، حەتتا گوتی ئەگەر پێوست دەکا من دەگەڕێمەوە و خوێندن بەجێ دێڵم و دێمە شام، عومەر شێخ موس و کەمال فوئادیش بە هەمان شێوە ئامادەیی خۆیان دەربری، واتا بەوشێوەیە دەستەی دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانمان دروستکرد.

پاش ماوەیەک، هەر خێرا نامیلکەی (الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا)م نوسی، لەوکاتەشدا دەستمانکردەوە بە پەیوەندی بە ناوەوە، لە ناوەوە هەڤاڵانیش زانیبویان کە ئێمە ئەو بەیانەمان دەرکردوە، چونکە لە رادیۆی دیمەشق خوێنرابۆوە، لەبەرئەوە ئەوانیش خێرا هەوڵیان دابو، نوێنەرانیان بنێرن بۆلامان، ئەوەبو فەرەیدون عەبدولقادریان نارد بۆلای ئێمە، فەرەیدون هات بۆ شاری بەرلین لە ئەڵمانیا، ئێمە بە دوورودرێژی قسەمان لەگەڵ کرد و هەموو شتەکانم بۆ شەرحکرد و وەزعەکانم تێگەیاند.[٢]

برادەرانی ناوەوەوە، کارەکەی ئێمە و شێوەی یەکێتی نیشتمانیان پێ شتێکی زۆر ئیبداع بو کە رێ دەدات کۆمەڵە بمێنێتەوە و سەربەخۆیی سیاسی و تەنزیمی

و فیکری خۆی هەبێت و لەناو بزوتنەوەیەکی گەورەی جەماهیریشدا ئیش بکات. ئێمە وامان دانا کۆمەڵە لە ناوەوە ببێت بە هەوێنی بزوتنەوەکە و کاربکات بۆئەوەی، خەڵک بەناوی یەکێتی نیشتمانیەوە لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە.

# سۆڤێت و یەکێتی

*** سۆڤێتەکان زانییان کە شۆڕش هەرەسی هێناوە و بارزانی ئامادەی بەرگری نیە، بۆچی پەیوەندیان بە ئێوەوە نەکرد و یارمەتی ئێوەیان نەدا کە ئامادەبون بەرگری بکەن؟**

- سۆڤێتیەکان پەیوەندیان پێوەکردین و گوتیان: "ئێوە چیتان بەدەستەوەیە"؟ گوتم: "ئێمە فکرەی دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیمان لا دروست بوە، حەزیش دەکەم لەگەڵ ئێوە باسی لێوەبکەم"، گوتیان: "باشە وەرە سەردانمان بکە لە مۆسکۆ"، ئەوە بو وەک بۆم باسکردی، خۆیان بلیتیان بۆ بڕیم و لە ڕێگای بەرلینی ڕۆژهەڵاتەوە سەفەری مۆسکۆم کرد.

*** ئەم سەفەرەی مۆسکۆ کەی بو؟**

- سەفەرەکە سەرەتای مانگی نیسانی ۱۹۷۵ بو، هاتم بۆ بەرلینی شەرقی لای ناسیاوێکی خۆم دابەزیم و مەوعیدم دانابو، گوتیان برادەرێک دێت لێت دەپرسێت و دەڵێت: تۆ ئەلکساندەر دەناسی؟ تۆش وەڵامی دەدەیتەوە ئەڵێیت: بەلێ ئەلیکساندەر دەناسم و دیومە، ئەویش دەڵێ: ئەلکسەندەر سەلامت لێ دەکات، تۆش پێی ئەڵێت: منیش سەلامی لێدەکەم و دەڵێت: هەرسەلامم لێدەکات یان شتی تریشی هەیە؟ دەڵێ تۆشی دەعوەت کردوە، ئەوە مانای ئەوەیە، ئەوکەسە ئەوەیە کە لەگەڵتا دێت بۆ مۆسکۆ.

هەرلەوێ بەو ناسیاوەی خۆم گوت کە لای بوم، ئەوە من دەچم بۆ مۆسکۆ هەر تۆ بزانە و کەسی تر نەیزانێ، تەماشا دەکەم یەکێک لە دورەوە بەرەو ڕومان دێت و پێدەکەنێ، تەماشا دەکەم دەیناسمەوە ئەوەی کە ناردویانە بۆلام، برادەرێکی دێرینی خۆم بو، بە ناوی (ئەزارۆ)، هەر لە دورەوە گوتی: ئەلیکساندەر دەناسی؟

وتم: باشی دەناسم و کۆنە رەفیقی خۆمە، ئیتر بو بەپێکەنین و دوای ئەوە چوین بۆ مۆسکۆ.

لەوێ باسی وەزعی کوردستان و عێراقم بۆکردن، ئەوان گوتیان: "ئێمە لەگەڵ چارەسەری سیاسی مەسەلەی کورددایین"، ئەوان پێیان ناخۆش بو کە شۆرشی مەلا مستەفا هەرەسی هێناوە.

*** ئەوان ئامادەبون، پەیوەندی رەسمی لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانی دروستبکەن و هاوکاریتان بکەن؟**

- سۆڤێتیەکان گوتیان: "ئێمە ئامادەین هاوکاریتان بکەین، بەمەرجێ ئەگەر ئێوە بەرگری بکەن، بەڵام ئێمە دەمانەوێ شتێکتان پێبڵێین ئەویش ئەوەیە، پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئێوە پێویستە زۆر بە نهێنی بمێنێتەوە، هەرکەسێک بەو پەیوەندیە بزانێت، ئەوا تێکدەچێتەوە، چونکە ئێمە نامانەوێت عێراق بەو پەیوەندیە بزانێ، بە ئاشکرا گوتیان ئێمە پێمان خۆش نییە بزوتنەوەی کوردی بمرێت و بفەوتێت و لەناوبچێت".

*** لەو سەفەرەی مۆسکۆت کێت بینی؟**

- کابرایەکم بینی کە جێگری لێپرسراوی پەیوەندی دەرەوەبو، لە لێژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی روسی، لەگەڵ چەند کەسێکی تردا کە هەمو شارەزای عێراق و ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بون.

*** چەند رۆژ لەوێ مانەوە؟**

- چوار پێنج رۆژ لەوێ مامەوە و دوای تەواوبونی گفتوگۆکان، هێنایانمەوە بۆ بەرلینی شرقی و تەسلیمی ئەو زاتەیان کردمەوە.

# کۆمەڵە و گفتوگۆ

**※ ئایا سەرکردایەتی کۆمەڵە لە کوردستان، هەڵوێستیان چی بو بەرامبەر بە خەباتی چەکداری دژ بە رژێم؟**

– وەک لـــەوەو پێش بـۆم باسکردیت، مـــن نامـــەیـــەکی شـــەهـــابـــی شێخ نوریم بۆ هاتبو ئیشارەتێکم پێکردوە لە باسی کۆمەڵەدا، شـــەهاب لە نامەکەیدا زۆر مەدحی من دەکا و دەڵێ: "ئێستا خەڵک هەمو چاویان لەتۆیە، بەڵام چاویان لە تۆیە بۆ مەسەلەی گفتوگۆ لەگەڵ رژێم"، باسی لەوەکردبو، "ئێستا مەسەلەی مفاوەزات و رێگای مفاوەزات کارێکی خراپ نییە بەشکو تۆ هەوڵێک بدەیت لەگەڵ حکومەت و قەناعەتیان پێبکەیت، دەستبکەین بە گفتوگۆ".

منیش وەڵامم دایەوە و گوتم: ئێمە دەبێ خۆمان رێکبخەین و ریزەکانمان توندبکەین و باسی فکرەی یەکێتی نیشتمانیم بۆکرد و گوتم: "دوای ئەوە کە ئێمە بە هێزبوین و بونی خۆمان سەلماند، ئەوکاتە لە مەوقیعی هێز و تواناوە ئەتوانین هەڵوێست وەرگرین، ئەگەر لەم وەزعەی ئێستادا هەوڵی گفتوگۆ بدەین، وەک ئەوەیە تاکە نەفەرێ بچێ موراجەعەتی حکومەت بکات، هەروەکو داخوازیەکی تاکە کەسی لێدێت کە عەرزوحاڵ دەدا، بەڵام ئەگەر بەهێزبوین و توانامان باشتربو، ئەووەختە رەنگە حکومەت خۆی بیەوێت لەگەڵماندا قسەبکات، یاخود خۆمان بونی خۆمان دەسەلمێنین بەسەریاندا، لەبەرئەوە واباشە ئێستا هەنگاوی وا نەنێین".

باش بو ئەوانیش موافەقەتیان کرد لەسەر ئەو پێشنیازەی من. ئەوەی راستی بێت من هەمو ئەو مەسەلانەم بۆ فەریدون لە بەرلین رونکردەوە و تێمگەیاند کە بگەرێتەوە و چی و چۆن ئیشبکەن، هەروەها هەندێ پارەم دایە و گوتیشم چەندتان پارە دەوێت بۆتان دەنێرین.[٢]

*** بێجگە لەو زانیاریی و ڕێنماییانەی دەربارەی چۆنێتی یەکێتی نیشتمانی، چی ترتان بە فەرەیدون عەبدولقادر ڕاگەیاند؟**

- جگە لەو باس و خواسە، ناوی هەندێ برادەرم دایە کە پەیوەندیان پێوەبکەن، لەو کەسانەی بە خەیاڵما هاتبون، بریتی بون لە: دکتۆر خالید، ڕەسوڵ مامەند، عەلی هەژار، عەلی عەسکەریی و کۆمەڵێک برادەری تری خۆیان لە سلێمانی، بێ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئەوانە کۆنە مەلایی بوبن یاخود کۆنە جەلالی.

ئەوەبو، دوای ماوەیەک شازاد سائیبم لە لەندەن بینی و بە دورودرێژی تێمگەیاند کە بچێ شەهابی شێخ نوری ببینێ و چی بکات. شازاد سائیب و سمکۆ فەتحوڵلا و دکتۆر خەسرەو، هەندێ تێکۆشەربون کە پێشنیازمان کردبون بۆ سەرکردایەتی یەکێتی.

ئێمە ئامۆژگاری و ڕێنمایەکانمان بە شەفەهی ناردەوە، پێمان باش نەبو بە نوسین بینێرینەوە، شازادیش چوەوە، بەڵام بەداخەوە ئەوەبو وەکو باسمکرد، شەهاب و هاورێکانیان بەقسەی منیان نەکرد و بەرەو ئێران ڕۆشتن، ئەگینا ڕەنگ بو توشی ئەو کارەساتە نەهاتنایە.

*** بۆچی ئەو ڕێکخراوە تازەیە ناونرا (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، ئایا پێشنیازی تر هەبون بۆ ناوەکەی؟**

- من لە نامیلکەی (الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا) باسی ئەوەمکردوە، من پێشنیازی ناوەکەمکرد، گوتمان شتێک بێت نیشانەی یەکێتی هێزە شۆڕشگێڕەکانی کورد بێت، ئەوەبو کە بوە دروشمی ڕۆژنامەی (الشرارة)ش کە ڕێکخراوێک بێت، هەمو تەیاراتی دیموکراتی پێشکەوتوخواز کۆبکاتەوە، تا پارتی پێشرەو دروست ئەبێت.

هیچ پێشنیازێکی تر نەبو بۆ ناوی یەکێتی، بۆیە کە ئەو پێشنیازەی من پێشکەش کرا، قبوڵکرا. ناوێکی گونجاوبو، چونکە لەگەڵ فیکرەکەدا دەگونجا کە ئەو ڕێکخستنە تەیارات و ڕێکخستنی جیا جیا کۆبکاتەوە و وەک نیمچە بەرەیەک بێ و بواری گەشەکردنی تەیاراتی جیاوازی تێدا هەبێت.

تەنها کەسێ کە پرسم پێکرد لەسەر تەرجومەی ناوەکە، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بو، بە سەفەر هاتبو بۆ شام، گوتم ئەوە چۆن (الاتحاد الوطني الكردستاني) تەرجومە دەکرێ بە کوردی، ئەویش گوتی: (یەکێتی نیشتمانی کوردستان). منیش کە بە برادەرانم گوت، هەمو پێیان باشبو.

بەوجۆرە من پێشنیازی ناوەکەم کرد و برادەرانیش پێیان باشبو، ئیتر یەکێتی کەوتە گەڕ لە دەرەوە و خەڵکمان زۆر لێ کۆبۆوە، خێرا بوین بە ئەندام لە (التجمع الوطني العراقي)دا.

هەرچەندە جەماعەتی ئیبراهیم عەلاوی کە کۆمەڵێکیان هەبو بەناوی (قیادەی مەرکەزی حیزبی شیوعی عێراقی) ویستیان کۆسپ دروست بکەن و نەیەڵن ببین بە ئەندام، بەڵام نەیانتوانی، لەناو جەماعەتی ئیبراهیم عەلاوی ئەو سەردەمە بۆ حەقیقەت و تەئریخ فازیلی مەلا مەحمود و (ئەبو ئەمەل) عادل عبدولمەهدی کە ئێستا ئەندامی سەرکردایتی ئەنجومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامییە و چەندەها پۆستی وەزاری لە دوای روخاندنی سەدامەوە وەرگرتوە، زۆر بە گەرمی پشتیوانیان لە ئێمەدەکرد.[٤]

*** ئایا گروپی (وحدة القاعدة) لە قیادەی مەرکەزی جیابونەوە؟**

- لەسەرەتادا (قیادەی مەرکەزی) بون و دوایی، کە ئیبراهیم عەلاوی جیابۆوە، ئەوان بون بە وەحدەی قاعیدە.

کۆمەڵێک خەڵکی باش لە ئیبراهیم عەلاوی جیابۆوە و وحدەی قاعدەیان دروستکرد، موزەفەر نەوابی شاعیری مەشهوری عێراقیش پشتگیری دەکردن. ئەوان دەیان گوت: "کە یەکێتی، کۆمەڵێکی پێشکەوتوخوازن، دەهێنێت ئێمە پشتگیریان بکەین"، بەڵام جەماعەتی ئیبراهیم عەلاوی زۆریان پێناخۆش بو.

ئیبراهیم عەلاوی، هەر لە کۆنەوە رقی لەئێمەبو، پێی ناخۆشبو، ئێمە گەشەبکەین، بە حساب بۆشاییەک دروستبوە و پێیان ناخۆشبو کە ئێمە پڕی بکەینەوە، بەڵام دەشمانزانی کە بۆچونی ئەوان چۆنە، چونکە فازیل هەندێ قسەی بۆ دەگێڕاینەوە ئەو وەختە فازیل کەوتبوە ناکۆکییەوە لەگەڵ ئیبراهیم عەلاویدا و دەمانزانی، جەماعەتەکەی تر موخالیفی ئیبراهیم عەلاوین، ئەوان بە زوربەی دەنگ بریاریان دابو، ئەندامیتی ئێمە لە تەجەموعدا رەتنەکەنەوە.

# سوريا و يەكێتی

*** رۆڵی سوريا چی بو لە دامەزراندنی يەكێتيدا؟**

– لە سوريا رێگە دراين، چالاكی سياسی بنوێنين، من توانيم، سەرۆک حافز ئەسەد ببينم و بەڵێنی داينێ، هاوكاريمان بكات و گوتی: "سوريا وڵاتی خۆتانە، هاوكاريتان دەكەين بۆئەوەی هەڵسنەوە". بەراستی سوريا لەو رۆژە رەشانەدا يارمەتيەكی زۆر باشياندا‌ين، من بەش بە حاڵی خۆم پێموايە ئەو يارمەتی و پشتيوانييەی سەرۆک ئەسەد، بريارێكی مێژويی بو.

سوريا، هاوكاری زۆری لەهەمو بوارێكداكردين، يارمەتی هەمە جۆر و پشتگيری سياسی و مەعنەوەی و يارمەتی پارە و چەكی داوين و ئەوانە پاڵپشتێكی گرنگ بون بۆئێمە. من هەمو جارێ هاوكاری سوريا وا تەشبيه دەكەم، وەكو ئەوەی يەكێک لە سەحرايەک مارێک پێوەی دابێ و حەكيمێک بێت بڵێ چەند شرينقەيەكت لێ ئەدەم چاكتدەكەمەوە، ئەو يارمەتيەی سوريا بۆ رزگاركردنی ئێمە بەو شێوەيەبو.

ئەوەبو، ئەو رۆژە سوريا كرا بە بنكەيەک بۆ هەڵسانەوەی جوڵانەوی كوردی و بۆ هەڵسانەوەی كوردايەتی و بۆ هەڵسانەوەی شۆرش و خەبات.

بەراستی سوريا نەبوايە، رەنگ بو زۆر بە زەحمەت بتوانين خۆمان وەک پێويست كۆبكەينەوە و بتوانين كارەكانمان رێک بخەين و مەعەسكەراتی تەدريبی لە نزيک شام دابنێين، كە نزيكی ٢٠٠–٣٠٠ كەسێک تەدريب بكەين و بيانكەين بە پێشمەرگە و بيان نێرينەوە بۆ كوردستان.

لەسەرەتادا، ويستمان ماڵی مەلا مستەفا بەگژخۆماندا نەكەين و نەيان وروژێنين. لەبەرئەوە، لە سەرەتادا ئێمە هيچ ناوی شەخسی بارزانی، يان ماڵی بارزانيمان نەهێناوە، هەتا لە نوسين و بڵاوكراوەكانماندا رەچاوی ئەو مەسەلەيەمان دەكرد، بۆ نمونە، لە نوسينێكی مندا (باری ئێستای خەباتمان و ئەركەكانی سەرشانمان) ئەڵێين جارێ زوە بۆئەوەی تەقييمی بارزانی و قيادەی بارزانی بكەين.

مەبەستمان بو، لە سەرەتادا باسیان نەکەین، ئەوەبو من نامەیەکم لە ئابی ١٩٧٦ دا بۆ نوسین[٥]، ناوەرۆکەکەی بریتی بو لەوەی، مادام وازتان هێناوە و پاڵتان لێداوەتەوە، لێگەڕێن ئێمە واخەریکین دەست بەکاردەبین، لە جیاتی ئەوە هاوکاربن یان دۆستبن، ئێوە وەزعتان رەنگە لەبارنەبێت بۆ کاری تازە، ئێمە وەزعمان باشترە!!.

# جیابونەوەیەک لەنێوان پارتیدا

*** لەسەرەتادا کۆمەڵێک کادیر لە پارتی جیابونەوە، لەوانە دکتۆر مەحمود عوسمان، کە لیژنەی ئامادەکردنی پارتی دیموکراتی کوردستانیان دروستکرد، ئایا ئەوان هیچ پەیوەندیەکیان بە ئێوەوە هەبو؟**

- بەڵێ دکتۆر مەحمود و شەمسەدین موفتی وەکو نوێنەرانی ئێمەیان لێهاتبو، ناتقی ئێمە بون لە کەرەج دکتۆر مەحمود وەڵامی داینەوە گوتی: "من پێم وایە مەسعود ئیستیجابەی بەرامبەرتان دەبێت و هەڵوێستی باشدەبێت".

دوایی گوتی: "نەخێر هەردوکیان یەکماڵن هەردوکیان دژن، ئەوەی بە قسە دەیڵێن، لە ناخیاندا وا ناکەن، بۆیە نابێت پێیان باوەڕبکەن و ئەوان بەهەمو جۆرێک دژایەتیتان دەکەن، ئێرانیەکان و ئەمەریکایەکان و خەڵکتان لێ هاندەدەن و دەڵێن ئەوانە کۆمۆنیستن و خەریکن کوردستان دەخەنە ژێر دەسەڵاتی کۆمۆنیستەوە، بەوفێڵە دەیانەوێت خۆیان هەڵسێننەوە".[٦]

پاش ماوەیەک ساواکیان قانع کرد کە هاوکاری بکرێن، بەرامبەر بەوەی نەیەڵن کوردستان و ساحەی کوردستان بکەوێتە دەست کۆمۆنیستەکان، ئەوان وایان باسکردبو، گوایە ئێمە (ماو)یین.

ئەوەبو ئێران رێگای دان (قیادەی موەقەتە) دروست بکەن و سامی عەبدولرەحمان و جەماعەتێکیان بێنە دەرێ، ساواک و ئێران، سامی عەبدولرەحمانیان ناردە دەرێ وەک ڕوییەکی پێشکەوتوخواز

بۆئەوەی بەربەرەکانی ئێمە بکات و رێگربێت لە مەیدانەکانی خەباتی

کوردایەتیدا.[٧]

ئەوانە لە سەرتادا وەعدیان دابو، هیچ چالاکیەکی سیاسی نەکەن و لە ئێران بە هێمنی دانیشن و مەلا مستەفا خۆی لە چەند چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەرییدا، بۆ نمونە لە ڕۆژنامەی کەیهان لەگەڵ ئەمیر تاهیری لە ١٩٧٥/٥/٣ و لە ١٩٧٥/٥/١٠ دا، لەگەڵ رۆژنامەی (کەیهانی هەوایی) و ١٩٧٥/٩/٦ لەگەڵ محەمەد حەسنین هەیکەل، باس لەوەدەکات، کە (کاری ئەو تەواوبوە) و ئەمە (ئیرادەی خوابوە) و ئیتر ئەو هیچ کاری سیاسی ناکات و ئیشی تەواوبوە، خەبات و شۆڕش و ژیانی سیاسی ئەو کۆتایی هاتوە.

ئەوەبو دوای دروستبونی یەکێتی، قیادە موقەتەیان دروستکرد، هەر بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکو چەند کەسێکیان ناردبو بۆ تورکیا وەکو کەریم سنجاری و جەوهەر نامیق و ئەبو عەنتەر بۆئەوەی بەگژ ئێمەدابێن.

بە دڵنیایەوە دەزانم، میت و ساڤاک پێکەوە هاوکارییانکردن بۆدژایەتی ئێمە، بە تەئکید مۆسادیش دەستی تێیداهەبو، چونکە ئێمە لەگەڵ فەلەستینەکان نێوانمان زۆر باشبو، ئەوان پێیان خوش نەبو، بزوتنەوەی کوردی دۆستی فەلەستین بێت[٨]

# پەیوەندی حکومەت لەگەڵ یەکێتیدا

*** ئایا لە سەرەتای کاری یەکێتیدا حکومەتی عێراق هیچ هەوڵیدا پەیوەندیتان لەگەڵدا دروستبکات؟**

- بێگومان، حکومەتی عێراق هەوڵیدا بەهۆی عومەر دەبابەوە پەیوەندی بکات، ئەوەبو حکومەت عومەر دەبابەیان بەزۆر نارد بۆلامان، وتبویان بزانین ئەوانە چیان دەوێت.

پێش ئەوەی حکومەت ئەو بنێرێت، دەمەوێت راستییەکی دیکەش هەیە باسی بکەم کە پەیوەندی بە هەمان مەسەلەوە هەیە، ڕۆژێک لە بەیروت دکتۆر جۆرج حەبەش و ئوم مەیسی خێزانی و هانی هیندی و ئوم مەحمودی خێزانی، من و هێرۆش دەعوەت کرابوین، دکتۆر جۆرج گوتی: "جەلال دوێنێ شتێکی سەیر ڕویدا،

سەفیری عێراقی بە پەلە داوای بینینی منی کرد، کاتێ کە هات بۆلام گوتی: تۆ جەلال تالەبانی دۆستتە، منیش نەم دەزانی بڵێم چی، وتم بەڵێ جەلال دەناسم و وایە، ئەویش وتی قەیناکە دوکتۆر (لا تحرج)، ئێمە ئیشمان پێتە و هەوڵدە بەشکو چاوپێکەوتنێکمان بۆ دروستبکەیت لەگەڵ جەلال تالەبانی، پێکەوە من و تۆ و جەلال تالەبانی و برادەرێکی تر، لە بەغداوە هاتوە دەیەوێ ببینێ"، وا بزانم سەعدون شاکیربو، ئەوکاتە مودیری موخابەرات بو.

هەروەها لە هاوینی ١٩٧٥دا لەکاتی بەستنی کۆنگرەی کۆمەڵەی خوێنکارانی کوردا لە بەرلینی رۆژئاوا(٩)، منیش ئامادەی بوم، شێخ جەباری تاهر شەریف کە جاسوسی موخابەرات بو، لەگەڵ سەعدون شاکیردا هاتبون بۆ بەرلین، ئەوکاتە داوای بینینی منیانکرد، منیش بینینەکەم قبوڵکرد و گوتم: "بەڵام ئێمە خۆمان جێگای چاوپێکەوتنەکە دادەنێین"، ئەو گوتی: "نا ئێوە وەرنە بەرلینی خۆرهەڵات"، منیش ئەوکاتە نەم دەوێرا بچمە بەرلینی خۆرهەڵات، بۆیە گوتم: "ئەگەر ئەو دێتە بەرلینی خۆرئاوا ئەوا باشە، وەکو تر من ناچمە خۆرهەڵات".

ئەوەبو چاوپێکەوتنەکە رووی نەدا، بەڵام رۆژێک لە بەرلینی خۆرئاوا دەرۆیشتین لەوبەری شەقامەکەوە دیتمان ئەو و جەبار پێکەوە دەرۆشتن، بۆیە منیش ئەو مەسەلەیەم بەبیر جۆرج حەبەش هێنایەوە و گوتم: "من لەوانە نەترسم، ئەوانە سڵناکەنەوە، رەنگە قاوەیەکت بدەنێ ژەهری تێدابێت، یاخود پیلانێکت بۆ دائەنێن". جۆرجیش گوتی: "جا ئاخر منیش لەگەڵتادێم و پێکەوە دەچین"، جا گوتم: "سودی چیە کە تۆش لەگەڵما ژەهرت خوارد و تۆش کوژرای"! پێکەنیم و گوتم: "ئایا تۆ سیقەت پێیانە"؟ کەمێک راما و گوتی: "نەوەڵلا"! منیش گوتم: "باشە بۆچی ئینسان لەگەڵ جەماعەتێک قاوە بخواتەوە کە سیقەی پێیان نەبێت و چۆن ئەتوانێت لەگەڵیاندا پێکبێت؟ چۆن ئەتوانین گفتوگۆ بکەین، سەرەرای ئەوەش من پرسی برادەران دەکەم با بزانم ئەڵێن چی"؟

# جاسوسی عێراق لەناو سەرکردایەتی یەکێتیدا

*** راستە کە دەڵێن حکومەتی عێراق لە سەرەتای دروستبونی یەکێتیدا، جاسوسێکی خۆی خستۆتە ناو ریزەکانی سەرکردایەتی یەکێتییەوە؟**

- بەڵێ راستبو، حکومەتی عێراق توانیبوی جاسوسێک بخاتە ریزەکانمانەوە، ئەویش (م.ن.) بو، بەڕەئی من (م) لە کۆنەوە جاسوس بوە، ئەوکاتەی کە لەگەڵ پاراستنیش ئیشی کردوە.

من هەتا ئێستا قەناعەتی ویژدانی خۆم وایە و بۆ مێژوش تۆماری دەکەم و تۆش بینوسە، کە بە گرتندان و ئیعدامکردنی لەیلا قاسم و هاورێکانی، دەستی (م) تێدابوە.

بەڵام (م) ئەوەندە چالاک و ئەوەندە زیرەک و بە توانابو، خۆی واخستبوە پێشەوە و بوبو بە یەکێک لە کادێرە پێشکەوتوەکان، بەڕاستی لای من ئەوەندە هاتبوە پێشەوە، ئەگەر بیویستایە دەیتوانی بمکوژێت! گەلێکجار بەیەکەوە دەچوین بۆ لوبنان و ئەو ئوتومبیلەکەی لێدەخوڕی، یان پێکەوە دەچوین بۆ شوێنێک، یا شەوێک لە یەک شوقە پێکەوە دەبوین، واتا ئەگەر بیویستبایە ئەیتوانی بمکوژێت!.

من پێموایە حکومەت ئەوی دانابو بۆئەوەی هەواڵ و زانیاریمان لێوەرگرێت، نەک بمانکوژێت، حکومەت داینابو تەرشیحی بکات و ببێتە سەرکردایەتی یەکێتی، چونکە زۆر کەس هەبو داوای دەکرد، هەڵیببژێرین بۆ سەرکردایەتی، دەیانگوت ئەو شایەستەی سەرکردایەتیە، کوڕێکی بە کەفائەت بو، خۆشی ئەو تموحەی هەبو، بەتەما بو بەجارێک بازێکبدا و بگاتە سەرکردایەتی.

عومەر دەبابە، هاتبو بۆلای ئێمە بۆ شام، لە فرۆکەخانەی دیمەشقەوە تەلەفۆنی کرد و من لە ماڵ دانیشتبوم و گوتم: ئەوە دێم بە دواتا، سایەقەکەم لەوێ نەبو، بۆیە منیش (م)م لەگەڵ خۆم برد، چونکە ئەیزانی ئۆتۆمبیل لێ بخوڕیت، لەڕێگا ئەو گوتی: "وابزانم کاک عومەر حکومەت ناردویەتی"، منیش گوتم: بۆ، چۆن؟

گوتی: :کاک عومەر چۆن دەوێرێت لە فرۆکەخانەوە تەلەفون بکات و بێت بۆلای تۆ؟ ئەگەر حکومەت نەی ناردبێت". تومەس (م) لە بنەوە ئاگادار بو کە حکومەت عومەر دەبابەی ناردوە.(١٠) کە چوین عومەر دەبابەمان هێنا، لە ڕێگا کاک عومەر هەلێکی قۆستەوە، پێش ئەوەی (م) جانتا و شتەکان دابگرێت"، گوتی: "ئەو کوڕەی لەگەڵتە جاسوسە و ئاگات لەخۆت بێت، بۆیە من هەمو قسەیەک لەکن ئەو ناکەم، لەوێ من ئەو قسانە دەکەم کە حکومەت پێی گوتوم، گوتی: "من هاتوم چونکە حکومەت بانگیان کردوم و مودیری ئەمن پێی گوتوم بڕۆ فلان کەس ببینە و بزانە بۆچی وادەکەن؟ با بێنەوە، ئەوە بزوتنەوە کۆنەپەرستەکە نەماوە و حکومەت هەموکارەکان بە باشی بەرێوەدەبات". ئێمەش گوتمان: "زۆر زۆر چاکە، ئێمە رازین لەسەر ئەوەی، حکومەت خۆی داوێتی بە کورد، ئەویش بەیانی ئازارە پێویستە جێبەجێ بکرێت، ئەوان نالێن ئەوانە جیب عمیل و نۆکەری ئیستیعمار و کۆنەپەرست بون، ئەوە ئەوان وانەماون، ئێمەش خەڵکانی پێشکەوتنخواز و نیشتمان پەروەرین، دێینەوە با خەڵکی تری وەک خۆمان کۆبکەینەوە و حکومەت ڕێگا بە کارکردنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی بدات و ڕێگای چالاکی بدات و بەیانی ئازار جێبەجێ بکات، ئەوکاتە ئێمە دەبینە ئەندامی بەرەی نیشتمانی پێشکەوتنخوازی عێراقی لەگەڵ حیزبی شیوعیدا.

بەڵام پێش ئەوەی ئەوە بکرێت و متمانە لە نێوانماندا دروست ببێت، ئەوا پێویستە ئەو کوردانەی کە ڕاگوێزراون بۆ خواروی عێراق، ببرێنەوە بۆ کوردستان و حکومەت عەفوی عام دەربکات و ئەو یاسایانە پوچەڵبکاتەوە کە دژی کورد دەرچون، وەک قەدەغەکردنی سیاسەت لەوانەی لە بزوتنەوەی کوردیدا دەوریان هەبوە، ئەوکاتە بەسەرچاو هەمومان دێینەوە".

عومەر دەبابە گەڕایەوە و ئەو هەواڵانەی بردەوە، بەڵام لەگەڵ عومەر دەبابە قسەی تریشمانکرد و گوتم: " پەیوەندی بە دکتۆر خالیدەوە بکات و پێی بڵێت، ڕێکخستن دروست بکات، تۆ خۆت نەخۆشی دڵت هەیە، قەیناکە تۆ دانیشە"، بەڕاستی لەبەرهەندێ هۆ تەشویقمان نەکرد بێتە دەرێ، لەوانە:

یەکەم: خۆی کاک عومەر لەو برادەرە کۆنانەبو، بریارمان دابو کۆنەکان نەیەنە پێشەوە.

دوهەم: کاک عومەر نەخۆشی دڵی لەگەڵدابو، ئەو نەی ئەتوانی ئەوکارەی ئێمە ئەمانەوێت بیکات.

سێهەم: ئەگەر ئەو وەک شەخسیەتێکی وەتەنی بمایەتەوە، ڕەنگبو لەناو

کۆمەڵگای کوردەواریدا زیاتر سودی لێوەرگرین، بۆیە من تەشویقم نەکرد، بێتەدەرێ، ئەگینا خۆی زۆر ئامادەیی تێیدابو.

*** لەو بینینەدا عومەر دەبابە چۆن زانی (م) جاسوسی بەعسە؟**

- عومەر دەبابە، لەکۆنەوە رەئی خراپبو لەسەرێ، ئەگینا ئەو هەروەکو یەقین قسەی دەکرد، پاش ماوەی مانگێک، رۆژێک لە کۆمیتەی سەرکردایەتی باسی شتێکی وام کرد و گوتم کوڕینە قسەیەک هەیە لەسەر (م)، برادەران بۆچونیان وانەبو، بەتایبەتی عادل موراد، کە زۆر دیفاعی لێدەکرد.

*** ئەی دوایی چۆن زانرا کە (م) جاسوسی عێراقە؟**

- سورییەکان توانیان کەشفی بکەن، ئەگینا خۆی و براکەی چاک جێگای خۆیانیان لەناوماناندا کردبۆوە. سورییەکان بروسکەیەکی سەفارەتی عێراقیان لە بەیروتەوە وەگرت و لەپاشاندا پۆستێکی سەفارەتیان لە فرۆکەخانە گرت، کە شتێکی رەمزی تێیدابو و دەڵێ "فڵانە کەس کەبرایەکی ئەفسەرە و لەگەڵ جەلال تاڵەبانی لە سوریایە".

ئنجا سوریەکان کەوتنە پشکنین، سەرۆکی ئەرکانی سوپا (حیکمەت شەهابی) ناردی بە دواما، من ئەوکاتە لە قامیشلی بوم، ناچار بەپەلە گەڕامەوە و لەگەڵ عبدول ئیلا نەسراوی و باقر یاسین چوینە لای و گوتی: "ئەو هەواڵەتان بۆ دەخوێنمەوە، بزانن لەناو بزوتنەوەی نیشتمانی عێراقی جاسوسێک هەیە، بزانن لە کوێیە"؟ هەر کە خوێندیەوە گوتم: "ئەوە لای ئێمەیە"، چونکە وەسفەکە لە (م) دەچو، کە خۆی و براکەی (و) ئەفسەربون و لە دەرەوەش بون.

زانیاریەکە وا هات، کە (م) مەوعدێکی لە ئەنقەرە هەیە و یەکێک دەبینێ، ئێمەش لەگەڵ حیکمەت شەهابی رێکەوتین کە بەشوێنیەوەبین، بۆئەوەی بەڵگەی تەواومان هەبێت.

من ئەو زانیاریانەم بە برادەرانی خۆمان نەگوت، (م) چەند رۆژێ پێش سەفەرەکە هاتە لام و گوتی: "وەڵڵا خزمێکم دێ بۆ ئەستەمبوڵ و ئەمەوێت ببینم، ئەگەر ئیجازەم بدەیتێ، ئەوا دەیبینم و ئەخباریش تێ دەگەم"، منیش گوتم: "زۆر باشە، پارە و شتی وات ناوێت بدەمێ؟ ها حەز ئەکەی باشتێک پارەت بدەمێ هەر پێتبێ باشە"، گوتی: نامەوێ بەڵام من دووسەد دینارم بەزۆر دایە، بۆئەوەی هیچ شک نەکات.

من سورییەکانیشم ئاگادارکرد کە دەڕوات، سورییەکان چاودێری هەمان ئوتێلیان کرد کە ئەو لێی دابەزیبو و ڕەسمیان گرتبو کە کابرای جاسوسی بینیبو.

دوایی گەڕایەوە شام، و ئێمەش هیچ دەنگمان نەکرد، سورییەکان گوتیان ئێوە هەقتان نەبێ، ئێمە خۆمان دەیگرین. ڕۆژێک لە ڕۆیشتنیا بۆ لوبنان و لەسەر سنور گرتبویان و هێنابویانەوە. کە مواجەهەمانکرد بەو ڕاستیانە، گوتی: "وایە بەڵام من تازە پەیوەندیم پەیداکردوە، باوکم پێش ماوەیەک هاتوە و پەیوەندی بۆ من و (و)ی برامی لەگەڵ ئیستیخباراتدا دروستکردوە".

سوریەکان ئەشکەنجەیاندا زانیاری بدرکێنێ، بەڵام خۆی ڕاگرت و تەنها هەندێ زانیاریی درکاند، و دوای ئەو براکەشی هەڵات و ئێمە ڕزگارمان بو.

ڕژێم جاسوسێکی دیکەشی لەناودا دروستکردبو، ئەویش کە زانی (م) گیراوە، شەو ڕایکردبو بۆ ئوردون و لەوێوە تەسلیم بوەوە بە سەفارەتی عێراق و چوەوە بۆ عێراق.[11]

*** بۆچی هەر لە سەرەتاوە یەکسەر دەستاندایە خەباتی چەکداری، نەئەبو تەنها کاری سیاسی بکەن؟**

– باوەڕەمان بەوە بو کە خەباتی چەکداری لە کوردستان زەرورەیە، پێمانوابو لە کوردستاندا خەباتی چەکداریێ خەباتی سیاسی بۆ پێشەوەو ناچێت و نامێنێت، تەنانەت بۆ ژیان و گەشەکردنی خەباتی سیاسییش خەباتی چەکداری پێویستە.

بڕیارماندا، خەڵکی بۆ ئامادەبکەین، لەبەرئەوە چەندین موعەسکەری تەدریبیمان کردەوە لە سوریا، ئیبراهیم عەزۆ و چەند ئەفسەرێکی تر، وەکو سەید کەریم و حەسەن خۆشناو مەشقیان بە پێشمەرگەکان دەکرد. هەندێ ئەفسەری ترمان هەبون، وەکو مولازم فوئاد و جەمال خۆشناو کە معاون شورتە بون و کوڕی زۆر چاک بون، ئەوانە هەمو هاوکاریان دەکرد.

دەورەی باشمان لەسەر (حرب الأنصار) کردەوە، هەتتا لەسەر جۆرەها چەک تەدریبیمان کرد و دوسەد، سێسەد کەسێکمان ئامادەکرد، خەڵکی کەش هاتن بۆلامان لەو کەسانەی کە هاتن بۆلامان و زۆر پیاوی بەڕێزبون، وەک شێخ حسێنی بابە شێخ کە بەڕەئی من ڕۆڵەیەکی هەڵکەوتوی میللەتی کوردبو، زۆر بەداخەوە کە شەهیدبو، بەڕەئی من شێخ حسێن خەسارەتێک بو، لە میللەتی کورد کەوت، ئەو لەو ئێزدیانەبو، باوەڕی بەوەهەبو کە ئێزدی کوردن و دەبێ لە کوردایەتیدا بەشداربن، کوڕی بابە شێخ بو، بابە شێخ بە تەریقەی دینی دوەم کەسە لەناو

ئێزدییەکاندا، لەدوای میر ئەودێت، لەبەرئەوە تەئسیرێکی زۆری هەبو لەسەر ئێزدیەکانی سوریا و تورکیا و عێراق و سۆڤێت.

وەکو ئینسان پیاوێکی جوامێر و دلێر و بە ڕەوشت و ساحێبی شەخسیەتێکی گەورە، بێ فرتوفێڵ و ساغڵەمبو.

هەروەها ئیبراهیم عەزۆش چەند سیفەتێکی کۆکردبۆوە، یەکەم بادینی بو دوهەم، عەسکەری بو، سێهەم، ئەندازیار و رۆشنبیر و نووسەر و ئازابو، چاک لە شەڕی پارتیزانی تێگەیشتبو، شەهیدبونی کەلەبەرێک بو، بە ئاسانی بۆمان پڕنەکرایەوە.

لەهەمانکاتدا شێخ تەحسینی ئێزدی ئەو وەختە لە عێراق تۆرابو، چوبوە لەندەن، ئێمە دەعوەتمان کرد و هات بۆ شام و لەوێ قسەمان لەگەڵ کرد و بەیەکەوە جەولەیەکمان کرد بۆ ناوچەی قامیشلی و سەردانی یەزیدیەکانمان کرد، ئەویش وەکو یەکێتیەک خۆی حسێب دەکرد و ئێمەش دەمانویست نزیکی بکەینەوە، چونکە لە یەکێتی نزیکبو.

## پەراوێزەکان:

١- لەو کاتەی ئەم بەشەی چاوپێکەوتنە بڵاونەکرابونەوە

٢- فەریدون عەبدولقادر، لە ١٩٧٥/٨/١٤ لە شاری بەرلین، لە کاتی بەستنی کۆنگرەی حەڤدەهەمی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا، چاوی بە مام جەلال دەکەوێت و ڕاسپاردەی وڵاتی پێرادەگەیەنێت و هەواڵی دروستبونی نوێی یەکێتی و شێوەی کارکردنی ناوە و دەرەوەی پێیرادەگەیەنێت.

٣- (چەند جارێك هەستم بەگلەیی مام جەلال لە بیروبۆچونی کاك شەهاب کردوە، گوایە مەسەلەی خەباتی چینایەتی بەسەر خەباتی نەتەوەییدا زاڵکردوە، ئەوەش وایکردوە کە مەسەلەکانی "تێزی سێ جیهاندا" ڕیزبەندی ناکۆکیەکان وا لێنەکات کە خەباتی دژی ڕژێمی عێراق لە ناکۆکی سەرەکیەوە بکەوێتە ئاستی ناکۆکی ناسەرەکی...ڕاستە کاك شەهاب لە ناکۆکیەکانی جوڵانەوەی کرێکاری و کۆمۆنیستی جیهاندا دژی ئیمپریالیزم مەسەلەی "تێزی سێ جیهان" و ڕیزبەندی ناکۆکیەکانی لا پەسەند بو). (کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین- ناوەندی مێژوو (ی.ن.ك.) ل. ٨٧).

٤- ئیبراهیم عەلاوی ناوی خۆی نەجم مەحمود و لە سەرکردەکانی قیادەی مەرکەزی حیزبی شیوعی عێراقی بو، لە ١٧ ئەیلولی ١٩٦٧ لە حیزبی شیوعی جیابونەوە، تا کۆتایی ٢٠٠٤ وەك سکرتێری قیادەی مەرکەزی مابۆوە، بەڵام هیچ چالاکیەکی دیاریان نیە و لە لەندەن دەژیا و لە ٢٣ کانونی یەکەمی ٢٠١٤ لە سلێمانی کۆچی دواییکرد و لە شاری نەجەف بە خاك سپێرا).

٥- نامەی مام جەلال لە ١٩٧٦/٨/١٤دا بو بۆ ئیدریس و مەسعود بارزانی.

٦- (لیژنەی ئامادەکاریی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٧٧ لەسەر دەستی هەریەکە لە: د.محمود عوسمان، عەدنان موفتی، شەمسەدین موفتی، قادر جەباری، مولازم جەمال خۆشناو، مولازم فواد چەلەبی، مستەفا خۆخێ)، دامەزرا. (ڕەوتی چەپ لە باشووری کوردستان.ل. ١١٢).

٧- (قیادەی موقەتە، هەوڵیاندا کە بەهیچ جۆرێك، نیشانی نەدەن، ئەمان پەیوندیان بە بارزانیەوە هەیە، بۆیە لە بەیانێکیان لە ١٩٧٦/٣/٦ دا بەبۆنەی ساڵێك بەسەر ڕێککەوتنی جەزائیر و بەیانێکی تر لە کۆتایی مارتی ١٩٧٧ کە لە ئەوروپا بڵاویانکردەوە، لە هیچ کام لەو بەیانانە، باسی مەلا مستەفا و ڕۆڵی بازانی تێدا باس نەکرابو). (التیارات السیاسیة.ل. ٦٩٩).

٨- هەژار موکریانی، دۆستی نزیکی بارزانی لە کتێبی چێشتی مجێوەر، باسی سەردانی بارزانی دەکات لە دوای مۆرکردنی رێکەوتنامەی جەزائیرەوە بۆ لای سەرۆکی ساواک "نەسیری" کە خۆی لەگەڵ د.مەحمودا ئامادەی دانیشتنەکە بوە و دەڵی: (نەسیری روی کردە بارزانی و گوتی: ئێرانی شاهنشا بە سەدەها هەزار دۆلاری یارمەتی شۆرشی داوە، بە چەك و سەربازی خۆشمان هاتوینەتە یاریدەتان، ئێوە هیچ بەهرەتان پێوەنەماوە! گەورەکانی لەشکرتان هەمو دزن، هەر خەریکی گیرفانی خۆیانن. چەند جارمان گوتوە "حەسۆ میرخان" "عەلی شەعبان" "رەشید سەندی" و کێ و کێ دز و خائینن بە شۆرش، دەریان کەن، بە قسەتان نەکردوین، ئێستا لەم شەرە گەورەیەدا هەرچی سەرانی شۆرش و فەرماندەی هێزەکانتانن لە شارەکانی ئێران رادەبوێرن و کەسیان لە جەبهەنین. پەنجا هەزار گولە تۆپمان لە داوێنی چیای زۆزك تەقاند و سەنگەرمان بە عەرەب بەجێ هێشت، پێشمەرگە نەچون سەنگەرەکان داگیرکەن یاریدەتانتان جگە لە زیان بۆ ئێران هیچ بەهرە نادات). (هەژار موکریانی، کتێبی چێشتی مجێوەر، ل. ٥٥٤).

٩- کۆنگرەی حەڤدەهەمی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا لە بەرلینی رۆژئاوا لە ٢٧-١٩٧٥/٨/٢٨ گیرا، کۆمەڵە لەو کۆنگرەیەدا بو بەدوبەشەوە و کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات دروست بو.

١٠- عومەر دەبابە لە ١٩٧٦/١١/٦ هاتە دیمەشق.

١١- ئەوکەسە ناوی (ف.ج.) بو.

# سەرەتای خەباتی چەکداری یەکێتی

*** کەی خەباتی چەکداریی دەستپێکرد، یان کەی دەستانکردەوە بە ناردنی پێشمەرگە بۆ کوردستان؟**

– لە یادی یەکەمدا، واتا دوای ساڵێک بەسەر دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانیدا، یەکەم گروپی چەکدارمان گەیاندەوە کوردستان. لەوکاتەدا پەیوەندیمان لەگەڵ ئارامیش پەیداکرد، دوجاریش جەماله رەش هات و نامە و راسپاردەی برادەرانی وڵاتی بۆهێناین.

برادەرانیش لە وڵات کەوتبونە چالاکی و نوسراوەکانی ئێمەیان چاپ و بڵاودەکردەوە و خەڵکیان رێکخستبو.

*** بۆچی لە سەرەتادا سودتان لە کادیرە کۆنەکانی ناو پارتی وەرنەگرت کە گەرابونەوە بۆ عێراق؟**

– ئەو بۆچونە هەبو کە پێویستە ئێمە سود لەو کادیرە کۆنە شارەزایانە وەربگرین، بەڵام من رەئی خۆم زۆر بە سەربەستی لەسەر ئەو فکرەیە بڵێم: یەکەمجار لە ئێران پاش روخانی شۆرشی کورد و ئاشبەتاڵ، کۆمەڵێک کادیری کۆنی پارتی بە سەرپەرشتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و بەشداری چالاکانەی عەلی عەسکەری و عومەر دەبابە باس لەوەدەکەن، چی بکەن، ئەوان بریارئەدەن کە کادیرەکان بگەرێنەوە بۆ عێراق و هەوڵدەن، ئەگەر حکومەتی عێراق رێیاندان حیزبێکی سیاسی دروستبکەن و هەمو بگەرێنەوە، خۆ ئەگەر رێیاننەدان ئەوا، بۆخۆیان هەوڵدەن رێکخستنێک دروستبکەن.

بریارئەدەن و کەمال محێدین دەنێرن بۆلای تەها محێدین، دەڵێ: کاک تەها حاڵ و مەسەلەیەکی واهەیە، ئەویش دەڵێ باشە، با بچم پرس بکەم، کە پرس دەکا دەڵێ: "باشە بەسەرچاوان حکومەت دەڵێ باشە و بابێنەوە".

کە جەماعەت دەچنەوە (عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری) بەو ئومێدەی

حکومەت ڕێگایان بدات حیزب دروستکەن، ئەوەبو حکومەت ڕێگای پێنەدان و هەموویانی نارد بۆ خوارووی عێراق.

کۆمەڵێک لە کادیرە کۆنەکان، لەگەڵ بارزانی بون و گەڕابونەوە عێراق و لە دەوری سەیدا سالّح یوسفی کۆبونەوە و خەریک بون ڕێکخستنێک دروستبکەن، ئەوانە بریتی بون لە: سەیدای یوسفی، عەلی هەژار، ڕەسوڵ مامەند، مەلا ناسح و چەند برادەرێکی تر، دەستیان کردبو بە چالاکی و چوبون بۆ رفاعی[1] بۆلای عەلی عەسکەریش کە ئەو کاتە سەرۆکی شارەوانی ئەوێ بو.

عەلی عەسکەری، گومان لە عەلی هەژار و مەلا ناسح دەکات و وادەزانێ ئەو چالاکییە بە هاوکاری ڕژێمە، لەبەرئەوە دەڵێ: "بەخوا من وازم لە سیاسەت هێناوە" و بەڵام ناشیەوێت لەگەڵیاندا بیپچڕێنێت، دوای ئەوە جارێکی تر دەچنەوە لای و وردە وردە قەناعەتی پێ دەکەن کە کاریان لەگەڵدا بکات.

بەڵام دوای ئەوەی کە ئێمە ناومان دەرکرد و دەستمانکرد بە چالاکی، بە تەقدیری خۆم و بەپێی ئەو زانیاریانەی کە من و نەوشیروان دەستمان کەوت، ئەو جوڵانەوەیە دەستی حکومەتی تێیدابو، بۆئەوەی یەکێتی ئەو بۆشاییەی لە مەیدانی نیشتمانپەروەری و دیموکراتی و شۆڕشگێری و جەماهیریدا دروستبوبو، پڕی نەکاتەوە و ئەوانەی تەشویقکرد بەتایبەتی سەیدای یوسفی و ئەو جەماعەتە.

ئەوانە هەڵسان ڕێکخستنێکیان دروستکرد بە ناوی (الحركة الاشتركية الديمقراطية الكردستانية)، پەیوەندیشیان بە دکتۆر خالیدەوە کردبو، بەڵام چونکە ئەو لەبنەوە پەیوەندی لەگەڵ ئێمەداهەبو، ئاگادارمان کردبۆوە کە خۆی ئامادەبکات بۆ هاتنەدەرەوە، ئەویش وەڵامی داینەوە، کۆمەڵێک لە پارتیە کۆنەکانی ئامادەکردوە. پاشان داوای چەند هەزار دینارێکی کرد و ئێمەش بۆمان نارد، بۆئەوەی لەوێ چەک و تەقەمەنی پێبکڕن و بچنە شاخ.

*** لە سەرەتادا کۆمەڵێک چەکدار لە ناوچەی حاجی ئۆمەران - مەنگورایەتی قەڵادزێ - بە دەستپێشخەری (کوێخا رینگۆ) هاتنە دەرەوە، ئایا پەیوەندیان بە ئێوەوە هەبو، یان بە ئاگاداری ئێوە بو؟**

- نە پەیوەندیان لەگەڵ ئێمەهەبو، نە ئاگامان لێیان هەبو، لەپڕ جوڵانەوەیەک تەقییەوە لە حاجی ئۆمەران، لەوێ کۆمەڵێک خەڵک وەک حاجی شێخە و عەلی ئاغا و کۆمەڵێک لە خەڵکی ئەو ناوچەیە ڕاپەڕین و دایانە شاخ، ئەوانە یەکسەر

پەیوەندیان بە ئێمەوە کرد و هاواریان بۆ ئێمە هێنا و گوتیان ئێمە بە تەمای ئێوەین و لەگەڵ ئێوەدەبین.

ئەوانە بەشێکی زۆریان لە کۆنە جەلالیەکان بون، هەرچەندە کۆنە مەلایشیان لەگەڵدابو، بەڵام ئومێدیان بەئێمەهەبو. ئێمەش پەلەمان لە دکتۆر خالید کرد و گوتمان تۆ زو ئیلتیحاق بکە و بیانگەرێ و سەرکردایەتیان بکە، با ئەوانە لە دەست دەرنەچن، ئەوانە سەد چەکدارێک بون لەوێ و چەکی خۆشیان پێ بو.

دکتۆر خالیدیش لەوکاتەدا لەگەڵ عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری قسەدەکات، عەلی عەسکەری دەڵێ: "من هیچ ئامادەی هاتنەدەرەوە نیم، بەڵام ئەگەر مام جەلال گوتویەتی، ئەوە لەبەرخاتری ئەو دێمەدەرەوە، چونکە ئەو باشتر لە ئێمە دەزانێ، من لەسەر ئەو ئەساسە دێم کە ئەو هەواڵی ناردوە".

لەراستیدا من خەبەرم نەناردبو عەلی عەسکەری بێتە دەرەوە، بەڵکو تەنها هەواڵم بۆ دکتۆر خالید ناردبو، بەڵام دکتۆر خالیدیش پێی دەڵێ، "مام جەلال گوتوێتی تۆش وەرە دەرێ".

دکتۆر خالید، دەیویست زۆرترین خەڵک بێتە دەرەوە، هەروەها پەیوەندی بە عومەر دەبابەشەوە دەکەن کە بێتەدەرێ، ئەویش دەڵێت: "ئێوە هەردوکتان برۆن و ئێمەش لەگەڵتانین".

ئیتر عەلی عەسکەری و عومەر دەبابە و چەند کۆنە کادێرێکی پێشمەرگەش لەگەڵیان دێن، وەکو سەعدی گچکە و سەید کاکە، ئەوانە کۆنە پێشمەرگە بون لە ناوچەی هەولێر. ئەوانە دێنە دەرێ و دەچنە شاخ، بەسەر ناوچە جیاوازەکاندا دابەش دەبن، عەلی عەسکەری دەچێتە ناوچەی شەدەڵە و لەوێ پەیوەندی بە ئارام و ئەو برادەرانەوە دەکات و خەڵک لەوێ کۆدەکاتەوە، لەولاشەوە عومەر دەبابە و برادەرانی تر نامە دەنوسن بۆ خەڵک کە بێنە دەرەوە، کۆمەڵێک خەڵک بەدویان دەکەون، وەک کورانی عەباس ئاغا و عەشیرەتی ئاکۆ، نزیکی چەند سەد کەسێکیان لە ناوچەی باڵەکایەتی لێ کۆبۆوە.

ئیتر وردە وردە بزوتنەوەکە گەورەبو، زۆر لەوە گەورەتربو کە ئێمە دەمانویست، بەڕاستی پەلەپەل و دڵسۆزی د. خالید، رۆڵی سەرەکی بینی، ئێمە رەئیمان وانەبو هاتنە دەرەوە بەو خێراییە بێت، واتا کارەکە بە خواستی ئێمە نەرۆیشت، بەو شێوەیە دەبینین، دەست پێکردنەوەی شەر بەسێ شێوە دەستی پێکرد:

یەکەم: ئەو مەفرەزانەی ئێمە ئامادەمانکردن لە سوریاوە بۆ ئەوەی بیاننێرینەوە بۆ کوردستان.

دوهەم: هاتنە دەرەوەی عەلی عەسکەری و عومەر دبابە و دکتۆر خالد و ئەو کەسانەی تر، بونەهۆی تەقینەوەی شۆرشەکە و هاتنە دەرەوەی سەدان کەس، لەئەنجامدا ژمارەیان زۆر زیادیکرد، بەلام زوربەیان بەشێوەی عەشائیری و عاتفی و لە سەر بناغەی دۆستایەتی و برادەرایەتی کۆبونەوە، نەک لەسەر بناغەی رێکخستنێکی نوێ و حیزبی و هۆشیارانە، بۆیە ئەم ژمارە زۆرە (زۆر و بۆربو) ماوەیەکی زۆری نەخایاند و چەند مانگێکی پێنەچو، دەستیانکرد بە تەسلیم بوونەوە و گەرانەوە بۆ باوەشی رژێم.

سێهەم: ئەومەفرەزە بچکۆلانەبون کە کۆمەلەی رەنجدەرانی کوردستان، ناردنییانە دەرێ، ئەوکاتە ناوی کۆمەلەی مارکس لینینی کوردستان بو، یەکەم مەفرەزە لە هەلەبجە هاتەدەرێ کە بریتی بون لە: ئەندامانی کۆمەلە (حامیدی حاجی غالی، شەوکەتی حاجی موشیر، حەمەی حاجی مەحمود، عەلی شیعە و چەند برادەرێکی تریش) جگە لەوانە، لە ناوچەی سلێمانی ملازم عومەری حاجی عەبدوللا و کۆمەلێک برادەری تر هاتبونە دەرێ و ئارامیش خۆی چو بو بۆ قەرەداخ و هێزێکی چەکداری دروستکردبو.[٢]

ئەوەی ئێمە لە سوریا ئامادەمانکردبو بینێرینەوە، هێزێکی باشی پێشمەرگە بو، بەلام راستیەکەی نەمان دەزانی لەدیوی ناوەوە چۆن دەژێن و زەمینەی کار چۆنە، لەبەرئەوە یەکەمجار وامان پەسەندکرد ژمارەیەکی کەم بنێرینەوە.

ئەوەبو چەند هەولێکماندا بۆ ناردنەوە، یەکەمجار هەولێکماندا، کۆمەلێک برادەر لەوانە عادل موراد و فەرهاد شاکەلی و چەند برادەرێکی تر بچن، بەلام لە نیوەی رێگا برادەرەکان گەرانەوە و بریان نەکرد و توانای چونەوەیان نەبو، هەریەکە بیانویەکی هەبو.

# ئیبراهیم عەزۆ و مەفرەزە سەرەتاییەکان

*** کە هەوڵدانی یەکەمتان بۆ گەڕانەوە بۆ کوردستان سەرکەوتونەبو، پیلانی داهاتوتان چی بو؟**

– مەفرەزەی یەکەم سەرنەکەوت، جاری دوهەم ئیبراهیم عەزۆ و برادەران چون و سەرکەوتن و گەیشتنەوە کوردستانی عێراق، ئیبراهیم عەزۆ، لاوێکی ژیری تێکۆشەربو، ئەندازیاربو کرابو بە سەرباز و بوبو بە نەقیب لە سوپای عێراقیدا، لە مۆسکۆ دەورەی لەسەر سامی شەش بینیبو، خوێندەوارێکی چاکبو، عەرەبی و ئینگلیزی و کوردی بە هەردو لەهجەکانی دەزانی. دەستی نوسینیشی هەبو، هەم لە روی عەسکەریەوە و هەم لەروی سیاسیەوە و هەم لە روی بیرکردنەوەوە و هۆشەوە بەتوانابو، بەراستی شەهیدبونی، زیانێک بو کە هەتا ئێستاش کەلێنەکەی لە ناوچەی بادینان پڕنەکراوەتەوە.

کە ئیبراهیم عەزۆ گەڕایەوە، ٤٠ کەسی لەگەڵ بو، دو کەسیان نەخۆش کەوتن و خۆیان لادا، بەڵام بە ٣٨ کەسەوە گەڕایەوە ناو کوردستانی عێراق. گەڕانەوەیان بەهۆی هەڤاڵانی کوردستانی تورکیاوەبو لە سەروهەمویانەوە، شەهیدی نەمری کوردستان (نەجمەدین بیوکەیا) کە لای ئێمە بە (سەلاح) ناوی دەرکردبو، ئەو سەردەمە ئەوانە لەناو پارتی دیموکرتی کوردستاندا کاریاندەکرد، کە پێیان دەوتن (شڤان چی) یان دوایی بەناوی (دە دە کە دە) ناویان دەرکرد، ئەوانە هاوکاری ئێمەبون و یارمەتی ئێمەیان دەدا لە دەربازکردنی ئەو برادەرانەدا.[٣]

سەلاح دەورێکی گەورەی هەبو، بۆ گەیاندنی ئەو برادەرانە بۆ ناوسنور، بەڵام بەداخەوە ئەو برادەرانە، چونەناوەوە پەیوەندیان لەگەڵ ئێمە پچڕا، جێی داخ و ئەسەفە ئەوکاتە نەمان توانی بێ سیمێکیان بدەینێ، بۆئەوەی بتوانن لەگەڵ ئێمە پەیوەندی بکەن و ئاگامان لێیان بێت.

ئەگەر پەیوەندیمان لەگەڵیان هەبوایە، توشی ئەو گیروگرفتانە نەئەهاتن، کاتێ ئەو برادەرانە دەگەنەوە وڵات، لەناو ئەو برادەرانەدا کۆمەڵێک کادێری ژیر

و هۆشیار و باش هەبون وەک عەبدول رەحمان شەنگاری، قاسم محەمەد عەلی و چەندین لاوی تر کە بەداخەوە ئێستا هەمو ناوەکانیانم لە بیرنیە، ئەوانە چوبونەوە و هەریەکە لە ناوچەی خۆی توانی پەیوەندی بە خەڵکەوە بکات و خەریکی دروستکردنی مەفرەزەبون، بەڵام بەداخەوە قیادەی موەقەتەی سەر بەماڵی مەلا مستەفا کەوتنە پیلانگێران لێیان و کەوتنە راونانیان.(٤)

# سەرەتای شەڕی ناوخۆ

*** ئێوە خۆتان بۆ ئەو بەربەرەکانیە ئامادەنەکردبو لەگەڵ هێزەکانی پارتی؟**

- بەهیچ جۆرێک چاوەڕێی بەربەرەکانیمان لەوانەوە نەئەکرد، چونکە ئێمە نەماندەزانی ئەوان شەڕمان لەگەڵدادەکەن! برادەرانی ئێمە هێشتا جێی خۆیان نەگرتبو، ئەوان بەفێڵ کۆمەڵێکیان گرتن و کوشتیانن.

پاش ماوەیەک ئیبراهیم عەزۆ لەگەڵ دوسێ پێشمەرگە دەچنە گوندێک لە کوردستانی تورکیا بۆ سۆراخی ئەوانە، ئەوەبو قیادەی موەقەتە بەهۆی عەشایری کوردی تورکیاوە دەیانگرن، پاشان ئیبراهیم عەزۆشیان لە بەندیخانە شەهیدکرد(٥)

دوای ماوەیەکی تر، یەکێ لە کادێرە پێشکەوتوەکانمان لەگەڵ ١٨ ئەندام و کادێری ترمان دەچنە دێیەک لە تورکیا، ئەوانیش دەگرن و دوای ئەوەی دەیانبەنە ئەشکەوتی (باڤێ) لەوێ زوربەیان دەکوژن. بەمجۆرە ئەو مەفرەزانەی، ئیبراهیم عەزۆ لەگەڵ خۆی بردینیەوە هەمویان بەدەستی قیادەی موەقەتە و بەدەستی نۆکەرانی میتی تورکیا کوژران، جێی داخە، قیادەی موەقەتە بەوجۆرە بەرەنگاری شۆڕشی تازەی کوردستان بونەوە و کەوتنە لەناوبردن و کوشتنی ئەوکەسانەی، دەیانویست شۆڕش هەڵگیرسێنن.

لەجیاتی ئەوەی یارمەتی و هاوکاریان بکەن، لەجیاتی ئەوەی پشتیوانیان لێبکەن، کەچی دەستیانکرد بە کوشتن و لەناوبردنی ئەو تێکۆشەرە قارەمانانەی چوبونەوە، شۆڕش هەڵگیرسێننەوە، لەوکارە ناجوامیرانەدا هاوکاری تەواویان لە ئاغا و دەرەبەگە خائینەکانی کوردستانی تورکیا وەرگرت، زۆر بەداخەوە

هەرچەندە ئێمە هەوڵماندا کە دۆستایەتی لەگەڵ مەسعود و ئیدریس بارزانی دروستبکەین، بەڵام بێ ئەنجامبو، ئیدریس لە کۆبونەوەیەکدا کە کۆمەڵێک کادێری تێیدا بەشداربو لەوانە: سەید کاکە و سەعدی گچکە و چەند کەسێکی تر، هەرەشەی کردبو، گوتبوی (راستە ئێمە شۆڕشمان پێنەکرا، بەڵام دەتوانین شۆڕش تێکبدەین، ئەگەر شۆڕشمان پێ نەکرێ شۆڕشمان پێ تێکدەدرێ، ئێمە ئاگاداری ئەو بزوتنەوەیە نین، کە ئێستا یەکێتی نیشتمانی دەستی پێکردوە)، ئەوەبو لە بادینان تەهدیدەکەی خۆیان هێنایەدی و ئەو مەفرەزە سی و هەشت کەسییەی، گەڕابونەوە بۆ خەبات، لە ناویان بردن، ئەگەر لەناویان نەبردنایە بەراستی دەبونە هەوێنێکی باش، بۆ بزوتنەوەیەکی پێشمەرگانەی گەورە لە ناوچەی بادینان.

# شەهیدکردنی ئیبراهیم عەزۆ و هاوڕێکانی

*** واتا شەهیدکردنی ئەو برادەرانە لە بادینان بە سەرەتای شەڕی ناوخۆی دوهەم دا ئەنرێت؟**

- زۆر بەداخەوە سەرکردایەتی بارزانی جارێکی دیکەش، لە ختوخۆرایی و بەبێ هۆ شەڕی براکوژیی هەڵگیرساندەوە، بەتایبەتی شەهیدکردنی عیزەت شەنگاری و ١٨ هەڤاڵەکەی لەناو ئەشکەوتی (باڤێ)دا و لە زیندانی قیادەی موقەتەدا تاوانێکی بێوێنەیە لە مێژوی میللەتی کوردا.

عیزەت شەنگاری و هاورێکانی و کۆمەڵێک لاوی کوردپەروەر و شۆڕشگێر و پێشکەوتنخوازی کوردستان، لە کاتێکدا شەهیدکران، گیانی خۆیان خستبوە سەردەستیان و وازیان لە ژیان و گوزەرانی تایبەتی خۆیانهێنابو، چوبون بۆ هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی کوردستان و بوژاندنەوەی کوردایەتی و کڕینەوەی شەرەف و ناموسی کوردەواریی.

بەداخەوە، لەجیاتی ئەوەی پشتیوانییان لێبکرێت و یارمەتیان بدرێت، کەچی بەشێوەیەکی زۆر نامەردانە هەمویان کوشتن، یەکێکیان دەرچو کە کەوتبوە بنەوە

و بریندارىو، دوايى كە بكوژەكان رۆيشتبون خۆی دزیبۆوه، خۆی گەیاندبۆوه شوێنێکی ئارام، بەڵام ئەویش لە ئەنجامی ئەو کارەساتە نەختێ تێکچوبو.

ئیبراهیم عەزۆ و دو هاورێی کەشیان لە زینداندا شەهیدکران، جگەلەوە چەند برادەرێکی کەشمان کە کەوتبونە دەستیان ئەوانیشیان شەهیدکردن، باوکی یەکێکیان تێکۆشەرێکی دێرینی پارتی بو و بە ناحەق لەلایەن مەفرەزەیەکی پارتیەوە لەسەر کانی گرتیان و کوشتیان.

بەمجۆرە سەرکردایەتی بارزانی ویستی بیسەلمێنێ، کە ئەوان هیچیان پێنەکرێت، ئەتوانن شۆرش تێکبدەن. لەگەڵ ئەوەشدا، یەکێتی نیشتمانی نەیدەویست ئەمکارانە بکات بە بیانویەک بۆئەوەی شەڕێکی سەرتاسەری لەنێوان یەکێتی و پارتیدا دروستبکاتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەوڵیدا، بەرێگای ئاشتی و برایانە ئەو مەسەلەیە چارەسەربکات.

*** تۆ هیچ هەوڵی بەردانی ئەو برادەرانەتدا لە زیندانەکانی قیادەی موەقەتە، یاخود هەوڵی دانوستاندنتدا لەگەڵیان؟**

– من نامەیەکم بۆ ئیدریس و مەسعود بارزانی نوسی و داوام لێکردن، ئەو برادەرانە بەردرێن، من نەم ئەزانی ئەو برادەرانە کوژراون، من وام ئەزانی ئەوان گیراون، نوسیبوم ئەوە کارێکی زۆر خراپە، ئەگەر ئەو برادەرانە بکوژرێن بەتایبەتی ئەو برادەرانە خۆیان تەرخانکردوە بۆ هەڵسانەوەی شۆڕش، پێویستە لە کوردستاندا ئازادی بیروباوەر هەبێت و ئەوان سەربەست بن لە خەباتدا، بە تایبەتیش ئەوانە هیچ دژایەتیەکی ئێوەیان نەکردوە، بەپێچەوانەوە ئەوانە هەمویان کادرێری پێشوی پارتی بون، لەبەرئەوە داوای بەردانیان دەکەم.[٦]

لە لەندەنیش بەهۆی عەلی سنجاریەوە چاوپێکەوتنێک لەگەڵ مەسعود بارزانی دروستبو، تکام لێکرد کە رێگای ئەوگرتن و کوشتارە نەدات و ئەمربکات، ئەو برادەرانە بەربدرێن. مەسعود بەڵێنیدا و گوتی: "هەوڵئەدەم ئازادیان بکەم و نامە دەنوسم بۆئەوەی بەریانبدەن".[٧]

بەڵام بەداخەوە لە جیاتی ئازادکردنیان، هەمویان شەهیدکران، سەرەرای ئەوەش ئێمە لەگەڵ مەسعود پێکهاتین کە هاوکاری یەکتر بکەین و تەبابین و دژایەتی یەکترنەکەین.

مەسعود بارزانی، هاتە شام و لەوێ لە ١ مارتی ١٩٧٧ دا رێککەوتنێکی سێ قۆڵیمان ئیمزاکرد، لەنێوان ئێمە و ئەوان و (باقر یاسین) بەناوی قیادەی قوتری

عێراقی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکییەوە.

لەو ڕێکەوتنامەیەدا هاتبو، شەڕی یەکتری نەکەین و هاوکاری یەکتری بکەین، ئێمە بە چەک یارمەتیان بدەین، ئەوانیش لەو پارە زۆرەی شۆڕشی کوردستان کە لایانبو، هەندێک هاوکاریمان بۆ دابینبکەن بۆ یارمەتی دانی شۆڕش. ئەوەبو ئێمە لەسەرەتادا ٥٠ کلاشینکۆفمان دانێ، کۆمەڵێک تەقەمەنیمان دانێ و لە قامشلیەوە بۆمان ناردن، هەروەها لەگەڵ مەسعود پێکهاتین، ئێمە جەماعەتێکی تر بنێرینەوە بۆ بادینان و ئەوان ڕێیان لێنەگرن.

ئێمە شێخ حسێنی شێخ بابە شێخی ئێزدیمان پێشیازکرد، ببێتە لێپرسراوی ئەو کۆمەڵە، وەک لەوە پێش باسمکرد کە ئەو پیاوێکی لەسەرخۆ و ژیر بو، مەسعود خۆی وتبوی منیش شێخ حسێنم زۆر خۆشدەوێت و لاریم نیە ببێتە لێپرسراوی ئێوە لەو ناوچەیە و ئەتوانێت لەگەڵ هێزەکانی ئێمەدابێت.

هۆی ئەوەی ئێمە ئەومان پێشنیازکرد، بۆ ئەوەبو پێکادان رونەدات، کەچی بەداخەوە دوای ئەوەی مەسعود بارزانی گەڕابۆوە، هەمو کارەکان بەپێچەوانەوەکرا. لە جیاتی ئەوەی بڕیار بو یارمەتیمان بدەن و ڕێمان نیشان بدەن، ڕێیان لێگرتین و دوجار کەمینیان بۆ دانایین، بۆ ئەوەی برادەرانمان لەناوبەرن و بیانکوژن، بەڵام ئەوان قارەمانانە و ئازایانە ئەو پیلانەیان پەک خست، برادەران نەیان توانی بگەنە بادینان، بەڵام گەیشتبونە لای سێ سنورەکە.

پاشان لەگەڵ نەوشیروان و برادەرانی تر یەکیان گرتەوە، لەسەرڕێکی ترەوە لە جیاتی ئەوەی یارمەتی و پارەمان بدەنێ، دەستیانکرد بە پیلانگێران و تێکدانی ڕیزەکانمان. ئێمە لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی ڕێژی هەمو ئەوانەمان دەگرت کە بەناوی ئەوانەوە هاتبونەوە ئەو ناوچانەوە. بەڵام مەسعود بەڵێنەکانی خۆی هیچی بەجێ نەگەیاند، ئێمە چەک و تەقەمەنیمان دانێ، بەڵام ئەوان ئەو پارەیەی بەڵێنیان دابو بماندەنێ نەیاندایێ، پاشان وادەردەکەوێت وەکو لە چەند کەسێکم بیست لەوانە (مولازم ئیبراهیم دزەیی) کە خۆی ئەو سەردەمە لەگەڵ مەلا مستەفا بو لە واشنتۆن، وا دەردەکەوێت، مەلا مستەفا دژی ئەو ڕێکەوتنامەیە بوە، هەواڵەکەی دراوەتێ مەسعود ڕێکەوتنی لەگەڵ من ئیمزاکردوە، لەجیاتی ئەوەی پێی خۆشبێ گوتویەتی، "جەلال ئەویشی هەڵخەڵەتاند و مەسعودیشی بەفریوبرد"، داوای لێکردوە بەتاڵی بکاتەوە.

*** رۆڵی سامی عەبدولرەحمان چی بو لەو روداوانە؟**

- وەک دەرکەوت، بارزانی دژی ئەو ڕێکەوتنامەیەبوە و نەیهێشتوە ئەو ڕێککەوتنە سەربگرێت، من پێموابو سامیش لە لەندەن لەو ڕێککەوتنەدا بەشدار بو، پێشتریش من ئەوم لە ڤیەنا بینیبو، بریارمان دابو دژایەتی یەکتر نەکەین و پێکەوە ئیش بکەین و هاوخەباتبین، بەڵام لەوە دەچێت، ئەو دەستی هەبوبێت لە تێکدانی ئەو ڕێکەوتنامەیەدا.

وەکو دەردەکەوێت، مەلا مستەفا خۆی ئەو ئیشەی کردوە، هەرچەندە سامی لە دامەزراندنی قیادەی موەقەتەدا، بە بەرگێکی پێشکەوتنخواز و چەپ هاتەپێشەوە، بەڵام لە کوشتنی هاورێکانی ئێمە و بەتایبەتی لە پیلاندانان بۆ کەمین دانان بۆ گرتنی حەسەن خۆشناو و هاورێکانی و بۆ ئیعدامکردنی عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید و سولاقە (کە پێشمەرگەیەکی مەسیحی بو) و هەڤاڵەکانیان، دەستێکی باڵای هەبو دەوری گەورەی بینی لەوکارەدا و لێپرسراوێتیەکی مێژویی لە ئەستۆدایە.

*** هۆی چی بو، سەرکردایەتی بارزانی دژایەتی یەکێتیان دەکرد؟**

- وەک دەرکەوت ئەوانە بە خوت و خۆرایی سێجار، یەک لە دوای یەک شەڕیان بە ئێمە فرۆشت و ئەو برادەرانەی ئێمەیان تێرۆرکرد، جاری یەکەم گروپی ئیبراهیم عەزۆ، عزەت شەنگاریی، عەبدولرەحمان شەنگاریی، قاسم محەمەد عەلی و سوندی و برادەرەکانی تریان شەهیدکرد کە نزیکی ٣٧ کادێری زۆر باشبون.

ئەوکاتە ٣٧ کادێر، گەڵێک زۆربو، لە سەرەتادا لە هەمو ناوچەی سلێمانی ٣٠ تا ٣٨ کەس چوبونە دەرەوە، جاری دوهەم، پاش ڕێکەوتنمان لەگەڵ مەسعود بارزانی و مۆرکردنی ئیتفاقیەکەی شام ئەوەبو من گەرامەوە بۆ وڵات و لەوێ چەکمان بەهۆی برادەرانی کوردستانی تورکیاوە بۆهاتبو.

بۆ وەرگرتنی چەکەکان، مەفرەزەیەکمان بە سەرۆکایەتی حەسەن خۆشناو نارد کە بیهێنن، قیادەی موەقەتە دیسان کەمینێکیان بۆ دانان و حەسەن خۆشناو و هەشت نۆ پێشمەرگەی تریان شەهیدکردین و چەکەکانیان بەتاڵان برد و چەندین برادەریشیان بەندکرد.[٨]

ئەم تاوانەشیان بەهۆی هەندێ ئەندام و کادرێری خۆیان و عەشائیری کوردی تورکیاوە ئەنجامدا کە نۆکەری میت و دەرەبەگ و کۆنەپەرست بون. ئەوانە وایان دەزانی، ئەوە کارێکی باشە، چەکەکانیان بۆخۆیان بێت و سەرەکانیشیان بۆ

سەرکردایەتی بارزانی بێت.

جاری سێهەمیشیان، ئەوەبو کە کارەساتی هەکارییان بەسەرا هێنابن ( نامەوێ لەسەری بڕۆم) چونکە کارەساتی هەکاری لە نامیلکە نایابەکەی نەوشیرواندا کە من، ناوەڕۆکەکەی زۆر بەباش و راست دەزانم و تەعبیر لەرەئی منیش دەکات باسکراوە.(٩)

قیادەی موەقەتە، سێجار یەک لەدوای یەک شەڕیان پێ فرۆشتین، ئینجا ئێمەش بڕیارماندا، مادام ئەوان لە هەرجێیەک دەستیان دەروات نایەڵن ئێمە هەبین، ئێمەش لەو شوێنانەی دەستمان دەروات نەیەڵین ئەوان هەبن.

ئەوەبو ئەوانمان لە پارێزگای کەرکوک، هەولێر و سلێمانی دەرپەراند و لە ناوچەی بادینان مانەوە، ئێمەش لەو سێ پارێزگایە هێزی پێشمەگە و توانای خۆمان دروست کردەوە و وردە وردە گەشەمان پێدا.

دیارە شەهیدکردنی عەلی عەسکەری و دوکتۆر خالید و شێخ حسێن و هەڤاڵەکانیان، لەگەڵ دەیان کادێر و پێشمەرگەی تری وەک حەسەن خۆشناو و ئیبراهیم عەزۆ و هەڤاڵەکانیان، بۆشاییەکی گەورەی خستە بەینی ئێمە و پارتی دیموکراتی کوردستان - قیادەی موقەتەوە، ئەوان دەریانخست، پەیوەندیەکانی کۆنی خۆیان نەبڕیوە، هەرچەندە وایان باس لێوە نەدەکرد.

جارێ لەدیوی ئێران، بە ئاشکرا ساواک، بارەگای بۆ دانابون لە هەورامان و لە دزڵی و لە سەردەشت، یارمەتی ئەدان لەدژی ئێمە، هەرچەندە حکومەتی ئێران رێکەوتنی هەبو لەگەڵ عێراق، بەپێی رێکەوتننامەی جەزائیر، دەبوایە ئێران ماوەی هیچ جۆرە چالاکیەکی جەماعەتی قیادەی موقەتەی نەدایە، بەڵام وادیاربو ئەوان بە رەزامەندی عێراق و ئێران شەڕی براکوژییان دروستکردبوّوە، بۆئەوەی شۆڕشی کورد لە ناوخۆدا یەکتری بخۆن و ماوەیان نەبێت، دژی عێراق خەبات بکرێت، ئەگینا ئێرانێک کە لەگەڵ عێراق لەسەر بناغەی رێکەوتنامەی جەزائیر رێکەوتبێت، چۆن دەبێت رێگای چەکدار و پێشمەرگەی کورد بدات!؟.

هاوکاری میت لەگەڵ قیادەی موەقەتە لە دژی شۆڕشگێرانی کورد، چ لە ناوبردنی ئیبراهیم عەزۆ و عزەت شەنگاری و گروپەکەیان و چ لە کارەساتی هەکاریدا بێت، دەریخست، ئەوان پەیوەندیەکانی دەرەوەیان هەر نەبڕیبو.

نامەی بارزانیش بۆ جیمی کارتەر دەریخست، مەلا مستەفا لەسەر هەمان رێبازی خۆی بەردەوامە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەمەریکا و دەوڵەتەکانی دراوسێدا، پەیوەندیەکانی بەستۆتەوە بەوانەوە و لەشێوەی هاوکاری دەرچوە، بەڵکو

خۆبەستنەوەبو، دوربو لە هاوکاری سیاسی لەنێوان دو هێزی سیاسیدا.[١٠]

مەلا مستەفا، بەهیوای ئەوەبو خۆی بەشێک بێ لەوان، تەنانەت لە نامەکەیدا، دوژمنایەتیەکی زۆری شیوعیەت نیشان دەدات، وا نیشان دەدات کە شۆڕشی ئەیلولی لە دژی شیوعیەت و کەریم قاسم کردوە، چونکە قاسم شیوعی بوە. بێگومان ئەمانە لە بنەڕەتدا هیچ ئەسڵ و ئەساسی نیە، ئەم قسانە بۆ ئەوەبوە، ئەمەریکا یارمەتی بدات، هەربۆیە لە نامەکەیدا دەڵێ: "پێویستە ئێوە یارمەتیم بدەن، من پەنجا ساڵە متمانەی میلەتی کوردم هەیە"، بە کارتەر دەڵێ: "من ئەو متمانەیەمدا بەتۆ، تۆش بەکاری بهێنە بۆ ئێمە و یارمەتیمان بدەو و دەستمان بگرە و هەڵمان بستێنەوە".

هەروەها لەو نامانەیدا کە لە زۆربەی لە رۆژنامەکانی ئیسرائیلدا دەرکەوت، بارزانی بەهۆی (ستیبان سۆلارتزی) سەرۆکی لۆبی سەهونیەوە لە ئەمەریکا، دیسان پەیوەندی کردوە و سڵاوی ناردۆتەوە بۆ کاربەدەستانی ئیسرائیل و بەهۆی ئەویشەوە داوای لە حکومەتی ئیسرائیل کردوە یارمەتی نەبڕێت. من پێم وایە، ئەو پەیوەندیەی لە نێوان موساد و سەرکردایەتی بارزانی هەبوە، هەمو مانگێک پەنجا هەزار دۆلار و چەک و شتیان داوەتێ و دەزگای پاراستنیان بۆ تەدریب کردون. مەسعود و ئیدریس و دەیان کادرێری تریان لە ئیسرائیل بۆ تەدریب کردبوون، من بڕوا ناکەم ئەو پەیوەندیە پسابێت.[١١] ئەو هەڵوێستە دوژمنانە و ناحەزانەی سەرکردایەتی بارزانی بەرامبەر یەکێتی نیشتمانی کە شۆڕشی دەست پێکردەوە، هیچ بیانویەکی سیاسی نەبو بۆنمونە، جاران شەڕی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتییان دەکرد، ئەیان گوت ئەمانە لەگەڵ حکومەتی عیراقن و بەشێکن لەوان، بەڵام ئەمجارە یەکێتی نیشتمانی کوردستان شەڕی دژی حکومەتی عێراق دەستپێکردوە، لە کاتێکدا ئەوان ئاشبەتاڵیان کردبو هەڵ هاتبون یەکێتی هاتبوە مەیدان و بەهەمو هێزو و توانایەوە خەباتی دەکرد، پرسیارەکە ئەوەبو، بۆ شەریان دەکرد؟ بۆ دەچون بە گژیاندا و راوی تێکۆشەرەکانیان دەکردن؟.

قیادەی موەقەتە هاوکاری ساواک و میت و دەوڵەتانی تری دەکرد، بۆ کوژانەوەی شۆڕشی کوردستان. ئەو هەڵوێستە بۆ هۆیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە کە بنەماڵەی بارزانی ئەوکاتە وایان دەزانی، کوردستان موڵکی خۆیانە و هیچ جوڵانەوەیەک لەوێ نابێت بەبێ ئەوەی ئەوان رازییان لەسەربێت دەستپێبکات. هەرچی مەلا مستەفا گوتی ئەبێ وابێ، ئەگەر هەڵسا پیویستە خەڵک هەڵسێ، ئەگەر دانیشتەوە ئەوا خەڵک دانیشێتەوە.

لە دنیا و لە بازاری سەودادا لەگەڵ ئەمەریکا و ئیسرائیل و ئێراندا، مەلا مستەفا ویستویەتی بڵێ، کلیلی کوردستان لە گیرفانی مندایە و خەڵکی کوردستان بەقسەی من دەکەن و هەڵسان و دانیشتنیان بە قسەی منە، لەبەرئەوە نابێ تاقمێکی تر بچن شۆڕش و خەبات بکەن، بەبێ ڕەزامەندی ئەو.

هەروەها نابێ جەماعەتێکی پێشکەوتوخواز و دیموکرات و شۆڕشگێڕ بێن و بڵێن قیادەی عەشائیری نەماوە و ڕۆڵی نەماوە و توانای سەرکردایەتی نەماوە، هەوڵبدەن جڵەوی کوردایەتی و ئاڵای شۆڕشی کوردستان هەڵبکەن و سەرکردایەتی و ڕێبەرایتی خەڵکی کوردستان بکەن!!.

لەبەر ئەو هۆیانە قیادەی موەقەتە کوێرانە، کەوتە شەڕ و شەڕیان دژ بە یەکێتی هەڵگیرساند. ئەمجارەیان بەئاشکرا بە ڕۆژی نیوەڕۆ و بەزەق ورەقی، ئۆباڵی هەڵگیرساندنەوەی شەڕی براکوژیان گرتەوە ئەستۆی خۆیان و بەئاشکرا و بە بەرچاوی جوڵانەوەی نیشتمانی عێراقیشەوە، دەستیانکردەوە بە شەڕی شۆڕشی نوێ. هێزی بەرپەرەکانی عێراقیش کە ئەو سەردەمە لە (التجمع الوطني العراقي)دا خۆی ئەنواند، ئەوان بەیانێکیان دەرکرد و ئیدانەی ئەو هەڵویستەی قیادەی موەقەتەیان کرد کە شەڕیان هەڵگیرساندەوە.

*** هەڵوێستی ئێوە چی بو بەرامبەر بەو کارانەی قیادەی موەقەت، یان سەرکردایەتی بارزانی دەیانکرد؟**

– ئەوەی ڕاستبێ ئەوەبوە، ئێمەش ئەوانمان لە ناوچەکانی خۆمان دەرکرد و ڕاومان نان، ئەگینا ئێمە نەمان دەویست بە هیچ جۆرێک شەڕیان بکەین. بەپێچەوانەوە ساڵی یەکەم، هیچ جۆرە هێزێکمان نەکردە سەریان. ئەوکاتەی ئەوان شکابون و ئاشبەتاڵیان کردبو، خەڵک ئامادەبو، زەمینە خۆشبو بۆ دژایەتیان، بەڵام ئێمە ئەو هەڵوێستەمان وەرنەگرت. ئێمە تەنها قسەی مەبدەئیمان کرد و گوتمان ئەم سەردەمە سەردەمێکی ترە کە شۆڕشی گەلان بۆتە شۆڕشی نیشتمانی و دیموکراتی، شۆڕشی دیموکراتی بە سەرکردایەتی عەشائیری و بۆرجوازی ناکرێت، بەڵکو بە سەرکردایەتی نوێ ئەنجام ئەدرێت.

لە سەرەتادا ناوی بارزانیشمان بە چاک و خراپ لە هیچ جێیەکدا نەهێنا، هەتا شەر دەستیپێکرد، یاخود بە تایبەتی دوای شەهیدکردنی ئیبراهیم عەزۆ و حەسەن خۆشناو و برادەرەکانیان کە زانیمان ئەوانە سورن لەسەر کوشتن و کوشتار و شەڕی براکوژی، ئەوسا بەیانێکمان دەرکرد و ڕاستیەکانمان لە کۆمەڵانی خەڵک گەیاند.

# قیادەی موەقەتە

*** ئایا هیچ جیاوازی هەبو لە نێوان قیادەی موەقەت و سەرکردایەتی بارزانیدا؟**

– دوای ماوەیەک قیادەی موەقەتە توشی گیروگرفت هات، چونکە ئەوان دەیان گوت ماڵی بارزانیمان لەگەڵ نیە، بەڵام کاتێ بارزانی نامەکەی بۆ کارتەر نوسی، بەناوی سەرۆکی حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە ئیمزای کردبو، ئیتر ئەوکاتە نەیان دەتوانی بڵێن بارزانی سەرۆکمان نیە. لەبەرئەوە مەسەلەکە تەقیەوە و دەرکەوت قیادەی موقەتە شتێک بوە، کە هەم سامی ویستویەتی کەڵک لە بنەماڵەی بارزانی وەربگرێت بۆ خۆی و حیزبێک پێکەوە بنێت بە هاوکاری مەسعود یان ئیدریس، ئەگەر ئەوەنەکرا، ئەوا خۆی جیابێتەوە و حیزبی تایبەتی خۆی دروستبکات.

ماڵی بارزانی کە لە مەیدانی کوردایەتی و شۆڕشدا شکستیان هێنابو، ئەیانویست بە بەرگێکی پێشکەوتنخواز و بەناوێکی ترەوە هەرچۆنێک بێت حیزبێک ببوژێننەوە کە سود لە کەسانی رۆشنبیر و خوێندەوار وەربگرن.[12]

ئەوەبو توانیان سود لە سامی عەبدولرەحمان و چەند کەسانێکی تری رۆشنبیر وەربگرن و دوای ئەوەی حیزبەکە بەهێزبو، ئیتر ئەوانیان دەرکرد و دەریان پەراندن.

دەرکەوت ئەوەی پێی دەوترێت پارتی دیموکراتی کوردستان، لە راستیدا دەزگایەکی سیاسی سەر بە بنەماڵەی بارزانیە، ئەوان چۆنیان بوێ وای دەبەن بەڕێوە.[13]

*** با بێینەوە سەر باسی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش و دەوری یەکێتی لە ناوەوە و دەرەوە؟**

– کە شۆڕش هەڵگیرسایەوە و عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری و دکتۆر خالد و برادەرانی تر هاتنە دەرێ، حکومەت پێشئەوە عومەر دەبابەیان نارد بۆ سوریا، ئەو هات بۆلامان، وەک بۆم باسکردی، باسیکرد شۆڕش گەشەی کردوە و پەرەی سەندوە.

ئێمە لەوکاتەدا ئەوجۆرە گەشەکردنەمان بەو پەلەیە پێ باشنەبو، ئەو زۆری و بۆریەمان پێباشنەبو، ئەوە بە پێچەوانەی ئەو نەخشەیە بو کە ئێمە لە دەرەوەی وڵات بۆ سەرهەڵدانی شۆرش دامانرشتبو. ئێمە وامان دانابو شۆرش لە سەرەتادا بە مەفرەزەی بچکۆلەی ١٥ کەسی دەست پێبکات و لەهەر پارێزگایەک ١٠ -١٥- ٢٠مەفرەزەی وا بچوک دروست بکەین و زۆرتر ئیشیان وەک دەستەی هۆشیاری بێت و گروپی گەڕۆکی چەکداربن، لە ناو کوردستان بگەڕێن ڕێکخستن دروستبکەن کۆمەڵانی خەڵک هوشیار بکەنەوە و زەمینەی پەرەپێدانی شۆرش خۆش بکەن، تا وایلێبێت بە ئاسانی بتوانرێت سەدان و هەزاران کەس کۆبکرێتەوە.

تا ئەوکاتەش دەتوانرێت کەرەستەی شۆرش و ئیمکانیەتی دارایی و چەک و تەقەمەنی و بێسیم و رادێو و پێویستی تر پەیدابکرێت. بەڵام هاتنە دەرەوەی دکتۆر خالید و عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری، مەسەلەکەی تەقاندەوە و هێزەکەی زۆرکرد. لەبەرئەوە ئێمە توشی واقعێک بوین، لە لایەکەوە پێمان خۆشبو کە ژمارەی چەکدار زۆر بون و خەڵک هاتۆتە شاخ، لەلایەکی ترەوە جۆری هاتنەکە بەشێوەیەکی هەرەمەکی و نیمچە عەشائیری بو کە بەراستی دڵخۆشکەر نەبو.

## دروستکردنی بزوتنەوەی سۆسیال دیموکراتی کوردستان

*** عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری بەناوی کام ڕێکخستنەوە هاتبونە دەرەوە؟**

- ئەوان بەناوی (بزوتنەوەی سۆسیال دیموکراتی کوردستان)ەوە هاتبونە دەرەوە، بڕیاریاندابو کە ڕێکخستنەکەیان بێتە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە. ئەوە مەرجی عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید بو، بۆئەوەی ڕەسوڵ مامەند و ساڵح یوسفی و ئەوانی تریش لەم ڕێکخستنەدا بەشداربن.

ئەوەی ڕاست بێت، ئێمە ئەو کارەمان پێ خۆش نەبو، چونکە ئێمە پیلانمان وابو یەکێتی نیشتمانی کوردستان، وەک یەک ڕێکخراوی جەماوەری گەورە دروستبکەین، لەناویدا کۆمەڵە هەبێت وەک ڕێکخراوێکی مارکس لینینی و ئەوەی

تر خەڵکی دیموکرات و شۆڕشگێر بێت و بەهەمو، یەک ڕێکخستن دروست بکەین و تێکەڵاوبین.

بەڵام ئەو ڕێکخستنە تازەیە واقعێک بو، بو بە توشمانەوە، ئەو برادەرانە هاتبونە دەرێ و لە ناوەوەش لەگەڵ ئارام و برادەرانی کۆمەڵە ڕێکەوتبون، پەیوەندیان دروستکردبو.

کە عومەر دەبابە هات بۆلای ئێمە بۆ شام، دەستەی سەرکردایەتی لەگەڵی دانیشتین و گوتمان باشە ئێمە قبوڵمانە کە (بزوتنەوەی سۆشیالیستی دیموکراتی) بێتە ناو ئێمەوە، بەڵام ناوەکەیمان پێ گۆڕیی و گوتمان: سۆشیال دیموکرات ناوی حیزبێکی دیاریکراوە و خەباتی چەکداری ناکات و ناکۆکی زۆری هەبوە لەگەڵ بزوتنەوەی کۆمۆنیستدا و ئەو ناوە لە وڵاتی ئێمە پەسەندنیە، بۆیە ناوەکەمان گۆڕی بۆ (بزوتنەوەی سۆسیالستی کوردستان) (الحركة الاشتراكية الكردستانية) و گوتیشمان دەبێ بەرنامە و سیاسەتی یەکێتی قبوڵ بکەن.[١٤]

لەوکاتەدا ساڵح یوسفی و جەماعەتێ لە بزوتنەوە، بەهۆی سەلاح بەدرەدینەوە لە ناوەوەی وڵاتەوە بڵاوکراوەیەکیان ناردبو بۆ دەرەوە بەناوی (بزوتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی)یەوە، لە (بەرگێکی زەرد) دا بڵاویانکردەوە. لەبەرئەوە ناومان لێنابو (نامە زەردەکە) کە تێیدا بیروباوەری ئیسلاحی و جۆرێک نەرمی بەرامبەر بە حکومەت دیاربو، بە تایبەتی کە دەڵێ "ئەوە شۆڕش نییە و ئەوە جوڵانەوەیەکی چەکدارە بۆ خۆپاراستن و خەڵک ناچاربوە بەرگری لە خۆی بکات"، هەروەها دەرگای خستبوە سەرپشت بۆئەوەی لەگەڵ حکومەتی بەعسی عێراقی پێکبێن.

*** بۆچونی ئێوە چی بو دەربارەی ئەو بەیاننامەیەی کە لەو سەردەم و بارودۆخەدا دەرچو؟**

- بەلای ئێمەوە ئەو بەیانە شتێکی خراپبو، ئێمە ئەو بەیانەمان بە هی خۆمان نەدەزانی، هەرچەندە سەلاح بەدرەدین بەناوی ئێمەوە لە دەرەوە بڵاویکردەوە، ئێمە بۆ برادەرانی ناوەوەمان نوسی، ئەوبۆچونە هەڵوێستێکی باش نیە و برادەرانی شاخیش بڵاویاننەکردەوە.

*** کەواتە لەو کاتەدا یەکێتی وەک یەک ڕێکخستن نەما، بەڵکو بو بە چەند باڵێک؟**

- ڕاستە بەو جۆرە یەکێتی نیشتمانی بو بەسێ باڵ، کۆمەڵە، بزوتنەوەی سۆسیالستی کوردستان و باڵێکیشیان هێڵی گشتی بو کە ئەوانە هەر ئەندامی

یەکێتی بون، بێ ئەوەی سەر بە هیچ باڵێک بن .

ئێمە لە ١٩٧٦ خەباتی چەکداریمان هەڵگیرساندەوە و لە ١٩٧٧ برادەرانێکی زۆرمان ناردەوە بۆناو کوردستان و بریاربو منیش لە ١٩٧٧ بگەڕێمەوە بۆ وڵات، بەڵام پێش ئەوەی بگەڕێمەوە، لەگەڵ برادەرانی (التجمع الوطني العراقي) کۆبونەوەمان کرد و چەند جارێک چومە لیبیا و بەڵێنم وەرگرت کە ئەوان یارمەتیمان بدەن.

# یارمەتی لیبیا

*** یارمەتییەکەی لیبیا بۆ یەکێتی مەرج داربو، یان بێ مەرج؟**

- ئەو یارمەتیەی لیبیەکان بەڵێنیان داینێ وەرمان نەگرت، چونکە رائید عەبدولسەلام جەلود چو بۆ بەغدا و لەگەڵ سەدام پێکهاتبو، کە هیچ یارمەتی بزوتنەوەی کوردی نەدات، لەبەرئەوە بە فەرمانی خۆی مەنعیکرد و نەیهێشت ئەو یارمەتیەی بۆمان دانرابو بماندەنێ. بەوجۆرە ئێمە پێش دەستپێکردنەوەی شۆرش، بەڵێنمان وەرگرتبو لە برادەرانی لیبیا، یارمەتی تەواومان بدەن، تەنانەت گوتیان پێشمەرگەکانی ئێوە وەکو سەربازی لیبیی سەیردەکەین و موچە و میزانیەی تایبەتیان بۆ دادەنێین، خوا حەقە عەقید موعەمەر قەزافی بە خەتی خۆی لەسەر داخوازیەکانی من نوسیبوی، دەڵێ: "هەمو داخوازیەکانی برام جەلال تاڵەبانی جێبەجێ بکرێت".

چەند ناسیاوێکی لیبی وەک ئەبوبەکر یونس، ئەبوزەید عومەر دوردە، حاجی ئەحمەد شحاتە و سالم بوشرێدە و عەقید سالح درێگی هەمو هەوڵیاندا، بەڵام بەداخەوە عەبدولسەلام جەلود رێگەی گرت و نەیهێشت ئەو یارمەتیەمان بدرێتێ.

کە دەستمان بە شۆرش کردەوە یارمەتیمان لێبڕابو، ئەو یارمەتیەی بە تەمابوین بمانگاتێ، بە تایبەتی یارمەتیەکەی موعەمەر قەزافی بو.

قەزافی بۆچونێکی زۆر سیاسی و باش و پێشکەوتنخوازی هەبو دەربارەی مەسەلەی کورد، موعەمەر قەزافی چەند جارێک بیروڕای خۆی دەربارەی کێشەی

کورد دەربڕیوە و وتویەتی "گەلی کورد کوردستانی هەیە و ئەو میللەتە کوردستانیە مافی هەیە ڕزگار بێت و یەک بگرێتەوە و دەوڵەتی خۆی هەبێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، شان بەشانی نەتەوەی عەرەب و تورک و وەک ئەوان بژی".

زۆری لەسەر مەسەلەی کورد باسکردوە و لەزۆر جێگاوە ڕەخنەشی هاتۆتەسەر، بەلام گوێی نەداوەتێ، بەڕاستی ئەوە یەکەم سەرۆکی وڵاتێکی عەرەبیە کە باوەڕی بە بونی نەتەوەی کورد و مافی چارەنوسی نەتەوەی کورد و مافی ڕزگاربون و یەکگرتنەوەی نەتەوەی کوردستان هەیە.

پێشتر پەیوەندی کورد لەگەڵ ئەو حکومەتانەدا هەبوە، ناکۆکییان لەگەڵ یەکتر هەبو، هەتا لەگەڵ سوریاش لەسەر ئەو بناغەیە نەبوە کە حکومەتی سوریا باوەری بەوە هەیە، یەک نەتەوە هەیە و نەتەوەی کورد و مافی ڕزگاربون و یەک بونەوە و سەربەخۆیی خۆی هەیە، بەڵکو لەسەر بناغەی ئەوە بوە کە حکومەتی عێراق حکومەتێکی کۆنەپەرست و دوژمنی هەردولایە و پێکەوە هاوکاری یەکتربکەن بۆ ڕوخاندنی.

هاوکاری لەگەڵ لیبیا بناغەیەکەی سیاسی و ئیدۆلۆجی هەبو، لەسەر بناغەی تیوری موعەمەر قەزافی دانرابو، ئەڵێ: "کورد نەتەوەیەکە و مافی ڕزگاربون و یەکبونەوە و دەوڵەتی سەربەخۆی هەیە" ئەو بۆچونەی بەدزیەوە نەوتوە، بەڵکو بە ئاشکرا دەیڵێت، لە نوسینەکانیدا نوسیویەتی لە کۆبونەوەکاندا باسیدەکات.

بە ئامادەبونی چەندین سەرۆک کۆمار و سەرۆک وەزیرانی وەک بولند ئەجەوید، لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەگەریدا و لە کەریملێن بەرامبەر برژنێف و لە زۆر جێگای تردا ئەو بۆچونەی دوبارە کردۆتەوە.[١٥]

*** کە یارمەتیەکەی قەزافی نەگەیشت، ئێوە چیتانکرد و چۆن کاروباری داریتان بەڕێوە دەبرد؟**

- ئێمە لە کوردستان پشت ئەستور بەخۆمان و بەکۆمەڵانی خەڵکی خۆمانماینەوە، بەیارمەتیەکی کەمی برادەرانی سوریا، لەبەرئەوەی باری دارایمان خراپبو، یارمەتیەکە ئەوان تەنها هەربەشی مەسروفاتی بارەگای سوریای دەکردین، سەرەرای ئەوەش وردە وردە خەباتەکەمان پەرەیسەند و بەرەو پێشەوە چوین.

## پەراوێزەکان:

١- (رفاعی) گەورەترین قەزای سەر بە پارێزگای زیقارە و کەوتۆتە خواروی عێراقەوە.

٢- (لە ٢٦ی حوزیرانی ١٩٧٦ گروپێکی کۆمەڵە کە بریتی دەبن لە: مەحمود عەبدولرەحمان، ناسراو بە علی کەشکۆڵ، عەلی شیعە، شەوکەتی حاجی موشیر، حامیدی حاجی غالی، محەمەدی حاجی مەحمود، تۆفیق رەحیم، حەمە سەعید محەمەد ئەمین، بەرەو شاخی سورێن دەکەونە رێ، هەروەها دوای ئەوانیش لە ١٩ی تەموزی ١٩٧٦ دا سالار عەزیز، جەمالی عەلی باپیر، تاهیری شێخ سدیق و محەمەد غەریب رودەکەنە ناوچەی شارباژێر). (رەوتی چەپ لە باشووری کوردستان.ل. ٩٩).

٣- (لە سەرەتای ١٩٧٠ کاندا هەندێك جموجۆڵ لە باشوری کوردستان پەیدا دەبن، رەنگدانەوەیان لەسەر باکور دەبێت، بۆ نمونە سەعیدەکان دامەزرێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان، سەعید ئالچی و سەعید کرمزی تۆپراك(د.شوان) بە باشوردا هەندێك ئامادەکاری سیاسی و رێکخستنیان کردبوو. د.شوان تۆزێك رادیکاڵتر و توندتر دیاربوو و ویستویەتی لە هەکاری دەست بە جموجۆڵ بکات، بەڵام بارزانی ئەمە قبوڵ ناکات و رێگای لێ دەگرێت. دوای ئەوەش هەوڵێکی تێکدەرانە دەدرێت و تێدا سەعید ئالچی "لە حوزیرانی ١٩٧١ دا لە ناوچەی زاخۆ" دەکوژرێت و لە دوای ئەوە، بارزانی د. شوان دەکوژێت. لە پاش هەموو ئەو روداوانەش سیخورێکی میت بەناوی دەروێش سەعدۆ دەکرێتە سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا).(شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا- گەشتێکی مێژوویی. جنگیز چاندەر. و. زریان رۆژهەڵاتی.ل.٤٤٤).

٤- (ئەو دەستەیە، بە سەرۆکایەتی ئیبراهیم عەزۆ، دابەشکران بە سەر ٤ مەفرەزەدا، بەسەرۆکایەتی هەریەکە لە: عیزەت ئیسماعیل شەنگاری، عەبدولجەبار مەلا غەنی سندی، عومەر ئیبراهیم رەشید، عەبدولرەحمان حەسەن. زوربەیان پێشمەرگە یان کادیر بون لە شۆرشی ئەیلول دا، شارەزای ناوچەکانی بادینان و ئاشنای خەڵکەکە بون). (لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ — نەشیروان مستەفا. ل. ٨٩).

٥- (ئیبراهیم عەزۆ لە ١٩٧٦/٧/١٥ لەگەڵ مەفرەزەکەی چۆتە گوندی (نیروە) لە ناوچەی گوییی (قەزای ئولودەرە) لە کوردستانی تورکیا، پێشتر، قیادەی موقەتە کەوتونە چاودێری و سۆراخی ئەم پێشمەرگانە لە ناوچە سنوریەکانی ئولودەرە-چەقورجە، خێڵە کوردەکانی ئەوێ یان لێ هاندابون کە هەکەسێکیان لەو پێشمەرگانە بەر دەست کەوت بیان گرن، چەك و کەلوپەلەکانیان بۆ ئەوان و سەریشیان بۆ قیادەی موقەتە، چونکە ئەوانە جاشی سەدامن و بە فیتی سەدام ئەیانەوێت شۆرش لە بارزانی تێك بدەن.

خەڵکی گوندی نیروە بە ناوی میواندارییەوە لەناو ماڵێکدا دایان ئەنێن، دەوریان ئەگرن و بە فێڵ هەموویان چەک دەکەن و بە گیراوی تەسلیمی لێپرسراوەکانی قیادەی موقەتە: هاشم رەمەزان، کەریم سنجاری، جەوهەر نامیق یان دەکەن. ماوەیەک بە گیراوی لە گەورو گوفەکانی ناوچەکانی گوێی، قەشوری، ئەرتوش..سوراندوایانەوە و، قیادەی موقەتە، گوێیان نەدایە نامەکانی مام جەلال و ناوبژی و هەڵەکانی ددك د "گروپێکی سیاسی کوردستانی تورکیا بون". سەرنجام هەموویانیان کوشت). (لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ – ئەوشیروان مستەفا. ل.١٢١-١٢٢).

٦- مام جەلال لە ١٤ ئابی ١٩٧٦ نامەیەکی ئاراستەی ئیدریس و مەسعود بارزانی کرد. دەربارەی بارودۆخەکە و تێداهاتوە "هەمو هێز و تاقم و کوردێك ئەبێ هەڵوێستی خۆی دیار و ئاشکرا کات، بەرامبەر بەم هەوڵەی تاقمێك لە رۆڵە جوامێرە لەخۆبوردەکانی کوردستان ئەیدەن دژی حوکمی فاشیستی بەغداد و ئەو پلانە ئیمپریالیستیەی دژی کوردایەتی گێڕدرا، ئەوانەی یارمەتی ئەم خەباتە تازەیە ئەدەن و دڵسۆز و کورد پەروەرن و، ئەوانەی دژی ئەوەستن، دژی کوردایەتی ئەوەستن.."

٧- مام جەلال و مەسعود بارزانی لە ١٩٧٦/١٠/١٦ دا لە لەندن چاویان بەیەك کەوت.

٨- لە ١٣/١٠/ ١٩٧٧ دا حەسەن خۆشناو و ١٠ هاورێی بە دەستی قیادەی موقەتە و هاوکاری دانیشتوانی گوندی باویان کوژران.

٩- ئەوشیروان مستەفا، لە ٣٠ نیسانی ١٩٨١ دا، نامیلکەیەکی بەناوی "کارەساتی هەکاری" لە ناوزەنگ بڵاوکردەوە کە بە درێژی باسی رووداوەکانی ئەو کارەساتە دەکات و کۆمەڵێك دیکۆمێنت و نامەی دەستنوسی تێدایە، ئەم نامیلکەیە چەند جارێك چاپکراوەتەوە.

١٠- (بارزانی لە ٩ شوبات و ٣ مارتی ١٩٧٧ دا، دو نامەی بۆ سەرۆکی پێشوی ئەمەریکا، جیمی کارتەر نوسیوە و هەردو نامەکە بێ وەڵام مانەوە و لە هەردونامەکەدا، بارزانی داوای هەڵوێستی مرۆڤانەی لە کارتەر کردوە). (دۆزی کورد..گۆران ئیبراهیم .ل. ١٥٦).

١١- (مێژوی پەیوەندی و هاوکاری فیعلی نێوان بارزانی و ئیسرائیل، دەگەڕێتەوە بۆ ١٩٦٣/٦/٣٠ کاتێك نوێنەرانی ئسرائیل و ئێران لە پاریس رێکەتن کە یارمەتی کورد بدەن و ئیسرائیل لە رێگای ئێرانەوە، هاوکاریەکانی بگەیەنێتە کوردەکان. ئەم پرۆژەی هاوکاریەشیان ناونا "تەسینا") (الموساد في العراق - شلۆمۆ نکدیمون - ل.٩٩).

١٢- (پارتی دیموکراتی کوردستان، قیادەی موقەتە، بەبۆنەی ساڵێك تێپەربون بەسەر رێکەتنامەی ئازاردا، لە ٦ مارتی ١٩٧٦دا بەیانێکیان دەرکرد، بە هیچ جۆرێك باسی بارزانی و رۆڵی ئەوانی تێدا نەبو) (یەکێتی نیشتمانی کوردستان - دامەزراندن و دەستپێکردنی شۆرش - سەروەر عەبدولرەحمان - ل.٢٧٢).

١٣- پارتی دیموکراتی کوردستان، قیادەی موقەتە لە ١٩٧٥/١٢/١٠ لە ئێران دروستبو، سەرکردایەتیەکەی بریتی بون لە: (ئیدریس و مەسعود بارزانی، سامی عەبدولرەحمان، جەوهەر نامیق، عارف تەیفور، کەریم سنجاری، محەمەد حەمە رەزا، ئازاد خەفاف، ئازاد بەرواری، غازی زێباری، وریا سعاتچی، فازیل جەلال، ئەررەحمان بیداوی، کەمال کرکوکی، شێرکۆ شێخ عەلی).

١٤- (لیژنەی ئامادەیی بزوتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان لە ١٦ ئاگۆستی١٩٧٦ دامەزراندنی خۆی راگەیاند و تێدا هاتبو: ئەم دامەزراندنە بۆئەوەیە کە بزوتنەوەکە بە ئەرکی مێژویی خۆی هەڵسێت لە رابەریکردنی خەباتی سەختی ئەم سەردەمە نالەبارەی کوردستان لە مەیدانی بەرگریکردن و پارێزگاری کردنی کورد و کوردستان لە عێراقێکی سۆسیالیستیدا، ئەندامانی لیژنەکە بریتی بون لە: سەیدا ساڵح یوسفی، عەلی عەسکەری، د.خالید سەعید، مولازم تاهیر عەلی والی بەگ، سەعدی گچکە، عومەر دەبابە، عەلی هەژار، کاردۆ گەلاڵی، مەلا ناسیح) (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەدامەزراندن و دەستپێکردنەوەی شۆڕش ١٩٧٥-١٩٧٦ل. ٩٨).

١٥- ئەم بەشە لە چاوپێکەوتنە لە کاتێك کراوە کە قەزافی سەرۆك کۆمار بوە و لە ژیاندا بوە).

# گەڕانەوەی مام جەلال بۆ کوردستان

*** کەی و چۆن گەڕایتەوە بۆ کوردستان؟**

- من لە هاوینی ١٩٧٧ بڕیامدا بگـــەڕێمەوە، گەڕانەوەکەش بەڕاستی بەوشێوەیەی خوارەوەبو، من و هێرۆ چوبوین بۆ بەیروت، خەریک بو هێرۆ منالّی ئەبو، قوباد بەرێوە بو، بۆیە بردمە لای دکتۆر و گوتیان ڕەنگە لە ماوەی یەک هەفتەدا منداڵەکەی ببێت، بەڵام بەو حاڵەشەوە لەگەڵ دکتۆر لەتیف ڕەشید منیان گەیاندە فرۆکەخانە.

نامەی نەوشیروان مستەفا هاتبو، دەڵێ بەپەلە بگەڕێرەوە، فلانە ڕۆژ، پێنج شەمەی دەستنیشان کردبو، برادەران حەسەن خۆشناو و سەلاحەدین لە ئەستەنبوڵ چاوەڕێت دەکەن، هاتنەوەت زۆر پێویستە، هەتا ئەگەر پارە و یارمەتیت پێ نایەتەوە، ئەوە هاتنەوەی خۆت زۆر پێویستە.

منیش لەگەڵ هێرۆدا قسەمکرد، ئەویش ڕازی بو کە بگەڕێمەوە، بڕیارمدا بێمەوە. هاتم لە فرۆکەخانەی بەیروت توشی هەندێ گیروگرفت بوم، بەهۆی ئەوەی یارمەتی برادەرانی سازمانی ئینقیلابیم دابو، هەروەها بەهۆی ئەوەی کە پەساپۆرتێکی ئێرانیم پێبو، کاتی خۆی فازیل تاڵەبانی بۆی دەرهێنابوم، لە ئەنجامدا منیان گرت.

دوایی بەهۆی سوریەکانەوە بەربوم و لە بەیروتەوە هاتم بۆ ڤینا و لە ڤیەناوە بۆ ئەستەنبوڵ، لە ئەستەنبوڵ سەلاح واتا نەجمەدین بیوکیا و حەسەن خۆشناوم دۆزیەوە.[1]

کە گەیشتمە ئەنقەرە، لەوێ بۆ یەکەمجار کەمال بورقایم دی و قسەم لەگەڵکرد، لەوێوە هاتین بۆ دیاربەکر، لەوێش عومەر چەتین ئێمەی بردە ماڵی خۆیان.

برادەرانی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا کە ئەو سەردەمە (شڤان چیان)پێ ئەوتن و دوایی بەناوی(دە دە کا دی)وە ناویان دەرکرد و دواییش ناوی خۆیان گۆڕی بونە (پارتی پێشرەوی کرێکارانی کوردستان)، بەگەرمی

پێشوازییان لێکردین و پێمانەوە ماندوبون.

عومەر چەتین، خۆی ئێمەی برد بۆ شاری وان و لەگەڵ چەند برادەرێکی سەرکردایەتی، لەوێ لە ماڵی برادەرێک بەناوی عەلی شێر میوان بوین، لەوێشەوە منیان برد هەتا سەر سنور و تەسلیمی برادەرانی خۆمانیان کردم.

*** کێ هاتبوە سەرسنور بۆ پێشوازیتان؟**

- نەوشیروان مستەفا و کۆمەڵێک برادەرنی تر، هاتبونە سەرسنور. لە دێیەکی سەر سنوری کوردستانی تورکیا توشم بو بە توشی رەسول مامەند و مەلابەختیار و هەندێ برادەری ترەوە کە هاتبون بۆ ناوبژی لە نێوان یەکێتی و پارتی و چارەسەریی ئەو گیروگرفتە، ئەوان نەیان دەزانی مەسەلەکان چیە و چ گۆڕانێک رویداوە، ئیتر من مەسەلەکانم بۆ گێڕانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هاتن و هەوڵەکە درا، بەڵێ یەکتر دیتراو رێکەوتنمان دوبارەکردەوە کە جارێکی تر کەس شەڕی ئەوەی تر نەکات، هەرکەس ئازادبێ و پێکەوە دۆست و هاوکاربن.

کەچی ئەو هەڵەیان قۆستەوە و ئێمەیان خاوکردەوە، کەمینیان نایەوە و حەسەن خۆشناو و ئەو برادەرانەیان شەهید کرد و کاروانەکەشیان تاڵانکرد، کە ١٠ دۆشکای لەگەڵ بو، ئێمەیان بێبەش کرد لەم چەکانە و رێگای چەک هێنانیشیان لە سوریاوە لێ گرتین.[٢]

بەوجۆرە ئێمە لە لایەکەوە ئێران پشتی لێ گرتبوین، لەلایەکی ترەوە تورکیا و قیادەی موقەتە واتا لە هەردو دیوەوە بەربەرەکانیمان دەکرا و لە بەرامبەرەکەشماندا حکومەتی عێراق وەزعێکی زۆر نالەبار و سەختی دروستکردبو.

## موفاجەئاتی یەکەم رۆژی ناو کوردستان

*** ئایا لە سەرەتادا، کە هاتیتەوە بۆ کوردستان، هیچ شتێک تازەبو بۆ تۆ؟**

- هەر کە گەیشتمە ناو کوردستانی عێراق، برادەران هاتبونە سەر سێ سنورەکە، نەوشیروان لە پێشەوە هات بەرەو پیرم، لێم پرسی وەزع چۆنە؟

کەمێک ڕۆشتین، ڕێگاکە هەوراز بو و هەردوکمان تەنگە نەفەس بوبوین، بۆیە گوتی: "دوایی تەفسیلاتت بۆ باس دەکەم".

گوتی: "ئێمە و برادەرانی ناوەوە هەر ناومان یەکە، ناومان یەکێتی نیشتمانییە ئەگینا، نە بیروبۆچونمان، نە تەفکیرمان، نە هەڵسوکەوتمان یەکە، برادەرەکان لە شکستیدان و لە لافاوی تەسلیم بونەوەدابون، خەڵک تاقم بەتاقم تەسلیم دەبونەوە، ئەگەر لە شکستدا نەبوینایە، من پێشنیازمدەکرد، بگەڕێینەوە و بۆ خۆیانی بەجێ بهێڵین، چۆنیان دەستپێکردوە با واش بیبەن بەرێوە! چونکە ئەوە ئەوەنەبو کە ئێمە ویستمان".

*** بۆچونی سەرەتایی تۆ چی بو، دوای ئەوەی کەمێک تێگەیشتی؟**

– دوای ماوەیەک تەماشامکرد، ئەمە ئەوەنیە کە ئێمە ویستمان، نە چۆنێتی پێشمەرگە ئەوەیە کە ئێمە دەمانەویست نە فکر و عەقلیەتیشیان ئەوەبو، ئێمە پێمان وابو، نابێ ئێمە هیچ جۆرە پەیوەندیەکمان لەگەڵ شای ئێراندا هەبێت، ئەوان پێیانوابو، ئاساییە ئەگەر پەیوەندیمان هەبێت.

ئێمە پێمانوابو، ئەمە شۆڕشێکی عێراقیە و بە شێوەیەکی عێراقی کردومانە، بەڵام ئەوان پێیانوابو کە ئەم شۆڕشە ڕێگایەکی گوشارە لەسەر حکومەتی عێراق، بۆ ئەوەی گفتوگۆی لەگەڵدا بکەین و هەندێ دەسکەوت بە دەست بهێنین.

ئەوان بەتەمای شۆڕشێکی درێژخایەنی نەفەس دور و درێژ نەبون کە ئەنجامەکەی ببێتە شۆڕشێکی عێراقی و ئەو شۆڕشە حکومەتی عێراق بگوڕێت و دیموکراتی بۆ عێراق و حوکمی زاتی راستەقینە بۆ کورد دابین بکات، لە ناوەرۆکدا پێشکەوتنخواز بێت و دژی دەوڵەتە کۆنەپەرستەکان بێت و هاوکاری لەگەڵ کوردەکانی ئێران و تورکیا و لەگەڵ هێزە پێش کەوتنخوازەکانی ئەو دو وڵاتە توند بکات.

برادەرانی شاخ رەئیان وابو "ئەمە شۆڕشێکە توشمان بوە بەتوشیەوە، گرنگە وا بکەین حکومەت ناچار بکەین بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ جێبەجێ بکات". ئەوان پێش ئەوەی ئێمە بگەڕێینەوە زەمینەی گفتوگۆکردنیان لەگەڵ حکومەت خۆش کردبو، ئەوە بو بزوتنەوەی سۆشیالستی کوردستان دەست پێشخەریان کردبو بۆ گفتوگۆکردن و برادەرانیش، وەک ئارام و سالار و برادەرانی تر رەزامەند بوبون.

مەسەلەکە وا دەستی پێکرد، رەسوڵ مەمەند لەناو حکومەتەوە هاتبو سەردانی هەندێ برادەری کردبو، لە برادەرانی وەک تایەری عەلی والی، ئەوانیش چەند

شەوێک هێشتیانەوە، لە ئەنجامی ئەوەی ئەو چەند شەوە مابۆوە، ئیتر کەمێک ناسرا و نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆناو حکومەت، ئەگینا بۆئەوە نەهاتبو بە یەکجاری بێتە دەرەوە.

کە نەیتوانی بگەڕێتەوە، نامەیەکی بۆ بەڕێوەبەری ئاسایشی قەلادزێ نوسیبو، دەڵێ "ئێمە ناچارین داومانەتە شاخ، لەبەرئەوە نییە کە دەمانەوێت دژی حکومەت بجەنگێین، بەڵکو بۆئەوەیە مافی خۆمان دابینبکەین و هیوادارین مافی خۆمانمان بدەنێ".

*** هەڵوێستی ئێوە چی بو لەو بۆچونانەی ئەو برادەرانە لە کوردستان، بە تایبەتی بەرامبەر بە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عێراق دا؟**

– کەمن چوم باسی گفتوگۆ گەرمبو، بۆیە ئێمە کۆبونەوەیەکمان کرد و باسمانکرد، بەڵێ ئێمە دژی ئەوەنین ئەگەر حکومەت مافەکانمان بدات، بەڵام ئایا حکومەت هیچ دەدات؟ ئەوە مەسەلەیەکە پێویستی بە باسکردن هەیە.

لەسێ سنورەکە دانیشتین کۆبونەوەیەکمانکرد کە سەرکردایەتی کۆمەڵە و سەرکردایەتی بزوتنەوە ئامادەی بون، تەنها ئارام نەهاتبو. بریارماندا، کۆمیتەی سەرکردایەتی دابمەزرێ، لە جیاتی کۆمیتەی دامەزرێنەر، کۆمیتەی سەرکردایەتی پێکهات لە خەتی گشتی ٥ کەس، بزوتنەوە ٥ کەس و کۆمەڵە ٥ کەس، ئەو کۆمیتەیە بوبەدەستەی سەرکردایەتی یەکێتی.

بۆ یەکەمجار لەوێدا دو پێشنیاز باس کرا و قبوڵکرا، لەوانە قبوڵکردنی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانی لەناو ریزی یەکێتییدا، هەروەها دانانی سکرتێری گشتی بۆ یەکێتی و فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان. من بە سکرتێری گشتی و عەلی عەسکەری بە فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەڵبژێراین.

ئەوی ڕاستی بێت، لەیەکەم کۆبونەوەدا ناکۆکییەک کەوتە نێوان نەوشیروان و عەلی عەسکەریەوە لەسەر چۆنێتی وەرگرتنی خەڵک و دانانی نوێنەر، عەلی عەسکەری بەتوندی مەسەلەکەی تەرحکرد، لەئەنجامدا پێکهاتنێک دروستبو.

منیش کەمێک دڵگران بوم و گوتم مادام وایلێهات من دەگەڕێمەوە بۆ دەرەوە، ئێوە خۆتان چۆنتان پێباشە ئاوا کارەکان ئەنجامبدەن. پاشان برادەرانی بزوتنەوە هاتن دڵیاندامەوە، وتیان ئێمە هیچ لاریەکمان نییە، تۆ چی دەڵێیت قبوڵمانە و تۆ نوێنەری ئێمەش بەو چیت پێباشە وابکە.

لە ئەنجامدا لەسەرئەوە پێکهاتین کە هەمو بە برایەتی و یەک دەستی بە یەکەوە کاربکەین و لەناو هێزی پێشمەرگەدا جیاوازی کۆمەڵە و بزوتنەوە و خەتی گشتی نەبێت و رێکخستنی لق دروستبکەین، بە ناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە.

دوای ئەوەی خەڵک دەبێتە یەکێتی، ئەوکاتە خۆی سەربەستە و سەرپشک بێت لەوەی دەبێتە بزوتنەوە، یان دەبێتە کۆمەڵە، هەر رێکخستنە لە ناوەوە سەربەستە خەتی تایبەتی خۆی هەبێت.

وابریاردرا لەناو شارەکاندا کۆمەڵە و بزوتنەوە و خەتی گشتی، سەربەستن لە کاری رێکخراوی خۆیاندا و لە دەرەوەی شارەکان، یان لەناو هێزی پێشمەرگە و لادێکاندا رێکخستن بەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە دەبێت و لق و لیژنەکان هی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەبێت و هەمو کەسێکی تێیدا دەبێت و بەپێی لێوەشاوەیی و توانا کارەکان دابەشبکرێت .

هێزی پێشمەرگەش بەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بێت لەسەر بناغەی لێوەشاوەیی و توانا دروستبکرێت، نەک لەسەر بناغەی رێکخستنەکان، واتا کارەکان لە نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوە و هیڵی گشتیدا دابەش نەکرێت، بۆیە دابەشکردن لەسەر بناغەی لێوەشاوەیی بو، بەهۆی چەسپاندنی گیانی تەبایی لەناو هەمو هێزەکاندا.

ئەو کۆبونەوەیەمان لە سێ سنورەکە ئەنجامدا، لە دۆڵی گۆست کە دوایی ناوێکی گاڵتەی لێنرا بەناوی (دۆڵە فشە)، چونکە پاش ئەوە قیادەی موقەتە خەڵکی لە ئێمە کوشت، هەمو رۆژێ برادەران بریارێکیان دەدا، کە ئێمەش بچینە سەریان و خەڵکیان لێ بکوژین، بەڵام دوایی تەئجیلیان دەکرد و نەیان دەکرد و دوایی هەرنەکرا، زۆر لە هەرەشەکانی کە لە قیادەی موقەتە کرا بە (فشە) دەرچو، بۆیە دۆڵەکە بە ناوی فشەوە ناونرا.[٣]

# گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت

*** دوای خۆ ڕێکخستنەوەتان، یەکەم گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت کەی بو و چۆن سەری هەڵدا؟**

- ئێمە لە ناوچەی سێ سنور بوین، واتا لە ناوچەی برادۆست، لەوێ سەرماندا لە حاجی شێخ محەمەدی کوری شێخ رەشیدی لۆلان، لە دێیەکەی خۆیان لە لۆلان بو، ئەوسا ئەو دێیە ئاوەدانبو، چاومان پێکەوت و دوای چاکوچۆنی و دەنگوباس، خۆی باسی ئەوەی کرد کە حکومەت رای سپاردوە ئەوان ئامادەی گفتوگۆن لەگەڵ ئێمە، ئێمەش مۆڵەتمان لێخواست تا لەناو خۆماندا باسی لێبکەین.

ئێمە کۆبونەوەیەکمان کرد و بەگشتی دەنگ هەمو برادەرانی سەرکردایەتی کە لەوێ بون، رەزامەندیان دەربڕی، لەو برادەرانەی، لە بیرمە کە لەوێ بەشداربون، جگە لە من و نەوشیروان، عەلی عەسکەری، سالار عەزیز، مولازم عومەر، رەسوڵ مامەند و چەند برادەرێکی تر بون.

دوای ئەوە سالار و رەسوڵ مامەند سەفەریانکرد، ئەو برادەرانەی تر ماینەوە، بریارماندا بچین بەپیر ئەو داخوازیەی حکومەتی عێراقەوە و بزانین چی دەبێت، پرسیمان حکومەتی عێراق کێی داناوە بۆ گفتوگۆ لەگەڵماندا، تائێمەش بەو پێیە برادەرێکی بۆ دابنێین، چونکە من گوتم: "ئەگەر ئەوان سەدام حسێنیان داناوە ئەوە ئێمە عەلی عەسکەری دەنێرین، ئەگەر قائیدی فەیلەقی کوردستانیان داناوە، ئەوا ئێمە ملازم عومەر دەنێرین".

کە وەڵام هاتەوە گوتیان سەدام حسێن ڕاسپێرراوە، بۆیە ئێمەش بریارماندا عەلی عەسکەری بنێرین. عەلی عەسکەری لەگەڵ شێخ محەمەدی لۆلان ڕۆیشتن، وەکو پاشان خۆی گێرایەوە لە بەغدا لەپێشەوە عەدنان خەیروڵڵا ئەیبینێت و قسەی دۆستانەیان لەگەڵ کردبو، پاشان دەچێتە لای سەدام حسێن.

داخوازییەکانی ئێمەی ئەو سەردەمە کە عەلی عەسکەری بە سەدامی وتبو بریتی بون لە:

یەکەم: راگرتنی سیاسەتی کاولکردنی دێهاتی کوردستان و راگواستنیان بۆ

خوارووی عێراق، چونکە حکومەت تازە بڕیاریدابو کە بە درێژایی هەمو سنورەکان لە سنوری سوریاوە لەلای شەنگارەوە بگرە بە درێژی سنوری تورکیا و هەمو سنوری ئێران، واتا هەمو ئەو شوێنانەی کوردنشینن، هەتا لای مەندەلی بەقوڵایی ۳۰ هەتا ٤۰ کیلۆ مەتر هەرچی دێهاتی کورد هەیە ڕایگوێزن و لە جێی ئەواندا عەشائیری عەرەب دانێن، یاخود چۆڵی بکەن و کەسی لێ دانەنێن.

بڕیاریاندابو، ئەو ناوچانە هەر گیان لەبەرێکی تێدابێ، ئینسان بێت یان ئاژەڵ، پێویستە بکوژرێت، دیارە ئەو پیلانە، بەلای ئێمەوە زۆر شۆفێنی و ڕەگەزپەرست و زیان بەخشبو، چونکە نەتەوەی کوردی لە یەک دائەبڕی، بەشی کوردستانی عێراقی لە کوردستانی تورکیا و سوریای دادەبڕێ، و ئێمەی والێدەکرد، پەیوەندی ئابوری و بازرگانی و هاتوچۆمان لەنێواندا نەمێنێ.

نیشانەیەکی تری خراپی ئەم پیلانە ئەوەبو کە حکومەت لەسەر سیاسەتی کاولکردنی کوردستان و ڕاگواستنی کوردستان و تەعریب کردن بەردەوامبو. بۆیە ئێمەش یەکەم داوامان ئەوەبو، ئەم سیاسەتە هەڵبوەشێتەوە.

دوەهەم: بەیانی ۱۱ی ئازار، کە حکومەت خۆی مۆری کردوە و بڵاویکردۆتەوە و سەدام حوسێن شانازی پێوەدەکات و خۆی بە ئەندازیارەکەی ئەزانێت، پێویستە جێبەجێبکرێت.

سێیەم: ڕێگای خەباتی سیاسی بە یەکێتی نیشتمانی بدرێت، بەرامبەر بەوەی واز لە خەباتی چەکداری بهێنێت .

چوارەم: گەشە بدرێت بە حوکمی زاتی، چونکە بەپێی ئەو نامەیەی پێشتر بۆ ئێمە هاتبو کە ئیمزای لەسەرکردبو، بەڵام من بە دەستوخەتەکەیدا ناسیمەوە کە خەتی سەدام حسێن بو، بە قسەکاندا زانیم قسەی سەدام حسێن خۆیەتی. دوایش سەدام بە عەلی عەسکەری وتبو کە ئەو نامەیە هی ئەو بوە، عەلی عەسکەریش پێی گوتبو مام جەلال زو هەستی کرد، ئەوە نامەی تۆیە.

لەو کۆبونەوەیەدا، باسی هەندێ شتی ئیجابی کردبو، گوتبوی جەلال و عەلی عەسکەری لەو کەسانەن ئینسان دەتوانێ گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات، ڕابردویان باشە و نیشتمانپەروەرن و ئێمە هەمومان پێکەوە دەتوانین عێراقێکی ئارام و گەشەکرد و دروستبکەین کە مافی کوردی تێیدا پارێزراوبێت. هەروەها سەدام گوتبوی لە جەوی دۆستایەتی و برادەرایەتیدا، شت جێبەجێدەکرێت و داخوازی بەیەک دەسەلمێندرێت نەک بە زۆر و بە شەڕ، ئێمە بە گوێڕایەڵی و لە ئەنجامی گفتوگۆ زیاتر شت ئەدەین، وەک بەزۆر و هێزی چەک.

سەدام حسێن گوتبوی: "ئێمە سیاسەتی ڕاگواستن جێبەجێدەکەین، ئەگەر هەمو لەشکری عێراقمان لەسەر دۆڕاندوە"، هەروەها گوتبوی: "ئێمە ئەو سیاسەتەمان داناوە و لە هیچی پەشیمان نین و لێشی نایەینە خوارێ، ئێمە تەنها لەوکاتەدا گوێتان لێ دەگرین کە بگەڕێنەوە بۆ ڕیزی نیشتمانی، هەر کاتێ گەڕانەوە ئەوە چیتان ویست گوێتان لێ دەگرین"، ئەویش گوتبوی "خۆمان بە نیشتمانپەروەر دەزانین و شوێنی خۆمان، ڕیزی خۆمان بە نیشتمانپەروەریی دەزانین و ئێمە پارێزگاری لە نیشتمانی خۆمان دەکەین و بۆ ئامانجێک چەکمان هەڵگرتوە، تا نەیەتەدی وازی لێناهێنین".

عەلی عەسکەری هەستی کردبو کە سەدام حسێن هیچ بۆنی خێری لێنایەت، بۆیە کە گەڕایەوە بێ هیوابو، ئێمەش هەمو دانیشتین و بڕیارماندا پەیوەندی بەردەوام بێت، هەموش ڕازی بوین و بەهۆی شێخ محەمەدەوە لەسەری ڕۆیشتین[٤]

# خۆ ڕێکخستن و خۆ چەکدارکردن

*** دوای ئەوەی گفتوگۆکانتان لەگەڵ بەعس شکستی هێنا، پیلانی چیتان دانا؟**

– دوای ئەو کۆبونەوانە، ئێمە گەڕاینەوە بۆ دێی تۆکان، یەک دومانگی زستان لەوێ جێگیربوین، دوایی پەڕینەوە بۆ زەڵێ و شێنێ و دۆڵە کۆکە.

نەوشیروان و مولازم عومەر و برادەرانی تر، لەو ماوەیەدا ئەو چەکەی هێنابومان بەشیان کردبو و هەر جەماعەتە بەشی خۆی وەرگرتبو و هەرکەسە گەڕابۆوە شوێنی خۆی.

ئەوان چوبون بۆ شارباژێر بۆ ڕیکخستنەوەی هێزی پێشمەرگە، چونکە بەڕاستی ئەو جەماعەتەی ئێمە کە کۆکرابونەوە لە شارباژێر بێجگە لە کوڕە باشەکان و پیاوە دڵسۆزەکان، هەندێ کەسی تێدابو، بونیان بە قازانج بۆ ئێمە نەدەگەڕایەوە.

نەوشیروان و مولازم عومەر چونەوە بۆ بژارکردنی هێزی پێشمەرگە و ڕێکخستنەوەیان و دابەشکردنی چەکەکان و بەرزکردنەوەی وورەی خەڵک.

هەروەها ئارامیان لە سەرجەم کارو وەزعەکە ئاگادارکردەوە و داوایان لێکرد،

بێت بۆلای من لە ناوچەی نۆکان و ئاگادارییان کردبۆوە کە بوە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی و پێویستە لەگەڵ ئێمە کاربکات، ئەویش ئامادەیی خۆی دەرخستبو، بەڵام بەداخەوە لە خۆسازداندا کە بێت بۆلای ئێمە، ئەوەبو شەهیدکرا.[٥]

*** ئەی لێپرسراوانی تری سیاسی و هی هێزی پێشمەرگە لە ناوچەکانی تری کوردستان چیان کرد؟**

- دکتۆر خالید و شێخ حسێن و نزیکی حەفتا هەشتا پێشمەرگەی تر، جەولەیەکی باشیان دەست پێکرد، لە ناوچەی شێخ رەشیدی لۆلانەوە بەناو پارێزگای هەولێر و خۆشناوەتی و ئینجا بۆلای شاربازێر و لەوێ لەگەڵ نەوشیروان و مولازم عومەر یەکیان گرتەوە، تا لای پێنجوین چون و دوایی هاتنەوە لای نۆکان و لەوێ یەکترمان گرتەوە، جەولەکەیان زیاتر لە ٣ مانگی خایاند.

لەو جەولەیەدا، خەڵکێکی زۆری بێ چەکیان لەگەڵ هاتبو، دەمانویست ئەوانە پڕ چەک بکەین، ئەوکاتە خەریک بوین بچین چەک لە سوریاوە بە رێگای کوردستانی تورکیاوە بهێنین و لەوێوە بۆمان دەهات. دکتۆر کەمال خۆشناو و برادەرانی تر خەریکی هێنانی چەک بون، چونکە بێ چەکی بەراستی تەنگی پێ هەڵچنیبوین، خەڵکێکی زۆر هەبون، دەیانویست ببن بە پێشمەرگە، بەڵام چەکیان نەبو.

بەداخەوە ئەو سیاسەتە ناراست و نا نیشتمانپەروەریەی قیادەی مەوەقەتە لە رێگرتن لە هێنانی چەک، کێشەی بۆ دروستکردبوین، ئەگینا دەمان توانی هەزاران پارچە چەک بهێنین و هەزاران کەس پڕ چەک بکەین و شەڕی گەورەبکەین، بۆ پەکخستنی سیاسەتی راگواستنی دێهاتی سەرسنور کە خەڵکەکە خۆیان ئامادەبون بەرگری بکەن. بە رای من تۆباڵێکی گەورەی ئەو سیاسەتە شۆفێنیەی حکومەتی عێراق، ئەخەمە ئەستۆی قیادەی موەقەتە و سەرکردەکانی.

بە بۆچونی من، دوەم تاوانی مێژویی قیادەی موەقەتە، هەڵگیرسانەوەی شەڕی برا کوژیی بو، بە رێگرتنیان لە هێنانی چەک بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان ئەو ئاگرەیان خۆشکرد.

ئێمەش بڕیارماندا بو، بچینەوە سەر سێ سنورەکە، لەوێ لە نزیک تورکیا هەوڵ بدەین بچین بۆ بادینان، بۆئەوەی هەم شێخ حسێنی بابە شێخ و برادەرەکانی تر لەو ناوچەیە دابمەزرێنین و هێزی بادینان لەوێ بمێنێتەوە، هەم کۆمەڵێک چەک لە ناوچەی سوریاوە بهێنین بۆ ئەو هێزانە و ئەو خەڵکانەی بێ چەک مابونەوە و پڕ چەکیان بکەین و چەکی تریش دابەشبکەین بەسەر هێزی پێشمەرگەدا .

*** ئایا بۆچونی سەرکردایەتی یەکێتی دەربارەی پیلانەکانتان وەک یەک وابو، یاخود باڵ و ئاراستەکان، یان سەرکردەکان ناکۆکیان هەبو لەسەر دارشتنی بەرنامەی سیاسی و پێشمەرگایەتی؟**

- بۆچونمان لەسەر چون بۆ تورکیا و شێوەی چون وەک یەک نەبو، من و نەوشیروان پێمانوابو، دەبێ بە ژیری و بە شێنەیی بیریی لێ بکەینەوە، عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید زۆر بەپەلە و بەهەڵپە بون لەم کارەدا، پێیان وابو، دەکرێ تایەری عەلی والی و سەید کاکە و برادەرانی تر بەهۆی چاوپۆشی ئێرانەوە بەوێدا تێپەرن.

ئالێرەدا، پێویستی بەوە هەیە چەند شتێ باسبکەین: لە لایەک هاتنەوەی برادەران و گەڕانیان لە زۆر شوێندا بە سەرپەرشتی نەوشیروان و مولازم عومەر لەلایەک و دکتۆر خالید و شێخ حسێن لەلایەکی تر، هەستی شۆڕشگێرانەی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا بزواند و جوڵاند. خەڵک بەچاوی خۆی بینی کە شۆڕش دەستی پێکردۆتەوە و سەدان پێشمەرگە هەیە و لەناونەچون و چالاکن، ئەو تەسلیم بونەوانە پێشمەرگەی لەناونەبردوە، بۆیە ورەی خەڵک بەرزبویەوە و هیواو ئومێدی ژیانەوە و بەتەمابون رۆژی رزگارییان لێ هەڵبێتەوە.

ئەو جەولەو چالاکیانەی ئەو برادەرانە بە ناوچەی جیاوازی کوردستاندا، بوەهۆی ئەوەی رێکخستنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە زۆر شوێن دابمەزرێت و خەڵک لە دەوری ئاڵای یەکێتی کۆ ببێتەوە، وەک شۆڕش هەڵگیرسێنەر و خەباتگێڕ و شۆڕشگێر سەیری بکرێت و ببێتە جێگای هیواو ئومێدی جەماوەر.

لەلایەکی تر، سودی ئەو گەڕانە ئەوەبو کە پەیوەندی کرا بە رێکخراوەکانی ناوشار و بە تێکۆشەرانی ناسراوی خۆمان، بۆ خۆرێکخستنەوەیان و هاندانیان.

لەلایەکی ترەوە پەیوەندی کرا بە زۆر خەڵک، لە شار و لە لادێ بۆئەوەی ئامادەبکرێن بۆ کاتی پێویست، بۆ ئەو کاتەی چەکمان بۆ بێت. ئەوەبو گەلێک کەس ئامادەیی خۆیان نیشاندا، هەروەها پەیوەندی کرا بەهەمو دێهاتەکانی سەر سنورەکان، بۆئەوەی بەربەرەکانی بکەن و راگواستن قبوڵ نەکەن و شەربکەن.

داخوازی خەڵک ئەوەبو، چەکیان بۆ پەیدابکەین، هەتا چەکی دژی فرۆکەش، و ئامادەبون ئەگەر چەکیان هەبێت بەربەرەکانی بکەن، بەداخەوە قیادەی موقەتە ١٠ دۆشکەی لێگرتین.

*** تۆ زۆر باسی سەرکەوتن دەکەیت، ئەی توشی کۆمەڵێک شکست و کێشە و ململانێی سەخت نەهاتن لەگەڵ پارتی لەلایەک و رژێمی بەعس لەلایەکی ترەوە؟**

- بێگومان توشی شکستیش هاتین، لەگەڵ ئەو سەرکەوتنانەدا دو شکستی گەورەمان تووشبو، یەکێکیان شەهیدکردنی ئارام (شاسوار جەلال) بو، دوەمیان تاقمێک لە پێشمەرگە قارەمانەکان بە بەشداری سەید کاکە و سەعدی گچکە لە دەشتی دزەیانەوە دەهاتن بۆ نۆکان بۆ کۆبونەوە لە ناوچەی قەڵادزێ، توشی شەڕهاتن لەگەڵ حکومەت، لەو ناوچەیە بەرزاییەکی گرنگ هەبو کە سەید کاکەی لێبو، لە شەڕەکەدا هەڵهات و بەجێی هێشت و شوێنەکە کەوتە دەست دوژمن، پاشان سەعدی گچکە و هەندێ برادەری تر چون بیگرنەوە، لەو پەلاماردانەدا بۆ گرتنەوەی، هەندێکیان شەهیدبون. ئەگەر سەید کاکە هەڵنەهاتایە و ئەو شوێنەی بەجێ نەهێشتایە، ئەو کارەسەتەمان بەسەردا نەدەهات. لە ئەنجامدا سەعدی گچکە و جەماعەتێکی زۆر شەهیدبون و چەند کەسێکیش گیران، یەکێک لە بەندەکان جەعفەری کاکە ئەسوەدی کۆیە بو، ئەویش دوایی لەگەڵ چەند لاوێکی تر ئیعدامکران.

بە گشتی لەو ٣٠ - ٤٠ کەسەی بەیەکەوە هاتبون، لە ئەنجامدا ١٠ - ١٢ کەسێکیان بە سەلامەتی گەیشتن، یەکێک لەوانە قادر عەزیزی سکرتێری حیزبی زەحمەتکێشان، برازای سەعدی گچکە بو.

قادر عزیز، بە شەهیدبونی سەعدی زۆر شپرزەبو، زۆر زۆر گریا، بەراستی زۆر بەشێوەیەکی نائاسایی هاتە بەرچاوم و لە لاوێکی شۆڕشگێری کوردم رەچاونەدەکرد کەوا بروخێ و بێ ورەبێت، تەنها لەبەرئەوەی نزیکێکی شەهیدکراوە، شەهیدبون روداوێکی ئاساییە لە شۆرش و لە گۆرەپانی خەباتدا، لەوکاتانەدا پێویستە پێشمەرگە بە گشتی و کادێر و لێپرسراو بە تایبەتی خۆڕاگربێت. زۆر گرنگە ئەو لێپرسراوە کە کەسێکی نزیکی، یان هاورێیەکی شەهیددەبێت، نەشڵەژێ و ورە لە دەست نەدا، بە پێچەوانەوە ورەی خۆی بەرزکاتەوە خۆی جۆشبداتەوە و خۆی بێنێتەوە جۆش و خرۆش و خەباتکردن و ورەی دەوروپشتی بەرزبکاتەوە.

بەداخەوە، ئەوکاتە لە کارەکەی سەید کاکەمان نەکۆڵیەوە، پێویست بو لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت کە بۆچی ئەوکارەیکردوە و ئەو کارەساتەی بەسەر هێناوین، ئەوەبو چاوپۆشی لێکرا.

کارەساتێکی هاو شێوەمان لە ناوچەی ماوەت بەسەرهات، لەوێش کاکە خانەی موعینی برای سلێمانی موعینی کە هاتبو بۆئەوەی لەگەڵ برادەرانی ئێمە بێت، ئەوەبو لەگەڵ ١٠ برادەری ئێمەدا لە ناوچەی درێ لە نزیک ماوەت شەهیدکران.

# پەیوەندی لەگەڵ کوردی ئێران

*** کەواتە ئێوە پەیوەندیتان لەگەڵ کوردەکانی ئێران هەبو؟**

- بەڵێ وابو، کاکە خانەی موعینی نوێنەری کۆمەڵەی شۆرشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بو، هاتنی ئەوان سەرەتای پەیوەندیەکی نوێ بو، لە نێوان شۆڕشگێرانی کوردستانی ئێران و ئێمەدا، چونکە ئێمە هەستمان بە کەلەبەرێک دەکرد، لە نێوانماندا هەیە، دەمان ویست بەو هاتنە ئەو بۆشاییە پڕ بکەینەوە، چونکە دەنگ و رەنگی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەناو ئێراندا زۆر کزبو، رێکخستنیان زۆر کەمبو، نوێنەریان لە بەغدا هەبو، بۆیە پەیوەندیان لەگەڵ ئێمە کەمێک لاوازبو.[٦]

ئەوان هاوکارییان وەک پێویست نەدەکردین، هەرچەندە من لە دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا پرسم بە دکتۆر قاسملۆ کردبو، وە نامەم بۆ نوسی و بەیانەکەی یەکێتیشم بۆ نارد، ئەویش وەڵامی دابومەوە کە زۆر پێی خۆشە و پشتیوانی دەکات و پێی باشە، بەڵام بە کردەوە هیچ هاوکاریەکی پێویستی نەکردین.

*** ئایا ئەو کاتە بارەگاکانتان لەناو خاکی کوردستانی عێراقدابو، یان لەدیوی ئێران؟**

- ئێمە لە نۆکان لەدیوی ئێران کۆبوینەوە و خۆمان سازدەدا بۆ رۆیشتن. لەوکاتەدا ئێرانیەکان هاتنە سەرمان و ناچاریان کردین، بەپەلە لەوێ دەرچین و بچینە توژەڵە، بە ناچاریش لەوێ رۆیشتین و چوینە دۆڵەکۆکە کە وەزعێکی خراپی بێ جێگا و بێ نان و کێشەی زۆر روی تێکردبوین. لەوکاتەدا ئێمە گەیشتبوینە ئەو ئەنجامەی، بچین بۆ بادینان، بەڵام لەسەر شێوەی چونەکەمان کە پێشتر باسمکرد بۆچونی جیاوازمان هەبو، بەڵام لە ئەنجامدا گەیشتینە ئەو ئەنجامەی، بەناوی عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید و تایەری عەلی والیەوە نامە بۆ حەمایل خان و شێخ محەمەد خالید و ئیدریس بارزانی، ئەوکاتە لە کەرەج

بون، بنوسین و داوایان لێبکەین، کەوا ئێمە ئەچین بۆ بادینان بۆ چەک هێنان بۆ بەربەرەکانی کردنی دوژمنی کورد و بۆ شەڕی دوژمنی کورد و تکایە شەڕمان پێ مەفرۆشن و تەشقەڵەمان پێمەکەن.

لەم کاتەدا، ئێرانیەکانیش (مینە کوپە) یان نارد بۆلامان بۆئەوەی بزانن نیازمان چیە، زۆرتر نیازیان جاسوسیەت بو بەسەرمانەوە، بەڵام بەناوی ئەوەی، رەنگە رێمان بدەن ئەگەر ئێمە بە خاکی ئێراندا تێپەرین، ماوەیەکی زۆر ئێمەیان هێنا و برد و دوایان خستین.

*** ئایا ئێوە هاوکاری ئێرانیتان قبوڵکردبو؟**

– لەسەر ئەو پەیوەندیە لەگەڵ ئێراندا بۆچونی جیاواز هەبو لە نێوانماندا، من و نەوشیروان لایەنگری ئەو پەیوەندیە نەبوین، بەڵام برادەرنی تر ئەو پەیوەندیەیان پێ خراپ نەبو، بەتایبەتی ئەو سەردەمە شەمسەدین مفتی و دوکتۆر مەحمود و هەندێ برادەری تر بەناوی (لیژنەی ئامادەکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان)، هاتبونە لامان لە سێ سنورەکە و لە نۆکان بارەگایان دانابو.

بۆ مەسەلەی خەباتی چەکدار و هاوکاری و بەربەرەکانی قیادەی موەقەتە، ئەوان لەو بۆچونەدابون کە نەختێ چاوپۆشی ئیران لە ئێمە و ئێمە لەوان، باشە تا خۆمان دەگرین و دائەمەزرێین، ئیتر دوایی پێویستیمان بەوان نابێ.

بۆچونیان وابو کە سود لەو پێشنیازەی ئێران وەرگرین، لەئەنجامدا بریاردرا پەیوەندی نەپچرین، بەڵام ئەو رۆژەی لە دۆڵەکۆکەوە بەرە و دیوی ئیران رۆیشتین، ئەوەبو ئێرانیەکان کەوتنە تۆپ باران کردنمان و بە هەزار حاڵ رزگارمان بو، ناچار گەراینەوە.

دوای ئەو تۆپبارانکردنە، ئەو برادەرانەی گەرم بون لە چاوپۆشی و هاوکاریکردن لەگەڵ ئیران، بە تایبەتی تایەری عەلی والی و سەید کاکە، کەوتنە پرتە و بۆڵە، منیش گوتم: "برادەرینە، ئەوە ئەو قسانەیە کە پێشتر پێمان وتن، ئێران، ئێرانی شایە و دوژمنە و داگیرکەری کوردستانە و پشتی پێنابەسترێت.

پاشان روم تێکردن و گوتم: قەیناکە ئەوە مەکەن بە هەرا، ئێستا پێی ناوێت پرتە و بۆڵە بکەن، بەڵام لولەی ئەو تۆپانەی کە پێمانەوە نران، بابێت بە وانەیەک بۆ ئەوەی هەرگیز لەیادمان نەچێت".

هەروەها شتێکی تری کە لەوماوەیەدا رویدا، ئەوەبو پەیوەندیمان لەگەڵ برادەرانی کۆمەڵەی ئێران نوێ بۆوە، ئەویش بەهۆی سەلاحەدینی موهتەدییەوە

کە لەگەڵ ئەوەی نامەی بۆ ناردبوین و ئاگاداری کردبوین لە بارودۆخی کوردستانی ئێران، هەروەها پێنج هەزار دیناریشی بۆ ناردین، لە ڕۆژێکی زۆر ڕەش و تەنگاودا بە دەستمان گەیشت، بەراستی ئەو ڕۆژە ئەو پارەیە یارمەتیەکی زۆر گەورە بو کە زۆر سودمان لێ وەرگرت.

*** ئەی ئێوە هەر لەسەر سنور مانەوە؟ یان ڕۆشتن بۆ ناوچەکانی تریش؟**

- بریارماندا بجوڵێین و بەسەر پشتی دۆڵەکۆگەدا و بە قەندیل دا هەڵگەراین، بە ناوبەفرێکی زۆر ناخۆشدا، ڕۆیشتین هەتا چۆک دەچەقیە بەفرەوە، بەدرێژایی ڕۆژێکی دورودرێژ ڕۆیشتین، کەچی لە ڕاستیێدا ماوەیەکی زۆر کەممان بریبو، دوایی توشی هەڵدێریک هاتین و خۆمان خلۆر کردەوە و توشی چەند ڕەشماڵێک هاتین لە ڕەشاییەکدا. لە ڕۆژی دوهەمدا، چوینە جێگایەک کە گیا و سەوزایی لێبو، کە پێیان دەگوت (دۆڵە نیە) لەوێ حەساینەوە و خۆمان ئامادەکرد بۆ ڕۆیشتن.

پێش ئێمە، دکتۆر خالید و شێخ حوسێن و برادەرانی تر کە نزیکی ٢٠٠ کەسێک دەبون، تێپەڕیبون و ڕۆیشتبون و گەیشتبونە ناوچەی شێخ ڕەشیدی لۆلان، واتا ناوچەی برادۆست، لەوێ پەلە پەلیان دەکرد و هەواڵیان دەنارد کە برادەران زو بچن بۆئەوێ.

لە دۆڵە نیە، نەوشیروان مستەفا لە کۆبونەوەیەکدا رای خۆی بە ئاشکرا دەربری و گوتی: "وا باش نیە ئێمە هەمومان ئەم ناوچەیە چۆڵ بکەین، یان من و مام جەلال دەچین بۆئەوێ و کاک عەلی و برادەرانی تر لێرە بمێننەوە، یان ئێمە دەمێنینەوە و ئێوە بڕۆن".

ئەوان گوتیان نا ئێوە بمێننەوە، لەسەرئەوە بریارەکە هەڵوەشایەوە و وای لێهات کە من و نەوشیروان و دکتۆر مەحمود بمێنینەوە، برادەرانی تر بچن بۆئەوێ.

برادەرانی تر بە سەرکردایەتی عەلی عەسکەری و مولازم عومەر و دکتۆر خالید و شێخ حوسێن و تایەری عەلی والی و ئازاد هەورامی و چەندین برادەری تر بەرەو ئەوێ ڕۆیشتن، هێزێکی زۆربون، ژمارەی ٧٠٠ تا ٨٠٠ کەسێک دەبون، نزیکی ٣٠٠ کەسێکی بە چەک بون و ٤٠٠ یان بێ چەک بون.

لەوێدا بۆ مێژو ڕاستیەک دەڵێم کە دوکتۆر مەحمود رای خۆی بە ئاشکرا گوت ئەویش ئەوەبو: "ئەو دودڵیەی دکتۆر خالید و عەلی عەسکەری و تایەری عەلی

والی هەیان بو لەسەر مەسەلەی قیادە موەقەتە، مەترسیەکی گەورەیە و بەوە دەفەوتێین"، هەروەها گوتی: "راستە ئێمە هەوڵمان داوە کە شەڕ رونەدات و شەڕی یەکتر نەکەین و بەگژی یەکتردا نەچین، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەڵێم ئەوان رێتان پێدەگرن و دێنە سەر رێگاتان، لەبەرئەوە هەر جۆرە خۆ خڵافاندنێک، هەر جۆرە خۆ هەڵخەڵەتاندنێک بۆئەوەی ئەوان شەڕتان ناکەن، ئەوە لە واقیعەکە دورتان دەخاتەوە و بە هەڵەتاندا دەبات، ئەوان عەشائیری کوردی تورکیا و میت و ساواکتان دەکەن بە گژدا. ئەوە توشی سستی و کەم تەرخەمی و خافڵاندنتان دەکەن، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی تێیدا بفەوتێن، لەبەرئەوە ئەگەر ئەوان شەڕیانکردن، ئێوەش ئەبێ شەڕیان لەگەڵدا بکەنەوە، ئەگەر بەو شێوەیە هەڵوێست وەرنەگرن، ئەوا بەراستی دەفەوتێین".

برادەران بە تایبەتی عەلی عەسکەری و تایەری عەلی والی گوتیان: "ئەوە بۆ خۆمان بەجێ بهێڵن و ئێمە خۆمان چارەسەری دەکەین و خۆمان دەزانین چۆن ئیش و رەفتار دەکەین و چۆن کاردەکەین؟".

لەئەنجامدا ئەو برادەرانە کەوتنەرێ و بە سەختی و بە نارەحەتیەکی ئێجگار زۆرەوە، ئێرانیان بڕی و گەیشتنە لای کێلە شین و پەرینەوە و جارێکی تر بۆناو عێراق، هەتا لەوێ فرۆکە هاتە سەریان و لێیدان و زۆریان لەناو بەفردا بریندار بون و ئەو هێرشە زۆر شپرزەیکردن.

دوایی گەیشتنە لای دکتۆر خالید و برادەران لە نزیک (دۆڵە کۆستە) و یەکتریان گرتەوە، زۆر بەداخەوە کە هەڤاڵان رۆیشتن توشی کارەساتی هەکاری هاتن کە بەراستی زیانێکی گەورە بو لە شۆرشی نوێی گەلەکەمان ویارمەتیەکی راستەوخۆ و ناراستەوخۆی حکومەتی داگیرکەری بەغدا و لەلایەن قیادەی موەقەتە و میت و ساواکەوە، ئەوانە هەریەکە بە شێوەیەک بەشداربون لەو تاوانە گەورەیەدا کە لە مێژوی میلەتی کورد تۆمارکراوە.

لەم کارەساتەدا، سەدان کادیر و ئەندام و پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی تێیداچون و بەشێوەیەکی زۆر ناجوامێرانە و نامەردانە دیلەکانیش کوژران. ئەوە جارێکی تر تاوانەکانی شەهیدکردنی ئیبراهیم عەزۆ و تاوانی ئەشکەوتی باڤێ دوپات کرایەوە و ئەمجارە سێ قارەمانی گەلەکەمان عەلی عەسکەری و حوسێن بابە شێخی ئێزدی و دوکتۆر خالیدیان لە زینداندا ئیعدامکرد و دەیانی تریش بەشێوەی نامەردانە لەملاولەولا لەناوبران.

## پەراوێزەکان:

١- لە ٢٠ تەموزی ١٩٧٧ دا مام جلال بە پەساپۆرتە ئێرانیەکەی فازیل تاڵەبانی کە خۆی لە نەخۆشخانەی لەندەن کەوتبو، گەڕایەوە بۆ کوردستان.

٢- (لە ١٣/١٠/١٩٧٧، قیادەی موقەتە، بۆسەیەکیان بۆ حەسەن خۆشناو و هاوڕێکانیان دانا و حەسەن و ئەم پێشمەرگانەیان کوشت: باهیر ئەحمەد(میەدێ)، کمال محەمەد حسێن(ماوەت)، نەجات نورەدین (کرکوك)، عەلی کوێخا هۆمەر(باوزێ)، خدر ئەحمەد (ماوەت)، عەبدولمەلیك بەرزنجی "سەرهەنگ"(دوزخورماتو)، لە کوردەکانی سوریاش، عەزیز چەرکەس، خالید و حسێن. چەند پێشمەرگەیەکیش بریندار بون. ئەوانەی تریان هەمو گرت و بە دیلیی بردیانن بۆ گوندی شەتونسی تورکی لەسەر سنوری عێراق، کاروانەکەیان روتکردەوە. بریندارەکانیان ئیزن دابو بۆ ئەوەی چاوی یەکێتی پێ بترسێنن. ئەمە جەزرەبەیەکی کاریگەر بو لە یەکێتی یان دا. سەرلەنوێ ئاگری شەری ناوخۆ هەڵگیرسایەوە). (لە کەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ. ل. ١٧٩).

٣- (ئەوە زنجیرەیەك کۆبونەوە بوە، کە لە ٣١ ئابەوە تا ١٢ ئەیلولی ١٩٧٧ ی خایاندوە و بە گرنگترین کۆبونەوەکان دەژمێرێت کە بناغەی سیاسی و عەسکەری و رێکخراوەیی یەکێتی دەستنیشان کرد). (لە کەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ، لاپەرەکانی ١٧٠-١٧٥).

٤- (عەلی عەسکەری سێ رۆژ لە بەغدا مایەوە و لەگەڵ هەریەك لە سەعدون شاکیر، بەرێوەبەری گشتی ئیستیخباراتی گشتی، فەریق روکنی یەکەم عەدنان خیروڵلا وەزیری بەرگری، فەریق روکنی یەکەم عەبدولجەبار شەنشەل و لەکۆتاییدا لەگەڵ سەدام حسێن. گفتوگۆکان بە هیچ ئەنجامێك نەگەیشت و دوایی گەڕایەوە ناوچەی برادۆست و رژێم ماوەی ٢٤ کاتژمێریان دانا. بۆئەوەی مەکتەبی سیاسی بریار لەسەر ئەنجامی گفتوگۆکان بدات، واتا بێ ئەنجام بو).(التیارات السیاسیة في کردستان العراق.ل. ٣٦٦).

٥-(رۆژی ٣١/١/١٩٧٨، مەفرەزەیەکی جاش بە رێکەوت چونەتە گوندی تەنگیسەر لە قەرەداغ، کاك ئارام خۆی لەو گوندەدا شاردبۆوە، کە جاشەکان نەیبینێ، تفەنگەکەی ئەکاتە شانی و ئەیەوێت بە خێرایی لە ئاوایی دەربچێ، جاشەکان بەدی ئەکەن و تەقەی لێ ئەکەن، کاك ئارام ئەپێکرێ و هەر لەوێ دا گیانی دەرئەچێ. جاشەکان ئەچنە سەری و گیرفانی ئەپشکنن "هەویە"یەکی پێ ئەبێ بە ناوی "أنور"ەوە. جاشەکان ئای ئاسن و لاشەکەی بەجێ ئەهێڵن. بەڵام "هەویە" یەکەی ئەبەن و، ئەیدەن بە دائیرەی "ئەمن" لە سلێمانی. "ئەمن" یش نەیزانی بو ئەو "أنور" ناوە کاك ئارامە). (لە کەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ. ل.٢٢٨).

٦- کاك سەعید موعینی کە لە روی خۆشەویستی پێیان گوتوە "خانە" لە بنەماڵەیەکی شۆرشگێر و باوکی لە کۆماری کوردستان وەزیر بوە، لە ساڵی ۱۹٥۰ لە دایك بو. لە ساڵی ۱۹۷٤ لە تاران لەلایان ساواکەوە دەگیرێت و ۱۸ مانگ لە زیندان بەرگری دەکات، خۆڕاگری کاك خانە لە ژێر ئەشکەنجە لە سەرتاسەری زیندانەکانی ئێران دەنگی دایەوە. کاك خانە ئەندامی کۆمەڵەی شۆرشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بو. دوای زیندان و لە سەرەتای شۆرشی گەلانی ئێران هات بۆ باشوری کوردستان و ویستی بگاتە سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەران و یەکێتی نیشتمانی، لە رێگادا لەگەڵ مەفرەزەیەکی پێشمەرگەکانی یەکێتی لە ۳۱ی جۆزەردان ۱۹۷۸ توشی کەمینی جاش و جەیشی عێراق بون و کاك خانە لە گوندی دڕی لە ناوچەی ماوەت شەهیدبو، ئێستاش گۆڕ و ئارامگای لە شارۆچکەی ماوەتە.

٧- کاك خانە برای هەردو شەهیدی سەرکردەی شۆرشی رۆژهەڵاتی ساڵانی ٦٧-٦٨ کاك سولەیمان و کاك عەبدوڵڵای موعینییە.

# کارەساتی هەکاری

*** کارەساتی هەکاریتان چۆن هەڵسەنگاند؟**

- لەسەر کارەساتی هەکاری نامیلکەکەی نەوشیروان مستەفا بەتەواوی بیروڕای هەمومان دەردەخات، بەڵام من چەند سەرنجێکم هەیە دەمەوێ لێرەدا تۆماری بکەم: یەکێکیان ئەوەیە، دەکرا کارەساتی هەکاریمان بەسەردانەیەت، ئەگەر ئەو برادەرانەی سەرکردایەتی، ڕێبەری ئەو هێزەیان دەکرد وردترو و ژیرانەتر و لەسەرخۆتر بونایە و ئەم هەڵانەی خوارەوەیان نەکردبا، یا خۆیان لەم هەڵانەی خوارەوە لابدایە:

یەکەم: ئەوەندە نەچونایە ناو قوڵایی تورکیاوە و ئەوەندە نزیک نەبونایەتەوە لەو عەشیرەت و تاقمانەی، سەر بە قیادەی موقەت و میت بون، دەزانرا ئەوانە دوژمنایەتی دەکەن، یان نەشزانرێ دەبوایە چاوەڕێی ئەوەبکرایە.

دوەم: دەبوایە ئەوەندە دڵپاک نەبن، ئەوەندە بێباک نەبن لە قیادەی موەقەتە و پیلانگێڕیەکانی و بە قسە لوسەکانیان باوەڕنەکەن و هەڵنەخەڵەتێن. دەبوایە بزانن کە ئەوانە هەروەک دکتۆر مەحمود، لە دۆڵە نیە ئاگاداری کردنەوە، پیلانیان لێدەگێڕن و هەوڵ دەدەن بۆ لەناو بردنیان و تورک و عەجەم و میت و ساواکیان دەکەن بەگژا و عەشائیری کوردی تورکیایان لێدەکەن بە دوژمن. کەواتە دەبوایە ئیحتیاتاتی تەواو وەربگرن و ئەگەری هەرە خراپ لێکبدەنەوە نەک وا بێباک و دڵپاکانە بڕۆن و بچنە ناو قوڵایی تورکیاوە.

سێیەم: لەکاتی پێکهاتندا دەبوایە خێرا ڕێگای کشانەوە و بیر لەکشانەوە بکەنەوە، بەتایبەتی کە ئەوان لەشەڕدا نەشکان و لەشەردا سەرکەوتن، وەکو برادەران دەگێڕنەوە دو هەڵەی گەورەی تێیداکرا، یەکێکیان لە جیاتی ئەوەی قۆڵەکەی دکتۆر خالید بێتە لای ئەو قۆڵەی عەلی عەسکەری و لەوێوە بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەو بۆ ناو ئەو عەشیرەتەی کە دوایی چونە ناویان و دۆستبون و یارمەتیاندان. ئەوان جارێک پەڕینەوە بۆ لای قۆڵەکەی تری دکتۆر خالید و ئینجا

جارێکی تر هاتنەوە بەم قۆڵەدا، پێویست بو لێوەی دەرباز ببنەوە ئەگەر ئەوە نەکرابایە، ئەیانتوانی بە ئاسانی لەوێوە بکشێنەوە.

چوارەم: ئەو قۆڵەی عەلی عەسکەری لێێ بەرپرس بو، لە برادەرانی تر دابڕان، ئینجا بەهۆی خیانەتەوە بوبێ (واهەستمان کرد دەستی ئەوانەی تێدابو، دوایی یەکێکمان بەسزای گەل گەیاند و یەکێکیان پەشیمان بوەوە و هاتەوە لای خۆمان) یاخود بەهۆی کەم تەرخەمیەوە بوبێت، دەبوایە ئەو هێزە پێکەوە بونایە و نە دەبوایە لە پێشەوە بڕۆن، بەڵکو دەبوایە لە ناوەڕاستی ڕەتڵەکەی خۆیدا بوایە، یاخود کەمێک بە پێش خۆی بخستایە و هەندێکی لە دوای خۆی بوایە.

ئەوکاتە ئەگەر ئەو ڕەتڵەی خۆی لەگەڵیا بوایە، ئەیانتوانی هەمو کەمینێک بشکێنن توشی دەبون و ئەیانتوانی هەمویان بە سەلامەتی دەربازبن و دەچونەوە ئەو شوێنەی کە برادەران دوای کشانەوەیان چون. ئەگەر ئەو ڕەتڵەی لەگەڵ عەلی عەسکەری بون، دانەبرایە و بەرەو قولایی عێراق نەرۆیشتبایە، هەم لە دیوی عێراق نەئەفەوتان و هەم تەسلیم بە میری نەدەبونەوە و عەلی عەسکەریش بەوشێوەیە دیل نەدەکرا و نەدەکەوتە دەست قیادەی موەقەتەوە.

پێنجەم: هەڵەیەکی تر ئەوەبو، ئەو قۆڵەی کە مابۆوە و بەدەستی دوکتۆر خالید و مولازم عومەرەوە بو، دەبوایە باش سۆراغی عەلی عەسکەریان بکردایە و بیانزانیایە چیان بەسەر هاتوە، ئینجا بەبێ باکی و بێئەوەی سەبربکەن ڕێگای خۆیان بگرن.

کاتێ هەواڵی گیرانی عەلی عەسکەری و برادەرانی تر دەگات، یەکسەر ئەوان بەرێگایەکی تردا مل دەنێن و دەکەونە ناو کەمینی دوژمنانی ترەوە کە ئەوە کارێکی دووربینانە و ژیرانەنەبو.

دیارە وردە هەڵەی تەکتیکی تریش رویدا و ئەو هەڤاڵانەی کە لەناو کارەساتەکەدا بون باشتری لێ دەزانن.

*** هەڵوێستی ئێوە چی بو دوای ئەو کارەساتە و ئەو زیانە گەورەیەی لێتانکەوت، ورەی سەرکردایەتی لە چ ئاستێکدا بو؟**

– بە پێچەوانەی ئاوات و ویستی گڵاوی ناحەزان و دوژمنانەوە، هەرچەندە کارەساتی هەکاری کارەساتێکی گەورە و جەرگبڕ و دڵتەزێن بو، بەڵام ورەی سەرکردایەتی و کادرەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی نەڕوخاند و نەیبەزاند و بەپێچەوانەوە بریاری مێژویی خۆیان دایەوە، دەبێت درێژەبدەن بە خەبات،

تەنانەت ئەگەر مردنی خۆشیانی تێیدابێت.

لێرەدا بۆ مێژو دەمەوێ هەڵوێستێکی جوامێرانەی نەوشیروان مستەفا تۆماربکەم، دوای ئەوەی کە زانیمان ئەو کارەساتە بەسەر برادەراندا هاتوە، هەموومان زۆر دڵتەنگ بوین، ئێمە ئەوانەی لە دۆڵە نیە مابوینەوە ٤٢ کەس بووین، ٢ چەکدار و ١٤ بێ چەک، نانمان نەبو، پارەمان نەبو، لەم دیوەوە ڕۆژانە ئێران بە هەلیکۆپتەر بۆردومانی دەکردین، لەو دیوەوە عێراق تۆپی پێوەدەناین و کەوتبوینە نێوان دو ئاگرەوە.

# هەرەس یان بەرگری

*** ئایا لەو کاتە سەختانەدا بیرتان لەوە نەکردەوە، زەمینەی شۆڕش و خەبات لەبارنیە و باشتر وایە ڕو بکەنەوە دەرەوەی وڵات؟.**

- بە هیچ شێوەیەک، با ئەم مەسەلەیەت لەو بارەیەوە بۆ باسبکەم، ڕۆژێکیان نەوشیروان هات بۆلای من و گوتی: با پێکەوە پیاسەیەک بکەین کە پیاسەمان کرد پرسیارێکی لێکردم و گوتی: "تۆ پێت وایە من لەو کەسانەم حەزدەکەم پێش تۆ بمرم و ئەو گوللانەی بۆ تۆ دێ بەلەشی خۆم بیگێڕمەوە و بێ ئەندازە ڕێز و خۆشەویستیم هەیە بۆ تۆ"؟ گوتم: بەڵێ پێم وایە و باوەڕی تەواوم بەوە هەیە، ئەویش گوتی: "کەواتە من پێشنیارێکم هەیە، ئەمەوێ باش گوێم لێبگریت، پێشنیارەکەشم ئەوەیە: تا ئێستا سەرکردەی شۆڕشەکانی کورد لە شکست و لێقەوماندا هەڵهاتون و وڵاتەکەیان بەجێ هێشتوە و زوربەیان لە دەرەوەی وڵات مردون، با ئێمە ئەمجارە وا نەکەین و ڕانەکەین، با لەناو شاخ و دۆڵەکانی کوردستانی خۆماندا بمێنینەوە تا مردن، گۆڕ و گۆرستان و شوێنەواری شەهیدبون بەجێ دەهێڵین، یان کە هیچ جێ نەما و چارە نەما دەچینەوە شارەکان و سەرکردایەتی خەباتی نهێنی دەکەین و لەوێ یا مردن یا سەرکەوتن بەدەست دەهێنین".

من پێشنیازەکەم زۆر بەدڵبو، و گوتم: "من خۆشم هەروام بیرکردۆتەوە، بە

هیچ شێوەیەک بیر ناکەینەوە لە چونە دەرەوە و راکردن، بەڵکو درێژە دەدەین بە خەبات و پیلان دادەنێین بۆ خۆسازدانەوە و هەڵسانەوە".

لە ژێر باڵە پەستۆی بۆردمانی ئێران و برسێتیدا، بەرێ کەوتین بەرەو کێوی قەندیل و ناوچەی باڵەکایەتی، ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە سەری قەندیل. لە بەیانیەوە کە بەرێوە بوین بەفر دەباری و بە زەحمەتێکی زۆر رێگامان بڕیبو کە گەیشتینە ئەوێ زۆر ساردبو، بەرامبەرەکەشمان رەبایەی عێراقی بو، نەدەکرا بە رۆژ دابەزین چونکە بەفری قەندیل سپی و ئێمەش رەتڵێکی ٤٢ کەسی، دەبیندراین، بۆیە ئەبوایە چاوەڕێ بکەین تا دنیا تاریکدادێ ئینجا دابەزین.

لەوێ بۆ یەکەمینجار دیتم کە پێشمەرگە لەسەر بەفر بە چیلکە و دار، ئاگریان کردەوە و لە پەنایەک و لەو دۆڵەی ئێمە پێدا هەڵگەڕاین پێی دەڵێن (دۆڵی شێخ شەڕو) دەستی راستی لوتکەی بەرزی کۆکەسی سەربەرزی قەندیلە، ئەو ئێوارەیە هاتینە خوارێ من هەڵدێرام و خلۆر بومەوە، دەستێکم بە کلاشنکۆفەکەمەوە و دەستێکم بە گۆچانەکەمەوە بەرە و خواربومەوە، نازانم چیم بەسەردێت، تا لە شوێنێک لەسەر تەپۆڵکەیەک خۆم گرتەوە، بە دوای مندا دکتۆر مەحمودیش خۆی شۆڕ کردەوە بۆنەوەی ئەگەر شتێکم لێ هاتبێت، ئەو دکتۆرە بۆ تیمارم بکات بەڵام هیچم لێ نەهات و بە سەلامەتی دەرچوم.

لەوێوە وردە وردە رۆیشتین، بۆ بەرەبەیانی رۆژی دوەم بەفرێکی زۆربو، گەیشتینە دۆڵێک، پێی دەڵێن (دۆڵی خیلاپ)، دۆڵی خیلاپ دۆڵێک بو، بەفری لێ توابۆوە و زەوی رەشبو، گیای بەهار سەوزبوبو. ئەمەی کە باسی دەکەم مانگی مایس بو کە چوینە ئەوێ هیچمان نەبو، نانمان و خواردنمان نەبو، پێشمەرگە بە برسێتی کەوتنە ناو گیا و گوڵی بەهارەوە، لەوێدا قارچکێکی زۆر گەورەیان دۆزیەوە بۆ یەکەمجارم لە ژیانمدا قارچکی وا گەورەم بینی، لەبیرمە کە پۆڵای کوری مەعروف بەرزنجی کە لەگەڵ دکتۆر مەحمود و ئەوان بو، چو قارچکە گەورەکەی هێنا، ئێمە ١١ کەس بوین هەمومان لێمان خوارد!.

هەندێ شارەزای ئەو ناوچەیە کە لەگەڵ قادر خەبات و ئەوانەدا بون، دەستیان کرد بە گەڕان لە کون و کازێری خەڵک، چونکە دێهاتەکان ڕاگواسترابون، کەمێک شتیان دۆزییەوە وەک مەنجەڵ و قاپ و شتومەکی تر، کە خەڵک شاردبویەوە. ئێمەش زۆر باش کەڵکمان لێوەرگرتن بۆ چێشت لێنان و خۆراک دروستکردن.

مەڕدارێکی کوردستانی ئێرانیش مێگەلێک مەڕی لە کوردستانی ئێرانەوە بە

هیمەتی قادر خەبات و دوسێ هەڤاڵی تر بەخێر بۆ هێنابوین کە ١٤ سەر مەڕ و بەرخ و گیسک بون، قادر خەبات قارەمانانە چو هێنای و دەستمانکرد بە خواردنیان. ڕۆژێک ماینەوە، ڕۆژی دوهەم پیلان دانرا، لە دۆڵی خیلاپەوە بگوێزینەوە بۆ دۆڵی سەرشیو، وابزانم دۆڵێک بو کە ئەکەوتە ئەودیو دۆڵی خیلاپ و نزیک دەبۆوە لە باڵەکایەتی.

دوای ئەوەی چوینە ئەوێ، پاش ئێوارەیەک کاک نەوشیروان گروپێکی لەگەڵ خۆی بردبو بۆ کەشفی ناوچەکە، لەرێ توشی تەتەرێک هاتبون و پێی گوتبون کە بگەڕێنەوە، چونکە ئاگرێک لەسەر(شێخان) دەسوتێت، وابزانم دۆڵەکە دۆڵی سەر شێخانە، نەوەکا جاش و دوژمن بن و هاتبن بۆ ئەو ناوچەیە، بەڵام قادر خەبات وتبوی من دەچم سۆراغی دەکەم، کە چو بو لێیان نزیک بوبوەوە و بە دوربین تەماشای کردبون، ناسیبونیەوە کە پێشمەرگەنە، چوبو، تەماشای کردبو ئەحەمەد مەولودە بە خۆی و ١٨ پێشمەرگەوەوە ماونەتەوە و خۆیان پاراستوە و گوتویانە ڕۆژێک لە ڕۆژان سەرکردایەتی هەردێتەوە. ئەوەبو ڕۆژی دوهەم بە دیداریان شادبوینەوە، بەراستی زۆرخۆشحاڵ بوین کە ١٨ پێشمەرگەمان بە سەلامەتی گەیشتنەوە لامان.

*** ئێوە هەوڵتان نەدا پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی یەکێتییەوە لە شارەکاندا بکەنەوە، بۆ ئەوەی پێشمەرگەتان بۆ بنێرن و هاوکاریتان بکەن؟**

– بەڵی هەوڵماندا و لەو ماوەیەدا هەواڵماندابو بە خەڵک و ڕێکخراوەکانی یەکێتیەوە خەڵکمان بۆ بنێرن و ئەوانیش خەڵکیان هان دابو، ببن بە پێشمەرگە و بێنە لای ئێمە، ڕۆژێک سەیرمانکرد، کۆمەڵێک خەڵک لەسەر شاخەکانەوە بۆلای ئێمەدێن، لەسەرەتادا وامانزانی، ئەوانە جاشن، بەڵام کاتێ نەوشیروان بە هێزێکەوە بەرەو ڕوویان چو، دوایی هاتەوە لامان و گوتی: نەخێر ئەوانە خەڵکن هاتون ببنە پێشمەرگە، خەڵکی ڕاگوێزراون هەریەکە ١٠٠٠ تا ٢٠٠٠ دیناریان لەگەڵ خۆیانا هێناوە بۆئەوەی چەک بکرن و ببن بە پێشمەرگە.

بەوجۆرە ٢٢ کەسی تریشمان پەیداکرد، پاش ماوەیەک چەند کەسێکی تریش هاتنە لامان و ژمارەمان زیادیکرد و خۆمان گەیاندەوە نزیکی ١٠٠ کەسێک.

ماوەیەک لەوێ ماینەوە و پەیوەندیمان کرد بە ڕێکخراوەکانی یەکێتی نیشتمانییەوە لە ناوچەی گەلاڵە و چەند ئۆردوگایەکی ئەو ناوچەیە و لەوێوە نان و ئارد و برنج و ڕۆن و یارمەتی زۆریان بۆ ناردین، لەو دۆڵەش فیشەکێکی زۆر و

چەند تفەنگێکمان دۆزیەوە کە شاردرابۆوە و هەمومان هێنایەوە.

بەوهۆیەوە توانیمان خەڵکێکی باش پڕ چەک بکەین و فیشەکمان پەیداکرد و جارێکی تر بەرە و کوێستانەکانی قەندیل کەوتینە ڕێ، لە ناوچەی تاتیدۆ و دەراوی گورگان هەڵماندا و دەستمانکردەوە بە خۆسازدان و پەیوەندیکردن بە خەڵکەوە لە شارەکان و وردە وردە ژمارەمان زیادیدەکرد و بوینە ٢٠٠-٣٠٠پێشمەرگەیەک.

لەو هاوینەدا لە قەندیل دو روداو رویدا، یەکێکیان دڵخۆشکەر و ئەوەی تریان ناخۆش، یەکێکیان ئەوەبو، دو برادەری کوردی ئێران کە پاشان بون بە سەرکردەکانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بە هەستی شۆرشگێڕانە و جوامێرانە و کوردانەوە خۆیان گەیاندە لای ئێمە، یەکێکیان دکتۆر جەعفەری شەفیعی بو، ئەوی تریان مامۆستا ساعدی وەتەن دۆست بو، لای ئێمە بە (مامۆستا ئیبراهیم) ناوی دەرچوە. ئەم دو ڕۆڵە تێکۆشەرە هاتبون بۆ لامان و مامۆستا ئیبراهیم لەگەڵ خۆی سێ هەزار دیناریشی هێنابو، وەک ئەندازیارێک پاشکەوتی کردبو. دوکتۆر جەعفەریش داوودەرمانێکی زۆری هێنابو، ئێمە زۆر خۆشحاڵ بوین بە هاتنیان.

بەڵام ئێمە وامان باس کرد، ئەوانە هەردوکیان تاڵەبانین و خزمی منن، هەردوکیان لە ئێران خوێندویانە، بەڵام خەڵکی ناوچەی خانەقینن، ناوەکانیانمان گۆرین، دکتۆر جەعفەر بە دکتۆر عەزیز، مامۆستا ساعدی وەتەن دۆستیش بە مامۆستا ئیبراهیم.

کارە ناخۆشەکە ئەوەبو، لەوکاتە ناسکەدا رەسوڵ مامەند، لە جیاتی ئەوەی هەستی لێپرسراوێتی پاڵی پێوەبنێ و زیاتر لێمان نزیکبێتەوە، دەستیکرد بە تەکەتولێکی ئاشکرا بە نیازی جیابونەوە و دابرینی ریزەکان، دەرکەوت کە لەژێر کاریگەری کاردۆ گەلاڵی و عەلی هەژاردابوە. لە شارەکانەوە دەستیکرد بە چالاکی و بەناوی ئەوەی کەوا بزوتنەوەکەیان سەربەخۆیی خۆیان هەیە و هەڵوێستی سەربەخۆی خۆیان دەپارێزن، لەبەرئەوە کەوتە نانەوەی ناکۆکی و دوبەرەکی، تەنانەت بارەگاکەشی لە ئێمە دورخستەوە و رۆیشت بۆ ناوچەی شێنێ و لەوێ بە ئاشکرا هەڵوێستی جیاوازی لە ئێمەی وەرگرت. تەنانەت بیستمان کە پەیوەندیشی کردوە بە سامی و قیادەی موەقەتیشەوە، بۆئەوەی کەوا هەڵوێستی جیای خۆی لە یەکێتی نیشتمانی کوردستانی دەرببرێت. بیستیشمان کە پەیوەندییەکیشیان لەگەڵ حکومەتی عێراقدا کردوە، بۆئەوەی لەگەڵیاندا پێکبێن.

دیارە ئەم پیلانە لەو ڕۆژەوە دەستی پێنەکردبو، ئەنجامەکەی بەجیابوونەوەی

لە یەکێتی نیشتمان کوردستان کۆتاییهات، بەڵکو سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی ئێمە لە تۆکان بوین و لەوێ عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید و ئەوانیشمان لەگەڵدابون، سەرەتای ئەو تەکەتولەی ڕەسول مامەند و عەلی هەژار و مەلا ناسح و ئەمانە لەوێ سەری هەڵدابو، بەڵام لە بەردەم عەلی عەسکەری و دکتۆر خالیدا نەیان دەوێرا دەری ببڕن.

بەڵام دوای گیرانی ئەو برادەرانەیان لە کارەساتی هەکاریدا، بە هەل قۆستیانەوە و ئەوشتەی کە لە دڵیاندابو، هێنایانە مەیدانی جێبەجێکردنەوە و خۆیان جیاکردەوە.

*** ئایا ئەو بارودۆخە قورس و گرانەی ئەو ڕۆژە، هانی نەدان پەیوەندی بە ڕژێمەوە بکەن؟**

- بەڵێ، بەڵام بەم شێوەیەبو، ئێمە لە قەندیل بوین، حکومەت جارێکیان هەمزەی نارد (هەمزەی باپیرئاغای پشدەری)، جارێکیشیان (شێخ مەحمودی کارێزە)ی نارد بۆ لامان، بۆ ئەوەی بزانن چیمان دەوێت و داخوازیمان چیە؟ لەوێ برادەرانی سەرکردایەتی کۆبونەوە، بە گشتی دەنگ بێجگە لە من، بڕیاریاندا کە پەیوەندی بکەن و مەبدەئی گفتوگۆ قبوڵبکەن و نامە بۆ حکومەت بنوسن، هەرچەندە من تەحەفوزم هەبو و دەمگوت دەبێ پرس بە (تەجەموعی وەتەنی عێراقی) بکەین و بەبێ ئاگاداری ئەوان نەیکەین، چونکە ئێمە ئەندامی ئەو تەجەموعەین.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ملکەچی بڕیاری زوربە بوم و نامەیەکمان بە ئیمزای من نارد، لە نامەکەدا دیسان داوای مافی کوردمان کردبوەوە، چارەی سیاسی، بەیانی ئازار و ڕاگرتنی ڕاگواستن و ئازادییە دیموکراتیەکان، ئەم نامەیەش وەک نامەکانی تر هیچ وەڵامی نەبو.

لە شاخی قەندیل، چەندین نامەی تریشمان نارد، یەکێ لەوانە نامەیەکمان نارد بۆ ئیمام خومەینی، لە نەجەف بو بەهۆی باوکی شەهید سەلمانەوە، ئەوکاتە جوڵانەوەی ئێران دەستی پێکردبو و نامەشمان نارد بۆ ئەو کەسایەتیانەی، ئەوکاتە لە ئێران ناویان هەبو، وەکو دوکتۆر کەریمی سنجابی، مەهدی بازرگان، ئایەتوڵا تاڵەقانی و خەڵکانی تریش.

لەو نامانەدا هاودەردی خۆمان دەربری بۆ ئیمام خومەینی و ئاگادارمان کردەوە، ئێمە هەمو هێزو توانای خۆمان لە بن دەستی شۆڕشی ئیرانە و چیان دەوێ دژی شا، ئێمە ئامادەین و ئامادەی هەمو جۆرە هاوکاریەکین.[1]

**پەراوێزەکان:**

* (مام جەلال، نامەی بۆ خومەینی، بەهۆی داود حسێن، باوکی شەهید سەلمانەوە نارد، لە ڕێکخراوی هەڵوی سور، تازە لە بەغدا ئیعدام کرابو، خۆی شیعە بو وە لە بەغدا دائەنیشت). (لە کەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگە، لاپەرە ٣٥٠).

# گرتنی شەهابی شێخ نوری و هاوڕێکانی

*** ئایا ئێوە ئاگاداربون کە شەهابی شێخ نوری و هاوڕێکانی دەچن بۆ ئێران؟ بۆچی لە دەرەوە هەوڵی بەرەڵاکردنیانتان نەدا؟**

– بەداخەوە ئێمە ئاگامان لە چونەکەیان بۆ ئێران و تەسلیم کرنەوەیان نەبو، ئێمە دوایی بیستمان کە گەڕاونەتەوە. ئەگەر ئێمە ئاگامان لە چونەکەیان بۆ ئێران و گیرانەکەیان بوایە، دەمان توانی شتێکیان بۆ بکەین و کارێک بکەین کە رزگاریان بکەین، چونکە شای ئێران لەو سەردەمەدا، هەوڵێکی دابو پەیوەندیەک بە ئێمەوە بکات، بۆ پاکانەکردن بۆ ئەو خیانەتەی لە ١٩٧٥ لە کورد کردبوی، دەمانتوانی ئەو هەلە بقۆزینەوە و کەڵکی لێوەرگرین و هەوڵی بەردانیان بدەین.

*** ئایا گرتنی شەهابی شێخ نوری و هاوڕێکانی هیچ کاریگەریەکی لەسەر کۆمەڵە و یەکێتی هەبو؟**

– گیرانی ئەوان وەک سەرکردایەتی کۆمەڵە بۆشاییەکی گەورەی لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا پەیداکرد، بەهۆی ئەوەوە دو تاقمی جیاواز هاتنە پێشەوە، یەکێکیان تاقمی ئیبراهیم خلیل بون کە دوایی کۆمەڵەی رەنجدەرانیان دروستکرد و ئەوەی تریان تاقمەکەی ئارام (شاسوار جەلال) بو، لەناو کۆمەڵەدا مانەوە. ئەوەی جێی داخە هەردو تاقمەکە دژی شەهابی شێخ نوری و هەڤاڵانی بون و هەریەکەیان لە لایەکەوە بۆ مەسەلەکە ئەچو.[1]

بۆچونەکانی ئیبراهیم خلیل زۆر نزیک بو لە بۆچونەکانی ئێمەوە لە دەرەوە، ئەگەر بهاتایە ئێمە پێی ڕابگەیشتینایە، دەمانتوانی بۆچونە ناڕاستەکانی بۆ ڕاست بکەینەوە و بیگێڕینەوە بۆ ڕیزی کۆمەڵە، بەڵام ئارام کە لایەکەی تری کۆمەڵەی گرتبۆوە، لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ ئەو برادەرانە هەوڵبدات و پێکبێتەوە و بە گفتوگۆ پێیان بسەلمێنێت و لەسەر بناغەی رەخنە و رەخنە لەخۆگرتن کارەکان چارەسەربکات، ئەوەبو بەشێوەیەکی تر چارەسەری کرد کە جێگای داخە ئەم

جۆرە هەڵسوکەوتانە هەبون و لەناو شۆڕشگێڕان و لەناو کەسانی تێکۆشەر و کەسانێک، خۆیان بە مارکسی لینینی دەزانی.

ئارام، نوێنەرانی ئەو ڕێکخراوانەی لە شارەکانی کەرکوک و خانەقین و سلێمانی مابونەوە، لە خۆی کۆکردەوە و دەستیکرد بەکارکردنەوە، ئارام شتێکی دروست کردبو بەناوی کۆمیتەی هەرێمەکان، لە ئازاد هەورامی و خۆی و سالار عزیز و حیکمەت حەمە کەریم کە دوایی بە (مەلا بەختیار) ناسرا.

برادەرانی هـــەولێر لەگەڵیدا نەچون و ئەوەیان قبوڵنەکرد، عەبدولڕەزاق حەمەد و ئەوان ئەوەیان قبوڵنەکرد و بۆخۆیان بەجیامانەوە، تا دوایی ئێمە کۆمانکردنەوە[٢]

*** ناکۆکی کەوتە نێوان ئارام و جەماعەتی ڕەنجدرانەوە؟**

– ئارام بەهۆی هاورێیکیەوە، دوژمنایەتی زۆری ئەو برادەرانەی کرد، بەداخەوە هەندێ لەو برادەرانە حکومەت ئیعدامیکردن، جێی داخە، ئارام هەرچەندە دەوری گرنگی هەبو لەناو کۆمەڵەدا، بەڵام سەرەتا بە ناکۆکی لەگەڵ شەهاب و هەندێ برادەری تر کارەکەی دەست پێکرد.

# ناکۆکی نێوان کۆمەڵە

*** ئایا ئارام و برادەرەکانی، هیچیان بە نوسین دژی شەهابی شێخ نوری و برادەرەکانی بڵاوکردەوە؟**

– ئارام و ئەوان راپۆرتێکیان بەناوی (راپۆرتی شوبات) بڵاوکردەوە و لەوێدا زۆر هێرشیان کردە سەر شەهاب و برادەرەکانی و راستی و واقعی ئەو کاتەیان شێواند، ناراستەوخۆ بە حکومەتیان راگەیاندوە کە ڕێکخستنێک هەیە کە شەهاب لێپرسراوێتی.

شەهاب و هاورێکانی لە دادگادا بەرگرییەکی قارەمانانەیان کرد و وتیان ئێمە کۆمەڵێکی مارکسی لینینین و ئەڵقەی رۆشنبیریمان هەبوە، ئێمە هیچ ڕێکخستنمان

نییە، حیزبمان دروستنەکردوە، بەڵام رژێم گوتی: بەڵێ ئەوە رێکخستن هەیە و ئەوە رەخنە هەیە، راپۆرتی شوباتیان وەک بەڵگە نیشان دان.

ئەو راپۆرتە ئەوەندە خراپ بو، کاتێ ئێمە لە دەرەوە گەراینەوە، لە ترسان کۆیانکردەوە و نەیانوێرا بڵاویبکەنەوە، چونکە نارەزایی هەم لەناو جەماوەر پەیدابو، هەم لای ئێمەش، چونکە دەیانزانی من و نەوشیروان و ئەو هەڤاڵانەی لە دەرەوە هاتوینەتەوە، شتی وامان لاپەسەند نییە. ئارام بەتەمای گۆرانێکی سەرەکی بو لەناو کۆمەڵەدا، راستیەکەی بەتەمای ئەوەبو، زۆر لە برادەرانی پێشو دوربخاتەوە و خۆی سەرلەنوێ لەسەر بناغەی شەخسییەتی خۆی کۆمەڵە بینابکاتەوە.[٣]

من لەبیرمە، ئارام نامەی بۆ هەندێ برادەر لە دەرەوە نوسیبو کە بچن نوێنەرایەتیان بکەن و پەیوەندی بکەن بە رێکخراوی مارکسی لینینیەوە، ئەو نەی دەزانی هەندێ لەوانە روخاون، ئەوەبو بە هەندێکیمان گوت بچنەوە بۆ کوردستان، بە بیانوی ئەوەی، ئەم شۆرشە سەرکردایەتیەکەی پرۆلیتاریا نییە و مارکس لینینی سەرکردایەتی ناکات، هەڵاتن و وازیان هێنا و بەرەو دەرەوە سەفەریانکرد، لەوێ وازیان لە یەکێتی و بیروباوەری پێشکەوتنخوازانە هێنا.

ئەو نامەیە، کەوتە دەست من و منیش بۆم نوسی کاکە ئەوانە وازیانهێناوە لە ریزی یەکێتی. لە سەرێکی کەوە، ئارام خەریکی دارشتنی جۆرێک لە تاکتیک بو، لە ناوەرۆکدا زۆر دوربو لە بۆچونەکانی یەکێتی.

بەکارهێنانی توندوتیژی بەرامبەر بەوانەی وەک ئەوان بیریان نەدەکردەوە، لای ئەو کۆمەڵە و برادەرەکانیان بوبو بە نەهج و باورێکی تەواویان پێی هەبو، واتا بوبو بە یەکێک لە مەبادیئەکان و یەکێک لە کۆڵەکەکان و ئەستونەکانی تەفکیر و رەفتاریان. هەروەها لە کۆبوونەوەیەکدا، یەکێکیان پێشنیازیکرد گوتی: "ئێمە بۆ مەسەلەی رەسوڵ مامەند و ئەوانەی کە ئیختیلافیان هەیە، ئەوە بەوە چارەسەر ناکرێ، مام جەلال دەڵێ دانیشین و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەین و تەنازولیان بۆ بکەین، بەڵکو بەوە چارەسەر دەکرێت، بانگیان بکەین بۆ دەعوەت و لەوێ سواری سەریان بین و هەمویان بگرین".

ئەو ئەقڵییەتە، بوبو بە یەکێک لەئەستوندەکانی رەشماڵی بیریان و هەروەها یەکێک لە مەبدەئەکانیان.

بێگومان ئارام شانبەشانی برادەرانی تر دەوری چاکیان نواند لەوەی، ئەو نوسینانەی من لە دەرەوە بۆم ناردن بڵاویاندەکردەوە، بۆ نمونە نامیلکەی (یەکێتی

نیشتمانی کوردستان- بۆچی؟) یان بە کوردی بڵاوکردەوە و ئامۆژگاری و زانیاریان بەو پێیەی، من بۆم ناردن بڵاویاندەکردەوە، بۆ دروستکردنی ڕێکخستنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان. پاشان دەورێکی تری هەبو لە دروستکردنی مەفرەزەکانی یەکەمی کۆمەڵە لە ناوەوەی وڵات بۆ هێزی چەکدار، بەپێی ئەو ئامۆژگاری و پێشنیازانەی ئێمە لە دەرەوە بۆمان ناردبون.

بەڕاستی، من پێموایە ئەو هەڵانەی ئارام لە ئەنجامی نا کامڵی و ئاگادارنەبون لە بارودۆخی دەرەوە و دنیا بو، ئەگەر بهاتایە لەکاتی خۆیدا و بەزویی دەستمان بگەیشتایە و پەیوەندی راستەخۆمان پێوەبکردایە، دڵنیام ئارام دەهاتەسەر خەتی راست و هەڵەکانی خۆی راستدەکردەوە و سەرکردەیەکی زۆر باشی لێدەردەچو و دەبو بە یەکێک لە سەرکردە باشەکانی شۆڕش و کۆمەڵە و یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

# باری ئاڵۆزی کۆمەڵە

*** ڕۆڵی نەوشیروان مستەفا چی بو لەو کاتانەی باسی لێوە دەکەیت کە ململانێ ناوخۆییەکان لە پەرەسەندندابون؟**

- من و نەوشیروان بڕیاری گەڕانەوەماندا بۆ وڵات، دیارە من پێشتر لەگەڵ نەوشیرواندا قسەم کردبو، نەوشیروانم دانابو بە یەکێک لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر، ئەویش قبوڵی کردبو. نەوشیروان دەورێکی چاکی بینی و ئازایانە لە ڤیەناوە هاتە شام و لەوێ دانیشت و دوایی چو بۆ قامیشلی و پێشمەرگەکانی ئەوێی سازدا و تەرتیبی کردن و مەفرەزەکانی بردەوە لەگەڵ خۆی و چوەوە وڵات.

کە منیش چومەوە، بەیەکەوە بینیمان وەزعی کۆمەڵە خراپە و لێپرسراوەکانی نەناسراون و چەند گەنجێکی وەک ئازاد هەورامی و مەلا بەختیار و سالار بون، بەرامبەر بەوان بزوتنەوەی سۆسیالیستی هەبو، کە پیاوانی وەکو عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید کە لە کۆنەوە ناسراوبون، لێپرسراوەکانی پێشوی شۆڕشیش، وەک سەعدی گچکە و سەید کاکە و تایەری عەلی والی و کۆمەڵێ لەو

خەڵکانەیان کۆکردبۆوە.

لەناوخەڵک دا ئەو برادەرانەی کۆمەڵە هیچ نمونەیەکیان نەئەبینرا و هیچ پریستیژێکی ئەوتۆیان نەبو، لەبەرئەوە من و نەوشیروان نەخشەمان دانا کە ئەو بگەڕێتەوە ناویان و لەگەڵیاندا ئیش بکات و منیش چەند بکرێت هاوکاریان بکەم و یارمەتی و پشتگیریان لێبکەم، بۆئەوەی پەرەبسێنن. بۆئەوەش نەخشەیەکمان دانا، نەخشەکە ئەوەبو کەوا نەوشیروان لەگەڵیاندا ئیش بکات و هەندێ لەو برادەرانەی کە لەدەرەوە هاتبونەوە دەور و ناویان هەبو، بەئاشکرا، یان بە دزی، ئیش بکەن، وەکو د.کەمال خۆشناو و هەندێ لە برادەرانی تر، کرابون بە کۆمەڵە، وەکو سەید کەریم.

ئەوانە هاتنە مەیدان و پشتیوانیان لێکردین، بەڕاستی هەمو ئەوانەی کە چوبوینەوە وڵات هەمومان پشتیوانیمان لە کۆمەڵە دەکرد، بۆئەوەی:

یەکەم: پەرەبسێنێتەوە

دوەم: هەوڵ بدەین ئامۆژگاریان بکەین.

سێیەم: نامە بنوسین بۆ ئەو کەسانەی، دەماننناسین لە شارەکان بۆئەوەی هاوکاری رێکخستنەکانمان بکەن.

چوارەم: هەوڵ بدەین ئەوانەی، پچڕاون کۆیان کەینەوە.

پێنجەم : هەوڵ بدەین زو ئارام و برادەران ببینین و لەگەڵیاندا رێکبکەوین و پێکبێین و هاوکاریان بکەین.

هەروەها هانی ئەو کادێرانە بدەین کە ئیشیان نەدرابویە، وەکو بەکری حاجی سەفەرو هەندێ برادەری تر، ئەوانەش بخەینەگەڕ کە هەریەکە لە ناوچەی خۆی و لە شوێنی خۆی و لە شاری خۆیدا ئیشی خۆی بکات. بەداخەوە برادەرێ لەو برادەرانە دەوری باشی نەبینی و نەی هێشت ئارام بگاتە لامان.

بڕیاربو ئارام بێت بۆلای سەرکردایەتی بۆ سێ سنوورەکە، ئەو هاتبو گوتبوی تا من نەچم تۆ مەیە کە هاتبو جاسوسێک هەبو، مامۆستابو، کەوتبوە ناویانەوە، ئەوی بە رێگادا بە ئۆتۆمبیل ناردبو، نامەیەکیشی پێدابو پرپشی کردبو لە هەواڵی خراپ دژی ئێمە و بە ئارامی گوتبو: ئەمانە دژی کۆمەڵەن چونکە خۆی لەگەڵ من و نەوشیرواندا ناکۆک بو، لەسەر مەسەلەی سەرکردایەتی، لەسەرئەوەی ئەو دەیویست ببێتە سەرکردەی گشتی شۆڕش، کاک نەوشیروانیش پێی گوت، "کاکە تۆ نە تەجروبەت هەیە و نە شەڕت کردوە و نە شەڕی پێشمەرگەییت دیوە، ماوەیەک بمێنەوە تا فێردەبیت، ئینجا دەتوانی ئەو دەورە ببینیت".

بەڕاستی بۆ مێژوی کورد و بۆ مێژوی کۆمەڵە، پێموایە ئەو ناراستگۆییەی ئەو برادەرە و ئەو ڕۆڵە سلبییەی هەندێکیان دەیانبینی، دەورێکی زۆری هەبو لە بە کوشتدانی ئارام، لەوەی ئەو لەو ناوچەیە بە تەنها مایەوە، بێ ئەوەی هێزی لەگەڵدابێت، هەروەها بێ باکی خۆی و چاک خۆنەشاردنەوەی بونەهۆی شەهیدکردنی.[٤]

# شەهیدبونی ئارام

*** شەهیدبونی ئارام، چ کاریگەریەکی هەبو لەسەر کۆمەڵە؟**

- بێگومان شەهیدبونی ئارام، بەڕاستی خەسارەتێک بو، چونکە ئەو سەردەمە کادرێکی وەکو ئەومان زۆر پێویستبو، هەم بۆ نوسین زۆر باشبو، هەم لە کاری ڕێکخستن و پێشمەرگانەدا دەیتوانی دەوری چاک و کاریگەر ببینێت، لەبەرئەوە شەهیدبونی بە زیانێکی گەورە دانرا. هەرچەندە بەداخەوە ئارام هەڵوێستی بەرامبەر شەهاب و هاوڕێیانی باش نەبو، خەڵکی بەو گیانە پەروەردەکردبو کە پێشتر باسمکرد، تەنانەت کەم تەرخەمبون لە دەرکردنی بەیانێک بۆ شەهیدکردنی شەهاب و هاوڕێیانی، لەژێر فشاری عەلی عەسکەری و لەژێر زەختی ئەو حەملەیەی کە ئێمە لە دەرەوە کردمان، ئەمجا بەیانێکیان بەناوی یەکێتیەوە دەرکرد.

کاتێ شەهاب و هاورێکانی گیران، ئێمە لە دەرەوە حەملەیەکی گەورەمان بۆ ڕزگارکردنیانکرد، لە دنیا هەزاران هەزار تەوقیع و لە چەندەها ئەندامی پەرلەمان و سیاسەتمدار ئیمزامان کۆکردەوە بۆ بەردانیان، تەنانەت لە ڕێکخراوە مافپەروەرەکانی دنیا و ڕێکخراوی پارێزگاری لە مافی مرۆڤ و ئەمنستی، شەهاب کرا بە زیندانیی ساڵ و ناوی بڵاوکرایەوە.

خەڵکی لەهەمو لایەکی دونیاوە بروسکە و نامە و کارتی نارەزاییان دەنارد بۆ حکومەتی عێراق، بەڵام سەدام حسێن کە قەت گوێی نەداوەتە رای گشتی دونیا و مافی مرۆڤ و دیموکراسی، هەمو ئەو داخوازیانەی خستە ژێرپێی و لەئەنجامدا تاوانی ئەوانەشی خستە سەر تاوانە زۆرەکانی تری خۆی.

*** ئایا ئێوە توانیتان دوای شەهیدبونی ئارام، ئەو بۆشاییەی بەجێی هێشتبو پڕی بکەنەوە؟**

- بە شەهیدبونی ئارام، ناوەندی کۆمەڵە هەڵتەکایەوە، بۆیە برادەرانی کۆمەڵە ناچاربون کە کۆبونەوەیەک بکەن بۆ دامەزراندنی کۆمیتەیەکی سەرکردایەتی.

کۆبوونەوەکە، لە شێنێ کرا کە ٢٧ کادێری کۆمەڵە تێیدا بەشداربون، لەو کۆبوونەوەیەدا نەوشیروان لەگەڵ چەند برادەرێکی تردا هەڵبژێران بۆ سەرکردایەتی. نەوشیروان، هەوڵیدا ئازاد هەورامی و مەلا بەختیار و چەند برادەرێکی تر لەوان دەرچن، دەنا دەرنەئەچون، هەروەها چەند برادەرێکی دیکەی هێنایە پێشەوە. بۆ مێژو دەیڵێم نەوشیروان پێیداگرت، گوتی "ئەبێ سالار عزیزیش هەڵ بژێردرێت، چونکە لێرە نییە، ئەگەر ویستیشتان لای بەرن، ئەوکاتە کە هاتەوە بۆناوتان ئەتوانن لای بەرن"، نەوشیروان سوربو لەسەر هەڵبژاردنی، کە هەم لەسەرکردایەتی یەکێتیش و هەم لە سەرکردایەتی کۆمەڵەدا بمێنێتەوە.(٥)

لەو کاتانەدا، پەیوەندیەکانمان لەگەڵ خەڵکی شارەکاندا بەری خۆی گرتبو، نامە نوسینی من بۆ عەبدولڕەزاق و برادەرانی ناوچەی هەولێر بەرهەمی خۆی هەبو، ئەوان لەگەڵ چەند برادەرێک هاتنە دەرەوە، ئەوانە کۆمەڵێکی باشبون لە کادێری شایستە و بە تەجروبە، ئەوەبو کە گەڕانەوە بۆناو ریزەکانی کۆمەڵە و دەستیانکردەوە بە ئیشکردن.

نەوشیروان، نامەی نوسی بۆ دکتۆر خەسرەو خاڵ و عومەر فەتاح و مەحمودی مەلاعززەت و حەمە چاوشین و کۆمەڵێک برادەری تر، لە سلێمانی بون، بۆئەوەی ئەوانیش بکەونە خۆیان، ئەوەبو هەریەکە خەتی باشی دروستکرد و رێکخستنی کۆمەڵە پەرەی سەند و وردە وردە کۆمەڵە ئەندام و دۆستی زیادیکرد. پێم وانیە لە سەرەتادا کۆمەڵە لەهەمو کوردستاندا چەند سەد ئەندامێکی هەبوبێ، بەڵام پاشان گەشەیکرد و سەدان و هەزاران ئەندام و لایەنگیر و خەڵک لە دەوری کۆبونەوە و کۆمەڵە بو بەهێزێکی گەورە و کاریگەری کوردستان.(٦)

*** هۆی گەشەکردن و بەرەو پێشەوە چونی خێرای کۆمەڵە چی بو؟**

- من پێموایە ئەو گەشەکردنەی کۆمەڵە ناگەرێتەوە تەنها بۆ یارمەتی و هاوکاری من و نەوشیروان، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو رێبازە راستەش کە بۆمان دارشتبو، رێبازی ئیشکردن بو لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان و لەناو کۆمەلانی خەڵکی کوردستان و رێبازی هەڵگرتنی دروشمی رزگاری نیشتمانی و دیموکراتی و چونە

ناو كۆمەڵانی خەڵک و هەڵگرتنی ئاڵای خەباتی نیشتمانی و دیموکراتی و شۆرشی نیشتمانی و دیموکراتی بو.

هەروەها ناودەرکردنی کۆمەڵەش دەگەڕێتەوە، بۆ ئەو چالاکی و فیداکاریەی پێشمەرگە و سەرکردە و کادێرەکانی، بە تایبەتی ئەو رۆڵە کاریگەریەی، لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا نواندیان و بۆ ئەو دەور و چالاکی و فیداکاری و قارەمانیانەی، لە شارەکاندا نواندیان. بەتایبەتی سەرکردە و کادێر و ئەندامەکانیان کە لە زینداندا قارەمانانە بەرگریان دەکرد و زۆر پاڵەوانانە چونە بەر پەتی سێدارە. ئەمانە هەمویان بەڕاستی دەورێکی زۆریان هەبو، لە جۆشدانی خەباتی کۆمەڵە و پەرەپێدانی ریزەکانیدا.

بۆ نمونە جەماله رەش بۆ یەکەمجار لە مێژودا، لە بەرامبەر ئیعدامدا هوتافی کێشابو بە ژیانی مارکسیزم و لینینیزم و بیروباوەڕی ماوتسی تۆنگ و ژیانی کۆمەڵە و بژی کۆمەڵە و بژی یەکێتی نیشتمانی و بژی مام جەلال و ئەوانە، من دوایی ئەو رستەیەم سڕییەوە لە وەسیەتەکەی کە پەیوەندی بە منەوە هەبو، نەمانهێشت بڵاوبکرێتەوە، چونکە بڕیارمان دابو، تەمجیدی ئەفراد نەهێڵین لەناو ریزەکانی یەکێتیدا، بەڵکو تەنها تەمجیدی شەهیدان بکەین.

ئەو کار و فیداکاری و خۆبەختکردنەی ئەوانە پەرەی سەند و دەنگی دایەوە بەتایبەتی جەماله رەش رای سپاردبو کە دەبێ دایک و خوشک و کەسوکاری جلی سور لەبەربکەن و ئینجا بچنە سەر گۆرەکەی، نەک بە جلی رەشەوە. بەڕاستی ئەو هەڵوێستانە زۆر دەنگی دایەوە و کاریگەریەکی زۆری هەبو، لەسەر گەشەپێدان و پەرەپێدانی کۆمەڵە لە ناوچەی سلێمانی.

جگە لەوە، سیاسەتی راست و رەوان و ئەو رێبازە راستەی کۆمەڵە لەناو شۆڕش و لەناو یەکێتی و لەناو جەماوەردا دەوری گرنگی هەبو. بەڕاستی کوڕە باشەکانیش لە هەمو لایەکەوە رویانکردە کۆمەڵە، ئەوەش رۆڵێکی باشی هەبو لە پەرەپێدانی کۆمەڵەدا.

نەوشیروان، دەورێکی زۆر باشی نواند لە دارشتنی رێبازی راست و تەکتیکی ئاقڵانە و ژیرانە بۆ کۆمەڵە و بۆ پەیوەندیکردن بە شارەکان و گەشەپێدانی رێکخستنەکان.

ئەگەر چاوێک بخشێنین بە کاتی پێش گەڕانەوەی من و نەوشیروان بۆ وڵات، لەگەڵ دوای گەڕانەوەمان، تەماشا دەکەین، لە پێش ئێمەدا، لە سەرتاسەری کوردستاندا باوەڕ ناکەم سەد ئەندامی کۆمەڵە هەبوبێت لەناو شۆڕشدا، هیچ

دەورێکی دیاریان نەبو لەناو شۆڕشدا. ڕاستە سێ چوار مەفرەزەی یەکەمیان دروست کردبو، ئەو مەفرەزانە دەورێکی باشیان هەبو، بۆ هوشیارکردنەوە، بەڵام مەفرەزەکان ڕۆڵێکی وەرچەرخانیان نەبینی، بەڵام پاش ئەوە، بە چەند ساڵێک ئەندامانی کۆمەڵەبون بە هەزاران ئەندام و هەزاران پێشمەرگەش لە دەوری کۆبۆوە و بەشی زۆری هێزی پێشمەرگە، لەژێر تەئسیر و دەسەڵات و بیروباوەڕی کۆمەڵەدابون و کۆمەڵە بو بە هێزی سەرەکی لەناو یەکێتی و لەناو شۆڕشدا.

# جیابونەوەی ئاڵای شۆڕش (ئاش)

*** لەکاتی ئەو گەشەکردنەدا، هەندێ سەرکردە و کۆمەڵێک کادێر بە سەرۆکایەتی مەلا بەختیار، جیابونەوە، هۆی ئەمە چی بو؟ ئایا کاریگەری ئەو جیابونەوەیە چی بو لەسەر یەکێتی بە گشتی و کۆمەڵە بە تایبەتی؟**

– بەداخەوە، لەناو کۆمەڵەدا تاقمێک پەیدابوبون مەغروربون بەو سەرکەوتنانە و بەو مەرکەزانەی کە درابویانێ، هەیان بو خەویشی بەوەوە نەدەدیت، کە زو بگاتە ئەو پایە و پلەیە و ئەو هەمو مەرکەز و دەسەڵاتەی هەبێت، بەڵام لە جیاتی ئەوەی وای لێبکات، پتر دڵسۆزبێت بۆ ئەو دارەی لەسەری ڕاوەستا بو، بەرزی کردبۆوە، بریتی بو لە کۆمەڵە و شۆڕش و یەکێتی.

ئەوانە زۆر زو خۆیان لێگۆڕا، وایان زانی بو کە ئەو گەشەکردنە لە قارەمانی و لە زیرەکی و لە بلیمەتی ئەوانەوەیە، ئەو بیرکردنەوەیە بە هەڵەیدابردن و کەوتنە دروستکردنی تەکەتولێک لەناو کۆمەڵەدا بەناوی تەکەتولی ئارامەوە. ئەوەی ڕاست بێت، ئارامیانکردبو بە کراسەکەی عوسمان، ئەگینا لەڕاستیدا ئەوان هیچ فریان بەسەر ڕەوشت و بیروباوەری ئارامەوە نەبو.

جارێکیان لە کۆبوونەوەیەک و لەبەرچاوی خەڵک، باسی کاروباری عەسکەری کرابو، ئارام قسەی کردبو، یەکێکیان گوتبوی: "کاک ئارام تۆ بێدەنگ بە، تۆ لە کاروباری عەسکەری نازانی، ئەو مەسەلەیە لێگەڕێ بۆ ئێمە"، ئەویش وەڵامی دابۆوە و گوتبوی: "کاکە تۆ کام ئەکادیمیەی عەسکەریت تەواوکردوە؟ لەو دو

سێ هەفتەیەی لێکدابڕاین، تەجروبەی کام شەڕ، کام پێکدادانت بینیوە؟ کوێڕا تۆ بوی بە پسپۆڕی شەڕی پارتیزانی"؟

وەک گوتم، ئەوان ئارامیان کرد بە کراسەکەی عوسمان، ئەوە جگە لە روی شەخسییەتەوە، هەتا لە روی مەبدەئیشەوە لەکاتێکدا ئارام پیاوێکی کوردستانی بو، ئەوان وردە وردە بەرەو عێراقچێتی رۆیشتن.

ئارام لایەنگری ئەوەبو، یەکێتی نیشتمانی کوردستان گەشە بکات و پەرەی پێبدرێت و کۆمەڵە لەناویا دەوری خۆی ببینێت، بەڵام ئەوان لایەنگری پارچە پارچە کردن و لاوازکردنی یەکێتی بون. ئارام حیزبی شیوعی عێراقی بە تەحریفی دەزانی، بەڵام کادێرە دیارەکانیان زۆر لە حیزبی شیوعی عێراقی نزیک بون و تا بەتەواوی ئاخیرەکەی، کەوتەنە بن باڵیان و ژێر تەئسیریان.

ئارام، زۆر دژی سەرکردایەتی بارزانی وماڵی بارزانی بو، و ڕەئی زۆر توند و تیژی خۆی نووسیوە لەسەریان، کەچی ئەمان ئاخری پەنایان بردەبەر ماڵی بەرزانی بۆ دژایەتی کۆمەڵە و یەکێتی نیشتمانی کوردستان. هەروەها بەراستی لەناو یەکێتیشدا ئەم برادەرانە دەورێکی خراپیان هەبو لە تۆراندنی رەسول مامەند و دەرپەڕاندنیدا، هەروەها بەشی خۆیان دەستیان هەبو لەنانەوەی ئاژاوە و لە عاجزکردنی کادێرەکان و دەستیان لە بەربەرەکانی کردنی هەندێک لە کادێرەکانی کۆمەڵەدا هەبو، بەتایبەتی مەوقیفێکی خراپیان هەبو لە مەسەلەی ئەو برادەرانەی لە سجن لە عەفوی ١٩٧٩دا بەربون، بریتی بون لە: فەرەیدون، دارۆ، ئەرسەلان، جەبار فرمان، عومەر سید عەلی، ئەنوەر حەسەن، عەلی بچکۆل و کۆمەڵێک برادەری گەنجی تر کە هەمو پیاوی تێکۆشەربون.[٧]

پێش ئەوەی کە بێنە دەرێ، وتارێکیان لە گۆڤاری کۆمەڵەدا دژ بە برادەرانی (سجن) نوسی و هەموی هێرش و پەلاماردان بو دژیان، تەنانەت برادەرانی سجن ترسابون، وایان دەزانی، ئێمەش پشتگیریان ئەکەین لەو نوسینەیان لە گۆڤاری کۆمەڵە و بەتەمابوون بگەڕێنەوە، بەڵام کە هاتن تێمانگەیاندن، ئێمە بۆچونمان وانیە، ئیتر وەزعەکە گۆڕا.[٨]

# گەشەکردنی کۆمەڵە و کێشەی (ئاش)

*** کۆمەڵە چۆن لە ناوەوە گەشەیکرد، بە تایبەتی لە بواری پێشمەرگایەتیدا؟**

– دوای کۆنفرانسی نۆکان، کۆمەڵە سەرکردایەتیەکی ناوەندی نوێی دانا و نەوشیروان بو بە لێپرسراوی ئەو ناوەندە و بەڕێوەبەری کارەکان و کەوتنە دەرکردنی گۆڤاری ناوخۆ و تەعەلیمات و پەیوەندیکردن بە خەڵکەوە و کۆکردنەوەی ئەندامان و ڕێکخستنەوە و دڵدانەوەی کادیرەکان و پێشخستنیان.[٩]

لەئەنجام دا هەرچەندە ئێمە شکستی هەکاریمان بەسەرداهات، بەڵام توانرا لەناو شارەکاندا ڕێکخراوی زۆر چاک دروستبکرێت و گەشەی پێبدرێت، لە پاشاندا بریاردرا ئۆرگانێکی تایبەتیش بۆ کۆمەڵە دەربکرێ بەناوی (کۆمەڵە) وە، هەروەها بە بۆنە تایبەتیەکانەوە بڵاوکراوە و پۆستەرات دەربکرێت.

ئەم چالاکیانە لە ١٩٧٧ وە دەستی پێکرد تا ساڵی ١٩٧٩، پێشتر وردە وردە چالاکی هەمەجۆر کرابو، بەڵام لەساڵی ١٩٧٩ کۆنفرانسێکی تری کۆمەڵە بەسترا لە گوندی (شێنێ)، لەوێ دیسان سەرکردایەتیەکی نوێ هەڵبژێردرا، ئەو جارەش هەندێ لەوان دەرنەچون، بەڵام نەوشیروان سوربو لەسەرئەوەی، کە دەبێت هەڵبژێررێنەوە بۆئەوەی کۆیانکاتەوە. (کۆبونەوەی شێنێ لە ٣ – ١٩٧٨/١١/٢٦ خایاند)

لەدوای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئێران، ئیتر کۆمەڵەش زیاتر هاتە ڕو، ئەوەبو ئەو برادەرانە کەوتنە پیلانگێری و دژایەتیکردنی نەوشیروان و ئەو ڕێبازەی کە نەوشیروان نوێنەرایەتی دەکرد، بەراستی لەناو یەکێتیشدا هەندێکیان دژایەتی منیشیان دەکرد و لە منیشەوە دژایەتی یەکێتییان دەکرد و هەوڵیاندەدا پاش دەرپەراندنی جەماعەتی ڕەسول مامەند، چی ماوە لەناو شۆڕشگێراندا، واتا لە باڵەکەی تری بزوتنەوەی سۆسیالیستی، دەریان پەڕێنن و دوریان بخەنەوە.

دوای ئەوەی جەماعەتی سجن هاتنە دەرێ، ئەوانیش کۆمەڵەیان دەوڵەمەندکرد و گەشەیانپێدا و زیادیانکرد، هەندێک لەو برادەرانەی ناو سجنیش هەڵبژێران بۆ

ناوەندی کۆمەڵە، نەوشیروان سکرتێری بو. نەوشیروان پشتیوانی لە برادەرانی سجن دەکرد و رێزی دەگرتن، سەبارەت بەوەی کە بۆچونیان راست و کەسانی تێکۆشەربون.

* کێ بون ئەوانەی لەو برادەرانە کۆبونەوە؟

– تەکەتولەکەی ئەوان لە خەڵکانێک پێکهاتبون کە هیچ بنەمایەکی فیکری و تیۆریان نەبو، سیاسەتێکی نا مەبدەئیان گرتەبەر لە کۆکردنەوەی هەمو نارازییەکان. هەر کەسێک لەبەر هەر هۆیەک دەتۆرا، ئەوان لە خۆیانیان کۆدەکردەوە. خەڵکانی نارەزا و پرتە و بۆڵەکەر و وەڕس، زوربەی جەماوەرەکەیان بون. ئەوانە بە ئاشکرا دەیانویست دەست بەسەر کۆمەڵەدا بگرن و نەوشیروان لابەرن و لەرێی دەست بەسەراگرتنی کۆمەڵەشەوە , دەست بەسەر یەکێتیشدا بگرن.

ئەوەندەی پێیان بکرایە، دژایەتی منیشیان دەکرد، بەڵام دوای کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە مەسەلەکان یەکالابوەوە و ناکۆکیەکان کەمبونەوە.

ئەوان لە گرتنەکەی نەوشیرواندا لەلایەن جەماعەتی حیزبی سوسیالیستەوە، ویستیان سودوەرگرن و کەوتنە ئیستیفزازکردنی جەماعەتی سوسیالیست. وایان دەویست بەشکو نەوشیروان بکوژرێت، تەنانەت یەکێکیان گوتبوی، تازە نەوشیروان رۆیشت و دەکوژرێت.[١٠]

بەراستی، هەمو رەفتاریان وادەکرد کە ئیستیفزازی حسک بکەن و ئەوان نەوشیروان بکوژن و لێی رزگاربن، بەڵام لەئەنجامدا، لە فرسەتێکدا نەوشیروان هەڵات و رزگاری بو و گەرایەوە ناومان.

بەرامبەر بەو رەفتارەی ئەوان، برادەرانی تر، بە تایبەتی برادەرانی شۆرشگێران، وەک عومەر دەبابە و شێخ دارای حەفید و جەمال حەکیم و عومەر شێخ موس و عەلی حەوێز و کۆمەڵێک برادەری تر، زۆر بە پەرۆشەوە هەوڵی رزگارکردنی کاک نەوشیروانیان ئەدا.

دوای ئازادبونی نەوشیروان، کۆنفرانسی کۆمەڵە گیرا، کادێرێکی دیاریان روخابو، چونکە برایەکی هەبو گیرا و ئیعترافی لەسەر خەڵک کرد و خەڵکی بە کوشتندا، خۆشی کوژرایەوە. ئەوەبو کە هەواڵی کوژرانی براکەی بۆهات، بەتەواوی روخا و دەگریا و شین و شەپۆڕی دەکرد، هەرچەندە من پێمگوت ئەوە عەیبە بۆ تۆ، بە فەرمانی ئێمەی سەرکردە، دەیان کەس و سەدان کەس لە

شۆڕشدا شەهیدبون، پێویستە هەرچی بێت بە برای خۆمانی بزانین، گرنگ ئەوەیە کە ئێمە ورەمان بەرزبێت.

*** ئایا کۆنفرانسی کۆمەڵە توانی گیروگرفتەکانی ناوخۆیان چارەسەر بکات؟**

- ناکۆکی ئەوان لەگەڵ نەوشیروان، لە کۆنفرانسدا ئاشکراتربو، ئەوان هەڵنەبژێرانەوە، تەنها مەلا بەختیار نەبێت، ئەویش بە کەمایەتیەکی کەم دەرچوەوە، ئەوانی تر هیچیان دەرنەچونەوە. نەک خۆیان دەرنەچون، بەڵکو ئەوەی لەسەر ئەوانیش حسێب بون.

هەڵنەبژاردنیان پێوە دیاربو، زۆریان سەری خۆیان هەڵگرت و چون بۆ تاران.

سەرەرای ئەوەی کە ئەوان لە کۆنفرانسدا هەڵنەبژێرانەوە، ئێمە ئیشمان لێ نەسەندنەوە.

بەڵام ئەوانە هەستیانکردبو کە زۆر زەرەرمەندبون و خەڵکی دەنگی بۆ نەداون و زانیان ئەو هێزەنین کە خۆیان پێیەوەی دەنازین، بەڵام دیسانیش هەر لەسەر رەوشتی خۆیان بەردەوامبون و درێژەیان بە تەکەتولاتی خۆیاندا.(١١)

*** ناوەرۆکی ناکۆکی ئەو برادەرانەی ئاش لەگەڵ کۆمەڵە بە تایبەتی و یەکێتی بە گشتی لەسەر چی بون؟**

- هەندێ سەرکردەیان چەند گۆڕانێکی سەرەکیان بەسەر بیرو باوەریاندا هاتبو، بە جەوهەری ناکۆکیەکان دائەنرا، ئەویش لەداخی ئەوەی ئەوانە لە یەکێتیدا رۆڵی گرنگیان نەماوە و لەناو کۆمەڵە و لە شۆرشدا دەوریان کزبوبو.

گۆڕینە گرنگەکانی کە بەسەر فکری هەندێکیاندا هاتبو ئەوە، بو بە هەڵگری بیروباوەریی ئەوەی شۆرش هەڵەیە و ئەو قۆناغە تەواوبوە و زەمانی شۆرشی چەکداری نەماوە و زەمانی شۆرشی لادێ نەماوە، ئێستا زەمانی ئەوەیە ئێمە بچینەوە ناوشارەکان و لە شارەکاندا خۆمان سازبدەین و کرێکاران رێکخەین بۆ راپەرینی چەکداری.

ناوەرۆکی بۆچونەکانیان بریتی بون لە عێراقچێتی، کەوا ئێمە پێویستە حیزبێکی عێراقی دروستکەینەوە، یان لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی عێراقدا پێکبێین، هەرچی بۆ یەکێتی خراپ بوایە و دژی یەکێتی بوایە ئەوەیان پێباشبو، بەشێوەیەکی زۆر نادۆستانە کاریان دەکرد. لە رودا خۆیان بە دۆست و برادەر و هاوبیر نیشان ئەدا، لەبنەوەش هەرچیان پێدەکرا دەیانکرد.

لە کاتی گفتوگۆ دا[١٢] برادەرێکیان داوای چونە دەرەوەی کرد و زۆر پاکانەی بۆخۆی کرد و خۆی نیشان دا کە زۆر دۆست و دڵسۆزە، گوتی: "ئەگەر گفتوگۆ سەرکەوت، ئەوە دێمەوە بۆ خۆم کەسابەت دەکەم، چونکە تاقەتی سیاسەتم نەماوە، ئەگەر سەرنەکەوت، ئەوە لە دەرەوەم هەر ئیشێکم پێ دەسپێرن و هەر کارێکم بەرەو ڕو دەکەنەوە، ئەوا دەیکەم و برا بچوکم و دڵسۆزم".

شەوێک لەماڵی ئێمە بە ئامادەبوونی ئازاد هەورامی و هێرۆ، ئەوەندە مەدح و سەنای منی کرد، بەراستی کە چوە دەرێ هێرۆ سەری سورما و گوتی: ئەوە چیە ئەو پیاوە!، گوتم وەڵا ئەوەشی ناراستە و هیچ ئەسڵی نیە.

پاشان کە گەیشتە دەرەوەی وڵات، هەڵوێستی باش نەبو، لەو پەیوەندیانەی کاتی خۆی بە ناوی یەکێتی دروستی کردبو کە نێررا بۆ دەرەوە وەکو نوێنەرێکی یەکێتی کەوتە دژایەتی یەکێتی.

هەوڵی ئەوەیدا، پەیوەندی دروست بکات و یارمەتی کۆبکاتەوە بۆئەوەی شەڕی یەکێتی پێبکات، حیزبی شیوعیش کەوتە بن کلێشەی و بەهۆی مەلا ئەحمەدی بانی خێڵانی و عەزیز محەمەد و کەریم ئەحمەد و ئەوانەی لە شام بون، هانیان دابو ئەو دەتوانێت دەورببینێت و دژی یەکێتی بوەستێت، ئەویش وای نیشاندابو دەتوانێت دەورێکی زۆر گەورە و زۆر گرنگ ببینێت لە دژی یەکێتی.

وای نیشاندابو، ئەو هێزێکی زۆری هەیە و برادەرەکانی تری پەیوەندیان هەیە لەگەڵیدا، توانایەکی زۆریان هەیە و زۆر پەرەیان سەندوە و ڕێکخراوێکی نوێیان دروستکردوە دوایی بەناوی (ئاڵای شۆرش)- ئاش-ەوە هاتەکایەوە.

*** ئەم خۆ بە گەورە زانینەی ئەم گروپە، لە کوێوە سەرچاوەی گرتبو؟**

- ئەوان، پێیانوابو بەشی زۆری پێشمەرگە و زوربەی کۆمەڵەیان لەگەڵدایە، حساباتیان لەوەدا لێتێکچوبو، وایاندەزانی پاش سەرنەکەوتنی گفتوگۆ لەگەڵ میری و پاش شەڕ هەڵگیرسانەوە، ئێمە شەڕمان پێ ناکرێتەوە و ئەوەش ئاشبەتاڵی ئێمەیە.

کە شەڕ هەڵگیرسایەوە، هەندێکیان هەڵیان قۆستەوە و هاتنە ئێران و بە پێچەوانەی ئەو قسانەی دەیانکرد و لە دەرەوە نامیلکەیەکیان دژی ئێمە دەرکرد بو بەناوی (لم يعد الصمت ممكنا) و هەرچی دەشێ و ناشێ بە ئێمەیان کردبو، بوختان و درۆ و دەلەسەیان دژی ئێمە بڵاوکردبۆوە.

درۆکانیان بەشێوەیەکی شاخدار بڵاودەکردەوە، بۆ نمونە، من پیاوێکی

ئیسرائیلیم بینیوە زۆر لە ڕاستیەوە دوربو، ئەوە لە کاتێکدا بڵاویاندەکردەوە کە ئێرانییەکان هاتبون بۆلای ئێمە، بەڵام خۆیان چونەوە ئێران و لەوێوە لەگەڵ ئیتیلاعاتی ئێران هەوڵیاندا لە دژی ئێمە کاربکەن و لەگەڵ جود و پارتیش هەوڵیاندا، دژمان کاربکەن.

*** ڕۆڵی ئەوانەی ناو کوردستان و دەرەوە چی بون؟ ئایا هاوکاری یەکتریان دەرکرد، یان پەیوەندیان لەگەڵ یەکتر هەبو؟**

– ئەوان، لە پەیوەندیدابون لەگەڵ یەکتر، هەندێکیان لە ئەوروپاوە هاتنە ئێران، نامەیان بۆ ئەوانەی کوردستان نوسی، ئەوانیش هاتنە لای من و ئاگاداریان کردم، ئایا پێمباشە بچن بۆلایان، وایان نیشاندا ئەچن ئامۆژگاریان دەکەن، بەڵام لە جیاتی ئامۆژگاری ئەوان بکەن، هەڵسان بەیەکەوە پیلانیان دژی ئێمە گێڕا.

لەپاشان هەندێک نامەی ئەوان کەوتە دەستمان، وا دیاربو زۆر بێ عەقڵانە بیریان کردبۆوە کە زوربەی پێشمەرگەیان لەگەڵدایە، بەو عەقڵیەتە هەندێک خەڵکیان لە دەرەوە لەخۆ کۆکردبۆوە.

ئەوە بو، هەندێ سەرکردەیان هەڵگەڕایەوە و جیابۆوە و پاشان گیران، دەرکەوت ئەوان جەماعەتێکی کەمن و شتێکی وا خەڵکیان لەگەڵ نەبوە، نیسبەتی کۆمەڵە کە ئەو دەمە لە ٣٠٠٠٠ ئەندامی زیاتر هەبو، ئەوان کەمتر لە ٢٠٠ کەسیان لەگەڵ بو کە نیسبەتێکی زۆر زۆر کەمبو لەچاو ژمارەی کۆمەڵەدا.

بەم جۆرە دەبینین، ئەوانە کە بەناوی ئاشەوە ئیشیان دەکرد، دوبەرەکیەکی تریان لەناو کۆمەڵەدا دروستکرد. ئەوانە ناوی (ئاڵای شۆرش) یان لە ئارام وەرگرتبو، دوایی خۆیان دانیانا بەوەدا کە هەمو ڕێبازەکانی ئارامیان گۆڕییەوە و وازیان لە هەمو ڕەوشت و ڕێبازی ئارام هێناوە، چ لە ڕوی کوردستانی بونەوە، چونکە داوای حیزبێکی عێراقیان دەکرد.

لەبەرئەوەی ئەوان دیسان نەیاندەزانی، کام جۆر مارکسیەتیان دەوێ، هەندێکیان نزیکی حیزبی شیوعی بون و هەندێکیان دەیانویست مارکسی لینینی بن، هەندێکیان لە پەیرەوی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، واتا لە پەیڕەوی مەنسوری حیکمەتەوە نزیک بون.(١٣)

ئەوانە، دو سێ کاری زۆر خراپیانکرد لە مێژوی کوردا باسدەکرێ:

یەکەم: دوبەرەکیان لە ناو کۆمەڵە و لەناو یەکێتی و شۆڕشدا دروستکرد، بە تایبەتی لە کاتێکدا کە ئێمە پێویستمان بە کۆکردنەوەی هێزەکان بو.

دووەم: بۆماوەی چەندین ساڵ لەناو ریزەکانی یەکێتی نیشتمانی، لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا، دەوری لادەر و تێکدەر و روخاندن و بێ بڕواییان لەناو خەڵکدا بڵاوکردەوە.

سێیەم: رێگەی پیلانگێڕی و دو رویی و جنێودان و لۆمەکردن و لە روەوە خۆ بەزل نیشاندانیان هێنایەکایەوە. هەندێ سەرکردەیان، دەهاتن هەزار سوێندیان بە گۆڕی ئارام و تەلاق و شەرەفی دەخوارد، تەکەتولیان نیە و کوتلەیان نیە، جگە لەوەش لەبنەوە رێکخستنیان هەبو.

نەوشیروان، ئاگای لە رێکخستنەکانیان هەبو، باسی دەکرد ئەوان راست ناکەن، پاشان لە کارە خراپەکانی کە کردیان ئەوەبو، بەهۆی هەندێ رێکخراوی بچکۆلەی شارەکانەوە دەستی حکومەتیان تێداهەبو، هەندێ پیاوی حکومەتیش کەوتبوە ناو ئەوانەوە. بەڕاستی لە وەختێکدا ویستیان دوبەرەکی لەناو یەکێتیدا دروست بکەن کە یەکێتی هێزی سەرەکی کوردستان بو وە هێزی بەرگری سەرەکی بو لە کوردستاندا.

حکومەت ویستی لەو رێگایەوە کەڵکیان لێوەگرێت بۆ تێکدانی ریزەکانی یەکێتی و شۆڕش، بەڵام ئەو پیلانە سەری نەگرت.

**٭ داخوازی سەرەکی ئەوان چی بو لە یەکێتی، هیچ داخوازیەکی فەرمیان پێشکەش بەنێوەکرد؟**

– بەڕاستی ئەوانە ویستیان بە هەمو هێز و توانایەکەوە یەکێتی لەناوبەرن، ئەو نامەیەی لێپرساوێکیان کە بۆ کەسی یەکەمیانی نوسیبو، کەوتە دەستمان، دەڵێ: "ئێمە خەباتەکەمان لەگەڵ ئەواندا یەکەمجار ئەوەیە بە سیاسی بیانشکێنین و دوایی بە سەربازی بیانشکێنین و تەفر و تونایان بکەین" و دەڵێ "ناکۆکی سەرەکی ئێمە لەگەڵ یەکێتییە، ئەگەر یەکێتی پەرەیسەند، ئەوا ئێمە روخاوین و ئەگەر یەکێتی روخا، ئەوا ئێمە سەرکەوتوین".[١٤]

پەیوەندی ئەوان لەگەڵ ئێران، وایان تبریر دەکرد کە هەمو کەس پێی باشە ئێمە لەگەڵ ئێراندا پەیوەندیمان هەبێت و بچینە لای ئێران، ئەوە دژی یەکێتیە، شانازی بەوەوە دەکات و دەڵێ ئەم هێشتوە ئێران و لیبیا و سوریا رایان لەسەر یەکێتی بگۆڕێ، دیارە ئەمە هەموی درۆ بو، چونکە قسەکانیان هیچ کاریگەریەکی لەسەر ئەوان نەبوە. هەروەها دەیانوت، "ئێمە نەمان هێشتوە یەکێتی لەگەڵ حیزبی شیوعی و پارتی و جود چاک بێتەوە".

ئەوەبو، پارتی و حیزبی شیوعیش ئەوانیان بەکارهێنا بۆئەوەی بیانکەن بەگژ یەکێتیدا، بە حساب یەکێتی پێ بێهێز و لاوازبکەن.(١٥) دواییش ئێران و لیبیا و سوریاش، ئەوانیان بۆ دەرکەوت، هیچ نین و هیچ قورسایەکیان لە کوردستاندا نیە، ئیتر وازیان لێهێنان.

هەڵەیەکی گەورەی تری ئەم کۆمەڵە ئەوەبو، ژمارەیەکی زۆر خەڵکیان کردە جاش، ئەوانەیان هان ئەدا کە شۆڕش نیە و ئەنجامی نیە و سەرکردایەتییەکەی بۆرجوازییە و حکومەت حکومەتی بۆرجوازی عەرەبە و لێرەش شۆرش بەدەست بۆرجوازیەوەیە.(١٦)

بەو شێوەیە دەیان کەسیان بە تەسلیمکردنەوەدا، وەکو عومەر عەرەب و عومەرە رەش و بابە تایەر. هەندێ لەوانە، بون بە جاسوس و بون بە جاشی حکومەت و مەفرەزەی تایبەت.(١٧)

## پەراویزەکان:

١- ئیبراهیم خەلیل و ئیبراهیم حەسەن، لە رێکخستنەکانی کۆمەڵەبون، لە سەرەتای ١٩٧٦ دا، جیابونەوە و رێکخراوێکی بچوکیان بەناوی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان دروستکرد. ئیبراهیم حەسەن، لەسەر رێگای هەڵەبجە لە خاڵێکی پشکنین شکی لێدەکەن و دەیگرن، هەر زو هەرەس دێنێت و ئیعتراف دەکات و ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی کۆمەڵە بە گرتن ئەدات و لەگەڵ هێزی رژێم ئەچێتە سەر ماڵی هەمو ئەوانەی ئیبراهیم خەلیل ئەیناسین، یان کاری سیاسی لەگەڵدا کردون. ئیبراهیم خەلیل پەیوەندی بە شۆڕشەوە دەکات و لە شەرێکدا لەگەڵ رژێم، لە نزیك هەڵەبجە شەهید دەبێت.

٢- عبدولرەزاق محەمەد، یان عبدورەزاق سێگرتکانی لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە، هاتۆتە ناو کاری سیاسی و رێکخراوەیی و لە ١٩٧١ دا پەیوەندی بە کۆمەڵەوە کردوە و دوای هەرەس، سەرپەرشتی رێکخستنی کۆمەڵەی کردوە لە هەولێر، لە راپەرینی بەهاری ١٩٩١ دا لە ئازادکردنی کەرکوك شەهیدبو.

٣- دەربارەی بەیانی شوبات کە لە شوباتی ١٩٧٦ دا نوسراوە، مەلا بەختیار دەنوسێ: (لە ناویشماندا، جگە لە شەهید ئارام، کەسی دیکەی بە توانا، ئەو کاتە نەبوو، کاری گرنگی وای پێ ئەنجام بدرێ، بۆیە ئەرکەکی پێسپێردرا، شەهید ئارام، رۆشتنی هاورێیانی بۆ ئێران بە هەڵەیەکی گەورە دەزانی. چونکە پێشتر بریاری وایان نەبووە. لەگەڵ مام جەلال لە سوریادا، کاك فەریدون و شەهید ئەنوەر، لەسەرەنەوە رێکەوتبون کە خۆیان بۆ شۆرش و چونە شاخ ئامادەبکەن...سەرکردایەتی کۆمەڵە لەبەرئەوەی نە لە کاتی هەرەسدا و نە دوای ئەوەش، باوەریان بە شۆرش بەرپاکردن نەبووە. بۆیە نە لە گەرمەی هەرەسەکەدا ئامادەی بەرگری بون و نە دوای ئەوەش) (چۆن چەپکێك و کام مێژووی کۆمەڵە؟! مەلا بەختیار - شوباتی ٢٠١٢ - ل. ٢١٥).

٤- (کوژرانی شاسوار جەلال (ئارام)، کاریگەری و رەنگدانەوەی بەسەر ئەندامان و پێشمەرگەکانی کۆمەڵە لە شار و شاخدا نەخشاند، بەو هۆیەشەوە جارێکی دیکە بۆشایی لە سەرکردایەتی کۆمەڵە دروستکردەوە، کە بە ئەندامانی دیکەی کۆمیتەی هەرێمەکان، سالار عەزیز، مەلا بەختیار و ئازاد هەوارمی پڕ نەدەکرایەوە، چونکە گەنجی تازە پێگەیشتو بوون، خاوەن ئەزموونێکی سیاسی و رێکخراوەیی و پێشمەرگایەتی وەها نەبوون و لەناو خەڵکیشدا ئەوەندە نەناسراو بوون) (رەوتی چەپ لە باشووری کوردستان. ل. ١٠٨).

٥- (گرنگترین کاری کۆبونەوەی شێنێ بریتی بو لەوەی یەك ناوەندی جێگای باوەر دروستبکات، سەرپەرشتی هەمو رێکخستنەکانی کۆمەڵە و پێشمەرگە و فەرماندەکانی بکات، یەکێتی بیر و هەڵوێست و کاریان تیدا دروست بکات... هەندێ بریاری رێکخراوەیی و سیاسی گرنگدرا. لەوانە:

- دروستکردنی ناوەندیك بۆ کۆمەڵە کە هەمو رێکخستنەکان و پێشمەرگەکانی کۆمەڵە فەرمان و ئامۆژگاری لەو وەرگرن. "تۆزگان" و بڵاوکراوەی پێویست دەر بکا.

- مانەوەی هەمو ئەوانەی ئەندامی سەرکردایەتی بون و بەهۆی خەباتی سیاسیەوە گیرا بون، لە سەرکردایەتیدا.

- دامەزراندنی سەرکردایەتی تایبەت بە رێکخستنەکانی شارەکان.

- بەهێزکردنی تەبایی و دۆستایەتی، لەگەڵ بزوتنەوە و بەهێزکردنی ریزەکانی یەکێتی.

لە ٣ تا ٢٦ تشرینی دوهەمی ١٩٧٨ خایاند). (لە کەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ.ل. ٢٥٣).

٦- (سەرەتای دەرکەوتنی ناکۆکی (نێوان ریزەکانی کۆمەڵە) لە ئەنجامی دابەشکردن و دیاریکردنی پۆستەکانی سەرکردایەتی لە دوای کۆبونەوە فراوانەکەی نۆکان هاتە ئاراوە، کاك سالار عزیز کە پێدەچوو، خۆی بە جێنشینی کاك ئارام زانیبێ، بە کەمتر لە پۆستی لێپرسراوی یەکەمی کۆمەڵە بە هیچی تر رازی نەبوو، لە کاتێکدا کارەکان بە پێچەوانەی ویستی ئەو رۆیشتبوو، لەبەرئەوە دەکەوێتە ململانێکردن و دەنگی نارەزایی خۆی بەرزدەکاتەوە. کاك نەوشیروانیش کە لە هەمویان بە تواناتر و کارامەتر بو، تێروانینی تایبەتی خۆی هەبوو، کە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ پرنسیپ و بنچینە و بنەما فیکریانەی کۆمەڵە لەسەری دامەزرابوو، نەدەگونجا، ئەو باوەری نە بەو تێزانەی کۆمەڵە هەبوو، نە بە شێوەی کار و پێکهاتەکەی)، (چەپێکێکی ژاکاو لە مێژوەکی هەڵبستراو. ل. ٧٧- موحسین عەلی ئەکبەر).

٧- کوتلەی سجن لە ئابی ١٩٧٩ بەر لێبوردنی گشتی سەدام کەوتن و لە زیندانەکانی ئەبو غرێب و موسڵ ئازاد کران و وردە وردە هاتنە ناو شۆرشەوە، لە دیارترینیان بریتی بون لە : فەریدون عەبدولقادر، دارۆی شێخ نوری، ئەرسەلان بایز، ئاوات عەبدولغەفور، عومەری سەید عەلی، عەلی بچکۆل، جەبار فەرمان، ئەنوەر حەسەن و هەندێ برادەری تر.

٨- لە کۆمەڵە ژمارە ٦ی پاییزی ١٩٧٩دا، بە ناوی باوکی ناوارە وتارێك نوسراوە، کە دەوترێت مەلا بەختیار نوسیویەتی لەژێرناوی "چەند تێبینیەك بەسەر هەندێ لایەنی خەباتی کۆمەڵەدا" لە ژمارە ٨ی کۆمەڵەدا، ناوەندی کۆمەڵە رونکردنەوەیەکی بڵاوکردۆتەوە دەربارەی ئەو وتارە، ئەوە بۆچونی نوسەرەکە خۆیەتی نەك کۆمەڵە.

٩- (کۆنفرانسی نۆکان، لە مارتی ١٩٧٨دا گیرا و نزیکی ٣٠ ئەندام بەشداری تێداکرد.، ئەم کۆبونەوەیە لە مێژوی کۆمەڵەدا بە "کۆبونەوەی کادیرانی کۆمەڵە" دەناسرێت. لێرەشدا دەتوانرێت بوترێت کۆمەڵە بەهۆی ئەو هەلومەرجەی تێدا دامەزرابوو لەگەڵ ئەو پێشهات و رووداوانەی رووبەرووی بونەوە، نەیتوانیبو لە تەمەنی رێکخراوەی خۆیدا کۆبونەوەی لەمشێوەیە ببەستێت، بۆیە ئەم کۆبونەوەیە بە یەکەمین کۆبونەوەی بەرفراوانی کادیرانی کۆمەڵە دادەنێرێت). (رەوتی چەپ لە باشووری کوردستان. ل. ١٠٩).

١٠- نەوشیروان مستەفا لە ١٩٨١/١/٥ لە گوندی قەویلە لەلایەن هێزێکی حسك دەگیرێت و لە ١٩٨١/٢/٧ دا لە ئەشکەوتی "هەزار ئەستون" هەڵدێت و رزگاردەبێت.

١١- (کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵە لە ١٩٨١/٥/٢٥دا لە گوندی مالیمۆس، بە ئامادەبونی نزیکی ١٨٥ ئەندام کە نوێنەرایەتی نزیکەی ٨ هەزار ئەندامی ڕێکخستنەکان و هێزی پێشمەرگە و کادێرەکانی دەرەوەی وڵاتیان کردوە، کۆنفرانسەکە نزیکەی دوو هەفتەی خایاند... کۆنفرانسەکە لە هەلومەرجێکێکدا بەسترا کە ململانێی ناوخۆیی لەناو کۆمەڵە، زۆر پەرەی سەندبوو. لەم سۆنگەیەوە ململانێکە رەنگدانەوەیەکی زۆری لەسەر بەرێوەچون و بریار و ئاکامەکانی کۆنفرانسەکە هەبو. بەڵام ئەم ململانێیە رەنگدانەوەی خراپی لەسەر شێوەی هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆنفرانس نەبو و لەم روەوە ،هیچ کێشەیەکی ئەوتۆ نەهاتە ئاراوە و کەس تانەی لە شێوەی هەڵبژاردنی ئەندامەکان نەداو هیچ سکاڵایەکیش تۆمارنەکرا.... بۆ سەرکردایەتیش هەریەکە لە : نەوشیروان مستەفا، کەمال خۆشناو، فەریدون عەبدولقادر، مەلا بەختیار، عومەری سەید عەلی، هەڵبژێران)، (ئینسکلۆپیدیای یەکێتی نیشتیمانی کوردستان. چاپی دووەم. ٢٠١٤ .ل.٦٢٢).

١٢- مەبەست گفتوگۆ بو لەگەڵ رژێمی بەغداد لە کۆتایی ١٩٨٣دا.

١٣- مەنسوری حیکمەت، کە ناوە راستیەکەی زوبین رازانی و لە تاران لە ساڵی ١٩٥١ لە دایك بوە و لە ١٩٨٣ یەکێك بوە لەوانەی حیزبی شیوعی ئێرانیان دروستکردوە و دوایی جیابۆتەوەو حیزبی شیوعی کرێکارانی دروستکردوە و لە ٤ تەموزی ٢٠٠٢ کۆچی دوایی کردوە، هەوادارەکانی زیاتر لە دەرەوەی ئێران بونیان هەیە.

١٤- دوای کۆنفرانسی کۆمەڵە، مەلا بەختیار و هاورێکانی لە کۆبونەوەیەکدا بریارنەدەن: (پەیوەندی ناو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بە ئاستێك گەیشتووە، بە ئاسانی ناتوانرێت چارەسەر بکرێت، چونکە ئەو بریار و بەرنامەییەی لە کۆنفرانس پەسەندکراون، وایان کردووە کۆمەڵە لە خەسڵەت و سیمای ڕێکخراوێکی مارکسیەت لینینستی دابرێت و جیاوازیەکانی خۆی لەناو یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا ون بکات، بەمەش لەبەر بێ هیوایی دانووستانەکان و بێ ئەنجامی شەڕی ناوخۆ، پێویست بە هەوڵدان بە کردنەوەی دەرگایەکی نوێ دەکات). (ڕەوتی چەپ لە باشووری کوردستان. ل. ١٦٤).

١٥- پشکۆ نەجمەدین، کادێری دیاری ئاڵای شۆرش، لە کتێبیەکەیدا "ئەزمون و یاد" ل. ٣٥٦ دا نوسیوێتی : (بازنەی پەیوەندییە سیاسیەکانی (ئاڵا) لەگەڵ هێزەکانی کوردستانی ئێراقدا. پارتی دیموکراتی کوردستان لە پلەی یەکەمدا و حیزبی شیوعی ئێراق لە پلەی دووەمدا بوو. پارتی جگە لە کۆمەکی لۆجیستیکی. لە سەرەتادا کاتژمێرێکی لە ویستگەی ڕادیۆکەی خۆی بە (ئاڵا) دابوو. حیزبی شیوعی ئێراق لەگەڵ ئەوەی هاوکاری (ئاڵا) یان دەکرد.دیسانیش وەکو پیشەی خۆیان دەستیان تێ وەردەدا و گرفت و کێشەی فیکری و سیاسییان بۆ دەخوڵقاند).

١٦- مەلا بەختیار و پشکۆ نەجمەدین و شێخ عەلی، لە ١٩٨٦/١/٧دا لە نامەیەکدا کە ئاراستەی کۆمیتەی سەرپەرشتیاری ئاڵای شۆرش دەکەن، پەشیمانی خۆیان لە کارو هەڵوێستی خۆیان دەردەبرن، لە پێشەکیەکەیدا نوسیویانە "پاش ئەو هەموو ململانێ و ناکۆکی و دژایەتیانەی پێشومان لە ناو

کۆمەڵەدا و دواتریش تاوانی خۆ ئیعلانکردنمان وەک ئاڵای شۆرش بەرامبەر بە کۆمەڵە و یەکێتی وەکو جیابونەوە لێیان، گەیشتینە ئەو قەناعەتەی هەموو ئەو کارە ناراستانەی پێشووی ناو کۆمەڵەمان و کردەوەکانی ئەم دواییەشمان ئیدانە بکەین و بە تاوانیان بزانین بەرامبەر بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و بزوتنەوەی کرێکارانی کوردستان و شۆرشی ڕزگاریخوازیانەی گەلەکەمان. بۆیە بڕیارماندا کە چیتر لەمەودوا لەگەڵ ئێوەدا کار نەکەین و واز لە سیاسەت بهێنین، وە هەمو پەیوەندیەکی خۆمان لەگەڵتاندا ببڕین لەبەر ئەم هۆ فکری و سیاسیانەی خوارەوە: ئەو شێوە کارکردنەی کە ئێمە مەارەسەمان کرد لە ناو کۆمەڵە و یەکێتیدا، پاشان پەیوەندکردنمان لەگەڵ ئاڵای شۆرش و نەپساندنی پەیوەند حزبیمان لەگەڵ کۆمەڵە بە ڕەسمی، واقیعەکە سەلماندی کە ئەو شێوە کارە ناشەرعی و نا دروست بوون و ئێمە بەش بە حاڵی خۆمان لێی پەشیمانین، وە دەرکەوت لە ناو شۆرش و گەلەکەمان دا لە کوردستانی عێراق دا، تەئسیری سەلبی زۆری بوو "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" ل. ٤٥٣.

هەر دەربارەی ئەو نامەیە کە بە (پاکانە) ناسرابو، پشکۆ نەجمەدین، سەرکردەی دیاری ئاڵای شۆرش لە کتێبەکەیدا "ئەزمون و یاد"دا لە لاپەرە ٢٧٥ دەنوسێ (ڕۆژانی پاشتر، دەقی پاکانەیەک کە لە ژێر حوکمی ئیعدامدا، بە ئێمە واژو کرابوو. لە ڕادیوی یەکێتیەوە خوێندرایەوە، لە بڵاوکراوەکانیدا بڵاوکرایەوە و سەدان نوسخەیان بۆ حیزب و لایەنە سیاسیەکانی کوردستان نارد. لەم پلینۆمە تایبەت و نائاسایەدا کە بۆ دادگایکردنی ئێمە و پڕکردنەوەی جێگا بەتاڵەکانی کۆمیتەی سەرکردایەتی کۆمەڵە بەسترابوو. ٥٨ کادری کۆمەڵە (کە هەر هەموویان هاوڕێی چەندین ساڵەی خەباتی سەختی شاخ و شارمان بوون)، بڕیاری ئیعدامکردنی ئێمەیان واژۆ کردبوو).

هەر دەربارەی شێوەی نوسینیی ئەو نامەیەیان، ئیبراهیم جەلال کە یەکێک بوە لەوانەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ هەر سێ بەندەکەدا کردوە، لە کتێبەکەیدا "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"، ل. ٤٥٢ دەنوسێ: بۆ ڕۆژی ١٩٨٥/١٢/١٦ چومە لای "مەبەست مەلا بەختیارە" و پرسی : وەڵام چیە؟ گوتم لە گولەباران دەتبورن و ماوەیەک زیندانی ئەبیت و پاشان دەردەکرێیت لە کۆمەڵە و یەکێتی... گوتی: دەباشە تەسجیلت هێناوە، داینێ و فەرموو بنوسە. گوتم: نا فەرموو بە دەستوخەتی خۆت وەڵامی ئەم پرسیارانەم بدەرەوە و بە نوسین بینوسە. مەلا بەختیار نەک هەر وەڵامی هەموو پرسیارەکانی منی بە نوسین دایەوە. بەڵکو کەوتە نوسینی ناوی هەموو ئەندام لق و شانە و ڕێکخستنەکانی ئاش. نەختێ دامام و پاشان گوتم: کاک بەختیار سەرکردەی پرۆلیتاریا بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆی، قوربانی بە ڕێکخراوەکەی و ئەندامان دەدا بەو جۆرە؟. بەس نەبوو لە شار دەست ڕژێم نەکەوتی، خۆ کۆمەڵەت بە هەڵتەکاندن ئەدا..).

١٧- لە گفتوگۆیەکدا لە نێوان ئازاد هەورامی و پشکۆ نەجمەدین، دا کە کادێرێکی دیاری ناو ئاڵای شۆرش بو، ئازاد هەورامی وەك دۆستی نزیکی ئەوان، بەم شێوەیە باسی جیابونەوە دەکات: "ئێمە بە یەکگرتویی ئەمە حاڵمانە کە هەیە! کۆمەڵە کە کرۆکی یەکێتییە بیبینە! تۆ کێ جیا دەکەیتەوە؟ حیزبی مارکسی عەیار ٢٤. بەم کەرەسەیە و لە شاخ و لە بزوتنەوەی چەکداریدا، دروست نابێت! تۆ ناتوانیت شتێك لە کۆمەڵە باشتر. بە جیابوونەوە لە کۆمەڵە. دروست بکەیت! جگەلەوە. بۆچی پێت وایە کارکردن

لەگەڵ سالاردا. لە کارکردن لەگەڵ کاك نەوشیرواندا خۆشتر و ئاسانترە! ئەی کاك بەختیار و کاك سالار! ئەوان چۆن پێکەوە هەڵدەکەن و دەسازێن؟ ئێمە وا خەریکە دەساڵێك لەم بزوتنەوەیەدا پڕدەکەینەوە و تا ئێرەمان هێناوە. لێگەڕێن با تا کۆتایی بگەیەنیین و یەك چارەنوسمان هەبێت! ئەگەر شکستمان خوارد، با هەموو پێکەوەبین، ئەگەریش بە مەنزڵێك گەیشتین و دەستمان لە چەك و شاخ بوویەوە، ئەوسا هەر کەس و حسابێك بۆ خۆی دەکات، ئێستا پاش ٢٤ ساڵ لەم گفتوگۆییەی نێوان ئازاد هەورامی و من، زۆر ئەستەمە بڵێم: دەبو چیمان بکردبا! بەڵام دەتوانم بڵێم: بۆچوونەکانی ئەو پیاوە وردبین و ژیرە، بەشێکی زۆر لە ڕاستیەکانیان لە خۆ گرتبوون". (ئەزمون و یاد، ئاڵای شۆرش و حیکایەتەکانی زیندان، پشکۆ نەجمەدین، چاپی دووەم. بەرگی یەکەم و دووەم - ١٩٧٨-١٩٨٩ - ل. ٢٢٨).

# جیابونەوەی رەسول مامەند

**٭بۆچی رەسول مامەند و برادەرەکانی لە یەکێتی جیابونەوە؟**

- دوای کارەساتی هەکاری، یەکێتی نیشتمانی کوردستان توشی حاڵ و وەزعێکی زۆر دژواربو، لەو کاتەدا دوژمنانی نەتەوەکەمان بەهیوای ئەوەبون کە شۆڕشە نوێکەمان لەناوبەرن، چۆن لە ڕوی سەربازیەوە زیانێکی گەورەی لێکەوت، ئاواش لەروی سیاسیەوە زەربەیەکی گەورەی لێبدەن، چاکترین ڕێگاش بۆ ئەو زەربەلێدانە، ئەوەبو هەوڵبدەن یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ناوەوە هەڵتەکێنن.

زۆر بەداخەوە، رەسول مامەند و ئەو برادەرانەی لەگەڵیدا بون و بە ناوی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانەوە کاریاندەکرد، کەوتنە ئەوداوەوە کە بەلای منەوە داوی دوژمنانی کورد و کوردستان و شۆرش بو، ئەوەی ئەوانی خستە ئەو داوەوە چەند هۆیەک بو:

یەکەم:هەندێ سەرکردەیان کە پەیوەندیان لەگەڵ حکومەت هەبو، حکومەتی عێراق دوای کارەساتی هەکاری پێیوابو، هەلێکی باشی بۆ رەخساوە بۆئەوەی یەکێتیش لە روی سیاسیەوە لەناو خۆیدا هەڵتەکێنێتەوە و بەناوی جیاکردنەوەی بزوتنەوە، دوبەرەکی خستە ناو ریزەکانی یەکێتیەوە.

دوەم: کە رەسوڵ مامەند و برادەرەکانی کاتی خۆی لەگەڵ عەلی عەسکەریدا توشی چەند گیروگرفتێک بوبون، دەیانزانی ئەگەر عەلی عەسکەری بمایە، ئەوانە ئەو دەسەلات و توانایەیان نەک هەر نەدەبو، بەڵکو هەندێکیان نەدەبرانە سەرکردایەتی، بەتایبەتی پێش ئەوەی هێزی یەکێتی لە تۆکانەوە بەرە و بادینان بچێت.

ناکۆکییەک ئەوکاتە هاتە کایەوە، کاتێ عەلی عەسکەری لە گیرفانی مەلا ناسیح نامەیەکی دەرهێنا، مەلا ناسیح وا ناسرابو، پەیوەندی لەگەڵ حکومەتدا هەیە و لەبنەوە سەرێکی بە ئەمنەوە و سەرێکی تری لەگەڵ بزوتنەوەی سۆسیالیستی گرێ دراوە.

عەلی عەسکەری، هەواڵی مەلا ناسحی لە ڕێگای سەید مەجیدی ئاوەڵزاوای مەلا ناسیحەوە دەزانی کە گوایە دایرەی ئەمن تەنانەت یارمەتی خێزانی مەلا ناسحیش دەدەن، لەبەر ئەوە عەلی عەسکەری بە گاڵتە پێکردنەوە کە زانی مەلا ناسیح هاتۆتە گۆڕەشێر، چو بۆلای و دەستیکرد بە گیرفانیدا و چەند نامەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا، لەوانە نامەیەک بو کە عەلی هەژار بۆ ڕەسوڵ مامەندی نوسیبو، داوای جیابونەوەی لێدەکرد لە یەکێتی، ئەویش لەژێرناوی سەربەخۆبون و پاراستنی سەربەخۆیی خۆیی و داوای ئەوەی لێدەکا، ئەگەر داخوازیەکانی بۆجێبەجێ نەکرێ، ئەوا جیاببنەوە.

ئەوکارە وای لە عەلی هەژار کرد، چاوبخشێنێتەوە بە هەڵوێستی خۆیدا لەناو بزوتنەوەدا، لەوێ ناکۆکیەکی باش کەوتبوە نێوان عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید لەلایەک و ڕەسوڵ مامەند لەلایەکی ترەوە. ڕەسوڵ مامەند، حاجی حاجی ئیبراهیمی لە دەوری خۆی کۆکردبۆوە و سەید کاکە و قادر عەزیزیش مام ناوەندی بون لە هەڵوێستیاندا، هەرچەندە قادر عەزیز ئەوکاتە سەرکردایەتی نەبو.

عەلی عەسکەری، لەگەڵ دکتۆر خالیدا پشت ئەستوربون بە گەلێک لە برادەرانی ناوەوەیان و پێیان وابو لە هاویندا کۆنفرانسێک ببەستن و تێیدا ئەو پەیوەندیەی نێوان مەلا ناسح و کاردۆ و عەلی هەژار و ئەوانەی تر، ئاشکرابکەن و زانیاریەکان بخەنە بەردەم کۆنفرانسەکە بۆ سزادانیان و بزوتنەوە وەک ڕێکخراوێکی ڕێکوپێک و شۆڕشگێڕانە و پاکژ بهێڵنەوە، بەڵام بەداخەوە بونی یاخود کارەساتی هەکاری پەکی جێبەجێکردنی ئەو پیلانەی خستن، ئیتر ڕەسوڵ مامەند بە ئازادی و بەتەنیا مابۆوە.

کاتی تەنگانە و ڕۆژی لێقەومان مرۆڤ تاقیدەکرێتەوە و دەبێتە بۆتەی تاقیکردنەوە و قاڵبونی مرۆڤ یان ساغبونەوە و دەرخستنی ناوەرۆکی زۆر کەس. بەداخەوە ڕەسوڵ مامەند و کۆمەڵەکەی لە ڕۆژی تەنگانەدا، لە جیاتی ئەوەی دەستی برایەتی و تەبایی و هاوکاری درێژبکەن بۆ بەشەکانی تری یەکێتی و هەڤاڵەکانی تریان، هەستان لە پشتەوە خەنجەری غەدریان لێدان، ئەویش ئەوەبو لە سەرێکەوە کەوتنە خۆ ئامادەرکردن بۆ جیابونەوە و لە سەرێکی ترەوە , کەوتنە پەیوەندیکردن بە سامی عەبدولڕەحمان و قیادەی موەقەتەوە.

سیاسەتەکەیان وای لێهاتبو، تەنانەت موقاتەعەی مەکتەبی سیاسی یەکێتیشیان کردبو کە نوێنەرێکی ئەوانیشی تێدابو، مەرکەزێکی تری جیاوازیان دانابو لە شێنێ و لەوێش دیعایەیان دژی سیاسەتی ڕەسمی یەکێتی دەکرد و ئەو ناراستیانەیان

باسدەکرد، مام جەلال و کۆمەڵە دەستیان بەسەر هەمو شتێکدا گرتوە و مام جەلال خۆشی کۆمەڵەیە و کۆمەڵەش شیوعییە و بە فکر ماوییە و ئەو سیاسەتە بۆ ئێمە دەست نادات.

هەروەها باسی ئەوەیان دەکرد، پێویستە ئێمە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت بکەین و پێکبێینەوە و بەشەڕ هیچمان بۆ ناکرێت و تاکە رێگەمان تەنها رێگەی گفتوگۆیە.

*** ئایا ئێوە و بزوتنەوەی سۆسیالیست، هەوڵی گفتوگۆتان نەدا بۆ نزیکبونەوە و چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانتان؟**

- رەسوڵ مامەند، هات بۆ مەکتەبی سیاسی، کاتێک حکومەت هەمزەی باپیر ئاغای ناردبو، بەلای شێنێدا هاتبو و ئەوانی بینیبو، گوتبوی حکومەت منی ناردوە و ئەوانیش گوتبویان با بنێرین مام جەلال بێت بۆئێرە، ئەویش گوتبوی من حکومەت ناردومی بۆلای مام جەلال و راسپاردەکان بەو دەڵێم.

ئەوانیش نامەیان بۆئێمە نوسی کە یەکتر ببینین، ئێمەش وەڵاممان دانەوە کە مەکتەبی سیاسی هەیە و ئەو بریارئەدا و هەرکەسێک ئیشی بە یەکێتی هەیە، ئەوا پێویستە بێتە مەکتەبی سیاسی، هەمزەی باپیر ئاغاش دێتە مەکتەبی سیاسی، ئێوەش ئەگەر پێتان خۆشە فەرمون تەشەریف بێنن بۆ مەکتەبی سیاسی، وەکو تر خۆتان ئازاد و سەربەستن. ئێمە هیچ دەسەڵاتێکی تر بەرامبەر بە مەکتەبی سیاسی قبوڵ ناکەین، هەروەها پێمان گوتن ئەو هەڵسوکەوتە، کارێکی ناڕاست و منداڵانەیە، ئێوە ئەندامی یەکێتین و هێشتا جیانەبونەتەوە لە سەرکردایەتی یەکێتی.

سکرتێری گشتی یەکێتی لە کوێ بێت، ئەوا ئەبێ مەکتەبی سیاسی یەکێتیش لەوێ بێت، لەبەرئەوە ئێوە تا جیادەبنەوە لە ئێمە، دەبێ بێن بۆ ئەو شوێنەی، مەرکەزی یەکێتیە.

دکتۆر مەحمود، هەڵوێستی دژی ئەو هەڵوێستانەی رەسوڵ مامەندبو، بە تایبەتی نزیکبونەوەی لە سامی و قیادەی موەقەت و ئەوانی بە مناڵ و نەفام و گەوج دەدایە قەڵەم.

بەڵام بەداخەوە، دکتۆر مەحمودیش یەک ڕەوشتی خراپی هەبو کە بۆتە سیمایەک لێی، ئەویش ئەوەیە لە هەرجێیەک بە جۆرێک قسە دەکات، کە خەڵکەکە پێی خۆشە و مەقبولە، لای ئێمە بەدڵی ئێمە قسەی دەکرد کە دەچوە لای ئەوان بە جۆرێکی تر قسەی دەکرد و خۆی لەوان نزیک دەکردەوە.

جگە لەوە، دکتۆر مەحمود وەک لێپرسراوی لیژنەی ئامادەکردنی پارتی

دیموکراتی کوردستان حەزی دەکرد، لەگەڵ باڵی بزوتنەوەی سەر بە رەسوڵ مامەند یەک بگرن و یەک حیزب دروست بکەن و خۆی ببێتە لێپرسراویان. بەداخەوە ئەویش سیاسەتێکی دو روانەی نواند و لە ئەنجامدا دایشکان بەلای رەسوڵ مامەندا، هەرچەندە بە قسە وای نیشان ئەدا کە سەدی سەد لەگەڵ ئێمەیە و خۆی بە دڵسۆز و برای راستەقینەی ئێمە دەزانێ.

کاتێ هەمزە هات، ئەوانیش هاتن و بەیەکەوە وەڵامێکی هاوبەشمان دایەوە و قسەمان کردەوە، بۆئەوەی پێکبێینەوە و ببینەوە یەک و یەک ناوەندمان هەبێت. رەسوڵ مامەند قبوڵیکرد، بە تایبەتی بە ئومێدی ئەوەبو ئەو گفتوگۆیە لەگەڵ رژێم ئەنجامێکی لێبکەوێتەوە.

ئەمجارەش لێک نزیکبوینەوە و رێگامان لێک نزیککردەوە و بڕیارماندا پێکەوە هاوکاری بکەین و لە مەکتەبی سیاسی، نوێنەری ئەوانیش بەشداری بکاتەوە. کارەکان بۆ ماوەیەک بە رێکوپێکی رۆیشتن، بەڵام لەبنەوە رەسوڵ مامەند هەر پەیوەندی لەگەڵ عەلی هەژار و کاردۆ و ئەوان مابۆوە، ئەوانیش هەر هانیان دەدا بۆئەوەی، ئەو سەربەخۆیی خۆی لە یەکێتی رابگەیەنێت و خۆی جیابکاتەوە. تەنانەت سامیش نامەی بۆ ناردبو، تێیدا نوسیبوی "رزگاربونتان لە عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید، هەلێکی باشە بۆتان بۆئەوەی بە سەربەستی جیاببنەوە".

چەند لایەک و بەشێوەی جیاواز هەوڵی هەڵتەکاندنی یەکێتی نیشتمانیان ئەدا، وەک: حکومەتی عێراق، قیادەی موەقەتە، سەرکردایەتی بارزانی و سامی عەبدولڕەحمان، ئەمانە هەریەکە بەشێوەک هەوڵی خۆی ئەدا.

ئەم هەوڵانە، هانی رەسوڵ مامەندیان ئەدا، درێژەبدەن بەو کارە تا تەنزیمیانەی خۆیان، هەرئەوەندە لە یەکێتی نزیک دەبونەوە تا کەڵکیان هەبوایە، ئەگەر یەکێتی دەسکەوتێکی هەبوایە، هەوڵیان ئەدا بەشداربن و بەشێک بۆ خۆیان بەرن.

بەڵام بە کردەوە و بەکار هەوڵی جیابونەوەیان دەدا، ئێمەش لای خۆمانەوە هەوڵمان ئەدا، رایان کێشینەوە و بیانکەینەوە بە یەکێتی راستەقینە، ئەو ناکۆکییانە چارەسەربکەین، لەبەرئەوە ئامادەبوین سازشیشیان لەگەڵدا بکەین، بۆیە زۆر شتمان لێقبوڵ دەکردن کە بەڕاستی هی ئەوە نەبو ئینسان لە حاڵەتی ئاساییدا قبوڵی بکات. بۆ نمونە، دوای شەهیدکردنی عەلی عەسکەری و هاورێکانی هەر لە خۆیانەوە چون ئەندامانی سەرکردایەتی خۆیان زیادکرد و گەورەیان کردن و قادر عەزیزیان هێنایە سەرکردایەتیەوە کە هێشتا کاتی ئەوەی نەهاتبو.

لەجیاتی ئەوەی رەسوڵ مامەند، خۆی یان یەکێک لە برادەرانی خۆیان بکەن

بە نوێنەری بزوتنەوە لە مەکتەبی سیاسی، هاتن قادر عەزیزیان بۆ دانایین کە لەوێ لەگەڵماندابێت و لەهەمو شتێکدا خاوەن دەنگ و بۆچونی تایبەتی بێت و وەک ئێمە مافی هەبێت.

ئێمە قبوڵمانکرد و گوتمان لە پێناوی یەکخستنی ریزەکانی یەکێتێیدا، دەبێ هەمو هەوڵێک بدەین و ئێمە باوەڕمان بەوە هەبو کە یەکێتی رێکخراوێکی نیمچە بەرەییە و موڵکی یەک حیزب نیە و باڵی جیاجیای تێیدایە، هەر لەبەرئەوە ململانێ و یەکگرتنیشی تێیدایە.

*** ئایا لەو کاتانەدا، عێراق هیچ هێرشێکی سەربازی گەورەی کردەسەر ئێوە؟**

- لە زستانی ١٩٧٧ - ١٩٧٨ ئێمە لە قەندیل مابوینەوە، وردە وردە هاتبوینەوە بۆ ناوچەی ناوزەنگ و لەوێ بارەگامان دانابو، لەوکاتانەدا سوپای عێراقی هێرشێکی گەورەی کردەسەرمان بە مەبەستی گرتنەوەی شێنێ و مامەندە. پاش شەرێکی سەخت توانیمان بیانشکێنین، بەتایبەتی بەهۆی ئەو برادەرانەی یەکێتیەوە کە لە باڵەکایەتییەوە هێنابومانن، وەک سەید کەریم و ئەحمەد مەولود. ئەو قارەمانانە دەوری زۆر باشیان نواند، لە بەرگری لە مامەندە و لە ئەنجامدا لە دەست خۆماندا مایەوە.

*** لەو کاتانەدا هەستتان بە راپەرینی گەلانی ئێران دەکرد؟**

- لە پایزی ١٩٧٩ ئێمە لە ناوزەنگ بوین و رەسوڵ مامەند و ئەوانیش هەر لە نزیکی ئێمەوەبون لەو کاتانەدا شۆڕشی گەلانی ئێران لە پەرەسەندندابو. لە هەمان کاتدا ئێمە لە قەندیل، جگە لە گفتوگۆکە لەگەڵ حکومەت کردبومان، چەندین نامەشمان ناردبو بۆ هێزە شۆڕشگێرەکانی ئێران، بۆ پیرۆزبایی و هاوکاری و هاوخەباتی.

ئێمە پەیوەندیەکی باشمان لەگەڵ کوردەکانی ئێراندا پەیداکردبو، ناوبانگیشمان زۆر باش بو. تەنانەت لە خۆپیشاندانەکانی ناوشاری بۆکان و چەند شارێکی تردا، بە ئاشکرا دروشمی پشتگیری یەکێتی نیشتمانی دەبیسترا و دەبینرا و بە پێچەوانەوە، خەڵک نەفرەت و جنێوی ئەدا بە قیادەی موەقەتە و بە خائینی ئەدایە قەڵەم. بەتایبەتی ئەو سەردەمە ماڵی بارزانیش، پەیوەندییان هێشتا هەر لەگەڵ شا و دام و دەزگاکەیدا مابو.

جەماوەری کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستان، تا ئەوکاتە،

بەئاشکرا چالاکیان نەدەکرد، بڵاوکراوەکانیان بەبێ ناو بڵاودەکردەوە، ئەوان مۆتۆری کارە جەماوەریەکان بون و زۆر هێرشی توندیان دەکردە سەر قیادەی موقەتە.

حیزبی دیموکراتی کوردستان، هەڵوێستی وا رون نەبو، ئەوان هەڵوێستێکی سازشکارانەیان هەبو لەگەڵیاندا کە بریتی بو لە رازانەوە و دڵدانەوە و راگرتنیان وەکو هێزیک بەرامبەر بە ئێمە.

*** کەی بزوتنەوەی سۆسیالیست بە تەواوی جیابونەوە لەئێوە، ئایا پێش ئەوە ئێوەیان ئاگادارکردەوە؟**

- لە نەورۆزی ١٩٧٩ دا و بە شەو و بەبێ پرس، لە بەرەی ئێمەوە گواستیانەوە چونە گۆرەشێر و ئیعلانی جیابونەوی خۆیانکرد. سەیر لەوەدابو، دکتۆر مەحمود، رۆژێک پێشتر هاتە لای من و نەوشیروان، ئێمە بە سێ قۆڵی دانیشتین و لەبەرچاوی نەوشیروان ئەوپەڕی پەرۆشی خۆی بۆ یەکێتی نیشتمانی دەرخست، بە تایبەتی بەرامبەر بە منیش و گوتی: "تۆ برا گەورەمانی من ئامادەم هەتا مردن لەگەڵ تۆ ببم و جانتاتان بۆ هەڵگرم". گوتی: "ئێمە هەرسێکمان کە بڕیارمان دابو بەسێ قۆڵی دابنیشین بۆ رێکخستنی ئەو سێیە و هەتا مردن سێ کوچکەی شۆڕش و یەکێتی دەبین".

کەچی بەداخەوە سبەینێ، ئەویش لەپێشیانەوە بو کە خۆیان جیاکردەوە. دیاربو ئەوان لەناو خۆیاندا پێکهاتبون، حیزبێکی تازە دروستبکەن و دکتۆر مەحمود بەتەمای ئەوەبو ببێتە سکرتێر، یان ریش سپی، یان کاربەدەستیان. هەرچەندە برادەرانی باڵەکەی تری بزوتنەوە، لەگەڵ یەکێتی مابونەوە، بەتایبەتی عومەر دەبابە، هەوڵێکی زۆریدا کە ئەوئیشە نەکەن و ئەو جیابونەوەیە خراپە و وەختی نیە و زۆر زەرەر دەدا لە شۆڕش. بەڵام ئەوە هیچ سودی نەبو، بەڵکو زۆر زیانی لێداین.

لە کاتێکدا ئەوان جیا بونەوە کە شۆڕشی ئێران لە سەرەتادابو، ئێمە پێویستمان بە هاوکاری هەبو، لەجیاتی ئەوەی هاوکار و دۆست و برا و خەباتگێڕ و پشت و پەنای ئێمەبن، بون بە دڕک و چقڵ و لەهەمو جێیەک پروپاگەندەیەکی زۆریان لەسەر ئێمە دەکرد، لەلای ئێران بە جۆرێک و لەلای عێراق بە جۆرێکی تر.

ئەوان، خێرا کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عێراق بەناوی ئەوەی کە حکومەت مافیان دەداتێ و حوکمی زاتی وەرئەگرن، بەڵام دوای ئەوەی گفتوگۆکەیان سەری نەگرت، ئینجا بایان دایەوە بەلای ئێراندا و لە ئێران دروێیان دژی ئێمە

بڵاودەکردەوە. فیتنەیەتیان دەکرد، گوایە "ئێمە ماوین و ئێمە یارمەتی کۆمەڵەی ئێران و یارمەتی شێخ عێزەدین و حیزبی دیموکرات دەدەین و گوایە ئێمە، دەستکردی عەرەبین و لەگەڵ سوریا و لیبیا یەکین"، واتا هەرچیان بتوانیایە لە دژی ئێمە ئەیان گوت.

بەراستی زۆر گیروگرفتیان هێنایە سەر رێگای پەیوەندی ئێمە و کۆماری ئیسلامی، لە هەمان کاتدا، ئەم برادەرانە بە جیابونەوەیان ١٥٠٠ پێشمەرگەیان برد، واتا نزیکی سێیەکی هێزی پێشمەرگەیان جیاکردەوە لە ئێمە.

بەمجۆرە دەبینین بزوتنەوەی سۆسیالیستی بەشێکی گرنگی لە یەکێتی نیشتمانی جیابۆوە، ئەو بەشەی تری کە وەفاداری رێبازی عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید بون، مانەوە لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی، بە تایبەتی عومەر دەبابە و جەمال حەکیم و مامۆستا عەلی حەوێز و مامۆستا نازم عومەر و دەیان کادێر و سەدان ئەندامی تری بزوتنەوە کە لەناو شارەکاندا بون.

دیاردەیەکی سەیر ئەوەبو، وەکو بڵێی کۆنە مەلاییەکان لەگەڵ ئەوان رۆیشتن و کۆنە جەلالییەکان لەگەڵ کاک عومەر دەبابە و برادەرانی تر مانەوە. بەڵام سەیر ئەوەبو، ئەو کۆنە جەلالییانەی مەشهورن بەوەی پەیوەندیان لەگەڵ حکومەت هەیە، ئەوان لەگەڵ رەسوڵ مامەند و ئەوان رۆشتن.

*** جیابونەوەی بزوتنەوەی سۆسیالیست چەند زیانی بە یەکێتی گەیاند و یەکێتی چۆن توانی هەڵسێتەوە؟**

- ئەو جیابونەوەیە گورزێکی سیاسی بو، بەڵام دیسان یەکێتی نیشتمانی زۆر لەوە بەهێزتر و بە تواناتربو کە تێک بچێت، بگرە لە سەرێکەوە یەکێتی قازانجێکی لەوەکرد، ئەویش ئەوەبو کە لە سیمایەکی غەریب لە ناو لەشی رزگاری بو. یەکێتی ریزەکانی بەهێزترکردەوە و توانای باشتربو، ئەو رێبازە راسترەوە و راڕاو نیمچە عەشایەرییەی کە ئەوان نوێنەری بون، بە راستی رۆیشت و یەکێتی لە روی چۆنایەتیەوە باشتر گەشەیکرد.

زۆری نەخایاند، یەکێتی ئەو برینانەی سارێژکرد کە بریتی بون لە کارەساتی هەکاری و جیابونەوەی رەسوڵ مامەند. یەکێتی توانی لە ماوەیەکی کورتدا زیاتر لە ٣٠٠٠ پێشمەرگە رێکبخاتەوە و رێکخستنیش لە شارەکان و لە شوێنەکانی تر، تادەهات پتر گەشەی دەکرد و ڕادیۆی یەکێتی نیشتمانی کەوتەوە گەڕ و دەستیکرد، بە بڵاوکردنەوەی پرۆگرامەکانی و پەیوەندییەکانیش لەگەڵ هێزە

شۆڕشگێڕەکانی ئێران بە گشتی و چەپەکان بەتایبەتی گەشەیکرد. هەر لە حیزبی ڕەنجدەرانەوە بگرە تا سەر چریک و پەیکار و کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی شۆڕشگێڕی کوردستانی ئێران، بەرەو باشی و پتەوی دەچو، و پەیوەندیش لەگەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستان وردە وردە ئاسایی دەبۆوە، دەتوانین بڵێین بەرە و باشی دەچو.

ئەگەر لە کاتی شۆڕشی ئێراندا کارەساتی هەکاری و جیابونەوەی برادەرانی بزوتنەوە روی نەدایە، دەمانتوانی زۆر کەڵک وەرگرین و تەنانەت دەمانتوانی زۆر شوێنی سەر سنورەکان بگرین و چەک و تەقەمەنی بۆخۆمان و بۆ شۆڕشەکەمان بهێنین و سود لەو بارودۆخەی ئێران باشتر وەربگرین.

# هەڵهاتنی حیزبی شیوعی بۆ کوردستان

*** لە کاتی شۆڕشی ئێراندا، بەعس شاڵاوی گرتن و کوشتنی لەسەر حیزبی شیوعی زیادکرد، ئەوان هەڵوێستیان چی بو؟ هەڵوێستی ئێوە چی بو بەرامبەریان؟**

– لە کۆتاییساڵی ١٩٧٨ و سەرەتای ١٩٧٩ دا، حیزبی شیوعی عێراقی وەزعی شلۆق بو، حکومەت کەوتە ڕاونان و گرتنیان و وردە وردە حیزبی شیوعیش ڕوی کردە لای ئێمە. ئێمە بە ئەرکی خۆمانمانزانی، هاوکاریان بکەین، هاوکاریمان کردن و جێ و چەکمان دانێ، پێخەفی سەر پشتی پێشمەرگەی خۆمان هەڵگرت و بەسەرماندا دابەشکردن و چەکمان لە شانی پێشمەرگەی خۆمان کردەوە و دامان بەوان.

جەماعەتی ڕەسوڵ مامەند، ئەوەشیان کرد بە بیانویەک و کەوتنە پڕوپاگەندەکردن کە گوایە ئێرە بۆتە شیوعی خانە و ئێمە چ پەیوەندیەکمان لەگەڵ شیوعیدا هەیە و هەمان مەسەلەیان بڵاودەکردەوە کە یەکێتی، مام جەلال و کۆمەڵە دەیبەن بەڕێوە، خۆیان ماویی و شیوعین و هەموو شۆڕش بوە بە شیوعی.[٣]

لەمکاتەدابو، بە نەهێنی حکومەت پەیوەندی بە رسوڵ مامەندەوە کردبو، حکومەت ئامادەبو بیانبینێ ئێمە ئەو سەردەمە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی

ئێران، پشتمان گەرم کردبو و ئومێدمان دەخواز کە زیاتر کاری خۆمان ئەنجام بدەین و وەزعمان باشتربێت.

رسوڵ مامەند و برادەرانی بزوتنەوە سودیان لە هەڵسوکەوتی منالآنە و لاسارانەی هەندێ لە کادێرەکانی ئالآی شۆرش وەرگرتبو، ئەو هەڵسوکەوتانە دەوریان هەبو لە مەسەلەی هاندان و وروژاندن و تۆراندنی برادەرانی سۆسیالیستدا.

یەکێک لە سەرکردەکانی ئاش، رۆژێک لە زەڵێوە دەڕوات بۆ شێنێ و توشی ئەوان دەبێ، سلآوی لێ ناکەن و ئەویش گەلێک جنێو بە بزوتنەوە دەدا و لە بارەگەکەی خۆی لە شێنێ، لەگەڵ برایەکی شێرکۆی شێخ عەلی دەیکا بە شەڕ و بە تەقە.

ئەم شەڕە لەگەڵ بزوتنەوە ڕویدا، بەبێ ئەوەی هیچ بریارێکی سەرکردایەتی هەبێت، لە کاتێکدا ئێمە هەوڵمان ئەدا ئەوان رازی بکەین و دڵیان بدەینەوە و بیانهێنینەوە و یەکیان خەین، بەتایبەتی ئەو سەردەمە هەندێ برادەری سەرکردایەتی نەتەوەیی حیزبی بەعسی چەپ، وەک حازم (عەبدولجەبار کوبەیسی)و ئەوانە، رۆڵێکیان بینی بۆ ئەوەی ئێمە لێک نزیکببینەوە و ئەوان جیانەبنەوە، بەڵام وادیار بو رەسوڵ مامەند و بزوتنەوە بڕیاری جیابونەوەی خۆیاندابو.

# شۆرشی ئێران و هەڵەکانی یەکێتی

*** ئایە یەکێتی توانی وەک پێویست، سود لە شۆرشی ئێران وەربگیرێت و پەیوەندی هەمەلایەنەی لەگەڵدا بەهێزبکات؟**

– هۆی ئەوەی یەکێتی نەیتوانی وەک پێویست سود لە شۆرشی ئێران وەربگرێت، دەگەڕێتەوە بۆ دو خاڵی سەرەکی:

یەکەم: باری ناوخۆی یەکێتی کە باسمانکرد.

دووەم: حیزبی دیموکراتی کوردستان لە لایەک و برادەرانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشی کوردستانی ئێران لە لایەکی ترەوە، پێیان باشنەبو، بانقەکان و دەبۆکان و شوێنە گشتی و گرنگەکانی حکومەت بگرین و بیخەینە دەست کوردەوە.

حیزبی دیموکرات هاتبوە سەر ئەو قەناعەتەی کە ئەو رەنگە تەنها لە مەهاباد بتوانێ کارەکانی ئەنجام بدات، حیزبی دیموکرات داوای یارمەتی و چەک و تەقەمەنی لە ئێمەدەکرد، ئێمە بۆمان ناردن و لە ئەنجامدا مەهابادیان گرت و هیچیان بە ئێمەنەدا. نەبونی پەیوەندیەکی باش لە نێوان ئێمە و دیموکراتدا، هۆیەکی گرنگ بو کە نەمانتوانی وەک پێویست سود لەوکاتە وەربگرین.

ئەگەر ئەو سەردەمە پەیوەندی نێوانی ئێمە و دیموکرات زۆر باشبوایە، دڵنیام دەمانتوانی زۆر شوێنی کوردستانی ئێران بگرین و دەیان دەبۆ و بانک و شوێنی گشتی بگرین و بە ملیۆنەها دینار و بە هەزاران پارچە چەکی باش بخەینە دەستی شۆڕشی کوردستان، لە هەردو پارچەکەدا. بەڵام بەداخەوە ئەو هۆیانە وایکرد وەک پێویست نەتوانین سود لە شۆڕشی ئێران وەربگرین، ئێمە تەنها رێگایەکمان بۆکرایەوە بۆ هاتوچۆ.

هەرچەندە پروپاگەندەی زۆر دژی ئێمەکرا، هەم لەلایەن حکومەتی بەختیارەوە کە ئێمە دەست وەردەدەین لە کاروباری ناوخۆی ئێراندا هەم لەلایەن نۆکەرانی ئەمەریکاوە کە خزابونە ریزەکانی حکومەتی مەهدی بازرگانەوە، ئەوانیش زۆر لە دژی ئێمەبون و زۆر شەڕی ئێمەیان دەکرد و بە پێچەوانەوە، هەوڵی بوژاندنەوەی قیادەی موەقەتەیان دەدا کە ڕسوا بوبون.

وەزعی کوردستانی ئێرانیش تا دەهات بەرەو ئاڵۆزی دەچو، چونکە کوردەکانی ئێران داوای مافی خۆیاندەکرد. ئەو سەردەمە سێ هێزی کوردی و چەندین هێزی ئێرانی لە کوردستاندا دەسەڵاتیان هەبو، حیزبی دیموکرات لە ناوچەی موکریان، کۆمەڵەی شۆڕگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان لە ناوچەی ئەردەڵان، واتا ناوچەی سنە، مامۆستا شێخ عیزەدین لە زۆر شوێنی تر. ئەوکاتە کۆمیتەی ناوچەکان، لە شارەکاندا دروست بوبون و لە ئەنجامدا هەمو بریاریاندا کە مامۆستا شێخ عیزەدین بکرێتە ریش سپی خۆیان و ئەویش وەکو سەرکردەیەکی سیاسی و رۆحی هاتبوە پێش و کۆمەڵەش پشتیوانی بەرامبەر حیزبی دیموکرات لێدەکرد.

ئێمەش پەیوەندیمان لەگەڵیاندا زۆر باشبو، لەبەئەوە دەتوانین بڵێین سێ هێزی کوردی لەسەر ساحەکەدا خۆیان دەنواند. جگە لەو هێزانە، هێزی تریش هەبون کە دەسەڵاتیان لە ناوچەی کرماشاندا هەبو، وەک چریکهای فیدای خەلق و موجاهیدینی خەلق و خەتی ئیمام پەیڕەوان.

باری کوردستانی ئێران هەنگا و بە هەنگاو بەرەو ئاڵۆزبون دەچو. دیارە ئەوکاتە سیاسەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەسەر بناغەی کوردستانییەت دامەزرابو، پێی وابو یەکێتی پێویستە لە جیاتی هاوکاری دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بکات، هاوکاری هێزە شۆڕشگێڕەکانی کودستانی ئێران و تورکیا بکات.

# پشتگیریی کوردی ئێران

*** یەکێتی بڕیارێکی سیاسی هەبو، چۆن مامەڵە لەگەڵ کوردی ئێران لەلایەک و حکومەتی ئێرانیش لەلایەکی تر بکات؟**

- کە بارودۆخی کوردستانی ئێران ئاڵۆزبو، ئێمە ئەم مەسەلەیەمان بە دور و درێژی لەناو خۆماندا باسکردوە و بڕیارمانوابو پشتیوانی لە کوردی ئێران بکەین. ئەو قسەیە بۆیە دەکەم، چونکە لە پاشاندا لێپرسراوانی ئاڵای شۆڕش کە جیابونەوە و بۆئەوەی خۆیان لە ئێران نزیک بخەنەوە، هێرشێکی گەورەیان کردەسەرمان کە گوایە تەنها من و نەوشیروان و مولازم عومەر بە ئارەزوی خۆمان، بڕیاری هاوکاری حیزبی دیموکرات و کوردی ئێرانماننداوە.

بەڵام سیاسەتی ئێمە لە هاوکاری لەگەڵ کوردی ئێران، زۆر کۆنتربو لەو هەڵوێستەی ئەوان باسیاندەکرد، چونکە پەیوەندی و هاوکاری ئێمە هی سەرەتای ۱۹۸۰ نەبو، بەڵکو هی سەرەتای شۆڕش بو کە هێزەکانی کوردستانی ئێران هاوکاری ئێمەیان دەکرد و ئێمەش بەهەمان شێوە.

بەڵام ئەو قسانەیان کردبو، بۆئەوەی خۆیان لە کۆماری ئیسلامی نزیک بخەنەوە و ئێمە لە بەرچاوی کۆماری ئیسلامی، وەکو دوژمنی سەرسەخت بدەنە قەڵەم.

کە ئاڵۆزی کەوتە نێوان هێزەکانی کورد و حکومەتی ئێرانەوە، بە شەڕێک دەستی پێکرد. بەداخەوە ئێمە ئەو شەڕەمان بە باش نەزانی، بە شەڕی براکوژیمان دایە قەڵەم، بەڵام پشتیوانی کوردی ئێرانمان کرد و ئەو هەڵوێستەمان بە باش زانی.

# یەکێتی وەک ناوبژیکەر
# لەنێوان کوردی ئێران و کۆماری ئیسلامیدا

*** ئێوە هیچ هەوڵێکتاندا بۆئەوەی، شەر لەنێوان هێزەکانی کوردستانی ئێران و حکومەتی ئێراندا رونەدات؟**

– من نامەیەکم بۆ ئایاتوڵڵا مونتەزیری نوسی، پێشتر من چوبومە ماڵی و لەو زیارەتەی کە بۆ قومم کرد و زیارەتی ئیمام خومەینیم کرد لە ماڵی ئەو دابەزیم. ئەو پەیوەندییەشم بەهۆی موحەممەد مونتەزیری کوڕیەوە دروستکردبو کە دۆستێکی عەرەبی نزیکی ئێمە، حازم (عەبدولجەبار کوبەیسی) ئێمەی ناساند بە محەمەد مونتەزیری.

لە نامەکەمدا نوسیبوم: "کە واباشە شەڕ نەبێت و شەڕ لە نێوان موسوڵمانان خراپە و بۆ کۆماری ئیسلامی زۆر خراپە و کورد سوننەیە و ئێوە شیعەن، ئەو شەڕە هەم بە دژایەتی کورد دادەنرێ، هەم بە دژایەتی شیعە بۆ سونە دادەنرێ، لەبەرئەوە وا باشە ئێوە گیروگرفتەکان بە ئاشتی چارەسەربکەن". وێنەیەک لەو نامەیەشم نارد بۆ مەهدی بازرگان کە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بو.

دوایی زانیم کە ئایاتوڵڵا حوسێن عەلی مونتەزیری نامەکەی من دەباتە لای ئیمام خومەینی و ئیمام موافەقەت دەکا و دەڵێ "نابێ شەڕی کورد بکەن"، دوایی داریوشی فروهەر بۆی گێڕامەوە، وتی کە باسی شێخ عێزەدینی حوسەینی زۆر بە ناراستی کرابو.

لە پاشان ئەوەبو ئێمە لەسەر ئەو پەیوەندییە رۆیشتین، ئیتر ئەوانیش گوتیان باشە ئێمە ئامادەین شەڕ رابگیرێت و وەڵامی نامەکەیان دامەوە، "ئامادەن ناوبژی ئێمە قبوڵبکەن". ئەوەبو ئێمە لەنێوان کوردی ئێران و دەوڵەتی مەرکەزیدا ناوبژیمانکرد. پاشان چوار وەزیری ئێرانی: وەزیری کیشوەر، وەزیری کار کە

ئاغای داریوشی فروهەر بو لەگەڵ دو وەزیری تر لەگەڵ فەرماندەی ژەندرمەرە هاتن، بەهۆی ئێمەوە دەستیانکرد بە گفتوگۆ لەگەڵ حیزبی دیموکرات لە ناوچەی سەردەشت.

ئێمە چاوپێکەوتنەکەمان رێکخست و لەدێی (بەنو خەڵەف) کۆمانکردنەوە، ئێمە بەرپرس بوین لە هێنانی ئەوان و لە سەلامەتی ئەوان. دانیشتنەکە بە ئامادەبونی نوێنەرانی حیزبی دیموکرات، مامۆستا شێخ عێزەدین، کۆمەڵە و چریکی فیدایی خەڵک بو.

پاش هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر، توانیان (هەیئەتی نمایندەگی خەڵکی کوردستان) دروستبکەن بە سەرۆکایەتی مامۆستا شێخ عێزەدین و بە بەشداری ئەم چوار لایەنە، لەگەڵ هەیئەتی نمایندەگی قسەکرا و ئەنجامەکەی بوە راگرتنی شەڕ و پێکدادان.

کە شەڕ وەستا، بەلای ئێمەوە ئەوە سەرکەوتنێکی گەورەبو، هەم بۆ کورد و هەم بۆ کۆماری ئیسلامی و هەم بۆ یەکێتی نیشتمانی کوردستان، چونکە رێگای چارەسەری سیاسی کرایەوە. ئەوکاتە کۆماری ئیسلامی تازە کۆرپەبو، هەمو کەس خۆشی دەویست، نمونەی بەرگری بو لە دژای ئیمپریالیزم و دەوڵەتە کۆنەپەرستەکان و وەک قەڵایەکی گەورەی ئازاد، دژ بە کۆنەپەرستی و ئیمپریالیزم و نۆکەرانی سەیر دەکرا.

لەبەرئەو هۆیانە، یەکێتی دوای ئەوەی نوێنەرانی حکومەت و کوردی بەیەک گەیاند، لە کێشەکە هاتەدەرێ و کارەکەی بۆ هەردو لا بەجێهێشت. ئەو هەڵوێستەی یەکێتی نیشتمانی بو بەهۆی ناڕەزایی باڵە توندڕەوەکانی ناو حکومەت، داوای ئەوەیان دەکرد کە دەبێ گیرگرفتی کورد لە ئێران، بە شەڕ و کوشتار چارەسەربکرێت.

کۆمەلێک لە دەسەڵاتدارانی حکومەت کەوتنە ئەوەی کە شەڕی ئێمە بکەن و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە دژی (ئینقیلاب) بدەنە قەڵەم، بۆ ئەمکارە قیادەی موەقەتە و جەماعەتی رەسوڵ مامەند کە حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتوی کوردستانیان دروست کردبو، ئەوانیش زۆر درۆی ناڕاستیان لای ئێرانیەکان کردبو. هەرچی باسی خراپی هەیە دژی ئێمە کردبویان، بۆئەوەی تا بۆیان بکرێت باڵە توندڕەوەکەمان بکەن بەگژا و ئێمەیان وەک پشتیوانانی کوردی ئێران و دژی حکومەت ئەدایە قەڵەم.

# هێزی پشتیوان

*** کاتێ گفتوگۆی نێوان کورد و حکومەتی ئێران سەری نەگرت و شەڕ دەستپێیکرد، هەڵوێستی یەکێتی چی بو؟**

- کە شەڕی نێوان هێزی کوردی و حکومەت کە بە شەڕی (سێ مانگە) ناودەبرێت دەستپێکرد و حکومەتی ئێران شارەکانی گرتەوە و کوردەکانی ئێران ناچاربون بکشێنەوە وبەرەو ناوزەنگ و توژەڵە هاتن، لەوانە برادەرانی حیزبی دیموکرات، کۆمەڵە، مامۆستا شێخ عێزەدین، کومەڵێک لە حیزبی تودە و چریکهای فیدایی خەڵق و جەماعەتی خوشکە ئەشرەفی دێهقانی. ئێمەش بە گەرمی لەوێ پێشەوازیمان لێکردن و ئەوەندەی پێمانکرا بەپێی توانا یارمەتیماندان و دریغیمان نەکرد لە هاوکارییان، من پێموایە ئەوە یەکێکە لە شانازیەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەرامبەر بە کوردستانی ئێران.

ئەو هەڵوێستەی ئێمە بو بەهۆی نزیکبونەوەی زیاتر لە حیزبی دیموکرات و بەینمان لەگەڵیاندا خۆشتربو، بۆ کوردی ئێرانیش دەرکەوت، ئێمە پشتیوانی ڕاستەقینەی ئەوان بوین. ئەوناوە کە بە هەق بەسەرماندابڕا (هێزی پشتیوان)، بەڕاستی هێزی پشتیوانبوین و لە هاوکاری لەگەڵ ئەواندا هیچ دریغیمان نەدەکرد، ئەو هاوکاریە بوە بەردی بناغە بۆ دۆستایەتیەک، لەگەڵ گروپە ئێرانیەکانی تری ئێرانیشدا.

لە هەمان کاتیشدا پەیوەندیمان لەگەڵ کۆماری ئیسلامیشدا هەبو وە هەوڵمان دەدا ئەو پەیوەندیە نەپسێنین، بەڵام بەداخەوە توندڕەوەکانی ناو ئێران، ئەوانەی پێیانوابو، ئەبێ بە شەڕ مەسەلەی کوردی ئێران چارەسەربکرێت، کەوتنە دژایەتیمان و موشاغەبەیان لەسەر دەکردین، بوەهۆی ئەوەی ساردی بکەوێتە نێوانمان و بەوهۆیەوە نەهێڵن ئەو چەکانەی لە سوریاوە بۆمان هاتبو بگاتە دەستمان. دکتۆر چەمران[٤] زۆر دەورێکی خراپی بینی لە دەستگرتن بەسەر چەکەکانماندا، دوایی زانیمان کە چەکەکانمان پاسداران دەستیان بەسەردا گرتوە و بۆ خۆیانیان بردوە. ئەوەش لەکاتێکدا بو کە ئێمە زۆر پێویستمان بە چەک هەبو، ئەگەر ئەو چەکانەمان پێ بگەیشتبایە دەمانتوانی هێزێکی گەورە دروست بکەین و ناوچەی زیاتر ئازادبکەین.

## پەراوێزەکان:

١- (ئەو باڵەی کە لەگەڵ ڕەسوڵ مامەند و هاوڕێکانی نەرۆشتن، بریتی بون لە: عومەر مستەفا "دەبابە"، جەمال حەکیم ئاغا، عەلی حەوێز، نازم عومەر، مامۆستا شەریف مەولود، عەزیز بەگ، سوار ئاغای عباس ئاغای سەرکەپکان، عومەر عەبدوڵڵا، عومەر عەزیز، تەمەنی بزوتنەوەی سۆسیالیست لەناو یەکێتی، پاش جیابونەوەی باڵی رەسوڵ مامەند، درێژ نەبوو بەڵکو تەنها ٣ ساڵ و شەش مانگ و نیو بوو، لە نەورۆزی ١٩٧٩ دەست پێ دەکا و لە ١١ ئەیلولی ١٩٨٢ کۆتایی دێ.. دوابەدوای ئەمە، ئەندامانی بزوتنەوە بەردەوام بوون لەسەر کارکردن لەناو یەکێتیدا لەژێر چەتری یەکێتی شۆرشگێراندا). (ئینسکلۆپیدیای یەکێتی. ل.٩٨).

٢- لە ١٩٧٩/٨/٣ بزوتنەوەی سوسیالیست کۆبونەوەی فراوانی گرت کە ٣ رۆژی خایاند و سەرکردایەتی نوێیان دانا و ناوی خۆشیان گۆری بە (حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتوی کوردستان: حسیک)

٣- حیزبی بەعس لە ١٨ مایسی ١٩٧٨دا، ٢١ کادێری چالاکی حیزبی شیوعی ئیعدامکرد، ئەمە سەرەتای دژیەتی ئاشکرای بەعس بو بەرامبەر بە حیزبی شیوعی، لەوکاتەوە شیوعی هەستیانکرد کە زەمینەی مانەومیان لەگەڵ بەعس نەماوە و وردە وردە دەستیانکرد بە کاری کەمێ نەهێنی تا گەیشتنە پچراندنی پەیوەندی.

٤- مستەفا چەمران لە ١٩٣٢ لە دایك بوە، لە سەرەتای دامەزراندنی کۆماری ئیسلامیدا، وەزیری بەرگری بو، سەرپەرشتی پاسداران و هێرشەکانی دەکرد بۆسەر کوردستانی ئێران لە ١٩٨١/٧/٢١ لە شەڕی دژ بە عێراقدا کوژرا.



زستانی ١٩٨٠ قاسمەرەش



مام جەلال لە ساڵی ١٩٨٦ بەسیم لە سنوری ماوەت-
نیوان گوندەکانی بەرکورد و کاکی دەپەڕێتەوە



له راستەوە؛ مولازم عومەر، مام جەلال، نەوشیروان مستەفا، سالار عەزیز- ناوزەنگ ١٩٧٩




کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە لە مێرگەپان، ١٩٨٤/٧/٣٠

لەڕاستەوە: قادری حاجی عەلی، ئازاد هەورامی، جەبار فەرمان، مام جەلال



لەگەڵ پۆلێک پێشمەرگە- تۆژەڵە ١٩٧٩



لە راستەوە؛ مام جەلال، عومەر دەبابە، کوێخا قادر و کوێخا عەلی و؟
دانیشتووەکان؛ د.فواد مەعسوم، عومەر شێخ موس، نەجمەدین بویکا (سەلاح)

# گفتوگۆی یەکێتی ١٩٨٣

*** فکرەی گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی بەغدا، چۆن هاتە کایەوە؟**

- پێشتر باسی چەندین جۆرە گفتوگۆمانکرد، لەگەڵ حکومەتی عێراقدا کە بە هاتنی عومەر دەبابە بۆ شام دەستیپێکرد، تا ئەوەی عەلی عەسکەریمان ناردەوە و سەدام حسێنی بینی، ئینجا کە لە قەندیل بوین و جارێکیان هەمزەی باپیرئاغا و جارێکیشیان شێخ مەحمودی کارێزە هات.

ئەم جارەیان خۆمان دەستپێشخەریمانکرد، ئەویش کاتی کۆنگرەی نەتەوەیی عەرەبی لە بەغدا دەبەسترا، بەهۆی ئەوەی ئەنوەر سادات چوبو بۆ ئیسرائیل، ئێمە بە پێویستمانزانی بەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە نامەیەک بنوسین بۆ ئەحمەد حەسەن بەکر و پێی بڵێین، "ئەگەر بێت و عێراق هاوکاری خەباتی رزگار کردنی فەلەستین بکات و هێز بنێرێت و بەرەی خۆرهەڵات ببوژێنێتەوە و هێزی بنێرێت بۆ سوریا، ئەوا ئێمە ئامادەین (ئاگربەست)ێک لەگەڵ حکومەتدا مۆربکەین و دەستبکەین بە گفتوگۆ بۆ چارەسەرێکی سیاسی مەسەلەی کورد".

ئەوانە هیچ وەڵامێکیان نەدایەوە، تا هاوینی ١٩٨٢، رۆژێکیان دکتۆر قاسملۆ نامەیەکی نووسیبو، دەڵێ "دەمەوێ سەردانی تۆ و عەزیز محەمەد بکەم و ئەمەوێت هەردوکتان پێکەوە ببینم، لەبەرئەوە پێمباشە لەنێوان خۆتاندا لەسەر شوێنێک بۆ بینین پێکبێن".

نامەکە لە پێشەوە گەیشتبوە دەست عەزیز محەمەد، چونکە ئەو لە نۆکان بو، واتا لەسەرە رێ بو، من ئەوکاتە لە توژەڵە بوم، بۆیە عەزیز محەمەد نامەکەی دکتۆری بۆ ناردبوم لەگەڵیا نوسیبوی: "من پێم باشە ئەم کۆبونەوەیە لای تۆ بێت، چونکە (مائیدەی یەکێتی عامیرترە لەهی ئێمە) و جێی ئێوەم بەلاوە خۆشترە، لەبەرئەوە وام پێباشە لای ئێوەبێت و ئێمەش دێین".

ئێمەش وەڵامی دکتۆرمان دایەوە کە ئێمە ئامادەین، ئەوەبو دکتۆر هات و عەزیز محەمەدیش دو برادەری لەگەڵدابو، من و نەوشیروان و مولازم عومەریش لەگەڵی

دانیشتین و گوتی: "من لە بەغداوە هاتوم و راسپاردەم پێیە"، من وەک جاران گاڵتەم لەگەڵ کرد و گوتم: "دەی با بزانین راسپاردەکەت لە سەرۆکەکەتانەوە چیە"؟ ئەویش گوتی: "من راسپاردەم پێیە کە حکومەتی عێراق ئامادەیە گفتوگۆتان لەگەڵدابکات، لەگەڵ ئێوە و لەگەڵ حیزبی شیوعی و بزانێت داخوازیتان چیە؟ تاکو چارەیەکی سیاسی بدۆزرێتەوە، بۆ وەزعی کوردستان و وەزعی عێراق بەگشتی".

ئێمەش هەندێ پرسیارمان لەمێشکدا هەبو و لێمان پرسی، ئەویش هەرچەندی توانی رونکردنەوەی داینێ. هەردولامان داوای مۆڵەتمان لێکرد، بۆئەوەی لەگەڵ سەرکردایەتی خۆمان باسی بکەین.

ئێمە، پاش ماوەیەک وەڵاممان دایەوە کە "ئامادەین گوێ بگرین لە رای حکومەتی عێراق و بزانین دەڵێ چی؟ بەڵام نامانەوێ ناوی گفتوگۆی لێبنرێت و دەمانەوێ بزانین حکومەت چی پێیە"؟.

حیزبی شیوعی دو بۆچونیان هەبو، عەزیز محەمەد بە تایبەتی بە منی گوت: "ئێوە باشە لەسەری برۆن"، بەڵام کە خۆیان کۆبونەوەیان کردبو، لیژنەی ناوەندیان وەڵامیان دابۆوە، ئەوان گفتوگۆ لەگەڵ ئەم حکومەتە ناکەن و بارودۆخی ئەوان لەبارنیە بۆ گفتوگۆ.

**بۆچی حکومەت تەنها لەگەڵ یەکێتی و شیوعی هەوڵی دانوستانیدا، ئایە پەیوەندی لەگەڵ پارتیش کردبو؟**

– عەزیز محەمەد، پێشنیارێکی کرد و گوتی: "من وەکو بیستومە حکومەت پەیوەندی لەگەڵ پارتیش کردەوە، بۆئەوەی حکومەت مەسەلەی کورد نەخاتە ململانێی نێوان یەکێتی و پارتیەوە، لەگەڵ لایەنێک رێکبکەوێت، بە کەمترین داخوازی رازی دەبێت، واباشە هاوئاهەنگی هەبێ لەنێوان ئێوە و پارتیدا، ئەگەر ئێوە لاریتان نیە من ئامادەم ئەو هاوئاهەنگیە بکەم.[1]

ئێمەش لە مەکتەبی سیاسی باسی هەمان مەسەلەمان کردبو، بۆیە گوتمان: "بەڵێ باشە، تۆ برۆ لەگەڵ مەسعودا قسە بکە، با ئێمە هەردولامان تەنسیق بکەین و یەک هەڵوێستمان هەبێت لە مەسەلەی گفتوگۆ و توشی ململانێ نەیەین".

ئێمە بە عەزیز محەمەدمان گوت کە لەسەر سەفەربو، گوتمان "پرسێک بە سۆڤێتەکان بکە و بزانە ئەوان ئەڵێن چی؟ ئەگەر دەتوانن با ئەوانیش قورسایی خۆیان بخەنەگەڕ و ئەگەر پێیان باشبو، ئەوا ئێمە وەڵامیان ئەدەینەوە".

پێش ئەوەی عەزیز محەمەد سەفەری دەرەوە بکات، روسەکان وەڵامی ئیجابیان

دابۆوە و حکومەتی عێراق دو کەسیان نارد بۆلامان. ڕۆژێک حیزبی دیموکرات هەواڵی داینێ و گوتیان: دو کەسی عێراقی دێن، بەڵام یەکەمجار ناوێرن بێنە بارەگای ئێوە و دێنە لای ئێمە لە گۆڕەشێر.

گۆڕەشێر لە سەرکردایەتی ئێمەوە لە ناوزەنگ، نزیکی سەعاتێک دوربو، پێشنیازیان کردبو کە ئێمە بچین لەوێ بیان بینین. ئێمەش بڕیارماندا من و نەوشیروان و هەندێ لە برادەرانی تر بچین، کە چوینە لای حیزبی دیموکرات، دو کەسی عێراقی لەوێ بون یەکێکیان ناوی (ئەبو ئەحمەد) بو دوایی بۆمان دەرکەوت کە عەقید (خەلیل شاکیر)ی ناوە، ئەوی تریان ناوی (ئەبو عودەی) بو، دەیناسیم و خۆی بەبیری هێنامەوە و گوتی: "من مولازم بوم لە دوکان و تۆم دیوە و تۆ ئەو کاتە لێپرسراو بویت و ئێمەمانان لە خوارێ دادەنیشتین کە تۆ لەگەڵ لێپرسراوەکانی ئێمە دادەنیشتی". ئەوان وایان دەست پێکرد، کە "سەرۆک سڵاوی هەیە و باری وڵات لە مەترسیدایە و مەترسی ئێران ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەکات".

کە لە قسەی خۆی بۆوە، ئێمەش پێمان گوت، "کاکە خۆت دەزانی ئێمە هەر لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە لایەنگری چارەی سیاسی مەسەلەی کوردین" و بۆمان ژمارد کە چەندجار هەوڵی گفتوگۆدراوە، باسی هاتنی عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری و هەمزەی باپیرئاغا و شێخ مەحموی کارێزەمان بۆ کردن، هەروەها نەوشیروان بەبیری هێنایەوە و گوتی: "کە شەڕ لەگەڵ ئێراندا هەڵگیرسا، ئێمە وەفدێکمان نارد بۆلای ئێوە و ئێوە قبوڵتان نەکرد".[٢]

هەروەها ئەوەم لەبیرچو بۆت باسبکەم، بەڕاستی ئەو کاتە لە عێراق نەبوم، من چوبوم بۆ سوریا و لیبیا، ئەوانە لە غیابی مندا مەکتەبی سیاسی و بەبێ ئەوەی تەنانەت ڕەئی منیش وەربگرن، بڕیاریاندابو گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتدا بکەن.

ئەوەشمان بەبیر هێنایەوە و گوتمان هەرچەندە ئێمە دژی ئەو شەڕەین کە ئێوە لەگەڵ ئێران هەڵتانگیرساندوە و پێمانوایە شەڕێکی ناڕەوایە و ناڕاستە و نابەجێیە و ناوەختە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە وەکو عێراقی نەمانویست لە دژی سوپای عێراق بوەستین و زۆرتر ویستمان هەستی سوپای عێراقی بجولێنین کە ئێمە سوپای عێراقی بە سوپای خۆمان دەزانین و پێمان خۆش نیە، لە کاتێکدا لە جەنگێکدایە لەگەڵ هێزێکی دەرەکی، ئێمە بێین و شەڕی بکەین، لەبەرئەوە ئێمە ویستومانە گفتوگۆ بکەین، بەڵام ئێوە وەڵامتان نەبوە.

ئێستاش دەمانەوێت بزانین ئێوە چی دەڵێن و چی ئەدەن بە کورد، ئەوان زۆرتر سوربون لەسەرئەوەی کە ئێمە وەفد بنێرین و نوێنەرمان بچێت.

*** ئێوە مەبەستان بو تەنها بیانبینن، یاخود وەفدیشتان بنێرن بۆ بەغدا؟**

- ئێمە ئەوکاتە بڕیاری وەفد ناردنمان نەبو، دەمانویست بزانین حکومەت چی دەدا، نەمان دەویست پەیوەندیەکە بپسێنین و بڕیاریشمان نەبو، بە قوڵی بچینە ناو مەسەلەکەوە، گوتمان ئێوە بۆچونی ئێمە دەزانن، بڕۆنەوە و رای ئێمەیان پێ بگەیەنن و با ئێمەش بزانین کە حکومەت هەڵوێستی چیە و ئاگادارمان بکەنەوە.

ئێمە واخۆمان نیشاندا کە ئامادەین و هەڵوێستمان باشە، لە هەندێ جێگادا کە پێویست بو تونددەبوین و لە هەندێ جێگای تر کەمێ هێمنتر. بیرمە کە هەڵسابن مەلا عەبدوڵڵا حیاکی (عەبدوڵڵای حەسەن زادە) زۆر مەدحی هەڵوێستی ئێمەی کرد، گوتی: "وەڵڵا نەمدەزانی ئێوە سیاسەتیش باشدەزانن، وامدەزانی تەنیا شەڕ و کاری حیزبی باشدەزانن".

ئەوان ڕۆیشتنەوە و ماوەیەکی پێچو، نامەیەکمان بۆهات. دوایی دەرکەوت تاریق عەزیز ناردوێتی، بەڵام نامەکە بەبێ ناونیشان و بەبێ ئیمزا بو، واتا نەنوسرابو بۆ کێیە و هی کێیە. گوایە ئەمە هەندێ بۆچون بو، لەو بۆچونانە باسی برایەتی کورد و عەرەب و چەسپاندنی یەکێتی نیشتمانی عێراق و بەیانی ئازاربو، کە بە بناغە دانرابو، بەڵام دو خاڵی تێیدابو، یەکێکیان ئەڵێ بەیانی ئازار (ئەتوانرێت گەشەی پێ بدرێت) و حوکمی زاتیش بە هەمان شێوە. ئەوانە بڕیارێک نین نەگۆڕێن، مەسەلەی پێشمەرگەش کە ئێمە لەگەڵیاندا باسمانکردبو، دەڵێ بۆ پێشمەرگە لەکاتی شەڕدا پێویستە، ئەگەر پێکهاتین بۆ بەرگری لە نیشتمان، پێشمەرگە دەبێ هەبێ، بەڵام کە شەڕ تەواوبو، پێویستە باسی لێوە بکەین، چونکە حەلکردنی پێشمەرگە بە بڕیارێکی سادە چارەسەر ناکرێ و ئێمە هاونیشتمانی یەک وڵاتین، بۆیە پێویستە گیروگرفتەکان بە گفتوگۆ چارەسەربکەین.

ئێمەش لە وەڵامی ئەو نوسینەدا، وەڵامێکمان ناردەوە، لە ئەنجامدا ئەوان پێشنیازیانکرد، ئێمە یەکێک بنێرین بۆلایان، ئێمەش گوتمان باشترە کە ئێوە وەڵامی نوسینەکەی ئێمە بدەنەوە، ئەوکاتە نوێنەر دەنێرین.

لە شوباتی ١٩٨٣دا، جارێکی تر وەفدەکەی حکومەت هاتنەوەوە، هەمان دو کەسی پێشو بون و وەڵامی ئەو نامەیەی ئێمەیان هێنابۆوە، ئەمجارەیان ئیجابیتربون.[٣]

# گفتوگۆ و ڕۆڵی دەرەوە

*** ڕێکخستنی یەکێتی لە دەرەوە گلەییان دەکرد کە وەک پێویست لە کاتی خۆیدا، ئاگادارنەکراونەتەوە کە یەکێتی لە گفتوگۆدایە لەگەڵ بەغدا؟**

– حەز ئەکەم لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە بیڵێم، ئەویش ئەوەیە، زۆر کەس دەڵێن ئێمە ئاگاداری ئەو گفتوگۆیە نەبوین و گلەییان هەبو کە پرسیان پێنەکراوە.

ڕاستیەکەی ئێمە بە برادەرانی دەرەوەمان گوتبو، پێمان گوتبون کە بە سوریا و لیبیا بڵێن کەوا یارمەتیمان لێبڕاوە، ئێران ڕێگای لێگرتوین و وەزعمان خراپە، بۆیە ناچارین گفتوگۆبکەین. جگە لە عومەر دەبابە، بە لیبیەکانی گوتبو، ئەوانی تر وەک دکتۆر فوئاد و برادەرانی تر، لە شام بون، هیچیان بە حکومەتی سوریا نەگوتبو، کاتێکیش دکتۆر فوئاد و کاک دارۆ باسیانکرد کە ئاگادارنەکراون و گوایە ئەو بروسکانەی ئێمە بۆمان لێداون لەو بارەیەوە ڕون نەبون.

من بڕوای خۆم ئەوەیە، چونکە عومەر دەبابە بڕوای بە گفتوگۆ هەبوە و بە پێویستی زانیبو و کاری بۆکردبو، بەڵام چونکە دکتۆر فوئاد و ئەوان لەگەڵ گفتوگۆنەبون و واشیانزانی ئەمجارەش وەکو جارەکانی ترە و ڕەنگە سەرنەگرێ، لەبەرئەوە بەپێویستیان نەزانیبو ڕاستیەکانیان بە سوریەکان و بە دۆستەکانی ناو بزوتنەوەی عێراقی بڵێن. هەرچەندە ئێمە حیزبی شیوعیمان نەک هەر ئاگادارکردبۆوە، بەڵکو هەنگاو بە هەنگاو لە قۆناغی بەرەوپێشەوە چونی گفتوگۆکە ئاگادارمان کردبونەوە.

بۆ نمونە، نوێنەرانی حکومەت هاتن بۆ گۆڕەشێر، من هەمان ڕۆژ، پاش ئەوەی لەوێ گەڕامەوە، ڕاستەوخۆ بەوێدا چومە لای عەزیز محەمەد و باسی دانیشتنەکەم بۆ گێڕایەوە. ئەویش گوتی: "کارێکی زۆر باشتانکردوە" قسەکانی منی زۆر بەدڵ بو، دوابەدوای ئەوە کەجاری تر هاتنەوە، ئێمە هەمو مەسەلەکانمان لەگەڵ کەریم

ئەحمەددا باسکرد کە بە سەرۆکایەتی وەفدێکی حیزبی شیوعی هاتبون بۆلای ئێمە. واتا ئێمە حیزبی شیوعیمان لە هەمو هەنگاوەکانی گفتوگۆ ئاگادارکردۆتەوە، ئەوان ئەیان ویست ئێمە و پارتی یەک بۆچونمان هەبێت بەرامبەر بە گفتوگۆ و روسەکانیشیان ئاگادارکردەوە.

# چونی یەکەم وەفد بۆ بەغدا

*** کەی و کێتان یەکەمجار نارد بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆ؟**

- لە مانگی مارتدا، ئەوان داوای ئەوەیانکرد، یەکێکی ئێمە بچێت بۆ بەغدا، ئێمە فەرەیدونمان لەکۆتایی تشرینی یەکەمی ١٩٨٣دا نارد، بەلام بەناوی نەخۆشییەوە ناردمان. جگە لە من و نەوشیروان و دوسێ برادەرانی مەکتەبی ساسیی، کەس ئاگای لێنەبو.

وامان باسکرد کە فەرەیدون نەخۆشە و حیزبی دیموکرات دەیبات لە بەغدا عەمەلیاتی بۆدەکات، ئەوەبو فەرەیدونیان برد و چارەسەریشیان بۆکرد، بەلام لە هەمان کاتدا فەرەیدون هەم بەرزانی برای سەدامی دیبو، هەم تاریق عەزیزی دیبو.

بەرزان، ئەوکاتە بەرێوەبەری موخابەرات بو، و ئەوکەسەبو کە هەموجارێ وەلامەکانی دەناردەوە و خەلکی دەنارد بۆلای ئێمە. هەتا گلەییەکی لەمن کردبو لای دوکتۆر قاسملۆ، کەوا حوکم کەوتۆتە دەست ئێمە، واتا "کاکم و من، ئێمە وای بۆ دەچین، مام جەلال وەکو یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکە لەگەلماندا دەبێت، نەک لە شاخ چەک هەلگرێ لە دژمان".

منیش وەلامم دایەوە، "ئێمە هەمیشە هەولماندادوە کێشەکە بە ئاشتی چارەسەربکەین، بەلام ئێوە نەتانویستوە". بارزان مەسەلەکەی بە گەرمی گرتبو، بۆ هەق و بۆ مێژو، ئەو دەیویست ئەو گفتوگۆیە سەربگرێ و بیکاتە سەرکەوتنێک بۆ خۆی. واتا چۆن کاکی بەیانی ئازاری بە سەرکەوتنێکی خۆی دانابو، پێموایە بارزانیش ئەم گفتوگۆیەی وا ئەویست، یەکێک لە سیفاتەکانی بارزان ئەوەبو، زۆر چاوی لە سەدام دەکرد.

لە بەغدا، زۆر ڕێزیان لە فەرەیدون گرتبو، زۆر ئیجابی بوبون لەگەڵیدا و گوتبویان ئەو داخوازیانەی ئێوە داوای دەکەن، هەموی داخوازی ڕەوایە و ئێمە هەمویمان قبوڵە، بەڵام بەڕاستی مەسەلەیەک هەیە دەمانەوێ پێتان بڵێین، ئەویش ئەوەیە کە (القائد الضرورة) مان هەیە و سەدام ئەو سەرکردە پێویستەیە، ئەو کاتە سەدام زۆر گەورە دەکرا و باس لە (القائد الضرورة، القائد الاوحد، القائد التاريخي) و چەندەها ناوی لەو جۆرە ئەکرا.

بەرزان هەواڵی ناردبو کە لەکاتی شەڕدا، سەدام هەمو دەسەڵاتێکی هەیە، بۆیە تەنها سەدامیش ئەتوانێ لەگەڵ مام جەلال وەک سکرتێری گشتی قسە بکات. ئەگەر ئەتانەوێت مەسەلەکە ببڕێتەوە، با مام جەلال بێت و ئێمە هەمو بەڵێنێک دەدەین و هەمو شتێک دەکەین و ڕێزی دەگرین.

هەروەها بە فەرەیدونیان گوتبو، حکومەت ئامادەیە ئەو یارمەتییە داراییەی دەرەوەی یەکێتی کە لە ئەنجامی گفتوگۆ لێی دەبرێت، قەرەبوی بکاتەوە، واتا پارەیەکمان بدەنێ.

بەڕاستی فەرەیدون زۆر کەمی داوا کردبو، ئەگینا ئەمانتوانی پێشەکی هی ساڵێکیان لێوەرگرین. بۆئەوەی ئەگەر یارمەتی دەرەوەشمان لێبڕا، توشی گیروگرفت نەیەین و پەکمان نەکەوێت.

کە فەرەیدون هاتەوە، من لە دۆڵە ڕەقە بوم و کاتی شەڕی بێتواتە بو وە سەرکەوتنی گەورەمان بەدەستهێنابو. یەکەمجاریبو ناحییەیەک بگرین و ناوچەیەکی گەورە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتمان و سەدان پارچە چەک و تەقەمەنیەکی زۆرمان دەستبکەوێت.

*** ئایا ڕێکخستنەکانی یەکێتی و هێزی پێشمەرگە ڕازی بون لەسەر ئەو گفتوگۆیە؟**

– کاتێ کە ئەوان گوتیان، دەبێت من بچم بۆ بەغدا و ئەگەر منیش بچم، دکتۆر قاسملۆ لەگەڵمان دێت، ئێمە لە مەکتەبی سیاسی بریارماندا بچین. بەڕاستی من زۆرتر حەزەر بوم و برادەرانی تر زۆرتر سوربون لەسەر چونم، من زۆر پەرۆشی چونی بەغدا نەبوم، بۆیە گوتم: پێویستە ئێمە پرسی هەمو کادێرەکان بکەین، بە مەرجێ ئازاد هەورامی و نەوشیروان ئاگاداربن و سەرپەرشتی بکەن".

ئازاد هەورامی، چوبو جەولەیەکی کردبو و لە کۆنفراسەکانی کۆمەڵە ئامادەبوبو، گوتی "من لە هەمو کۆبونەوەکاندا باسمکردوە و تاکە برادەرێک لەناو کۆمەڵەدا دژی گفتوگۆ نەبوە"، هەروەها لە شۆڕشگێڕانیش لێمپرسین، گوتیان: "نەخێر ئێمە

کەسمان دژ نین".

ئینجا من خۆم کادیرەکانی پێشمەرگەم کۆکردەوە، ناردم هەرچی لێپرسراوی پێشمەرگە هەیە هاتن بۆ بالیسان و لەوێ لە مزگەوتی بالیسان کۆمکردنەوە، کادیرەکان تا ئاستی رابەری سیاسیشم بانگکردبو. پرسیم کە رایان چیە لەسەر گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتدا. ئەوانە بەگشتی رازی بون، تەنها یەک برادەر نەبێت، زۆرجارێ ناوی دەڵێمەوە ناوی پۆڵایە و موهەندیسە، کورێکی زۆر چاکە و خەڵکی کەرکوکە، رابەری سیاسی بو، گوتی: "من لەگەڵ گفتوگۆم، بەڵام من پێم وایە لەکاتی گفتوگۆدا شەڕ را نەگرین، واتا هودنە نەکەین، ئەگینا من لەگەڵ گفتوگۆم".

هیچ کەسێ لەناو ریزی پێشمەرگە دژی گفتوگۆ نەبو. پێش ئەوەش ئێمە بە پێنج، شەش مانگ پرسێکمان بە خەڵکی شارەکان کردبو، شێرکۆ بێکەس و چەند برادەرێکی ترمان سەرپشک کردبو کە لە سلێمانی و شارەکانی تر بون کە پرس بە ئەدیب و رۆشنبیر و شاعیر و مامۆستای زانکۆ و کەسانی ناسراو بکەن بۆ مەسەلەی گفتوگۆ، ئەوانە هەمویان هانی گفتوگۆیاندەدا و پێیان باشبو.

ئێمەش بە دکتۆر قاسملۆمان راگەیاند کە ئێمە ئامادەین بۆ گفتوگۆ. کاتێک هاتەسەر چونی خۆم، بریاریاندا بچم بۆ بەغدا. کۆبونەوەیەکی کۆمیتەی سەرکردایەتی کراو بە گشتی دەنگ جگە لە دەنگی خۆم، بریاریاندا کە بچم. کە چونمان هاتەپێشەوە، دکتۆر قاسملۆ هات و لەوانیش موقەدەمێکی ئیستخباراتی عەسکەری هات و بە هێلیکۆپتەرێک، هاتنە دێی زیخان و لەوێوە دابەزین و لەگەڵ برادەران سواربوین.

*** کێ بون ئەندامانی وەفدەکە، کێ پێشەوازی لێکردن و یەکەم کۆبونەوە لەگەڵ کێ دانیشتن؟**

- ئەو برادەرانەی لە وەفدەکە لەگەڵما هاتن، بریتی بون لە: مولازم عومەر، فەریدون، دکتۆر خدر، مەلا بەختیار و چەند برادەرێکی تر کە گەیشتینە ئەوێ، پێشوازیەکی باشیانکردین و وەفدی عێراقیش بە سەرۆکایەتی (هیشام سەباح فەخری) بەرێوەبەری موخابەراتی گشتی بو، چونکە لەو ماوە کورتەدا بارزانی برای سەدام لابرابو لە لێپرسراوێتی. کۆبونەوەکان لە سەرەتاوە بە باسکردنی شتی گشتی دەستپێیکرد، بۆچونمان لێک نزیک بو، بەڵام تا ورد تر ئەبوینەوە جیاوازی پەیدائەبو.

*** داخوازییە سەرەکییەکانی ئێوە چی بو؟**

– یەک راستیت پێ بڵێم و بە دەنگی خۆم تۆماری بکەم، ئەویش، پێش ئەوەی سەفەر بکەین بۆ بەغدا، من و نەوشیروان پێکەوە راوێژێکمانکرد و ئەو رای وابو، "ئەم گفتوگۆیە حەوانەوەیەکە بۆ ئێمە و بۆ خۆسازدانە و چەندی پێمان دەکرێت پارە و چەکیان لێوەرگرین، لە پاشاندا دەتوانین بە درێژی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی ئامادەبکەین و بەرنامەیەک بدەینە حکومەت، تا ئەوکاتە دەتوانین زۆرتر رای خەڵکیشمان وەرگرتبێت، بڕیارماندا و داوامان لە حکومەت کرد، گفتوگۆکە نەهێنی بێت".

نوێنەرانی حکومەت پێیان باش بو، گفتوگۆکە ئاشکرا بکەین و هەتا بە تەلەفزیۆن وێنەیان گرتین و گوتیان ئەوە بۆ ئارشیفە و بۆ بڵاوکردنەوەنییە، هەرچەندە دوایی بیستمان کە لە تەلەفزیۆنی ئوردونەوە بڵاویانکردۆتەوە و بۆ ئارشیف نەبو، دیاربو حکومەت پێویستیان پێبو.

# گفتوگۆ و شەڕ

*** ڕەوتی گفتوگۆکان چۆن دەڕۆشت، کێشەی سەرەکی چی بو؟**

– سەرەتای کۆبونەوەکان بە باشی بەڕێوەچو، لەکۆبونەوەیەکدا بو بەشەڕ لەگەڵ تاریق عەزیز، ئەویش لەسەر قسەیەکی ناشایستەی ئەوبو، منیش تورەبوم و کاغەزەکانی خۆمم پێچایەوە و گوتم: "هەر لەگەڵ تۆ دانانیشم" و مەسەلەکە بەمشێوەیەبو:

باسی زانکۆی سلێمانی کرا کە لابراوە و گوێزراوەتەوە بۆ هەولێر، منیش گوتم: "زانکۆی سلێمانی بۆتە زانکۆی سەلاحەدین، با ئەو زانکۆیە نەگەڕێتەوە و لە هەولێر بمێنێتەوە، بەڵام ئێمە زانکۆی کوردستان لە سلێمانی دادەنێین"، واتا بە هەردولامان زانکۆیەک لە سلێمانی بەناوی زانکۆی کوردستانەوە دادەنێین. ئەوانیش گوتیان زۆر باشە، تەنها تاریق عەزیز ناڕازی بو، ئەوەیش ئەوەبو گوتی: "ئێستا پارەمان نیە و کاتی شەڕە، دوای دەخەین بۆ کاتێک کە پارە هەبو".

سەرۆکی ئەرکانی سوپا گوتی: "دەباشە خۆ ئەوە کێشەکەی ئێوە ئاسان دەکا، ئەگەر کاکە جەلال بچێ بۆلای هاورێکەی موعەمەر قەزافی و پارەمان بۆ بهێنێ و زانکۆی پێ دروستبکەین".

منیش گوتم: ئەوە هیچی تێیدانیە کە پێکهاتین نەتوانین ئەوەش بکەین، تاریق عەزیز گوتی: "دوای رێکەوتن هەرکەسێ پەیوەندی بە قەزافیەوە بکات، وای لێدەکەین"!.

منیش بەڕاستی زۆر تورە بوم، هەمو شتەکانی بەردەمم کۆکردەوە، عەینەکەکەم لەچاومکردەوە و کورسییەکەم وەرگێرا و گوتم: "ئەمن قسە لەگەڵ تۆ ناکەم"! گوتی بۆ؟ گوتم: "ئایا ئێمە بەندی شەڕین یان وەفدین و هاتوین بۆ گفتوگۆکردن؟ بۆیە ئێمە ئەو شێوەیە رەت دەکەینەوە. ئێمە وەکو دو حیزب مامەڵە لەگەڵ یەک دەکەین، ئێمە ئەو لەهجانە لە گفتوگۆدا ڕەتدەکەینەوە".

ئەویش گوتی: "برام من گاڵتە دەکەم"! منیش گوتم: "نەخێر ئەوە گاڵتەنیە، چۆن عیبارەتی وا بەکاردێنی، ئەسڵەن لەگەڵ تۆ هەر دانانیشم و قسەش ناکەم"، گوتیەوە برام داوای لێبوردن دەکەم، گوتم: لێبوردن قبوڵناکەم، گوتی: باشە قسەکانم سەحب دەکەمەوە، گوتم: ئەوەش قبوڵناکەم، گوتی: داوادەکەم کە لە مەحزەری کۆبونەوەکە بیسرنەوە، گوتم: ئەوەش قبوڵناکەم، گوتی: "باشە چیتان دەوێت؟ دەڵێم قسەکەم سەحب دەکەمەوە، داوای لێبوردن دەکەم، داوادەکەم قسەکە لە مەحزەری کۆبونەوەکە بسرنەوە، من بەراستیم نەبوە، تۆ هەزارجار دەڵێیت (بەعسی فاشی) و حکومەتی دیکتاتۆر، کەچی ئێمە عاجزنابین".

منیش گوتم: نا ئەمانە کۆبونەوەی رەسمین، ئەگەر ئەم قسانە لە کۆبونەوەی تایبەتدا بکرێت من قەت عاجزنابم. لەوکاتەدا دکتۆر قاسملۆ کە لە کۆبونەوەکەدابو نامەیەکی بچوکی دامێ و نوسیبوی، "بە رای من لێبوردنەکەی تاریق عەزیز قبوڵبکە". راوێژی برادەرانمکرد، مەلا بەختیار و مولازم عومەر و ئەوان گوتیان: ئێمەش پێمان باشە، قبوڵی بکەیت، منیش گوتم: باشە قبوڵمکرد جەلسەکە نەختێک تێکچو، بەڵام دوایی دەستمان پێکردەوە.

دوای چەند کۆبونەوەیەک، چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵ سەدام دانا کە دکتۆر قاسملۆش ئامادەبو، بەخێرهاتنێکی گەرمی کردین و گوتی: "من خۆشحاڵم، چونکە هەمو پرۆتۆکۆلی کۆبونەوەکانم خوێندۆتەوە، هەمو قسەکان بە نیشانەی جدی دەزانم، هەتا شەڕەکەی کاکە جەلال و تاریقیشم پێ خۆشە! گوتی نەک لەبەرئەوەی هانیانبدەم کە شەڕ بکەن، بەڵکو نیشانەی جدییەتە، ئەوە بەڵگەی

ئەوەیە، کە کاکە جەلال و جەماعەت بە جددی هاتون، ئەگینا ئەگەر بە جددی نەهاتنایە، ئەوا بە ڕێگایەکی دیبلۆماسیانە چارەسەری کێشەکەیان دەکرد".

هەروەها گوتی: "لەو کاتەوە ئێوە هاتون، زۆر جاریش بە برادەرانم گوتوە ئەوان نەپرسن بۆ وادەڵێن و ئێوەش مەپرسن بۆ ئێوە وادەکەن، نەپرسین بۆ ئەمڕۆ کاکە جەلال دێت و بۆ پێرێ نەهاتوە، بەڵام چەند ڕاستیەک دەرکەوتوە و پێویستە تەئکیدی لێبکەم ئەویش ڕەسەنایەتی عێراقیە کە عێراقییەکان لەکاتی ناخۆشیدا ڕەسەنایەتی خۆیان دەنوێنن، ئەوە نیشانەی ئەوەیە ئێوەش دەست بەو ڕەسەنایەتی عیراقییەوە دەگرن".

هەروەها گوتی: ئەو هەڵوێستەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بەناو ناوی منی هێنا کە هەڵوێستێکی جوامێرانەیە و ڕوی کردە عێزت دوری و تاریق عەزیز و گوتی: "پێویستە ئەم ڕاستیە بخەینە بەرنامەی خوێندنەوە لە عێراق و لە قوتابخانەکاندا بخوێندرێ کە عێراقیەکان لەکاتی ناخۆشی و پێویستدا، یەکدەگرنەوە و پشتی یەکدەگرن و یەکدەنگن".

هەروەها ڕوی لە من کرد و گوتی: "ئێوە ئێمەتان قەرزاربارکرد، ئێمە دو قەرزمان کەوتەسەر، یەکێکیان وەکو بەعسی قەرزاری ئێوەین، ئێوە لەم کاتەدا هاتون و دەستمان بۆ درێژدەکەن کە ئێمە وەزعمان باش نییە. دوەم قەرزێکتان لەسەر عێراق تۆمارکرد، چونکە نیشتمان لە مەترسیدایە و ئێوەهاتون هاوکاری دەکەن" کەوتە مەدحکردنی من و گوتی: "ئێوە بە هاتنتان ئازایەتیتان سەلماند. ئێستا خەڵک دەپرسن جەلال چۆن وێراویێتی بچێ؟ هەرچەندە تۆ ئێمە باش دەناسی و ڕەوشتی ئێمە باش دەناسی، بەڵام ئەم هاتنەی تۆ ئەشوبهێنم بە چونەکەی خۆم لە ۱۹۷۰دا بۆ لای مەلا مستەفا کە خەڵکی بە منی دەگوت سەدام چۆن دەوێرێ بچێت و ئیسرائیل و فلان و فلانی لێیە".

لە کۆتاییدا گوتی: "مەرج بێت شتێکتان بەرامبەر بەوە بدەمێ کە سەرت نەک تەنها بەرامبەر بە کوردی عێراق بەرزبکاتەوە، بەڵکو سەرت بەرامبەر بە هەمو کوردی تورکیا و ئێران و سوریا بەرزبکاتەوە".

# کوردستانبونی کەرکوک

* دەربارەی پرسی کەرکوک، سەدام حسێن چۆن دەیڕوانیە ئەو کێشەیە؟

- بەڵێ، لە قسەکانیدا گوتی: "من لاریم لەسەر داخوازیەکانتان نیە، هەمو مەسەلەیەک قابلیی قبوڵە، تەنها مەسەلەی شاری کەرکوک نەبێت. من ناڵێم کەرکوک شارێکی عەرەبی نیە و ناشڵێم کەرکوک کوردی نییە، بۆئەوەی کەرکوک نەبێتە مەڵبەندی جیابونەوە، من بڕوام بە بەیەکەوە ژیان و برایەتی کورد و عەرەب هەیە، بۆیە دەمەوێت لە سنوری حوکمی مەرکەزی بێت".

منیش وەڵامم دایەوە و سوپاسمکرد و گوتم: "ئێمە ئومێدمان بەتۆ زۆرە، لەبەرئەوەی تۆ ئەندازیاری بەیانی ئازاربویت و تۆ دەسەڵاتت هەیە، بریاری ئازایانە بدەیت".

هەروەها گوتم: "دەمەوێ تەئکید بکەمەوە لەسەر مەسەلەی کەرکوک، دیارە ئێمە کەرکوک بە بەشێک لە کوردستان دەزانین، بەڵام ئەو پێشنیازەی تۆمان قبوڵە، کەرکوک شارێکی عێراقی بێت و شاری برایەتی کورد و عەرەب بێت".

* ئایا هیچ یارمەتیەکی ئێوەیاندا؟ ئایا گفتوگۆکان بێ کێشە بەڕێوەچون؟

- دوای باسکردنی مەسەلەی جدی لای سەدام، هەندێ گاڵتەشمانکرد و لە کۆتاییدا گوتم: "کە ئێوە بۆ مەسەلەی یارمەتیی ئێمە سێ کەستان داناوە کە هەرسێکیان موسڵاوین و ئەوە مانای ئەوەیە کە ئێوە دەتانەوێ یارمەتیمان نەدەن".

کۆمەڵێک بەڵێنیان دایێ کە یارمەتیمان بدەن لە بواری چەک و تەقەمەنی و پارەدا، بەڵام هیچی وایان جێبەجێنەکرد، دوایی من لە ڕێگای هەولێر و شەقڵاوەوە گەڕامەوە بۆ شوێنی خۆمان. لەوکاتانەدا لە زوربەی کوردستان خۆپیشاندانی پشتگیری بۆ یەکێتی دەکرا و زۆریش دروشمی توندڕەوانەیان بەرزدەکردەوە، بۆ نمونە، یەکێک لە دروشمەکانی کە لەناو سلێمانی دەگوترا: (بە هێزی مامە ڕیشە، سەدام دەکەین بە شیشا). ئەگەر بەراوردێک بکرێت لەنێوان دروشمەکانی

١١ ئازاردا و ئەو دروشمانەی، کە ئەوکاتە ئەوترا، زۆر جیاوازبون. لەکاتی ئازاردا دروشمی (کێ بو خۆی کرد بە شەکر، ئەحمەد حەسەن بەکر) بەرز دەکرایەوە، واتا جیاوازی زۆرە لەنێوان خۆ بەشەکرکردن و لە شیشداندا هەیە!.
یاخود برادەرانی کۆمەڵە، لەزۆرشوێن دروشمیان بەرزکردبۆوە، (ئێمە نەوەی مارکسین، لە سێدارە ناترسین) یان (بژی هێزی پێشمەرگە، دوژمن نەسیبی مەرگە) (یەکێتی نیشتمانی پێشرەوی هەمومانی، یەکێتی نیشتمانی تۆ رابەری کوردانی).

*** ئایا هەڵوێستی جەماوەر چۆن بو بەرامبەر بە گفتوگۆ، ئایا دارودەستەی حکومەت سڵیان نەئەکردەوە؟**

– ئەو دروشمانە کە بەرزدەکرایەوە، زۆری زەق و رەق بون و بەعس و دارودەستەکەی ئەترساند. ئەوکاتە من لە زیخانبوم، زیخان کەوتۆتە دۆڵێک لە نێوان سپیلک و لەوێوە دەچێ بۆ گەلاڵە، ئینجا دۆڵێکە لەوێ دێتەوە تا لای سەروچاوە و بتوێن. لەبەرئەوە خەڵک هەم لە هەولێرەوە و هەم لە رەواندزو و موسڵ و سلێمانیەوە، بە شەقامی قیرتاو دەهاتن بۆ لامان. رۆژانە دەیان هەزار کەس دەهاتن، هەندێ رۆژ دەبوایە سێ، چوار جار بچم بۆ لای خەڵکەکە و قسەیان بۆ بکەم، هەندێ رۆژ هەبو بە تایبەتی رۆژانی هەینی کە نزیکی ٨٠٠٠ تا ١٠٠٠٠ کەس دەهاتن بۆلای ئێمە.

*** بە لێکدانەوەی خۆت، هەڵەکانی ئێوە چی بون لەکاتی گفتوگۆدا؟**

– ئێمە هەندێ هەڵەمان هەبون، بۆ نمونە چەند جاشێک هاتنە ناو هێزی پێشمەرگەوە، کەچی لە جیاتی ئەوەی وەرگیرێن و هانی جاشی تر بدرێن بۆ وازهێنان لە ریزی جاشایەتی، هەندێکیان لەلایەن ئێمەوە کوژران کە ئەوە کارێکی زۆر زۆر خراپ و دڕندانەبو، بەراستی کاری کردە سەر ئەوەی، کە ئیتر جاشی تر نەیەتە لامان. حکومەتیش لە هەندێ جێگا باسیدەکرد کە (الأخوان یرجعون الی الصف الوطني) برادەرانی ئێمە ئەو قسانەیان زۆر پێناخۆشبو، لەبەرئەوە لە ٢٥ی مانگ بریارماندا وەفدەکە نەچێتەوە.

*** نەگەڕانەوەی وەفدی ئێوە لەبەر قسەکانی حکومەت بو، یان هۆی تری هەبو؟**

– بەڵێ لەسەر ئەو قسانە بو کە پێیان دەگوتین، ئەوەبو نارەزاییمان نیشاندا و گوتمان: "ئەوەچیە و چۆن ئەبێ ئێوە وا قسەبکەن"؟ ئەوانیش وەڵامیان داینەوە و

گوتیان: "کاکە ئەو قسانە هیچ نین و خەڵک دەیکەن و ئەمە رای حکومەت نیە، رای ئێمە وانیە و خۆتان رای ئێمە دەزانن و لێپرسراوانی ئێمەتان دیوە".
لەو کاتانەدا تەرمەکەی تۆفیق وەهبی بەگ هاتەوە، من چوم بۆ پیرەمەگرون و جەماوەرێکی زۆر هاتبون بۆئەوێ، لەوێ وتارێکم پێشکەشکردن و باسی ئەوەمکرد کە ناسنامەی نیشتمانی لای ئێمەیە و لە شاخ و ئەشکەوتەکانی کوردستان دەرئەچێت و بە مۆری پێشمەرگە تۆماردەکرێت و کێ دەیەوێ نیشتمان پەروەری فێربێت، با لە ئێمەوە فێربێت، ئەوە وەڵامی ئەو قسانەبو کە حکومەت دەیکرد.

*** ئەنجامی گفتوگۆکە بە چیگەیشت؟**

- حکومەت پێی راگەیاندین، هەندێ مەسەلە دواکەوتوە، ئەو دواکەوتنە مانای هیچ ناگەیەنێ. ئەوەبو هەندێ چەک و پارەیان بۆناردین. ئێمە بریارماندا وەفدێک بە سەرۆکایەتی نەوشیروان مستەفا دروستکەین و بینێرین بۆ بەغدا.
ئەمجارە وەفدەکە سەدامیان نەبینی، نەک هەر نەیانبینین، تەقریبەن گفتوگۆیان لەگەڵ نەکردن، تەنها باسی شتی گشتیان کردبو. بردبویانن ئەم لاو ئەولایان نیشان دابون، بە ناراستەوخۆ باسیان کردبو کە بۆچی من نەچومەتەوە بۆ گفتوگۆکردن، مادام کێشەکە لای سەدام و ئەو ئەتوانێت چارەسەری بکات، دەبوایە من بچمەوە، لەبەرئەوە نە سەدام وەفدەکەی بینی و نە دانیشتنێکی رەسمییان لەگەڵکردن.
برادەران هاتنەوە و باسی مەسەلەکەیان کرد و گوتیان: "ئەگەر دەمانەوێ گفتوگۆکە سەربکەوێت، ئەوا ئەبێ خۆت بچیت"، منیش گوتم: "باشە من ئامادەم".
ئەمجارە کە چوینەوە تەماشامانکرد وەفدێکیان بە سەرۆکایەتی عیزەت دوری داناوە و کۆمەڵێک وەزیر و شارەزای تریشیان لەگەڵدایە، لەکاتی پێویستدا هەندێ شارەزای سەربازیشیان دەهێنا. هەروەها بەرێوەبەری موخابەرات و بەرێوەبەری ئاسایشی گشتی و سەرۆکی ئەرکانی سوپا و وەزیری دەرەوە و لێپرسراوانی حیزبی و حکومی جیاواز بەشداریان دەکرد.
عیزەت دوری، زیاتر قسەی دەکرد و ئەوانی تریش بەشداریان دەکرد. لەو دانیشتنانەدا بە رون و ئاشکرا پیان گوتین کە دو مەسەلەی گرنگ لای ئێمە هەیە، یەکێکیان شەری ئێران و عێراقە، سەرۆک خۆی بۆ تەرخانکردوە، ئەوی تریشیان مەسەلەی کوردە کە یاریدەدەری سەرۆک خۆی بۆ تەرخانکردوە.
ئێمە هەستمانکرد کە خەریکن لە قسەکانی سەرەتای گفتوگۆ پاشەکشەدەکەن،

هۆکەشی بە بۆچونی من دەگەڕایەوە بۆ سێ خاڵ.

یەکەمیان: نەچونەوەی ئێمە لە ٢٥ی کانونی دوهەم بۆ بەغدا. ئەگەر وەفدی ئێمە بە سەرۆکایەتی خۆم بچوینایەوە، بڕوام وایە لەو ماوەیەدا دەمانتوانی لەگەڵیاندا بگەینە ئەنجامێک.

چونکە لە کۆتایی شوباتدا هێرشێکی ئێران کرا بۆسەر ڕۆژهەڵاتی بەسرا (دوجەیلە) و ئێران گەیشتە فاو و قوڕنە و نزیک عەمارە، عێراق لەو شەڕەدا بۆ یەکەمجار چەکی کیمیاوی بەکارهێنا و سوپای ئێرانی بە چەکی کیمیاوی شکاند، شکانی هێرشی ئێران عێراقی مەغرورکرد. عێراق پێش ئەوە زۆر دەترسا لە هێرشی ڕۆژهەڵاتی بەسرا و چاوەڕێی دەکرد بزانێت ئێران دەگاتە کوێ! بەڵام کە ئێرانییەکانیان شکاند، ئەوە عێراقی مەغرورکرد.

هۆی دوەم : پەیوندی عێراق لەگەڵ سۆڤێت و ئەمەریکا بەرەو باشی دەڕۆیشت، سۆڤێت لەکاتی شەڕی ئێرانی- عێراقی، فرۆشتنی چەکی بە عێراق ڕاگرتبو، بەڵام کە سوپای عێراقی شکا و ئێران کەوتە هێرشکردن، سۆڤێت کەوتە ئەوەی کە چەک بداتەوە بە عێراق بۆئەوەی مەترسی گرتنی بەسرا کەمببێتەوە.

لەو شەرانەدا، هەم سۆڤێت و هەم ئەمەریکا بەهەمو جۆرێک یارمەتی عێراقیان ئەدا.

هۆی سێیەم: بەلای منەوە گوشاری تورک بو، تورک زۆر بە توندی دژی پێکهاتنی ئێمە و عێراق بو، دەیانگوت ئەو ڕێکەوتنە زۆر کاردەکاتە سەر ئاسایشی نەتەوەیی تورک، لەبەر ئەوە ئەوان هەڕەشەیان لە عێراق دەکرد، ئەگەر ڕێک بکەون، ئەوا نەوتەکە دەبڕێ. هەروەها ئەوکاتە دەنگ و باسی ئەوەهەبو کە تورکیا ویلایەتی موسڵ دەگرێت، هەم لە ڕۆژنامەکانی تورک و هەم دەنگ و باسی دنیا بڵاویکردەوە، ئەو هۆیانە هەمویان وایانکرد عێراق ئەو پاشەکشەیە بکات.

ئێمە لە گفتوگۆکاندا گەیشتینە چەند خاڵێکی سەرەکی و لەسەری ڕێکەوتین و دەبوایە من بێمەوە و بۆ نەورۆز ڕێکەوتنەکە بڵاوبکەینەوە.

ئەوەبو ئێمە لە سورداش نەورۆزە مەشهورەکەمان کرد، من لە کۆبونەوەکان ئیجازەم وەرگرت و هاتمەوە کە هاتمەوە ئەو نەورۆزە ئامادەکرابو. بەڕاستی کۆبونەوەیەکی زۆر گەورە و جوان بو، بەش بە حاڵی خۆم هەتا ئێستا کۆبونەوەی وا جەماوەری گەورەم نەدیوە لە کوردستان و لە عێراقدا، سەدان هەزار خەڵک هاتبون. ئەگەر ئیمکانییەت هەبوایە و حکومەت و قیادە موەقەتە پروپاگەندەیان دژ نەکردایە کە بۆمبا دەتەقێننەوە، دەتوانم بڵێم سێ ئەوەندەی تر خەڵک

دەهاتن، چونکە ئەوانەی هاتبون زۆربەیان دۆست و لایەنگیری یەکێتی بون.

حکومەت ئەو رۆژە هەم شەمەندەفەری راگرت و هەم پاسی گشتی و ئۆتۆمبیلی حکومی قەدەغەکرد، ئەگینا جەماوەرێکی زۆر زۆری تر کۆدەبونەوە.

من لەوێدا هەندێ قسەم کرد کە حکومەت پێیان ناخۆشبو. کە چومەوە زانیم قسەکانیان پێ ناخۆشە، من لە نەورۆزەکەدا داوای ئاشتبوونەوەی گشتیم کردبو، لەگەڵ پارتی و شیوعیشدا.

*** ئایا حکومەت لەگەڵ پارتیش گفتوگۆی هەبو یان هەوڵی گفتوگۆی دابو؟**

– وەکو من بزانم گفتوگۆی پارتی پێش گفتوگۆی ئێمە بو لە ١٩٨٣ دا.

حکومەت لەلایەک لەگەڵ ئێمە گفتوگۆی دەکرد، لەلایەکی تر لەگەڵ ئەوان، هەر بۆیە گفتوگۆیان لەگەڵ ئێمە دواخست. بەرای من ئەوماوەیە خەریکی ئەوەبون، لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی پێکبێن، تومەس نرخی رێکەوتن لەگەڵ پارتی کەمتربو لە هی ئێمە و داخوازیەکانی ئەوان کەمتربون لەوانەی ئێمە و دەیانویست ئەگەر بۆیان بکرێ لەگەڵ ئەوان پێکبێن، نەک لەگەڵ ئێمە، بەڵام کە زانیان لەگەڵ ئەوان ناگەنە هیچ ئەنجامێک، ئەوەبو بەلای ئێمەوە بایاندایەوە.

نوێنەرانی حکومەت گوتیان، ماڵی بارزانی خیانەتیان کردوە و پێش سوپای ئێرانی کەوتون و پاشان غەدریان لە ئێمە کردوە. ئێمە گفتوگۆمان هەبوە لەگەڵیاندا لەسەر هەمو شتێک پێکهاتبوین، بەڵام لە ئاخر لەحزەدا، لەجیاتی ئەوەی مەرجەکانی خۆیان بهێننەدی، هاتن چون پێش سوپای ئێرانی کەوتن بۆ گرتنەوەی حاجی ئۆمەران.

گوتیشیان، ئێمە گەیشتبوینە قۆناغی کۆتایی لە رێکەوتن لەگەڵ ئەوان و هاتبوینە سەر ئیمزاکردن و پارەشمان دانێ.

*** ئایا ئێوە داواتان لە بەعس کرد کە حیزبی شیوعیش لە گفتوگۆدا بەشداربێت؟**

– بەڵێ لە گفتوگۆدا باسی ئەوەمکرد کە باش دەبێت، حیزبی شیوعیش لە گفتوگۆدا بەشداربێت، گوتیان "بەڵێ، سەرۆک خۆشی گوتویەتی، ئێمە لاریمان نیە، حیزبی شیوعی شوێنی ئاسایی خۆی لە بەرەی نیشتمانی وەرگرێتەوە، شوێنەکەشی پارێزراوە". کە سەدام باسی عزیز محەمەدی دەکرد، بە رێزەوە ناوی دەبرد و دەیگوت (هاورێ عەزیز محەمەد).

لە سەرەتادا ئێمە هەنگاوی باشمان بڕی، دوایی من هاتمەوە بۆئەوەی

بۆچونەکانی حکومەت بە برادەران بگەیەنم و لە خاڵە هاوبەش و ناکۆکەکانمان بکۆڵینەوە.

*** ئەی بۆچی نەگیشتنە ئەنجامێک؟**

- برادەران هەمو ئەو خاڵانەیان بە باشزانی کە لەسەری رێکەوتبوین، بەلاّم هەستمان دەکرد، حکومەت لە پاشەکشێیە، من دەمەوێت رای خۆم بە رونی بۆ مێژو تۆماربکەم:

ئەگەر لەساڵی ١٩٨٣دا حیزبی شیوعی ئەو هەڵوێستە راڕایانەیان نەبوایە و لەگەڵ ئێمە بەشداری گفتوگۆیان بکردایە و پارتیش بە هەمان شێوە بەردەوام بوایە لەسەر گفتوگۆ، ئەوا بە هەرسێ لامان ئەنجامێکی باشمان لەگەڵ حکومەتی عێراقدا دەهێنایە دی کە باشتردەبو لە بەیانی ١١ ئازار. جا ئەو رێکەوتنە چەند سەری دەگرت و چەند سەری نەئەگرت، ئەوە بەندبو بە سروشتی حکومەت و شێوەی بیرکردنەوەی سەدام حسێن و حیزبەکەیەوە.

*** واتا بوژاندنەوەی عێراق لە جەنگی دژی ئێران و تێکشکاندنی هێرشەکەی بەسرە، هۆ بون بۆ پاشەکشەیان لە پەیمانەکانی خۆیان بەرامبەر بە مەسەلەی کورد؟**

- پاش شوباتی ١٩٨٤ حکومەت کەوتە خۆی و ئێران شکا، سۆڤێت و ئەمەریکا هاتنە مەیدانی یارمەتیدانی عێراقەوە، ئیتر عێراق ترسی نەما کە لەناو دەچێت. پێموایە دڵنیایی نێودەوڵەتی وەرگرت لە ئەمەریکا و سۆڤێتەوە کە ئەوان پشتگیری دەکەن و نایەڵن ئێران عێراق بگرێت.

ئەوە هۆبو کە وایکرد، عێراق لەو رێکەوتنانەی لەگەڵ ئێمە کردبوی پاشگەزبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هەر لەگەڵیدا رۆیشتین. ئەوکاتە ئێمە وردە وردە هاتینە سەر ئەو بڕوایەی کە حکومەت نایەوێت لەگەڵ ئێمە رێکبکەوێت، بەلاّم پێمان باشبو، تۆباڵی شکستی گفتوگۆکە لەسەر حوکمەت بێت، نەک لەسەرئێمە.

لێت ناشارمەوە ئێمە ئەوکاتەش، پەیوەندیمان لەگەڵ هەندێ ئەفسەری گەورەی عێراقی هەبو لە سوپادا. گفتوگۆمان بەهەلزانی بۆ نوێکردنەوەی ئەو پەیوەندیانە و فرسەتێکمان هێنا هەندێک کەس کە لێپرسراوی گەورەبون، جاران نەئەتوانرا بیانبینین، من دیمنەوە و قسەم لەگەڵکردن و پێیان باشبو، ئێمە درێژە بە گفتوگۆبدەین، تا بزانین بە چ ئەنجامێک دەگەین؟.

ئەفسەرە موعاریزەکانی ناو سوپا، پێیان وابو، ئێمە لەگەڵ حکومەتدا ناگەینە ئەنجامێک، دەیانگوت حکومەت لەگەڵتاندا رێکناکەوێت و هانیان ئەداین گفتوگۆ نەکەین.

دوایی لیژنەیەکمان دانا بۆ باسکردنی رێکەوتنامەکە، بەسەرۆکایەتی د.فوئاد، فەرەیدون عەبدولقادر، مولازم عومەر و عومەر عەزیز، ئەمانە چون بۆ بەغدا لەگەڵ عەلی حەسەن مەجید و وەزیرەکانی تر کۆبونەوە.

*** ئایا هیچ خاڵێک هەبو کە لە گفتوگۆکاندا، باسی لێوە نەکرابێت؟**

– هەندێ رێکەوتنامەمان ئیمزاکرد، دو خاڵ مایەوە، باسی لێوە نەکراو دواخرا، یەکێکیان مەسەلەی جاش و ئەوەی تر مەسەلەی سنوری ناوچەی ئۆتۆنۆمی بو.

ئەوان لە سنوری ناوچەی ئۆتۆنۆمی زۆر پەشیمان بوبونەوە. لە سەرەتادا قبوڵیان بو شێخان و ئاکرێ، بخرێتەوە سەر دهۆک و هەندێ ناوچەی تری گوندنشینی هەولێر بچێتەوە جێی پردێ، واتا هەتا کفری و خانەقینیش بخرێتە سەر حوکمی زاتی. حکومەت لە سەرەتای گفتوگۆدا ئەوانەیان هەمو قبوڵبو، بەڵام دوایی لەوانە هەمو پەشیمان بونەوە.

بۆنمونە کە هاتینە سەر مەسەلەی کفری، عیزەت دوری گوتی: "پرسمانکردوە بزانین ژمارەی دانیشتوانی کفری چەندە"، دوایی وەڵامەکەم بۆ هاتۆتەوە کە سەدا نەوەد و حەوتی کوردە، واتا ئەوان بۆ کفری رازی بون، تەنها کەرکوک مابۆوە.

ئێمەش ئامادەبوین، چارەسەرێکی تایبەتی بۆ بدۆزینەوە، لەسەر چەند خاڵێک رێکەوتبوین، کە دوایی لە هەندێکی پەشیمان بونەوە، بەڵام دیسان هەر شتی باشمان تۆمارکرد، لەوانە کە عەرەب بڕواتەوە جێگای خۆی و کورد بگەڕێتەوە کە بە ڕای من زۆر زۆر شتێکی گەورەبو، فەرمانبەر و کرێکار و جوتیار بگەڕێنەوە کەرکوک و ئیدارەی هاوبەشی هەبێت و ناوە کۆنە مێژویەکان بچنەوە جێی خۆیان.

رۆژێک، عەلی حەسەن مەجید بە کەش و فشێکی زۆرەوە هات بۆلام و گوتی: "سەرۆک سەلامتان لێ دەکات و هەوڵ ئەدات کارەکان بە ئاسانی بڕوات" و داوای پێشنیازی لە ئێمە کرد.

# هاتنی وەفدی حکومەت بۆ کوردستان

*** هەمو گفتوگۆکان لە بەغدا بەڕێوەدەچون؟**

– نەخێر، ئێمە وتمان زۆر هاتوین بۆ بەغدا، ئێستا کاتی ئەوەیە، ئێوەبێن بۆلای ئێمە، با عیزەت دوری بێت بۆ ئێرە و ئەمجارە کۆبونەوەکە لای ئێمەبێت. ئەو پێیباش بو، ماوەیەکی پێچو عیزەت دوری لەسەرەتای ئەیلولی ١٩٨٤دا هات بۆ سورداش و ئێمە پێشوازیەکی گەورەمانکرد و زۆر خۆشحاڵ بو و ڕێزمان زۆر لێگرت. هەمو کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکێتیم بۆ کۆکردەوە.

ژورێکی گەورەمان هەبو، لە شارەوانی سورداش چاکمان کردبو کردبومان بە هۆڵی کۆبونەوە، هەرچی سەرکردایەتی کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان و یەکێتی هەبو، هەموم بۆ کۆکردەوە، لەگەڵ هەندێ برادەرانی تری مەکتەبی ڕاگەیاندن و هەندێ برادەری تر، ئەویش خۆی و عەلی حەسەن مەجید و عەبدولفەتاح یاسین هاتبون.

عیزەت دوری، زۆر بە باشی باسی من و وەزعی ئێمە و دەوری ئێمەی کرد، گوتی: "کاکە دو گیروگرفت ماوە، من سەرتان نایەشێنم و من زۆریش سیاسی نیم، یەکێکیان مەسەلەی جاشە کە بەدەست منە، ئێمە ئامادەین جاش حەلبکەین، بەڵام دو مەرجمان لە ئێوە دەوێ:

یەکەم: بەڵێنمان بدەنێ کە کەس نە کوژرێ و حیمایە بکرێن و هیچ دەستدرێژیەک نەکرێتە سەر خۆیان و خێزانەکانیان".

منیش گوتم، ئێمە ئامادەین، بەڵێنتان بدەینێ و وەعدی شەرەفتان بدەینێ و هەرکەسێ یەکێک لەوانەی کوشت وەکو تاوانبار بیدەین بە دادگا، ئەوانیش وتیان باشە.

دووەم: گوتیان "ئەرکی پاراستنی کوردستان، ئێوە بیگرنە ئەستۆی خۆتان، ئەتوانن هەتا سەد هەزار پێشمەرگەتان هەبێت"، ئێمەش گوتمان زۆر زۆر باشە. من بەش بەحاڵی خۆم ئەوەم پێ لە حوکمی زاتیەکە باشتربو، چونکە سەد هەزار چەکدار زۆر گرنگترە لە مەجلیسی تەنفیزی.

خالێکی تر، مەسەلەی سنوربو، گوتی: "ئەو کێشەیە بەدەست من نیە، ئەگەر دەتانەوێ مەسەلەی سنوری ناوچەی ئۆتۆنۆمی دەستنیشان بکەن، ئەوە دەبێ بچینە لای سەرۆک کۆمار".

هەمو برادەران گوتیان زۆر باشە و بریاردرا وەفدمان بڕواتەوە. نیوەڕۆ لای ئێمە نانیان خوارد و دوایی بە هەلیکۆپتەر گەڕانەوە، ئەوان بە ترومبێل هاتن و بە هەلیکۆپتەر گەڕانەوە.

ئەو ڕۆژە من نەچوم لەگەڵیاندا، بۆ سبەینێ هەلیکۆپتەریان بۆ ناردم و من چوم بۆ بەغدا، وا بزانم ئەو شەممە هات، من یەکشەممە چوم، ڕۆژی دوشەممە کۆبونەوەمانکرد و سێشەممە لەگەڵ عیزەت دوری و عەلی حەسەن مەجید چوینە لای سەدام. سەدام زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردین و ئەملاو ئەولای ماچکردم و بەخێرهاتنی کردم و گوتی: "برادەرەکەت، عیزەت دوری نەدەهات بۆلات، بەڵکو من ناردم"، ئەویش گوتی ئاخر بشڵێ کە هاتمەوە چیم باسکرد، گوتی تۆ خۆت بیڵێ، گوتی: "وەڵلاهی سەرۆک هەموجارێ زوریەی هەمو بۆچونەکانت دوربین و ئەوەبو کە چونەکەم زۆر بەسودبو، دوپاتمکردەوە، ئەو برادەرانە هەمو کەسانی نیشتمانپەروەرن".

## سەدام و ڕێککەوتن لەگەڵ کورد

*** داخوازیەکانی ئێوە لە سەدام چی بون؟ هەڵوێستی ئەو چۆن بو لەبارەی داواکانی ئێوەوە؟**

– عیزەت دوری هەندێ قسەی باش و ستایشی منی لای سەدام کرد و گوتی: "ئێستا ماوەتەوە سەر تۆ، ئینجا بزانم تۆ ئەڵێی چی"؟ روم کردە سەدام گوتم: "من پرسیارێکم هەیە، لە بیرتە چ بەڵێنێکت دامێ لە کۆبونەوەی یەکەمدا، بە خزمەتت گەیشتین لە مەجلیسی وەتەنی"؟ گوتی: لە بیرمە، گوتم: لە بیرتە چۆن تەقدیری ئەو هاتنەی ئێمە و هەڵوێستی ئێمەت کرد و گوتت "شتێکتان ئەدەینێ سەرتان بەرامبەر بە کوردەکانی ئێران و تورکیا و سوریا بەرزبکاتەوە"، گوتم

باشە تۆ لەسەر وەعدەکانی خۆت ماویت؟ گوتی: "بەڵێ من لەسەر قسەی خۆم ماوم"، منیش گوتم: "دە زۆر چاکە فەرمو سەرمان بەرامبەر بە کوردەکانی تورکیا و ئێران و سوریا بەرز بکەرەوە، شێخان، ئاکرێم بۆ بخەوە سەر دهۆک"! گوتی: باشە! گوتم: بۆ هەمان مەبەست پردێ و قەرەهەنجیر، دەمزانی کەرکوک ناکرێ، ئەو گردەی کە لە پشتی بەغداوە دەست پێ دەکات و پشتی دوزە و ئەوەمکرد بە سنور و گوتم: با خانەقین و شوێنەکانی تریش بمێنێتەوە بۆ دوای جەنگ، سەدامیش گوتی: "تتدلل کاکە جلال صار".

دوای ئەوە، هەندێ موجامەلات و قسەی خۆشیکرد و عەلی حەسەن مەجید تەشجیعی کردبو گوتی: "وەڵلا من ئیقتیراحێکیشم هەیە سەیدی، کاکە جەلال زۆر ماندوبوە و زۆر جنێوی پێدراوە، پێویستە باسی هەڵوێستی کاکە جەلال بکرێت و لە بەیانەکەدا مەدحی بکرێت و پێمباشە، بەیانەکە کاکە جەلال خۆی بینوسێت"، گوتم "من ناینوسم، چۆن دەبێت من باسی خۆم بکەم، لێم پرسی ئایا من رۆڵم هەبوە"، گوتی: بەڵێ هەتبوە! گوتم واتا پاداشتێک هەیە بـۆ ئەم رۆڵەم؟ گوتی: بەڵێ، منیش گـوتم: "کـەواتە من ببەخشە لە هەمو پۆستێکی لێپرسراوەتی"، چونکە ئەوان پێشتر وایان نیشان ئەدا، مـن پۆستێک وەردەگرم، بەڵام ئێمە بریارماندابو، من و نەوشیروان مستەفا بە هیچ جورێک بەشداری حوکم نەکەین.

گوتم: "با من لە کوردستان بم، هەرکاتێک کارێکتان بە من هەبو، من دێمەوە، ئەگەر ئەتانەوێت ژورێکم لە کۆشکی کۆماری بدەنێ هەفتەی جارێ دێمەوە. با ژوری من بێت و ئەگەر پێویستیشی کرد دەگەڕێمەوە". سەدامیش گوتی: "رازیم لەسەر پێشنیازەکەت و بەسەرچاو قبوڵمە".

گوتم: "با دەست بکەین بە هاندانی جەماوەر و خۆمان ئامادەبکەین"، گوتی: "باشە ئێوە ئامادەن، رۆژی پێنجشەممە رێکەوتنەکە ڕابگەیەنین"؟ گوتم: بەڵێ. ئینجا ئێمەش خۆمان ئامادەکردبو، دکتۆر فوئادمان ناردبو بۆ هەولێر، سەربەست بامەڕنیمان ناردبو بۆ دهۆک، ئازاد هەورامیمان ناردبو بۆ کەرکوک، فەرەیدون عەبدولقادرمان نارد بۆ سلێمانی و بچێ ناوی وەزیر و ناوی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانیمان بۆ ئامادەبکات.

بەعسیەکان، دو سێ مانگێ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانییان لەسەر ئێمە دواخست. بۆ مێژو حکومەتی عێراق هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی لە کاتی خۆیدانەکرد، بە ئومێدی ئەوەی ئێمە بەشداری تێیدابکەین.

# بەشداری وەزیرە کوردەکان

*** چەند وەزیر درابو بە یەکێتی؟ ئایا ناوەکان لای ئێوەوە دەستنیشان کرابون؟**

- یەکەمجار، پێنج وەزیر بۆ ئێمە دانرابو، دوایی کردیان بە سێ. ئیتر ئێمەش هەندێ برادەرمان دەستنیشان کردبو، وەک فەرەیدون عەبدولقادر، دکتۆر فواد، مولازم عومەر، ئەو برادەرانە هیچیان قبوڵیان نەکرد.

***بەعسیەکان خۆیان ئەو وەزارەتانەیان دەستنیشان کردبو کە بیدەن بە ئێوە؟**

- ئەوان وەزارەتەکانیان دەستنیشان نەکردبو، دەسەڵاتیان دابە من کە ناوەکان دەستنیشان بکەم. منیش هەندێک ناوم لە خەیاڵ بو، وەک شازاد سائیب، مستەفا جاف، حەمەجەزا (کە بە داخەوە هەرسێکیان وەفاتیان کردوە).

*** ئەی ناوی ئەندامانی(ئەنجومەنی نیشتمانی) لەلای ئێوەوە دەستنیشانکران؟**

- ئێمە، بۆ ئەو ئەنجومەنە کەسایەتی نیشتمانپەروەرمان هەڵبژاردبو. لە هەر شارە و ناوچەیەک، کۆمەڵێک کەسانی باش و نیشتمانپەروەرمان هەڵبژاردبو کە مەرج نەبون یەکێتی بن، بەڵکو زیاتر هونەرمەند و نوسەر و حاکم و پیاوانی ناسراوی ناوچەکە بون. من، لەکاتی گفتوگۆدا لە بەغدا هەندێک کەسایەتی کوردیشم بینی، وەکو فوئاد عارف، ئێحسان شێرزاد، مەسعود محەمەد، حیلمی عەلی شەریف. ئەوانە هەمو گوتیان، ئێمە لەبەردەستی ئێوەین، چیمان پێ دەڵێن، ئامادەین بیکەین. مەسعود محەمەد گوتی: "بەس وەزارەتم پێناکرێ، ئەو قایش و قروشەی وەزارەتم پێ لەبەرناکرێت، دەنا لە فەڕاشیش دامنێن لەو حوکمی زاتیە دەیکەم". ئێحسان شێرزادیش گوتی: "من موحتاج نیم، بەڵام لە فەڕاشیەوە دەیکەم تا وەزیری، بۆخۆشم خۆت دەزانی دەمێکە وازم لە وەزارەت هێناوە، بەڵام دەزانم ئەمکارە بۆ کوردە و شەرەفی کورد بەرزدەکاتەوە". بەڵام بۆ مێژو فواد عارف گوتی: "با بزانم سەرۆک موافقە یان نا، هەروەها ئاخۆ ئەبێ فەرهادی کوڕیشم ببێ بە تەشریعی".

# ڕۆژی بڵاوکردنەوەی ڕێککەوتننامەکە

*** بڕیارتان دا کەی بەیانی ڕێکەوتنامەکە بڵاوبکەنەوە؟**

– ئێمە ڕۆژی سێشەمە کۆتایمان بە گفتوگۆهێنا، وتم ڕەنگە بۆ پێنجشەممە فریا نەکەوین، بەڵام بۆ شەممە بە دڵنیاییەوە ئامادەدەبین کە بڵاویبکەینەوە. سەدام گوتی: باشە بۆ شەممە. جەرەسێکی لێدا و تەلەفۆنی لەگەڵ لەتیف نسەیف جاسم کرد کە وەزیری ڕۆشنبیریی بو، گوتی: "ڕۆژی شەممە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و هەمو دەزگاکانی ڕاگەیاندن ئامادەبکە، جەژنێکی نیشتمانیمان هەیە، ئێستا کاکە جەلالم لایە و یەکسەر بە سکرتێرەکەشی گوت هەمو چاوپێکەوتەکانمان دوابخە و بیگۆرە بۆ کاتێکی تر".

سەدام تەوقەی لەگەڵ کردم ئەملاولای ماچکردم و گوتی: "خۆت ئامادەبکە، پێویستە خەڵکی لێپرسراو ئازابێت و ئامادەبێت لێپرسراوێتی وەربگرێت"، منیش گوتم "بەسەرچاو، ئێمە ڕێکەوتوین و قسەی خۆمانکردوە، مرۆڤی کورد کە گوتی نەخێر مانای نەخێرە، ئەگەر وتی بەڵێ، مانای قبوڵکردنە". یەکەمجاریش بو، تا بەردەرگا لەگەڵمدا بێت و بەڕێی کردم و جارێکی تر ئەملاوئەولای ماچکردمەوە.

منیش یەکسەر هەواڵم گەیاندە برادەران، پێش ئەوەی من هەواڵەکە بگەیەنم، ئەو هەواڵی دابو بە سەعدی مەهدی ساڵح کە سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی بو، ئەویش عومەر عەزیز و برادەرانی تری بانگ کردبو گوتبوی: "کاکە لەسەر هەمو شتێک پێکهاتوین و بڕۆن لای برادەران و خۆتان ئامادەبکەن".

لەوێوە بە بێسیم ئاگاداری نەوشیروان مستەفا و برادەرانم کرد، چەند دروشمێک بنوسن و خۆیان بۆ ڕۆژی شەممە ئامادەبکەن، ئەوانیش زۆر خۆشحاڵبون و خۆیان ئامادەکرد و بڕیاریاندا لە سەرتاسەری کوردستاندا ئاهەنگ بگێرڕێت.

ڕۆژی هەینی دەعوەتیان کردین، عەلی حەسەن مەجید وەک ئاوێنەی سەدام وابو، خۆی هیچ ڕای نەبو و هەمیشە چاوی لەو دەکرد. من پێشتریش هەستم کردبو، دەمزانی هەڵوێستی چۆنە.

ئەو، هەمو رۆژێ تەلەفونی لەگەڵ دەکردم، ئەگەر جەو زۆر باشبوایە بە گەرمیەوە دەیگوت (ئوستادی) و بەیانی باشی لێدەکردم، ئەگەر جەو ئاسایی بوایە بە (رفیق) بەیانی باشی لێدەکردم، ئیتر منیش دەمزانی، ئەو رۆژە جەو زۆر باشنیە!.

رۆژی پێنجشەمە، لەماڵی خۆی من و هێرۆی دەعوەت کرد، لە هەمان رۆژدا ئێمەیان برد بۆ وێنە گرتن. جێیەک هەبو لە بەغدا، وێنەی لێپرسراوانی لێدەگیرا، گوتم: "ئێمە ئەو کەسانەنین، کە بەشداربین لە حکومەتدا، بۆیە پێویست ناکات کە ئەو وێنانە بگرین"! گوتیان: "ئەو وێنانە بۆئەوەنیە، تەنها هەروەکو وێنەی شەخسیاتی وڵاتان وێنەتان بمێنێ"، هەروەها دو قات چاکەت و پانتۆڵیان بۆمن کردبو.

برادەران، دەسەڵاتیان دابومێ من خۆم لێپرسراوان دەستنیشان بکەم، لیستێکم ئامادەکردبو لە مێشکی خۆمدا. رۆژی هەینی ئەوانە هاتن و دەعوەتیان کردین، هەمو کارەکان زۆر ئاسایی بو.

*** چۆن خۆتان بۆ رۆژی بڵاوکردنەوەی رێکەوتنامەکە ئامادەکرد؟**

– بەیانی ئەو رۆژە، تەلەفۆنم لەگەڵ عیزەت دوری کرد و بەیانی باشم لێکرد و گوتم: "ئایا ئێمە بێین بۆ مۆرکردنی رێکەوتنامەکە"، ئەویش گوتی "بێگومان ئێمە چاوەرێی هاتنتانین".

ئێمەش سواری ئوتومبێل بوین و برادەرانیش هەمو خۆیان ئامادەکردبو قاتی تازەیان لەبەر کردبو، منیش جلی کوردیم لەبەردابو و خۆم رێکوپێک کردبو.

کە چوین لەبەر دەرگاکە، عزت دوری راوەستا بو ئەملاوئەولای برادەرانی ماچکرد. برادەران بریتی بون لە مولازم عومەر، ئازاد هەورامی، فوئاد مەعسوم، فەرەیدون عەبدولقادر و سەربەست بامەڕنی.

هەمویان خۆشی لە چاویاندا بەدی دەکرا، عیزەت دوریش لە خۆشیاندا بەپێوە بو، گوتی: "من دەچم بە هاورێیان دەڵێم، ئێوە هاتون و ئامادەن، ئەوە مەکتەبی خۆتانە و تکایە تا من دەگەڕێمەوە لە جیاتی من خواردنەوەیان بۆ داوابکە".

منیش جەرەسێکم لێدا و داوای چا و ئاوم کرد بۆ برادەران و نزیکەی نیو سەعاتی پێچو، ئینجا هاتەوە. کەهاتەوە یەکسەر چوە سەر مێزەکەی دانیشت و سارد بوبۆوە!.

# هۆکانی ڕێکنەکەوتن و ئەنجامەکانی

*** کە عیزەت دوری هاتەوە، چی پێ بو؟**

- کە دانیشت، گوتی: "من زۆر بەداخەوەم، هاوڕێیان دەڵێن هەندێ خاڵ ماوە پێویستە ئێمە چارەسەری بکەین، پێش ئەوەی ڕێکەوتننامەکە ئیمزا بکەین".

منیش ڕوم تێکرد و گوتم: ئەبو ئەحمەد کام خاڵ ماوە کە پێویستی بە باسکردن هەبێت؟ گوتی: "(میساقی عەمەلی وەتەنی) ماوە"، گوتم: "ئەو ڕۆژە قسەمان لێکرد لەگەڵ سەرۆک و گوتی باسکردنی ساڵێکی دەوێت، لەگەڵ شیوعیەکان بەساڵ و نیوێک کۆتاییمان پێهێناوە".

گوتم: "ئەبو ئەحمەد تۆ مرۆڤێکی موسڵمانی، سوێندمدا، ڕاستیەکەیمان پێ بڵێت، ئاخۆ ئەمە پەیوەندی بە هاتنی وەفدی تورکیاوە هەیە"؟ لەو کاتانەدا وەفدی تورکیا هاتبون بۆ بەغدا؟

عزت دوریش گوتی: "لعنة علی آبو الأتراك و الأمریكان"، منیش گوتم: "باشە ئێمە ئامادەین کە بە تێروتەسەلی باس لە (میساقی عەمەلی وەتەنی) و باس لە هەندێ مەسەلەی تر بکەین، وەک مەسەلەی (بەرەی نیشتمانی)، هەرچەندە ئێمە باسمان لەو مەسەلەیە کردوە"، گوتی: "بەڵام سەرکردایەتیمان بۆچونی تریان هەیە".

ئیتر من زانیم، ئەوان ئامادەنین لەگەڵ ئێمە ڕێکبکەون، بۆیە منیش بە برادەرانم گوت: "کاکە ئێوە وردە وردە بڕۆنەوە و منیش دەمێنمەوە"، هەتا ترسیشمان لێ پەیدابو. خوا حەقە مولازم عومەر گوتی: "من ناڕۆم بەبێ تۆ وەڵڵاهی یا بە سلامەتی دەگەڕێینەوە، یا پێکەوەدەبین".

برادەرانی ترمان وردە وردە ناردەوە، کۆبونەوەکانی دواتر قسەمان لەسەر مەسەلەی بەرە ئەوەبو کە ئایا، حیزبەکانی تر بەشدارین لە بەرەدا، یان بەشدار نەبن؟ پێشتر شێوەیەک هەبو داندرابو کە هەڵبژاردن بکرێت لە کوردستان و ئەگەر حیزبە کارتۆنیەکان بە بێ یارمەتی بەعس نیسبەتێکی باشیان هێنا، ئەوە باشە

و ئەتوانن بەشداربن، دەنا ئەوانە حیزب نین.

لەوێ دو بۆچون هەبون، عزەت دوری دەیگوت ئەوانە حیزب نین، نەعیم حەداد دەیگوت ئەوانە حیزبن. لە کۆبونەوەکەدا گوتم: "کاکە ئێستا من سەرم سوڕماوە، ئێوە هەریەکە بۆچونێکتان هەیە، من دەمەوێت بۆچونی حکومەت بزانم"؟ عیزەت دوری گوتی: "ئەوانە ئێمە، بە زۆر و بە پارە دروستمان کردون".

پاش هەفتەیەک، سەیرمکرد مانەوەم هیچ سودی نیە و کۆبونەوەکان ئەنجامی نیە. منیش گوتم: "ئەگەر ئیجازەم بدەیتێ دەڕۆمەوە"، گوتی: "بەسەر چاوان".

نەعیم حەداد گوتی: "وا هەڵبژاردنی (ئەنجومەنی نیشتمانی) نزیک بۆتەوە، دڵنیام ئێوە بەشداری ناکەن، بەڵام تکایە گیروگرفتمان بۆ دروست مەکەن"، منیش گوتم: "بەسەرچاو، بەڵام بە مەرجێک کە نەیەنە ناوچە رزگارکراوەکانەوە"، گوتی: "باشە، بەڵام ئێوە زەغت لە خەڵک مەکەن بە زۆر بیانبەن و ئێمەش لە شارەکان زەخت لە خەڵکناکەین کە بچێ بۆ دەنگدان".

# بڕیاری وەستانی گفتوگۆ

*** بۆچی کۆتاییتان بە گفتوگۆ هێنا، هۆکارە سەرەکیەکانی چی بون؟**

- رۆژ بە رۆژ هەست بە ساردی پەیوەندی نێوان ئێمە و حکومەت دەکرا و لە زۆر لاوە، نارەزایی لەسەر رەفتاری حکومەت پەیدابوبو. حکومەت هەندێ برادەرمانی دەستگیرکرد.

سەرکردایەتی یەکێتی، کۆبونەویەکی گەورەی کرد کە هەمو کادێری عەسکری و سیاسی و هەمو ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان بانگکرابون. کۆبونەوەکە بڕیاریدا کە یەکێتی نیشتمانی کۆتایی بە گفتوگۆ بهێنێت، بەڵام ئەمە مانای شەڕ ناگەیەنێت، بەڵکو ئیمکانییەتی شەڕنەکردن هەبێت، چونکە ئێمە بۆچونێکمان هەبو کە دەتوانرێ شەڕنەکردن بەردەوامبێت، بەڵام شەڕ نەکەینەوە.

هەمو لایەک گەیشتبوینە ئەو قەناعەتەی گفتوگۆ سودی نەماوە، ئێمە بۆچون و داخوازیەکانی خۆمانمان وتوە، ئێمە لە پانزەی مانگدا بەیانێکمان دەرکرد.

دوای ئەوە، حکومەت وەفدێکی ناردەوە بە سەرۆکایەتی سەعدی مەهدی سالّح، زۆر تکای کرد، "ئەو گفتوگۆیە بەردەوام بێت و بڕیاری وەستانی گفتوگۆ ڕەتبکرێتەوە"، گوتم: "ئەو بڕیارە سەحب ناکرێتەوە، بەلاّم دەتوانین شتێکی کە بکەین، ئەویش ئەوەیە شەڕ وەستاندەکە دەوام بکات".

حکومەت، بە دکتۆر قاسملۆدا هەوالّیان بۆ ناردین کە هودنەکە دەوام بکات، بەلاّم شەڕ وەستاندنکە دەوامی نەکرد و ئەوان شکاندیان و تێکیاندا، شەڕ دەستپێکرد.[٤]

*** حکومەت هیچ داوایەکی لە یەکێتی کرد، ئەبێ دژی ئێران شەڕبکات؟**

- بەلّێ داوایان کرد، لە کوردستان هێزی پێشمەرگەی یەکێتی، ناوچەکە بپارێزێت لە هەر هێزێکی دوژمن، دێتەسەری، هەر دوژمنێک بێت، تورک بێ، یان ئێران، هەرکەسێک بێت. کە هاتە خاکی کوردستانی عێراقەوە، ئەبێ یەکێتی لێپرسراوێتی ئەوە بگرێتە ئەستۆ کە بەرگری بکات.

ئێمە خۆشمان بۆچونێکمان لا دروست بوبو کە بەرگری لە کوردستان بکەین، ئەگەر ئێران هاتەناوەوە، ئەوە ئێمە بچین بەگژیا، بۆیەش ڕێگا دەدەن یەکێتی سەد هەزار پێشمەرگەی هەبێت و چەک و موچەی دەدەنێ کە لێپرسراوێتی بەرگری کوردستان لە ئەستۆ بگرێت.

ئێمەش قبولّمان کردبو، هەرکەسێک هاتە کوردستانەوە بەرەنگاری ببینەوە، بەلاّم نەک بچینە خوارو یان ناوەراستی عێراق بۆ شەڕ دژی ئێران.

**پەراوێزەکان:**

١- (پارتی لە ١٩٨٢ دا، کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ رژێم لە بەغدا، بەهۆی شێخ عوسمان بارزانی و بە سەرپەرشتی ئیدریس بارزانی، لە گفتوگۆکاندا کە لە ناوچەی برادۆست لەسەر سێ سنورەکە بەرێوەدەچو، گەیشتنە ئەوەی. بارزانی لە ئێران بگەرێتەوە و لە ناوچەی خۆیان لە بارزان نیشتەجێ بێت، دوای ئەوەی رژێم خانویان بۆ دابینده‌کات. لەگەڵ ئەوەی ١٠ هەزار پارچە چەك و٤ ملیۆن دیناریان بداتێ کە دەیکردە ١٣ ملیۆن دۆلار، ئەوان ٢ ملیۆن دیناریان وەرگرت. هەر کە رێککەوتنەکە ئەنجامی هەبو، پارتی هەڵسا ئێرانی لەو کارە ئاگادارکردەوە و ئێرانیش بەڵێنی پێدان، کە ئەوان ئامادەن دو ئەوەندە پارەیان زیاتر بدەنێ، کارەکە سەری نەگرت) (التیارات السیاسة في العراق. ل. ٢٦٦).

٢- سامی عەبدورەحمان، وەك باڵاترین لێپرسراوی مەکتەبی سیاسی پارتی، لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیدا لەگەڵ رۆژنامەنوسێکی نەمسایی، دەربارەی گفتوگۆی پارتی لەگەڵ رژێمی سەدامدا دەڵێت: "حکومەت هەوڵی پەیوەندی لەگەڵ ئێمە داوە، لە کۆتایی مارتی ١٩٧٩ دا، هەلیکۆپتەرێکی رژێم وەك رێکەوتبوین لەو شوێنەی بۆمان دەستنیشان کردبو لە کوردستان نیشتەوە، نوێنەری رژێم هاتبو هەوڵیدا رامانکێشێت بۆ گفتوگۆ. داوایکرد کە ئێمە شەری رژێم بۆ چەند مانگی بوەستێنین. بەڵام ویستیشیان ئێمە چەکەکانی خۆمانیان تەسلیم بکەین، ئەوە بۆ ئێمە جێی باسنەبو، چونکە ئێمە بروامان بەو رژێمە فاشستەی بەغدا نەبو". — کتێبی "من لای کوردەکان بوم" (فریتس زیتە. ل. ١٢٦- Ich war bei den Kurden. Fritz Sitte.S. ١٢٦).

* کۆبونەوەی یەکەم، لە ١٩٨٢/١٠/١٣ لە گوندی گۆرە شێر گیرا، بە ئامادەبونی قاسملۆ، لەلایەن یەکێتیەوە، مام جەلال و نەوشیروان مستەفا، لەلایەن حکومەتەوە، (عەقید روکن خەلیل محەمەد شاکیر - ئەبو ئەحمەد، عقید ئیحسان- ئەبو عودەی، ئەبو محەمەد) ئامادە بون.

* (لە ٢/١٣ /١٩٨٣دا نوێنەرانی حوکمەت جارێکی تر هاتنەوە، وەفدی حکومەت هەمان وەفدی پێشو ئەبو ئەحمەد، ئەبو عودەی و ئەبو محەمەد بو، رێگای سونێ- ناوزەنگ بەفر گرتبوی، بەفرەکەیش بەستبوی... نوێنەرەکانی حکومەت پێیان لەسەر ئەوە دا ئەگرت کە مام جەلال سەردانی بەغدا بکات و ئەیانوت: یەك دانیشتنی مام جەلال لەگەڵ سەرۆك هەمو کێشەکان چارەسەر ئەکات). (پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن- دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣ نەوشیروان مستەفا ئەمین. ل. ٢٨٢).

* یەکێتی، لە ١٩٨٥/١/١٥ بەیانێکی لەژێر ناوی بیان (الاتحاد الوطني الکردستاني حول قطع المفاوضات مع الحکومة العراقیة) دەرکرد و هۆی پچرانی گفتوگۆکەی خستبوە سەر رژێمی بەعس، هەروەها رژێمیش لە ١٩٨٥/٢/١٤ دا بە ئیمزای عیزەت ئیبراهیم، نامەیەکی ١٣ لاپەرەیی ئاراستەی مام جەلال کرد کە زیاتر وەڵامی یەکێتی بو، وە داوای بەردەوامی گفتوگۆی کردبو.

# ڕاپەڕینی ١٩٩١

*** کێ ڕۆڵی سەرەکی بینی لە ڕاپەڕینی ١٩٩١ دا؟**

- دەوری سەرەکی ڕاپەڕین، هـــی یەکێتی نیشتمانی کـــوردستان و ڕێکخستنەکانی ناوەوەی یەکێتی و مەفرەزەکانی ناوەوەبون و ئەوان ڕێبەرە فیعەلیەکەبون کە لەمەیدانەکەدابون، سەرکردایەتی فیعلی ڕاپەڕینەکەش کاک نەوشیروان مستەفا بو.

*** ڕاستە ڕاپەڕین سەرکەوتنی گەورەی بەدەستهێنا، بەڵام بە بۆچونی تۆ هەڵەکانی ڕاپەڕین چی بون؟**

- بە ڕای من هەندێ هەڵە لە ڕاپەڕیندا رویدا، گرنگترینیان ئەمانە بون:

یەکەم: ڕاپەڕین لەکاتی خۆیدانەبو، دەبوایە زوتر دەستمان پێبکردایە، یاخود هیچ نەبێ ئەو ڕۆژە هەڵسابینایە، لە خوارووی عێراق ڕاپەڕین دەستیپێکرد.

دوەم : پێویست بو ئێمە هێزی خۆمان تەرخانبکەین و ئەمبارەکانی چەک و تەقەمەنی ڕژێم کۆنترۆڵ بکەین و بەکارمان بهێنایە بۆ خۆمان.

سێیەم: دەبوایە تەجنیدی ئەندام و پێشمەرگە کۆنەکانی خۆمان بکەین، واتا بەیانێک دەرکەین کە هەرچی ئەندام و پێشمەرگەی کۆنی یەکێتی هەیە، پەیوەندی بە یەکێتیەوە بکاتەوە.

چوارەم: دەبوایە جەماوەر لەناو شارەکاندا چەکداربکەین، بۆ بەرگری لە شارەکان.

پێنجەم: پێویست بو هێڵی بەرگری لە شوێنی گرنگ دابنێین، بۆنمونە کە لە کەرکوک شکاین، لە جیاتی ئەوەی لە چیمەن و لە قەرە هەنجیر، هێڵی بەرگری دابنێین، پێویست بو هێڵی بەرگریمان لە دەربەندی بازیان و شیوە سور و بەردەمی تاسڵوجە دابنایە.

شەشەم: ئێمە شەڕی ناو شارمان نەدەکرد، دەبوایە شەڕی ناوشار شێوەیەک

بوایە لە شەڕکردن، چونکە شەڕی ناوشار هەم مومکینە، بەتایبەتی ئێمە وەک یەکێتی تاقیکردنەوەمان هەبو، پێشمەرگەی ئێمە تاقیکردنەوەی هەبو لە شەڕی ناولادێ و ناوگونددا و دەتوانرا زۆر باشتر لە دەشتەکان سودیان لێوەربگیرێت، پێشمەرگە لەکاتی خۆیدا چەندین داستانیان تۆمارکرد و لە شەڕی ناوگوندەکاندا شەڕی نمونەیان کردوە.

# ڕزگارکردنی کەرکوک

*** بۆ یەکەمینجار لە مێژوی خەباتی چەکداری کورددا، کەرکوک ڕزگارکرا، بەڵام پێشمەرگە نەیتوانی تێیدا بمێنێتەوە.**

- بەڵێ، کەرکوک بە هێزێکی سەرەکی یەکێتی کە ڕێبەرەکەی کاک نەوشیروان بو ڕزگارکرا، کۆسرەت رەسوڵ بە هاوکاری عومەر عەبدوڵڵا سەرکردایەتی شەری ناوشاریان دەکرد.

لەبەر چەند هۆیەک نەمانتوانی لە کەرکوکدا بمێنینەوە .

یەکەم: ماوەی ڕزگارکردنەکە زۆر کەمبو، ئەوەبو پاش ماوەیەکی کورت حکومەت پەلاماری دایەوە و نەتوانرا لەو ماوە کەمەدا، خەڵکەکە چەکدارکەین و هانیان بدەین بۆ بەربەرەکانی لە ناوشار و دانانی هێڵی بەرگری لە ناوشاردا. جگە لەوە، ئەوەبو عێراق هات و بە تۆپ و تانک و هەلیکۆپتەر، کەوتە گیانی خەڵکی ناوشار و ئینجا هێزی پێشمەرگە.

هێرشەکەی عێراق ورەی خەڵکی ڕوخاند، خەڵک وایزانی کە ئەمەریکا چرای سەوزی بۆ عێراق هەڵکردوە بۆئەوەی لێماندا، چونکە لەو کاتەدا حکومەتی ئەمەریکا بڵاویکردەوە کە هەقی نیە بەسەر خەڵکی عێراقەوە و خۆی (تێکەڵاوی گیروگرفتی ناوخۆیی ناکات) ئەو هەڵسوکەوتانە ڕێگایاندا، هەلیکۆپتەری عێراق بفرێ و دژی خەڵکی عێراق بەکاربهێنرێت، ئەو هێزە سوپاییەی عێراق ورەی خەڵکی روخاند.[1]

*** واتا ڕێککەوتنی سەفوان لەنێوان ئەمەریکا و عێراقدا، بە زیان گەڕایەوە بۆ گەلی عێراق بە گشتی و گەلی کورد بە تایبەتی؟**

- بەڵێ، ڕێککەوتنی سەفوان بە سود نەگەڕایەوە بۆ خەڵکی عێراق، ئەوان بڵاویانکردەوە، ئەمەریکا دەست ناخاتە کاری ناوخۆی عێراقەوە. جارێکیان عزت دوری بە وەفدی کوردی بە سەرۆکایەتی مەسعود بارزانی گوتبو: "لە دوای ئەوەی ئێوە کەرکوکتان گرت، چرای سەوزیان بۆ هەڵکردین کە بیگرینەوە"، ئینجا نازانم مەبەستی چرای سەوز تورک بو، یان ئەمەریکا.

*** هەڵەی یەکێتی لە کەرکوک چی بو، ئەوانەی باسکردن هەموی هەڵەی سیاسی و پێشمەرگانە و مەوزوعی بون، ئەی لەبواری شەخسیدا هەڵە روی نەدا؟**

- هەڵەی ئێمە کاکە سەلاح گیان چونکە من لەوێ نەبوم ناتوانم تەخمینی بکەم، باش دەبێت ئەو پرسیارە لە نەوشیروان، یان لە کۆسرەت بکەیت، چونکە ئەوان لەو کاتەدا لەوێ بون.

هەڵەی ئێمە ڕەنگە ئەوە بوبێت کە کەرکوک گرنگیەکی گرنگیەکی تایبەتی خۆی هەیە و دەیهێنا کە هەمو هەڤاڵانی سەرکردایەتی، یان بەشی زۆریان لەوێ بمێننەوە و خەڵک ڕێکبخەن و سەنگەرلێدەن کە کەرکوک رزگارکرا، برادەران پێیان وابو حکومەتی عێراق جارێکی دیکە هەڵناسێتەوە و ئەتوانن لەوێ بمێننەوە.

*** وەک دەزانین لەو ساتە وەختەدا تۆ لە دەرەوەی وڵات بویت، ڕۆڵی ئێوە چی بو لە دەرەوە بۆ خۆئامادەکردن بۆ ڕاپەڕین؟**

- لەڕاستێیدا ڕاپەڕین دەمێک بو، وەکو بیرۆکەیەک لە مێشکماندا گەڵاڵەبوبو، پێش ئەوەی من بچمە دەرێ، چەند جارێک لەگەڵ نەوشیروان قسەمان لێکردبو، لەو قەناعەتەدا بوین، ناکرێت هەتا ڕۆژی قیامەت بیر لە خەباتی شاخ بکەینەوە بەبێ ئەوەی شار گرنگی خۆی بدرێتێ. هەندێک خۆپیشاندان و ڕاپەڕینی شارەکانیش ڕوی دابو، ئەوە بۆچونێکی لامان دروستکردبو کە توانا لەناو خەڵکدا هەیە بۆ ڕاپەرین، لەبەرئەوە مەسەلەکە وەکو فیکرەیەک هاتبوە کایەوە و بڕیاردرابو چۆن کاری بۆ بکەین و خۆی بۆ ئامادەبکەین، تەنها مەسەلە کاتەکەی بو.

باسی ئەوەکرابو شانەی چەکدار دروستبکەین لەشارەکان و چەک بنێرین بۆ شارەکان و پەیوەندی بە کۆنە پێشمەرگەکانەوە بکەین کە بونەتە جاش و تەنانەت بە هەندێک لەسەرۆک جاشەکانەوە کە لە کۆنەوە دۆستایەتیمان هەبوە

لەگەڵیاندا، بەڵام لەسەر مەسەلەی کەی و شێوەی خۆئامادەکردنەکە بۆ ڕاپەڕین جیاوازیمان هەبو. من رام وابو لە عێراق دەدرێ، برادەران رایان وابو، لێی نادرێ و ئەوە گاڵتەیە و سەدام لە کوێت دەکشێتەوە، بەڵام من سوربوم لەسەرئەوەی لە عێراق ئەدرێ.

لەناو برادەراندا تەنها کۆسرەت پشتگیری راکەی منی دەکرد و برادەرانی تری مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی هەمویان ڕایان وابو لێنادرێت و لەبەرئەوە ئێمە خۆمان توشی ئەو بەڵایە نەکەین و عێراق لێمان ئەتۆرێ. بە تایبەتی ئەو کاتە هەستێکی گفتوگۆکردن پەیدابوبو، بەڕاستی ناکۆکیەکە پەرەیسەند و من گەیاندمە وازهێنان و گوتم یان وەرن ئێوە لێپرسراویەتیەکە وەرگرن، یان هاوکاری من بکەن.

گوتم: "یان ئێوە وەرن لێپرسراوێتی وەرگرن، یان شەش مانگ مۆڵەت بە من بدەن و ئەوەی من دەیڵێم ئێوە کاری پێبکەن و دەسەڵاتم بدەنێ و بەوپێیە لە دەرەوە ڕەفتار ئەکەم. ئەگەر ئەوەی من دەیڵێم وادەرنەچو، ئەوە خۆتان سەربەستن، پەیڕەوی کام سیاسەت بکەن"، ئەوەبو هەمو ڕەزامەندیان دەربری و دەسەڵاتیان دابەمن کە مەکتەبێکی سیاسی دروستکەم، ئەوە بو مەکتەبێکی سیاسیم دروستکرد.

من نامەیەکم بۆ نەوشیراوان نوسی و ئەویش وەڵامی دامەوە کە خەریکی دروستکردنی شانەی چەکدارە و خۆئامادەکردن و پەیوەندیکردنە بە جاشەکان و نەخشەدانانی گەڕانەوەی پێشمەرگەیە بۆ ناوەوە، ئەوەیش لەسەر بناغەی ئەوەی من گوتومە لە عێراق دەدرێ. من حەزدەکەم ئەوەت بۆ مێژو پێ بڵێم: کە من چۆن زانیم کە شەڕ دەبێت. من برادەرێکم هەبو لە سەرکردایەتی هێزی سەربازی گشتی عێراق، ئەو برادەرەم پێی گوتوبوم، سەدام لە کوێت ناکشێتەوە و پێیوایە شەڕ نابێت و ئەوە هەموی هاژ و هوژە، لەبەرئەوە هیچ پێویست ناکات، بکشێتەوە و پێشی وایە ئەمەریکا ناتوانێت هێرش بکات، ئەگینا وەکو ڤێتنامی لێدێت.

منیش بەهۆی ئەو زانیاریەوە دڵنیابوم کە ناکشێتەوە بە ئامادەبونی کۆسرەت گرەوم لەگەڵ حازم عەبدولجەبار کوبەیسی کرد لەسەر پێنج سەد پاوەند، ئەوەبو من بردمەوە و ئەو دۆرانی و پارەکەشی نەدا!

هەروەها زانیاریەکی ترم هەبو، ئەوەیش ئەوەبو: برادەرێکمان هەیە و دۆستی کوردە ناوی پێتەرگالبریس[٢]، لە واشنتۆن شتێکی پێ گوتم: کە ئەمەریکا لە

سەدام ئەدات، ئەمە پێش داگیرکردنی کوێت بو، چونکە سوپای عێراقی زۆر گەورەبوە و دەبێتە مەترسی لەسەر ئاسایشی ناوچەکە، لەبەرئەوە شتێکی هەر لێدەکەن و دەیخەنەوە حەجمی ئاسایی خۆیەوە. بۆیە ئەویش گوتی: جەلال تۆ حسابی خۆت لەسەر ئەم راستیانەی بکە لێدانی عێراق بڕواتەوە.

هەروەها دۆستێکی تری ئەمریکیم هەیە، ناوی (جیمیس ڕێگند)ە کاتی خۆی سەفیربوە لە سعودیە و لە عێراق، ئەوە یەکەم ئەمریکی بوە کە لە بەغدا ناسیومە، گوتی: "جەلال رەنگە ئەمەریکا پێی خۆش بێت کە عێراق نەکشێتەوە، بۆئەوەی لێیبدات و سوپاکەی لاواز و بێهێزبکات، ئینجا دوای ئەوە، سوپای عێراقی لاوازبو، قۆناغێکی تر دێتە پێشەوە، ئەویش لابردنی سەدامە و ڕژێمەکەشی دەبێت بڕوخێ".

من لە شام بوم، عومەری سەید عەلی و چەند برادەرێکی تریش لە شام بون و ئێوارە دانیشتبوین و دیسان هەمان باس هاتە پێشەوە، ئایا لێی دەدرێ، یان لێی نادرێ، ئەوان لەو ڕایەدابون لێی نادرێت، من لەسەر بۆچونی خۆم سوڕ بوم کە لێی ئەدرێت.

شەو درەنگ بو، دەوری سەعات یەک بو، گوتم من دەچم دەنوم، بەڵام تکایە هەڵم مەسێنن بۆئەوەی باش بنوم، تەنها ئەگەر لە عێراق درا، ئەوکاتە هەڵمسێنن.

بەیانی زو عەبدولڕەزاق کۆیی لە دەرگایدا، منیش گوتم: "نەمگوت عەبدولڕەزاق لێم گەڕێ بنوم"، گوتی ئەی نەتگوت ئەگەر لە کوێتیان دا هەڵمسێنن"!.

ئیتر برادەران کەوتنە خۆ ئامادەکردن بۆ ڕاپەڕین، ئەوەی لە دەرەوە پێمکرا، ئەوەبو پارەمان پەیداکرد و ناردمانەوە. ڕاستیەکەی عەرەبی سعودی و کوێتیەکان هەندێک یارمەتیان داین، هەرچەندە یارمەتیەکە کەمبو، بەڵام هەمویم ناردەوە بۆ وڵات.

# کۆڕەوی بەهاری ١٩٩١

*** بەڕای تۆ دەتوانرا ڕێگا لە کۆڕەوەکە بگیرێت؟**

- نەخێر، ڕەوەکە ئەوەندە زۆربو، ئەوەندە جەماوەریی بو، بە هیچ جۆرێک ڕێگای لێ نەئەگیرا. من چومە پێنجوین لەوێ قسەم بۆ خەڵککرد، هەزاران کەس لێم کۆبوە و هەمو چەپڵەی گەلێک گەرمیان بۆ لێدام، بەڵام کە داوامکرد بگەڕێنەوە، کەس لەگەڵم نەگەڕایەوە!.

ئنجا سەلاحەدین قسەیەکی خۆشت لەو بارەیەوە بۆ باسبکەم، من و نەوشیروان و بەرهەم لە کولیەی جەنگ بوین لە ئەمەریکا، بۆ بەشداری لە نەدوەیەک دەربارەی عێراق و باسی دوای ڕاپەرین. پیاوێک هەیە ڕەنگە بەرهەم ناوی پێ وتبیت دۆستی کوردە، تەعەلیقێکیدا و گوتی: "ئەم جەلال تاڵەبانیە بەڕاستی پیاوێکی زۆر زیرەکە و سەرکردەیەکی زۆر زیرەکە، ئسلوبێکی داهێنا بۆ ڕاکێشانی سۆزی دنیا بۆ کورد کە لە مێژودا روی نەداوە، ئەویش ئەو ڕەوە جەماوەریەبو کە خەڵکی کوردی هاندا بە ملیۆنان بچنە دەرەوە. ئەو ڕەوەش بوەهۆی ئەوەی ڕای گشتی دنیا. سۆزی بەرامبەر کورد زیادبکات و یارمەتییان بدات".

ئینجا کە کۆبونەوەکە تەواوبو، گوتمان: "ئێمە هانی خەڵکمان نەدا، بەڵکو جەماوەر خۆی کۆرەوی کرد". ئەو پێیوابو ئێمە بە پیلان ئەوەمانکردوە، بۆئەوەی سۆزی دنیا ڕابکێشین و هۆکاری دەرەکی بەدەست بهێنین بۆ پشتیوانی گەلەکەمان.

*** بەدەر لە سۆز و هاوکاری کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، ئایا کۆڕەوەکە هیچ زیانێکی هەبو؟**

- بەڕەئی من لەڕوی ستراتیجیەوە قازانجی هەبو، واتا ئەو سۆزەی هاتە سەر کورد و ئەو ناوچە ڕزگارکراوەی ئێستا هەمانە و ئەو پاراستنە ئاسمانیەی لێیکرا، هۆی ئەو کۆچەبو.

کاتێ جیمس بێکەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکامان بینیەوە، گوتی: "لەسەردەمی مندا زۆر شتی گەورە رویداوە، وەک روخانی دیواری بەرلین و

هەرەسهێنانی سیستەمی وڵاتانی سۆسیالیست و چەند شتێکی تریشی باسکرد، بەڵام هیچ شتێک بەقەدەر دیمەنی ئەو کوردە کۆچ کردووانە و ئاوارەبونیان کاری تێنەکردم، بە تایبەتی کە منداڵانم بینی لەسەر بەفرکەوتون، یەکسەر خۆم پێنەگیرا بگەمەوە سەفارەت، راستەوخۆ لە فرۆکەکەوە قسەم لەگەڵ سەرۆک کرد و وتم پێویستە ئێمە فریایان بکەوین".[٣]

*** لە کاتێکدا کۆڕەوەکە، ئەم دەنگدانەوە گەورەیەی دایەوە، چۆن ئەتوانرا زیاتر سود لەو کۆڕەوە وەربگیرێت؟**

– من پێم وایە کاکە سەلاحەدین سودی پێویستی لێ وەرگیرا، سودی پێویست هەر ئەوەبو کە سۆزی جیهان ڕابکێشیت و هاوکاری و یارمەتی بۆ دابینبکەیت، ئەوەشت لەبیرنەچێت کە ئەوکاتە ئێمە ئەو هێزەی ئێستامان نەبو، ئێمە هەموی سێ چوار هەزار پێشمەرگەمان هەبو و ڕێکخستنەکانمان خراپ نەبون، بەڵام ئەو هێزەی ئێستا نەبوین.

# گفتوگۆی ١٩٩١

*** لەو کاتە تراژیدی و کۆچەدا، چۆن بو مەسەلەی گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم هاتە کایەوە؟**

– مەسەلەی گفتوگۆ دو شێوەبو، یەکێکیان لە دەرەوە بەهۆی بارزانی برای سەدامەوە هاتەکایەوە کە سەرچل قەزاز ئاگای لە مەسەلەکە هەبو و بەداخەوە، بەهۆی هەڵوێستی برایانی پارتیەوە سەری نەگرت.[٤]

لە ناوەوەش، دوای ئەوەی رەوەکە رویدا، عێراق شوێنەکانی گرتەوە و خۆشی گەیشتە ئەو راستیەی کە دەبێ چارەیەک بدۆزرێتەوە بۆ ئەو کێشەیە و ناکرێ بە ملیۆنان خەڵک دەربەدەربێت.

حکومەت نوێنەری نارد بۆلامان و گوتیان دەمانەوێ گفتوگۆ بکەین، ئەوکاتە بەرەی کوردستانی هەبو، لە خەلیفان کۆبۆوە. من دەبوایە لە سلێمانیەوە بچم بۆ خەلیفان، بە ناوچەی حکومەتدا چوم بۆئەوێ، واتا حکومەت ئاسانکاری

بۆکردم. مەبەستیشم ئەوەبو، نەوترێت من لە چونمدا بۆلای میری، سڵ دەکەمەوە و ترسم هەیە.

کە چوینە ئەوێ، هەمو برادەران بە یەکێتی و پارتی و شیوعییەوە لایەنگری گفتوگۆ بون، تەنها من نەبێ. من لایەنگری گفتوگۆ نەبوم، چونکە پێموابو ئەوکاتە گفتوگۆ باشنەبو، ئەوە دنیا لەسەرمان هەڵدەداتێ و هاوکاری بۆ کورد لە زیادبوندابو، کۆڕەو شکستێکی کاتیە و هەڵدەستینەوە و ئێمە لەگەڵ ئەم حکومەتە ناگەینە ئەنجامێک.

برادەران گوتیان: "نەخێر ئەم گفتوگۆیە سودێکی هەیە، هەناسەیەک وەردەگرین و خەڵکەکەمان کۆدەکەینەوە و دێنەوەسەرخۆ. ئەو کۆڕەوە کارەساتە کە ملیۆنان کورد لەسەر ئەو شاخ و داخەیە و دەمرێ و ئەرکی ئێمەیە ڕزگاریان بکەین".

لە کۆتاییدا، من بە بۆچونی خۆم هیچم پێنەکرا گوتم باشە. ئەوان داوای وەفدێکیان کردبو، پێویست بو من یان مەسعود بارزانی بچین، زۆر لە برادەران گوتیان: "تۆ بچۆ". منیش گوتم: "نابێ من بچم، من لەگەڵ سەرۆکی عێراقی ئەو هەمو شەڕە جنێوەمان کردوە، ئەو هەمو قسەیەی بە من گوتوە، من زۆر قسەم لە دەرەوە کردوە". نەوشیروان هەڵی دایە گوتی: "تۆ کەی ترساوی! تۆ هەمیشە ڕۆحت لەسەر دەستت بوە و هەمیشە شەهیدبونت لەبەردەمبوە، ئەمکارەش لەپێناوی مەسەلەی کوردایە و با شەهید بیت"!.(٥)

منیش گوتم: "باشە بەو مەرجە دەچم، کە هەموتان بڕیارێک بەخەتی مەسعود بارزانی بنوسن و بۆم ئیمزابکەن. (مەسعود بارزانی خەتی خۆشە) و بنوسن ئێمە مام جەلالمان نارد بۆ گفتوگۆ، ئەوە یەکەم، دوەم کێم دەوێ پێویستە لەگەڵمدابێت"، ئەوانیش لەسەر ئەو دو مەرجە رازیبون.

پێش چونم بۆ سەلاحەدین، بەو نیازە چوبوم، ئەگەر برادەران بڕیاریاندا، گفتوگۆ بکەن، ئەوا من واز لە سکرتێری یەکێتیش دێنم و دەڵێم من دەچمە دەرەوە. بە هێرۆشم گوتبو جانتا و شتەکانت بپێچەرەوە دەڕۆین بۆ ئێران و دەرەوە، پارە و شتی یەکێتیم لابو، هەموویم تەسلیمی حەمە تۆفیق و ئەو برادەرانە کرد.

*** هۆی چی بو لە بڕیارەکەت پەشیمان بویتەوە و نەچویتە دەرەوەی وڵات؟**

- کاتێ هەمو سوربون لەسەر ئەوەی، دەبێت بچم بۆ گفتوگۆ، ئەوەبو ناچاربوم بڕیارەکەیان قبوڵبکەم. ئیتر دوای ئەوە لە ٧ی نیسانی ١٩٩١ دا چوینە بەغدا

و گفتوگۆ دەستیپێکرد و جارێکی تر مەسعود بارزانی چو، ئینجا هەردوکمان بەیەکەوە چوینەوە و بەوجۆرە.[٦]

* **باس لە نامەیەک دەکرێ کە ئەوکاتە مەسعود بارزانی نوسیویەتی؟**

- بەڵێ ئەو نامەیە ماوە، بەخەتی خۆی نوسیویەتی، مەسعودیش خۆی لەسێ لێدواندا گوتویەتی نامەی لەو جۆرەی نوسیوە.

# هۆی سەرنەکەوتنی گفتوگۆ

* **بۆچی گفتوگۆ سەری نەگرت، هەڵەکانی ئێوە چی بون؟ ئایا نەتوانرا لەگەڵ ڕژێم ڕێکبکەون؟**

- بەڕای من نەدەتوانرا لەگەڵ ڕژێم ڕێکبکەوین، ڕژێم تەبیعەتی لەگەڵ تەبیعەتی ئێمە نەئەگونجا. ئێمە دیموکراسیمان دەویست، ئەوان باوەڕیان بەدیموکراسی نەبو، ئێمە مافی مرۆڤمان دەویست، ئەوان باوەڕیان پێینەبو. مەسەلەیەکت بۆ بێنمەوە، ڕۆژانی یەکەم کە زۆر تەنگاوبون کە من لەوێ بوم گوتیان: باشە فەرمون چیتان دەوێ؟ من گوتم: چوار وەرەقەمان ئامادەکردوە کە بریتی بون لە:

یەکەم: دەربارەی فراوانکردنی دەسەڵاتەکانی حوکمی زاتی و ناوچەی حوکمی زاتی، گوتیان زۆر باشە.

دوەم: لەسەر مەسەلەی ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کوردستان و لابردنی شوێنەواری کۆچی بەزۆر و بەعەرەبکردن، بۆ ئەوەش وتیان باشە.

سێیەم: لەسەر مەسەلەی دیموکراتی، ئەویش گوتیان باشە.

چوارەم: لەسەر مەسەلەی مافی مرۆڤ و جێبەجێکردنی لە عێراق، گوتیان باشە.

ئەو کاتە بریاری نەتەوە یەکگرتوەکان (٦٨٨) کە پەیوەندی بە مافی مرۆڤ و دیموکراسیەتەوە هەیە دەرچوبو. یەکەمجار گوتیان باشە، جاری دوەم کە نەفەسێکیان هەڵکێشایەوە و وڵاتەکەیان کەوتەوە بەردەست و جێگیربون، یەک

بەیەک ئەوانەیان ڕەتکردەوە گوتیان مافی مرۆڤ، ئەوە لە بناغەدا فێڵێکی دەوڵەتە ئیستیعماریەکانە دژی وڵاتە سۆسیالیستەکان هێناویانە بۆ باسکردن، دیموکراسی شتێکی بۆرژوازیە ئێمە هەمومان پێشکەوتنخوازین و مەسەلەی فراوانکردنی دەسەڵاتی حوکمی زاتی پێویست ناکات، چونکە حوکمی زاتی خۆی هەیە![7]

*** بە هەڵسەنگاندنی ئێوە، چۆن حکومەت توانی بە ئاسانی ڕاپەڕینی کوردستان دامرکێنێتەوە و هێزی پێشمەرگە توشی ئەو شکست و هەڵهاتنە هات و شوێنەکان بگرێتەوە؟**

- چەند هۆیەک هەبون بۆ سەرکەوتنی کاتی حکومەت:

یەکەم: ئەو چەک و تەقەمەنی و کەلوپەلانەی کە گیران، کەوتنە دەست خەڵک و نەکەوتنە دەست پێشمەرگە. ئێمەش نەمان توانی بچین بەگژ خەڵکدا و نەیەڵین شتەکان بەرن، بۆیە هێزی پێشمەرگە چەک و تفاقی وەک پێوست پێ نەبو.

دوەم: نەمانتوانی هێزی پێشمەرگەی خۆمان بەهێزبکەین و ژمارەی زیادبکەین، ماوەکە کەمبو بۆئەوەی پێشمەرگە دێرینەکان و پێشمەرگەی تر کۆبکەینەوە. مەسەلەن ئێمە سێ، چوار هەزار پێشمەرگەمان هەبو، دەمانتوانی شەش، حەوت هەزاری تر کۆبکەینەوە .

سێیەم: ئاسان نەبو ئێمە شەڕی بەرەیی ببەینەوە، بۆ نمونە، ئێمە لە لەکەرکوک شەڕی بەرەییمانکرد، بەڵام ئەوان کەرکوکیان گرتەوە. هەروەها نەخشەی بەرگری لە سلێمانی بە هەڵە دانرابو، لە جیاتی ئەوەی هێڵی بەرگری لە دەربەندی بازیان و شیوە سور و تاسڵوجە دابنرێ، برادەران چو بون لە چیمەن و لە قەرەهەنجیر دایان نابو کە ناوچەیەکی دەشتە و دەبابە کە هات ڕێک تێکی شکاندن و پێشمەرگە پەڕاگەندەبو.

چوارەم: ئەوەبو، خەڵکەکە هەڵات، تاسەر سنور خۆی پێنەگیرا. وەک بۆم باسکردیت، من چوم بۆ پێنجوین، قسەم بۆ هەزاران کەس کرد و حەماسم دانێ و چەپڵەیان لێ ئەدا، بەڵام کەس نەهاتەوە لەگەڵمدا. ئەحمەد بامەڕنی لە کتێبەکەیدا نوسیویەتی و دەڵێ: "لە شۆڕشی پێشودا کە ئاش بەتاڵ بو، خەڵک ئامادەبو بەرگری بکەن، بەڵام سەرکردە ئامادەنەبو، ئەمجارە سەرکردە ئامادەبون، بەڵام خەڵک ئامادەنەبون".

لەو ئەزمرە مامۆستا جمال محەمەد و پانزە، بیست پێشمەرگە، توانیان بەرگری بکەن و سوپای عێراقیان ڕاگرت و نەیانتوانی بێتە پێشەوە. واتا ئەگەر خەڵک هەبوایە، سوپای عێراقی ئەوەنەبو، لە ماوەیەکی کەمدا زۆربەی شوێنەکان بگرێتەوە.

کە خەڵک ڕایدەکرد، پێشمەرگەش هەوڵی ئەدا خێزانەکەی خۆی ڕزگاربکات، بۆیە ئەویش ڕایدەکرد. بەڵام دوای ئەوەی لەکاتی گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت پشویەکماندا، ئینجا خەڵک هاتەوە. خۆ قسە مەشهورەکەی کۆسرەتت بیستوە کە من چوم بۆ گفتوگۆ، کەسی وامان لەگەڵ نەمابو، بەڵام کە خەڵک زانی گفتوگۆ هەیە و مام جەلال چۆتە بەغدا و وەفد لەوێیە، خەڵک هاتەوەلامان.

کە هاتمەوە، هەزاران پێشمەرگە هاتبون، کۆسرەت گوتی "پێیان بڵێ هەتیم لاچن، ئێستا مام جەلال ئێوە ببینێ مفاوەزاتەکەی تێک دەداتەوە، دەڵێت ئەوە خەڵک هاتەوە و کاتی خەباتە".

من دەمەوێ بڵێم سیاسەتی ناڕاست ئەنجامی وای لێدەبێتەوە، ئەگەر سیاسەتەکەمان ڕاست بوایە، بمانزانییایە چاک هەماهەنگی نێوان گفتوگۆ و خەباتی چەکداربکەین، ئەوەمان بەسەر نەدەهات.(٨)

*** دەوری وڵاتانی دراوسێ چی بو لە ڕاپەڕیندا؟**

– هیچ نەبو، واتا وڵاتانی دراوسێ هیچ دەورێکیان نەبو لە ڕاپەڕیندا، نە پشتیوانی سیاسیان کردین، نە هاوکاریان کردین بە چەک، نە بە پارە. پێشتر ئێران هەندێ چەک و تەقەمەنی دابوینێ و کارئاسانی بۆ کردین بۆ هاتنەوە، بەڵام ئەوەنەبو قورسایی خۆی هەبێت. بەڵام لەناو وڵاتانی دراوسێدا، تەنها ئێران دەوری هەبو. هەروەها ئێران دەورێکی تری هەبو لە ڕاپەڕیندا ئەویش ئەوەبو ئێستا بۆ مێژو بیگێڕینەوە. ئەوان چون مەسعود بارزانیان هێنایەوە بۆ کوردستان. مەسعود ئەو سەردەمە بڕوای وابو ئەگەرهاتو ئێمە ڕاپەڕین، ئەوا عێراق چەکی کیمیاوی بەکاردەهێنێت و میللەتەکەمان تەفروتون دەکات، لەبەرئەوە پێیوابو ڕاپەڕین کاتی نەهاتوە.

*** هەڵەکانی بەرەی کوردستانی چی بون لەو گفتوگۆیەدا؟**

– من پێموانیە ئێمە هەڵەمان کردبێت، بەڵام دو شت دەبینم بۆ مێژو:

یەکێکیان مەسعود بارزانی زۆر هەڵپەی نیشاندا، ئەو هەڵپە نیشاندانە وایکرد بەعسیەکان کلکیان توندکەنەوە و بەهێزبون و لە هێزەوە قسەیان دەکرد.

مەسعود بارزانی، وای قسە دەکرد کە هیچمان پێناکرێت و دەچینەوە ئێران و نوگرە سەلمان باشترە لە چونەوە بۆ ئێران. لە ژورەکانی کە ئێمەیان لێدانابو لە بەغدا، بە نەهێنی قسەکان تۆمار دەکران. ئەو وای نیشاندەدا کە ئێمە چارمان نیە،

تەنها ئەوەنەبێت لەگەڵ حکومەتدا پێکبێین و ئەوەباشترە لەهەمو رێگایەکی تر.

وەکو دەردەکەوێت لەو کاتەوە مەسعود بارزانی پەیوەندی لەگەڵ حکومەتدا دروستکردوە، نوسخەیەکم هەیە و دەتدەمێ لەو رێکەوتنامەیەی کە کرابو و ئامادەکرابو ئیمزا بکرێت.

ئێمە کوبونەوەمان کرد و باسی ئەو رێکەوتننامەیەمان کرد و هەمو لەو باوەرەدابوین، ئەو رێکەوتنامەیە، دەست و پەنجەی بەعسی پێوەیە و هەموی سەلماندنی سەرکردایەتی بەعس و سەروەری بەعس و شۆڕشی بەعس بو، هەتا شەڕی ئێران و کوێت بە شەرعی دائەنێت.[٩]

## پەراوێزەکان:

١- (ئێوارەی نەورۆز لە رۆژئاوای کەرکوکەوە (پردێ) و لە رۆژهەڵاتەوە (قەرەهەنجیر) پەلاماری شاری کەکوك درا، شەوی پێشو هێزە کەرکوکیەکان دزەیان کرد بو، چوبونە ناو گەڕەکە کوردەکانەوە. بۆ شەو هێزەکان لە هەمو لاوە هێرشیان کرد و رژانە ناو شارەوە تا رۆژی دوایی کە نەورۆز بو، ناو کەرکوکیان پاك کردەوە، تەنیا ئەو لایەی بە هێزەکانی گەرمیان، کفری، کەلار و دوز سپێدرا بو بە هۆی شەری "موجاهیدینەوە" نەیتوانی هیچ بەشداریەك لە جێبەجێکردنی پلانەکەدا بکا، بۆیە "موعەسکەر خالید" وەکو خەنجەرێکی کوشندە لە کەلەکەی کەرکوك دا مایەوە. شەوی ٢٠-٢١ی ٣ی ١٩٩١ بە تەواوی دەس گیرا بە سەر ناو شاری کەرکوك دا. لەناو شاری کەرکوکەوە لەسەر بۆنیتی ئۆتۆمبیلەکەمان هەواڵێکی کورتم وەك مژدە نوسی و بە بێتەل دامان بە رادێوە "دەنگی گەلی کوردستان" بڵاوی بکاتەوە). (خەون یان مۆتەکە نەوشیروان مستەفا، ل. ١٣).

٢- سەفیری جارانی ئەمریکا لە کرواتیا و راوێژکاری کورد لە کاتی نوسینەوەی دەستوری عێراقیدا.

٣- (جیمس بیکەر، لە ٧ نیسانی ١٩٩١دا بە فرۆکە بەسەر ئۆردوگای کوردەکاندا دەفرێ کە لە تورکیا بون و ئەو وێنانە کاریگەری زۆری کردە سەریان و سەفیری ئەمریکا لە تورکیا مۆرتۆن ئەبرۆمۆڤیتز نوسیبوی کە ئەو سەفەرە بە ١٢ گرنگترین دەقیقە دەژمێرێت لە مێژوی هاوکاری مرۆڤایەتیدا).(أمة في شقاق .. جوناثان راندل. ل. ٩٣).

٤- (مام جەلال لە ٤ نیسانی ١٩٩١ دا نامەیەکی نوسی بۆ سەدام، پەیامەکەی خۆیی (سەدام، لە کاتی راپەرین و پێش گرتنی کەرکوك، پەیامێکی نوسراوی ئاراستەی مام جەلال و مەسعود بارزانی کرد بو)، و نامەی بارزان تکرتیتی برای بیر هێنا بوەوە بۆ دەستپێکردنی گفتوگۆ: لە نامەکەی دا ئامادەیی دەربری بو بۆ راگرتنی شەڕ و ناردنی دەستەی نوێنەرایەتی بەرەی کوردستانی بۆ گفتوگۆ. نامەکەی دابو بە دارای تۆفیق ئاغا بییات بۆ سەکردایەتی عێراق... دارا نامەکەی مام جەلالی دابو بە سەدام، خوێندبویەوە. دارا داوای وەڵامی لێکرد بو. سەدام گوتبوی "پێی بڵێ جگە لە جیابونەوە هەمو شتێ قابیلی باس کردنە) (خەون یان مۆتەکە - ل. ١٦. نەوشیروان مستەفا).

٥- ( دەستەی نوێنەرانی بەرەی کوردستانی، هەمویان رەنی خۆیان بە سەربەستی دەربڕی، کەس نەبو دژی گفتوگۆ و رێکەوتن بێ، هەرەسی خەڵك و نەبونی توانای بەرنگاری جەیش و کۆچی بە کۆمەڵ و بێ هیوایی لە ئێران و سوریا و، باوەر نەبون بە ئەمریکا و دەوڵەتانی ئەوروپی، بە ئاشکرا لە سیمای

هەموان دا بەدی نەکرا، جۆرێ لە نائومێدی خەمگین باڵی بەسەر هەموان دا کێشا بو مام جەلال سەبارەت بە چونی خۆی بۆ بەغدا داوای کرد کە هەمو ئەوانەی لەو کۆبونەوەیەدا ئامادەن، ئەبێ کاغەزێکی بۆ ئیمزا بکەن کە ئەوان ئەینێرن...کاك مەسعود بڕیارەکەی بە خەتی خۆی نوسی و، هەمو دەسەڵاتێکی درایە بۆ رێکەوتن و ئیمزا کردنی رێکەوتنەکە و، هەمومان ئیمزامان کرد و، وەکو بەڵگەیەکی مێژویی، درا بە مام جەلال خۆی). (خەون یان مۆتەکە- ل.. ٢١. نەوشیروان مستەفا).

٦- خولی یەکەمی کۆبونەوەی نوێنەرانی بەرەی کوردستانی و سەرکردایەتی بەعس لە بەغدا لە ٢٠ نیسان ١٩٩١دا دەستی پێکرد و دوای ٨ رۆژ کۆتایی هات.

٧- لە ٢ نیسانی ١٩٩١، دەوڵەتی فەرەنسا لە ئەنجومەنی ئاسایشی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان، داوای دەستێوەردانی مرۆڤدۆستانەی لە کێشەکەدا کرد، بەریتانیا بە خێرایی رەزامەندی خۆی لەگەڵ ئەم هەڵوێستەی فەرەنسا دەربڕی... لە ٥ نیسانی ١٩٩١ ئەنجومەنی ئاسایش بڕیارنامەی ژمارە ٦٨٨ دەرکرد، دەربارەی چەوسانەوەی خەڵکانی سیڤیل لە عێراق، بە تایبەتی هاوڵاتیانی کورد، داوای لە وڵاتانی ئەندام کردبو، هاوکاری و یارمەتی مرۆیی بگەیەنە ئەو ناوچانە.

٨- نەوشیروان مستەفا کە رۆڵێکی سەرەکی هەبو لە راپەریندا، بەم شێوەیە باسی هۆی شکستی راپەرینەکە دەکات: (چەند هۆیەك هەبون. یەکەمیان بارودۆخی ناوخۆیی کە بەرەی کوردستانی نەیتوانی وەك پێویست رۆڵی خۆی ببینێت و سەرکردایەتیەکی یەکگرتو بۆ راپەرین دابنێت، و ئیدارەی ناوچەکان یەکبخات، بۆیە هەر حیزبێك بۆ خۆی ئیحتیکاری ناوچەکەی خۆی دەکرد، خاڵی دوهەم ئەوەبو، سەرکردایەتی کورد و سەرکردایەتی ئەو راپەرینە، لە کوردستان و لە خواروی عێراقیش، توشی جۆرێك لە هەڵسەنگاندنی هەڵە بون دەربارەی هێزی عێراقی و زانیاری هەڵەیان لا هەبو و وایان ئەزانی کە سوپای عێراقی بەرەو هەرەس هێنان و لەناوچون دەچێت... خاڵێکی تر ئەوە بو کە جوڵانەوەکە هیچ پشتیوانیەك و یارمەتیەکی دەرەوەی نەبو، وە ئێران رۆڵی باش نەبو، سنورەکانی بەدەم رۆژنامەنوسی بێگانە داخست و لە لایەکی تر سنورەکانی بۆ ئاوادیوکردنی چەکی قورس و کەرەسە و ئۆتۆبیل و دەزگای هەمەجۆر کردەوە کە لە شار و شارۆچکە و بازگەکانی حکومەت دەستیان بەسەر گیرابو. هەروەها شیعە لە خواروی عێراق، دروشمی زۆر زەقیان دژ بە سونە بەرز کردەوە کە ترسێکی لەناو سوپای سونی عێراقدا دروست کرد).. (چاوپێکەتن لەگەڵ نوشیروان مستەفا - بەرلین ١٩٩١/٨/٢٠).

٩- کۆمەڵێك رێکەوتنامە ئامادەکرابون و هەندێکیان تەواو بوبون و هەندێکیان دەسکاریکرابون لە نێوان رژێم و بەرەی کوردستانیدا، لەوانە، (ورقة التطبيع في ١٩٩١/٧/٢١، مشروع قانون الحكم الذاتي لمنطقة كردستان و ورقة تعديلها في ١٩٩١/٧/٢٢، مشروع ميثاق مشترك بين حزب البعث العربي الاشتركي و الجبهة الكردستانية في ١٩٩١/٨/١٤، مشروع البيان السياسي في ١٩٩١/٨/١٤).



وەفدی یەکێتی لە بەغدا، کانونی یەکەمی ١٩٨٣
لە راستەوە: تاریق عەزیز، عێزەت دوری، د.خدر مەعسوم، مەلا بەختیار،
سەدام حسێن، مام جەلال، مولازم عومەر، فەریدون عەبدولقادر



وەفدی حکومەت بۆ گفتوگۆ ١٩٨٤/٩/٣، سورداش لە راستەوە: د.خدر مەعسوم،
مولازم عومەر، فەریدون عەبدولقادر، نەوشیروان مستەفا، عەلی حەسەن مەجید،
عیزەت دوری، مام جەلال، د.فواد مەعسوم، قادری حاجی عەلی، سەربەست بامەرنی

# یەکێتی و ئەمەریکا

*** پەیوەندی یەکێتی و ئەمەریکا لەکوێ و کەی دەستی پێکرد؟**

- ئەگەر بێتو ئێمە بگەڕێینەوە بۆ پەیوەندی ئەمەریکا و یەکێتی، لە کوێوە دەستی پێکردوە، ئەوا پێویستە بەڕاستی بگەڕێینەوە بۆ هەشتاکان، ناوبەناو کەسانی وەکو، ولیام ئیگلتن لە ئەوروپا نوێنەری یەکێتیان دەبینی، بەڵام بینینەکە بەسیفەتی شەخسی بو، نەیاندەوت ئەوە بەسیفەتی ڕەسمیە، هەندێکجار ڕاسپاردە و قسەیان بۆ دەناردین.

کاتی خۆی کە ئیگلتن وەک سەفیر لە بەغداد بو، بەڵام هێشتا پەیوەندی لەنێوان عێراق و ئەمەریکا دروست نەبوبو، جارێکیان لە گفتوگۆی (١٩٨٣ — ١٩٨٤) دا ویستی بێت بۆلامان و هەتا دوکانیش هات بۆئەوەی بێتە سورداش، بەڵام نەیانهێشت بێت بۆ لامان.

بەڕاستی، ئەوە یەکەم هەوڵی ئەمەریکا بو، بۆئەوەی پەیوەندیمان لەگەڵدا پەیدابکات. لەو سەردەمەدا کە لەگەڵ عێراقدا گفتوگۆمان هەبو، ئەمەریکا زۆری پێباشبو و تەشویقیان دەکردین و پێیان ڕاگەیاندین، باش دەبێت لەسەری برۆن، ئەوان زۆرتر پەیوەندیەکانیان بە عومەر شێخ مووسەوە دەکرد، ئەوکاتە نوێنەرمان بو لە لەندەن.

ئەوەی بەناوی یەکێتیەوە ڕاستەوخۆ پەیوەندی دەستی پێکرد، لە نیسانی ١٩٨٩ دا، من چومە واشنتن. بۆ یەکەمجار نوێنەرانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکی منیان بینی، لێپرسراوی دیسکی عێراق من و دکتۆر لەتیف و حمە جەزای ئەندازیار و هێرۆ یان بینی.[١]

ئەوکاتە ئەمەریکا سیاسەتەکەی ئەوەبو کە چارنیە بۆ ئێمە و هەر دەبێ لەگەڵ عێراقدا پێکبێین و هەوڵێکی زۆریان دەدا قانعمان کەن کە ئێمە واقیعبین بین و ئەمری واقیع ئەوەیە، ئێمە لەگەڵ عێراق پێکبێین و هەر دەبێت بچین پێکبێین لەگەڵ عێراقدا.[٢]

جارێکی تریش، لە کاتێکدا کە ڕۆناڵد ڕێگن سەرۆک و شوڵتس وەزیری دەرەوەبو، دیسان ئێمە لە وەزارەتی دەرەوە بانگکراین و لە هەمان کاتدا تاریق عەزیز[٣] مەوعیدێکی هەبو لە وەزارەتی دەرەوە. ئەو موعدەکەی هەڵوەشانەوە لەسەرئەوەی کە وەزارەتی دەرەوە منیان بینیوە، گوتی: "پێویستە داوای لێبوردن لە عیراق بکەن، چونکە ئەوە پیاوێکی تیرۆریستە و دژی ئێمەیە و لەبەرئەوەی کە ئەوتان بینیوە من ئامادەنیم بێم بۆ بینینەکە"، ئەوانیش بڵاویانکردەوە بەناوی وەزارەتی دەرەوە، "ئێمە پۆزش ناهێنینەوە، ئێمە سەربەستین لەوەی کێ دەبینین و کێ نابینین".[٤]

*** ئەم پەیوەندیە، کەی چوە پێشەوە و گەشەی کرد و تا چ ئاستێک ڕۆیشت؟**

– ئەم پەیوەندیە، تا شەڕی کوێت بەو شێوەیە مایەوە، تا ئەوکاتە ئەوان یەک کەسیان بۆ پەیوەندی دانا لەگەڵ ئێمە، دەمان بینی ئەویش لەسەر ئاستی مافی مرۆڤ بو. ئەوان بە ئاشکرا دەیانوت، ئێمە لەسەر ئەساسی سیاسی ئێوە نابینین، ئێمە ئێوە لەسەر ئەساسی پرنسیپی مافی مرۆڤ دەبینین، لەبەرئەوە لێپرسراوی مافی مرۆڤیان لە سەفارەتی ئەمەریکا لە پاریس دانابو، بۆئەوەی پەیوەندیمان پێوەبکەن.

پێش داگیرکردنی کوێت، بە ماوەیەکی زۆر کورت من چوم بۆ پاریس و چومە لای ئەو کەسەی دایان نابو بۆ پەیوەندی و لێپرسراوی مافی مرۆڤ بو لە سەفارەت. چوم داوای ڤیزەی لێ بکەم، چونکە دەعوەت کرابوم بۆ (کۆنگرەی نیشتمانی- KNC) لە ئەمەریکا. چومە لای و پێم گوت دەعوەتێکی وام بۆهاتوە و زۆریش تاقەتی ئەو سەفەرەم نیە، ئەگەر ڤیزەکەم دەدەیتێ خۆت بۆم بکە، ئەویش گوتی باشە بۆت دەکەم. پەساپۆرتەکەی لێوەرگرتم و دای بە فەرمانبەرێک کە کارەکەم بە ئەنجام بگەیەنێ.

کەوتینە قسەو باس، ئەوکاتە خۆئامادەکردنی سوپای عێراقی هەبو، زۆریان وایان دەزانی بۆ ئیسرائیلە، من گوتم: "نەخێر ئەو خۆئامادەکردن نیە بۆ ئیسرائیل، بەڵکو بۆ هێرشە بۆ سەر کوێت و لە کوێت دەدا و دەیگرێ کە گرتی حکومەتێکی دەستکرد دروست دەکا و دوایی ئەینوسێنێت بە عێراقەوە".

کابرای دبلۆماسی پێکەنی و گوتی ئەوە شتێکی زۆر زەحمەتە، گوتم: "نازانم زەحمەت بێ یان زەحمەت نەبێ، بەڵام ئەوە گۆڕانی نەخشەی ناوچەکەیە، نەخشەی عێراق دەگۆڕێ و خۆئامادەکردنی سوپاکەشی پەیوەندی بە ئیسرائیلەوە

نیە"، ئەوباسە نەچو بە مێشکیا و باوەڕی نەکرد.

دوای ئەوەی عێراق کوێتی گرت، چوم بۆ کۆنگرەکەی KNC لە ئەمەریکا، لەوێ ڕۆژنامەنوسان زانیبویان، من ئەوەم کە پێش هێرشی کوێت بە ئەمریکیەکانم گوتوە عێراق کارێکی وای بە دەستەوەیە. لە وتەبێژی وەزارەتی دەرەویان پرسی، ئەڵێن تاڵەبانی کاتی خۆی شتێکی وای بەئێوە گوتوە، ئێوە بۆچی شتێکتان نەکرد؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتی: (No Comment) دیسان پرسیاریان کرد، بۆچی تاڵەبانی نابینن، گوتیان: "گرنگی ئێمە بە مەسەلەی کوردەوە بەستراوەتەوە بە کێشەی مافی مرۆڤەوە، تاڵەبانیش سەرۆکی حیزبێکی سیاسیە و سەرکردایەتی بزوتنەوەیەکی سیاسی دەکات، داوای مافی نەتەوەیی و سیاسی دەکا، بۆیە بۆ ئێمە ناگونجێ ببینین".

# بینینی رەسمی و نارەسمی

*** باشە بە نارەسمیش یاخود دور لە چاوی کامێرا و پرۆتۆکۆلی فەرمی نەیان بینیت؟**

- ئێمەیان بە نارەسمی بینی، ئەویش لە چێشتخانەیەکی چینی بو، لە نزیک وەزارەتی دەرەوە و دەعوەتیان کردین و کۆمەڵێک خەڵکیان هێنابو کە پێکەوە نان بخۆین. ئەوان تەنها پارەی خواردنەکەی منیاندا، بەڵام ئەوانی تر هەرکەس پارەی خۆیدا. لەوێ کۆمەڵێک پرسیاریان لێکردم لەسەر ئایندەی عێراق.

ڕۆژێک لە ئوتێل بوم، پیاوێک هات بۆلام و گوتی من لە (CIA) وە هاتوم، وتم بەخێربێیت و ناوی برادەرێکی کوردی دامێ گوتی: ئەو دەمناسێ، قسەم لەگەڵ برادەرە کوردەکە کرد گوتی: "بەڵێ دەیناسم و من پێمگوتوە تۆ لەوێیت ئەوهاتوە بتبینێ".

گوتی: هێزی ئێوە چەندە و چیتان پێدەکرێت و هەندێ پرسیاری تری لەو شێوەیەی لێکردم، منیش گوتم: ئێمە زۆر شتمان پێ دەکرێت و ئیمکانیاتمان کەم نیە، ئەوکاتە بەرەی کوردستانی هەبو و من بەناوی بەرەی کوردستانیەوە قسەم دەکرد. پاش ڕۆژێکی تر هاتەوە و گوتی: لاریت نیە ئەگەر یەکێکی کەش هەیە بێت

لەگەڵماندا و ئەویش حەزدەکات بتانبینێ؟ منیش گوتم: نەخێر، گوتیان: "ئایا ئێوە بەشداری دەکەن لەگەڵماندا لەشەڕ دژی عێراق"؟ منیش گوتم: ئەوە مەسەلەیەکی گرنگە و دەبێت پرس بە ناوەوەی وڵات بکەم، چونکە سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی لەناوەوەبو، گوتی: "ئەگەر لەگەڵماندا بەشداری بکەن ئەوا بەشتان دەبێ، ئەگەر بەشداری نەکەن ڕەنگە بەشتان نەبێ". بۆ ڕونکردنەوە گوتی: "فڵانە کەس تۆ یاری پۆکەر دەزانی"؟ گوتم: "بەڵێ دەیزانم"، گوتی "ئەگەر لە پۆکەردا خۆت یاری کەربیت، ئەوا یان دەیبەیتەوە یان دەیدۆڕێنی، بەڵام لەم یاریەدا بە دڵنیاییەوە دەیبەیتەوە! چونکە ئێمە دەیبەینەوە، خۆت دەزانی عێراق بە ئێمە ناوێرێت، ئەگەر لەگەڵماندا بیت دەیبەیتەوە و بەشیشت دەبێ. ئەگەر لەگەڵمان نەبیت زۆر زۆر تەوقعی ئەوە بکە یان وارت دەدەینێ یان شتێک بەخشیش، لەبەرئەوە ئەمە فرسەتێکە بۆتان هاتۆتە پێشەوە"، منیش گوتم: "باشە ئێوە ئامادەن چیمان بۆ بکەن"؟

گوتی: "یارمەتیتان دەدەین بە پارە و بە چەک"، پرسیم: "ئایا لە بواری سیاسیدا، وەعدمان دەدەنێ لە دواڕۆژدا شتێکمان هەبێت"؟ گوتی: "ئێستا نازانم پێویستە پرس بکەم".

دوای ماوەیەک لە لێپرسراوەکەی خۆی پرسیبو کە بە (دکتۆر) ناوی دەبرد، هاتەوە گوتی: "دکتۆر قسەی لەگەڵ سەرۆک کردووە گوتویانە، بەڵێ".

*** هەڵوێستی یەکێتی یان بەرەی کوردستانی چی بو، بۆ پێشنیازەکەی ئەمەریکا بۆ هاوکاری کورد و شەڕی دژ بە عێراق؟**

- دوای ئەوەی وەڵامی (دکتۆر) و ئەوانم وەرگرت و هەڵوێستیانم زانی، گوتم پێویستە من پرس بکەم و هەستام نامەیەکم بۆ مەسعود بارزانی و نەوشیروان مستەفا و برادەرانی تر لە ناوەوە نوسی، ئەوانیش وەڵامیان دامەوە و گوتیان: "ئێمە ئامادەنین ئەو هاوکاریە بکەین و بەرەی کوردستانی ئەوەی پێباش نیە".

نوسیبویان: "عێراق لە کوێت دەکشێتەوە و لێی نادرێت، بۆیە پێویست ناکات خۆمان توشی بەڵا بکەین و ئەگەر دژی بوەستین، ئەوا عێراق چەکی کیمیاوی لە دژمان بەکاردێنێت و میللەتەکەمان دەفەوتێ و جگە لەوە، ئێستا باوەڕمان بە ئەمەریکا نیە".

منیش ئەمریکیەکانم ئاگادارکردەوە کە برادەرانی ناوەوە ئەڵێن ئەو هاوکاریەمان پێناکرێت یارمەتیدان بدەین لە مەیدانی شەڕدا، بەڵام ڕەنگە بتوانین بە شێوەی تر هاوکاریتان بکەین و زۆرمان پێخۆشە کوێت ڕزگاربکرێت.

*** هەڵوێستی ئەمریکیەکان چی بو، بەرامبەر بە وەڵامی بەرەی کوردستانی؟**

- بە ئاسایی وەریان گرت. با شتێکت بۆ بگێڕمەوە کە کەرکوک گیرا، نەوشیروان تەلەفۆنی لەگەڵدا کردم و گوتی: "مام جەلال لەگەڵ ئەمریکیەکاندا هەوڵبدە، پێیان بڵێ نەیەڵن عێراق بەرەو ناوچەکانی تر بێن".

ئەوکاتە لە شام بوم و بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ هەمان کابرا کرد و باسی کێشەکەم بۆ کرد، ئەویش گوتی: "میستەر تاڵەبانی لەبیرتە پێم گوتی ئەگەر پۆکەر بکەیت و بیبەیتەوە، ئەوا بەشت دەبێ، بەڵام ئەگەر نەهاتی، تەنها وار وەردەگریت، وارەکەش هەر ئەوەیە دەیزانی"!

منیش وەڵامەکەیم بە برادەران ڕاگەیاند، "ئەمریکیەکان هاوکاری ناکەن و گوشار ناخەنە سەر عێراق، خۆتان پشت بەخۆتان ببەستن".

*** بۆچونی ئەمریکیەکانت باسکرد، بۆچونی بەرپرسانی کوردیشمان زانی، ئەی ڕای خۆت چی بو؟**

- دیارە من ڕام وابو، بۆ برادەرانیشم نوسیبو کە هەلێکی مێژویی هاتۆتە پێشەوە، پێمباشە لەم مەسەلەیەدا بەشداربین، لەبەر کۆمەلێک هۆ، لەوانە:

یەکەم: ڕزگارکردنی کوێت، مەسەلەیەکی ڕەوایە.

دوەم: ئەمە فرسەتێکە و ئێمە هەڵدەستینەوە، چونکە ئەوکاتە خەڵک چاوەڕێی نەدەکرد بەو شێوەیە ڕاپەڕین بکرێت. خۆ ئەگەر ڕاپەڕینیش سەرکەوێت، گرەنتیەکی دەوڵەتی نەبێت و ئەمەریکای لەپشت نەبێ، یان دەوڵەتێکی گەورەی لەپشت نەبێ، ئەوا سەرکەوتن و بەردەوامی ئاسان نیە.

*** پەیوەندی نێوان یەکێتی و ئەمەریکا چۆن گەشەیکرد؟**

- لەو پەیوەندیە سەرەتاییانەوە، جۆرێک پەیوەندی دەستپێکرد لە نێوان ئێمە و ئەمەریکادا، بەڵام نەگەیشتبوە ئاستی دانوستاندنی بەردەوام، ئەوان نەختێکیش لەو مەسەلەیەوە لێمان ساردبونەوە، هەتا جارێک لە کۆنگریسی ئەمەریکا کۆبونەوەیەک کرا بۆ مەسەلەی کورد و منیش ئامادەبوم، من بانگکرابوم و قسەشم هەبو و لە سەرۆکایەتیش دانرابوم لەگەڵ مەدام میتران و کەنداڵ نەزان و هەندێک کەسانی شارەزا و نوێنەرانی لیژنەی پەیوەندیەکانی دەرەوەی وەزارەتی دەرەوە.

من، بەهۆی ئەوەوە پیتەر گاڵبریس و جۆرج میشل و چەند سیناتۆرێکی

ناودارم دەناسی، هەندێک بە پێوە و هەندێک بە دانیشتن باسی مەسەلەی کورد و وەزعی خۆمان و عێراقم بۆکردن.

لەو کۆبونەوەیەدا داوا لە ئەمەریکا کرا، لەمەودوا گرنگی بە مەسەلەی کورد بدات و رەچاوی مافی کورد بکات و حکومەتی جۆرج بوش ئاگای لە کورد بێت. ئەو دەمە شەڕ هێشتا تەواو نەبوبو.

*** ئەمە پێش کۆتایی شەڕ یان دوای کۆتایی شەر بو؟**

- ئەم باسانە لە کاتێکدابو کە شەر بە رەسمی کۆتایی نەهاتبو، بەڵام هەمان رۆژ بۆ ئێوارەکەی، سەرۆک بوش ئاشکرایکرد و گوتی: "شەست سەعات بەسەر جەنگدا تێپەڕی و سوپای عێراقیمان شڕ و وڕکرد، کوێتمان ڕزگارکرد و ئێمە هیچ زیانمان نەبوە. بڕیارمدا شەڕ بوەستێ بەو مەرجەی عێراق مەرجەکانی ئەمەریکا قبوڵبکات".

ئەوەبو عێراق هەمو مەرجەکانی ئەمەریکای قبوڵکرد، ئەوەش هەنگاوێ پاڵی نا بە پەیوەندی ئێمە و ئەمەریکاوە، بەڵام دوایی ئەمەریکا لە مەسەلەی بەگژاچونی سەدام خۆی ماتکرد، هەتا راپەڕین رویدا و ئەنجامی کۆچرەوەکە بو.

کە کۆچەکە ڕویدا وەفدێکی ئێمە لە ئەمەریکا بو، یەک لەوانە دکتۆر لەتیف بو، بەیانی لەوەزارەتی دەرەوە دیترابون، پێیان گوتبون ئێمە هیچ پەیوەندیمان پێتانەوە نیە. نە بە قسەی ئێمەتانکردوە، نە بە فەرمانی ئێمە جوڵاونەتەوە، بۆیە بەتەمای یەک دۆلارنەبن و بەتەما نەبن یەک سەرباز بنێرین بۆ هاوکاریتان.

کە کۆچەکە دەستیپێکرد، فەرەنسوا میتران و کۆمەڵێک لە سەرۆک وڵاتان و ناسراوانی دنیا دەستیان بەقسەکرد و پشتگیری خۆیان بۆ مەسەلەی کورد دەربڕی و داوای چارەسەری خێرای کێشەکەیان کرد و جۆرج بۆش تاوانبارکرا کە داوای لەگەڵی عێراق کردوە راپەڕێن لە دژی حکومەتەکەی، وا راپەڕیوە کەچی ئێستا پشتیان تێدەکات و بەجێیان دەهێڵێت.

ئەوەبو دوای ماوەیەک ئەمەریکا بڕیاریدا، لەگەڵ هاوپەیمانان هێز بنێرن بۆ کوردستان و جۆن مێجەری سەرۆک وەزیرانی ئینگلترا، پێشنیازیکرد، ناوچەیەکی ئارام دابنرێت ولە ئەنجامدا ئەمەریکا بە هێزەوە هاتە ناوچەکە و تا پێش رزگارکردنی عێراق لە ۲۰۰۳ دا، ئاسمانی کوردستان و خوارووی عێراق ئەوان و ئینگلترا دەیانپاراست.

*** دوای ئەم روداوانە، کەی یەکەم سەفەری رەسمیت کرد بۆ ئەمەریکا؟**

– ساڵەکەم لەبیر نیە، بەڵام ئەو ساڵەیە کە بەرەی کوردستانی بانگهێشت کرابو، منش بەناوی بەرەوە سەفەرمکرد.(٥)

*** کە تۆ نوێنەری بەرەی کوردستانی بویت لە دەرەوە، ئایا ئەو نوێنەرایەتیە هیچ گیروگرفتێکی بۆ تۆ وەک سکرتێری یەکێتی دروست نەکردبو؟**

– نەخێر هیچ گیروگرفتی دروست نەکردبو، بە پێچەوانەوە، بەهۆی ئەوەوە زۆر بە رێزەوە سەیریان دەکردین و توانیمان بەناوی بەرەوە چەندەها چالاکی ئەنجام بدەین. بۆ نمونە من چەندین نامەم بەناوی بەرەی کوردستانی نوسی بۆ ئەندامانی کۆنگرێسی ئەمریکی و ئینگلیزی و ئەڵمانی، زوربەیان وەڵامیان داومەتەوە پشتگیریی و سۆزیان بەرامبەر بە کێشەی کورد نیشانداوە و ئێستا دەیان لەو نامانەم لاماوە.

# یەکێتی و تورکیا

*** پەیوەندی تۆ یان یەکێتی، لەگەڵ تورکیا کەی و چۆن دەستی پێکرد؟**

– ئەوە چیرۆکێکی خۆشە، ئەگەر هەمویم لە بیرنەمابێت خاڵە گرنگەکانیم لەبیرە. پەیوەندی لەگەڵ تورکیا، یەکەمجار رۆژنامەنووسێکی ناوداری تورک هەیە بەناوی محەمەد عەلی بیراند، داوای بینینی دکتۆر قاسملو و منی کرد لە پاریس، ئێمەش بینیمان.

*** ئەمە کەی بو؟**

–ئەمە سەرەتای ١٩٩٠ بو، واتا پێش داگیرکردنی کوێت. ئەو پەیوەندیە لەگەڵ داگیرکردنی کوێتدا هاتە پێشەوە، جارێکی تر محەمەد عەلی بیراند هاتە لەندەن و من بینیم و پێی گوتم: تۆ ئامادەی ئەگەر یەکێک بێت بتبینێت؟ گوتم: بەڵێ ئامادەم بەڵام بە مەرجێ، گوتی: باشە تۆ باوەڕت بەمن هەیە؟ گوتم: بەڵێ باوەڕم

بە تۆ هەیە، جا بەڕاستی باوەڕم پێدەکرد و دۆستمانە و قسەکانی ڕاست و ڕەوانە و هیچ پەناوپێچی نەبو، واتا دڵنیابوم فێڵم لێناکات .

گوتی: "من کاتێک پێت دەڵێم بیان بینە کە دڵنیابم ئاستی بینینەکە چۆنە و بزانم ئایا قسەکان ڕاستەوخۆ دەگاتەوە شوێنی پێویستی خۆی" ئەوکاتە سلێمان دیمیرێل سەرۆک وەزیران بو، دەنا من پێت ناڵێم بیان بینە.

ماوەیەکی پێ چو، تەلەفۆنێکی لەگەڵ کردم و گوتی: یەکێک دێت بۆ بینینت، منیش گوتم زۆرچاکە. کابرایەک هاتە لەندەن و لەگەڵ لەتیف رشید لە ڕیستۆرانتێکی ئیتاڵی بینیمان و قسە و باسی ئەوەمانکرد. کە پەیوەندی لە نێوان ئێمە و ئەوان چۆنە و باسی پەیوەندی کورد و تورکمانمان بۆ کرد، کەوا کورد و تورک سەدان ساڵە پێکەوە دەژین و ئێستا هەق نیە ئێوە دژی ئێمەبن و هەتا من مەسەلێکم بۆ هێنایەوە و گوتم: "تاکە میللەت کە هەتا سەر لەگەڵ تورک مایەوە تا دروستبونی کۆماری تورکیا، کورد بو".

ئەوکاتە تازە مەلیک حسێن چوبو بۆ تورکیا و پێشوازیەکی گەورەی لێکرا و گوتم: "نەوەی ئەو کەسەی شان بەشانی ئینگلیز شەری دژی ئێوەکرد، ئێستا مافوری سوری بۆ ڕادەخەن، بەڵام نەوە و کوڕی ئەو کەسانەی شان بەشانی ئێوە خۆیان بەکوشتدا و بەخوێن بەشداریانکرد لەسەرخستنی بەرەی تورکی، یان دەخرێنە زیندان، یان دەکوژرێن یان دەربەدەر دەکرێن، ئەوە کەی عەدالەتە"! کابراکە گوتی: "قسەیەکی زۆر کاریگەربو، ئەو قسەیە زۆر زۆر کاری تێکردم"، شتێکی تریشی گوت: "کە بۆچی ئێمە کوردمان زۆر خۆش ئەوێت و دەمانەوێت هەمیشە لە باوەشماندابێت و لەگەڵماندابێ"، گوتم: "باشە با لە باوەشتا بێت قەیناکە، بەڵام نەک بیفلیقێنیتەوە، لە باوەشتابێت بۆئەوەی ڕێزی لێبگریت و ئاگاداری بیت و هاوکاری بکەیت".

گوتی من هەمو ئەو قسانە دەگەێنمەوە بە سەرۆک وەزیران و وەڵامتان لێدەگێرمەوە.

# سەردانی رەسمی بۆ تورکیا

*** ئایا پەیوەندیەکە هەر وا ناراستەوخۆ مایەوە؟ کەی گۆڕانی بەسەردا هات و کەی یەکەم سەردانی رەسمیتان کرد بۆ تورکیا؟**

- پاش ماوەیەک برادەرێک هەیە بە ناوی (جەنگیز چاندار) کە رۆژنامەنوسە و دۆستی خۆمە، جەنگیز لە ساڵەکانی ۷۲ — ۷۳ لە لوبنانەوە دەیناسم، هاتە لەندەن و لە ماڵی ئەحمەد چەلەبی بینیم و گوتی: " ئۆزال منی ناردوە"، ئەو زۆر لە ئۆزالەوە نزیکبو، هەروەک زمان حاڵی ئۆزال وابو، گوتی "من هاتوم پرسیار بکەم کە ئایا تۆ ئامادەی بێیت بۆ تورکیا"؟ گوتم: "بەڵێ ئامادەم"، پێشنیازیکرد کە حەز دەکەن یەکێکیش لە پارتیش بێت، منیش گوتم زۆر باشە و موحسین دزەیی دانرا.

دوای ماوەیەک، لەگەڵ موحسن دزەیی سەردانی تورکیامانکرد و بە رەسمی پێشوازیان کردین و زۆر رێزیان لێگرتین، لەوکاتانەدابو کە لە کوردستان راپەرین دەستی پێکردبو و هێشتا تەواو نەبوبو.[٦]

گفتوگۆی زۆرمان لەگەڵ کردن دەربارەی هەمو مەسەلەکان، گوتیان: "ئەم جارە سەرۆک وەزیران ناتوانێت بتان بینێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە لە جاری داهاتودا دەتان بینێت". بەڵام چەندین لێپرسراوی دەسەڵاتدارمان بینی لە سوپا و میت و لە وەزارەتی دەرەوە.

# تورکیا و ئۆزال و کۆنگرەی سۆسیالیستی جیهانی

*** دوای ئەم بینینە نا فەرمیانە، پەیوەندی ئێوە لەگەڵ تورکیا بەرەو کوێ ڕۆیشت؟**

- پاش ڕاپەڕین ئەو پەیوەندیە دەوامیکرد و دوای ئەوەی خوالێخۆشبو تۆرگۆت ئۆزال بو بە سەرۆک کۆمار، من سەردانی تورکیام کرد و ئۆزالم بینی.(٧)

حەز دەکەم شتێکت بۆ بگێڕمەوە، پاش چونی من بۆ تورکیا لەناو ڕۆژنامەکانی تورکیادا هەواڵێک بڵاوبۆوە، دەڵێت: "جەلال تاڵەبانی دەعوەت دەکرێت بۆ تورکیا". ئەو ڕۆژەی تۆرگۆت ئۆزال سەفەری دەکرد بۆ مۆسکۆ، لە فرۆکەدا ڕۆژنامەنوسانی لەگەڵدابو و لێیان پرسی، "جەنابی سەرۆک ڕاستە بەتەمان کە جەلال تاڵەبانی دەعوەت بکەن بێت بۆ تورکیا"؟ ئەویش گوتی: "تالەبانی هات و ڕۆیشت و جارێکی تریش دەعوەتی دەکەینەوە".

ڕۆژی دواتر، مانشێتی گەلێک لە ڕۆژنامەکانی تورکی نوسیان (جەلال تاڵەبانی هات و ڕۆیشت).

دوای ئەوە جارێکی تر چومەوە بۆ تورکیا، ئەوکاتەبو ئێمە گفتوگۆمان لەگەڵ بەغدا هەبو. سەرۆکی وەفدەکە مەسعود بارزانی بو، نەوشیروانیش نوێنەری ئێمە بو لە وەفدەکەدا. کە وەفدەکە زانیبویان بڕیارە من بچم بۆ تورکیا، مەسعود زۆر تەنگاو بوبو. هەستا نەوشیروان و سامی عەبدولرەحمانی ناردەوە کە قەناعەتم پێ بکەن نەچم. منیش گوتم: "هەر دەچم، چونکە دو هۆ هەیە بۆ سەفەری من، یەکێکیان کۆنگرەی سۆشیالیستی ئینتەرناشناڵە کە لەوێ کۆ دەبێتەوە. دوەمیان من خۆشم حەز دەکەم لەگەڵ تورکیا پەیوەندیمان هەبێت، خۆم هیچ باوەڕیشم بەو گفتوگۆیەی بەغدا نیە کە سەر بگرێت".

نەوشیروان هەمان بۆچونی منی هەبو، سامی زۆر هەوڵیدا قەناعەتم پێبکات نەچم، بەڵام لە دوایدا من سامیم قانیعکرد کە چونی ئێمە سودی هەیە نەوشیروان گوتی: "ئیتر تەواو من ناچمەوە بۆ بەغدا". کۆسرەت مان نارد لە جێگای ئەو و گوتمان برۆ تۆ نوێنەری ئێمەبە لەگەڵ حکومەت.

من لە خەلیفانەوە چوم بۆ تورکیا، رۆژنامەکانی تورکیا زۆریان بە باشی لەسەر نوسین. زوربەی مانشێتی رۆژنامەکان باسی سەفەرەکەی من بو، تەنانەت ئێوارەکەی کە بۆ سبەینێ کۆبونەوەی سۆشیالیست ئینتەر ناشناڵ بو، لە ئۆتێلەکە چوم نان بخۆم، لەولاوە ڤیلی براندی سەرۆکی پارتی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیا لەگەڵ چەند سەرۆکێکی تر دانیشتبون کە منیان دیت، سڵاویان کرد و هەستان منیش چومە لایان. ڤیلی براند گوتی: "زۆر بەخێربێیت، دەبێت من سوپاست بکەم بەهۆی تۆوە کۆنگرەکەمان ناوبانگی دەرکرد"، منیش گوتم: "زۆر سوپاست دەکەم، بەهۆی ئێوەوەیە من هاتوم" و لەوێدا ڤیلی براند قسەی زۆر جوانی کرد و گوتی: "ئێوە بە تەنیانین، ئێمە پشتیوانتانین ئێمە خەباتی ئێوە بە هی خۆمان دەزانین"، خۆشی لە وتارەکەیدا بۆ کۆنگرە باسی ئێمەی کرد، منیش لەو کۆنگرەیەدا وتارێکم خوێندەوە .

ئیتر لەو کاتەوە پەیوەندیمان لەگەڵ تورکیادا بە گشتی و لەگەڵ ئۆزال بە تایبەتی دروستبو و پەرەیسەند

## پەراوێزەکان:

١- حەمە جەزا، ئەندازیارێکی خەڵکی سلێمانی بو، لە ئیمارت کاریدەکرد و دۆستی مام جەلال و یەکێتی بو، لە ١٩٨٩ دا کۆچی دوایی کرد.

٢- ئەمریکا ئاگاداری بارودۆخی کوردستان بو، (دیڤید نیوتۆن) باڵوێزی ئەمریکا لە عێراق دەڵێت (کارێکی ئاشکرا بو کە عێراق گوندەکانی کردبوە ئامانج و کێڵگەو باخەکانیشی لەناونەبرد، ئەمە شاڵاوێك بو لە دژی کوردە نەیارەکانی حکومەت، بەڵام ئەوەش دیار بو کەوا هەوڵێکە بۆ کەمکردنەوەی دانیشتوانی دیهاتەکان و دورخستەوەیان، وەك بنکەیەکی پشتگیری گەریلاکان، هەروەها ئەوەش رونبو، کە ئەوە کارێکی نامرۆڤانەبو، بەڵام من نایەتەوە یادم کە لەگەڵ عێراقیەکاندا باسمان کردبێت..) (دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندیەکانی ئەمریکا و عێراقدا ..گۆران ئیبراهیم ساڵح .ل. ٢٧٤).

٣- تاریق عەزیز لە ١٩٨٩/١٠/٠٦ سەردانی واشینتتۆنی کرد.

٤- (کۆبونەوەی نوێنەرانی ئەمریکا و تاڵەبانی، تەنها عێراقیەکانی تورەنەکرد، بەڵکو تورکەکانیش هاتنە سەر خەت، پیتەر گالبریس لە کتێبەکەیدا باسدەکات، کە ئەو وەك ئەندامی کۆمیتەی پەیوەندیەکانی دەرەوە لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکی، داوای لە (لاری پۆپ) بەرپرسی نوسینگەی عێراق-ئێران لە وەزارەتی دەرەوە کرد کە چاوی بە جەلال تاڵەبانی بکەوێت، ئەویش بریاریدا چاوی بە تاڵەبانی بکەوێت. ئەم چاوپێکەوتنە تورکیا و عێراقی تورە کرد و وەزارەتی دەرەوە، بریاری قەدەغەکردنی هەمو جۆرە دیدار و چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ هێزە بەرهەڵستکارەکانی عێراق و لە نێویاندا کورد دەرکرد). (دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندیەکانی ئەمریکا و عێراقدا .. گۆران ئیبراهیم ساڵح ل. ٢٩٦).

٥- (وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١، بەیانامەیەکی راگەیاند، کە تێدا هاتبو: پاشنیوەرۆی ئەمرۆ، ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١، جێگری سکرتێری NEA "ئۆفیسی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیك و ئاسیا"، بەرێز ئێدوارد جێرێجیان لەگەڵ لیژنەیەکی بەرەی کوردستانی عێراق دیداری کرد، جەلال تاڵەبانی، رێبەری یەکێ لە حیزبە سەرەکیەکانی کورد تێدا ئامادەبو، ئەم گروپە لە حەوتەی پێشوش لە وەزارەتی دەرەوە و بێنتاگۆن دانیشتنی هەبوە، نوێنەری کۆمەڵگای ئاسوری و تورکمانەکانی عێراقیشی لەخۆدەگرت). (مێژوی پەیوەندیەکانی کورد و ئەمریکا. وریا رەحمانی. ل. ٤٢٤).

٦- بینینی جەنگیز چاندەر لە لەندن، لە ١٩٩١/٢/١٧ ئەنجام درا.

٧- (بۆیەکەمجار سەرۆك کۆمارێکی تورکیا لەگەڵ سەرکردەیەکی کورد دیداریکرد، رۆژی هەینی ١٩٩١/٦/١٤ لە کۆشکی چانقایا ئەنجامدرا، جەلال تالەبانی و بەرهەم ساڵح و سەرچڵ قەزاز بون... تورگوت ئۆزال پێی گوتبو: لە نێوان کوردەکانی عێراق و قوبروس و تورکیای خۆرئاوا و تورکەکانی بولغاریا هیچ فەرق و جیاوازیەك ناکات) (شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا. جەنگیز چاندار.ل. ٩٢).

# داگیرکردنی کوێت، وەك سەرەتایەك بۆ ڕاپەرین

# داگیرکردنی کوێت

*** ڕاستە کە تۆ لە لەندەن پێش داگیرکردنی کوێت لە کۆبونەوەی (چەتم هاوس) دا باسی داگیرکردنی کوێتتان کردبو؟(١)**

- بەڵێ، من لە ١١ ئایار ١٩٩٠ دەعوت کرابوم بۆئەوەی لەوێ وتارێک پێشکەش بکەم، منیش وتارێکم بە عەرەبی نوسی و دام بە بەرهەم بۆئەوەی بۆم بکات بە ئینگلیزی. دوای ئەوەی بۆی تەواوکردم، شەوێ لەڕێگا لە دەرەوەی شار لەناو ئۆتۆمبیلەکەدا بۆی خوێندمەوە، بۆئەوەی تەلەفوزی هەندێ وشەم بۆ ڕاست بکاتەوە، لام زەحمەت بو.

ناونیشانی وتارەکە دەربارەی کێشەی کورد و بینینی ئێمەبو بۆ نەوەدەکان. لە پەرەگرافێکدا باسی ئەوەم کردبو دەڵێم: "کە ئەو سوپا عێراقیەی کۆکراوەتەوە، بۆ هێرشە بۆسەر کوێت" و باسی سیناریۆکەم کرد، عێراق کوێت دەگرێت و حکومەتێکی پۆپێت دروستدەکات و دوای ئەوە ئەیبەستێت بە عێراقەوە.

لەوێ کە ئەو قسەیەم کرد، لە خاڵەکانی تر موناقەشەم لەسەرنەکرا، چونکە من باسی ئەوەم کردبو، ئەگەر جوڵانەوەی ڕزگاری خەڵکی کوردستان لەسەر دەستی حیزبی عەلمانی سەرنەکەوێ، ئەوە جێ دەکرێتەوە بۆ گروپی توندرەوی تێرۆریست، لە کوردستانیش وەک وڵاتانی تر ئەو گروپانە پەیدائەبن، لەبەرئەوە حەقە هێزە دیموکراتەکانی دنیا پشتوانی ئەو جوڵانەوە ڕزگاریخوازەی خەڵکی کوردستان بکەن کە زۆر دیموکرات و پێشکەوتنخواز و مەدەنیە.

هیچ کەس لە ئامادەبوان لاریان نەبو لەسەر باسەکە، تەنها سێر جۆن مابرۆری نەبێت، ئەویش تەعەلیقەکەی ئەوەبو گوتی: "وەڵاهی میستەر تاڵەبانی بۆ پرستیجی جەنابت و هێزی بەرپەرەکانی عێراقی باش نیە موبالەغەی وا بکەن، دەزانم ئێوە هێزێکی بەرپەرەکانن بەڵام ئەوە زیاد باسکردنە، دەربارەی گرتنی کوێت"!.

من سور بوم لەسەر قسەکانی خۆم و سوربوم لەسەرئەوەی کە سوپای عێراقی، کوێت داگیردەکات و ئێوە بارودۆخەکە وەک ئێمە نابینن و ئەو گرژیە وەک خۆی

نابینن و ئەو راستیانە کە ئێمە دەیزانین لە ناوەوەی وڵات ئێوە وای نازانن.

ئیدوارد مورتیمەر دەعوەتی لەتیف رەشید و منی کردبو، لەگەڵ دیفید گۆربۆس لێپرسراوی بەشی رۆژهەڵاتی ناوەراست لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا. من وێنەیەکم لە وتارەکەی خۆم دایە و گوتم: ئەو فەقەرەیە بخوێنەرەوە، کە خوێندیەوە گوتی: "جەلال...! موبالەغەکردن بۆ تۆ و بۆ ناو و شەخسیەتی تۆ باش نیە، پیاوێکی ناسراوی وەک تۆ نابێ وا بیربکاتەوە"، وتم باشە و ماوەیەکی تر قسەی لێدەکەین و دەیبینیەوە و بزانین وایە یان وانیە.[٢]

ماوەیەک بەسەر ئەو کۆبونەوەیەدا رۆیشت و عێراق کوێتی داگیرکرد، مەسعود بارزانی و من لە بەغدا بوین بۆ مەسەلەی گفتوگۆ، سەدرەدین ئاغا خان هاتبو، سێر جۆنی لەگەڵ بو، تاریق عەزیز دەعوەتێکی کردبو و ئێمەش بانگکرابوین، چومە لای سێر جۆن و گوتم: ئایا رۆژەکە و وتارەکەی (چەتم هاوس)ت لە یادە؟، گوتی: بەڵی لە یادمە، لەوکاتەدا ئاغا خان هاتە پێشەوە و گوتی: ئەوە چیە مستەر تاڵەبانی؟! منیش چیرۆکەکەم بۆ باسکرد، ئاغا خان گوتی بێگومان خەڵکی وڵاتی خۆیان حکومەتی خۆیان باشتر دەناسن.

*** ئایا تۆ هیچ ئیشارەتێکت لە دەرەوە هەست پێنەکرد، حکومەت و دەزگای جیاوازی تر هەبێت نەیانەوێت عێراق گەورە و بەهێزبێت؟**

- من دۆستێکم هەیە لە ئەمەریکا پێش ئەوەی عێراق پەلاماری کوێت بدات، پێی گوتم: "جەلال عێراق زۆر گەورەبوە، هێزەکەی بۆتە مەترسی لەسەر ئاسایشی ناوچەکە و پێویستە ئەو هێزە نەمێنێ. پاش ماوەیەکی تر بەناوی مافی مرۆڤە وە تەشقەڵەیەکی پێ ئەکرێت، بۆئەوەی ئەو هێزەی کەمکرێتەوە و ئەو هێزەی نەمێنێ".

نامەیەکم نوسی بۆ مەسعود بارزانی و نەوشیروان مستەفا، ئەوەی لە دۆستەکەم بیستبو بۆم باسکردن. ئێوارەیەکیان تاریق عەزیز دەعوەتی مەسعود بارزانی و دارۆ و منی کردبو، دانیشتبوین، گوتم: "ئەبو زیاد ئەوە بۆ ئەو شەڕەی کوێتتان کر"د، گوتی: "ئێمە زانیاریمان هەبو کە دەیانەوێت بمانروخێنن و لە هێزمان کەم بکەنەوە، ئێمەش گوتمان دەچین کوێت دەگرین و ئاڵوگۆڕدەکەین، کوێتیان دەدەینەوە بە مەرجێ وازمان لێبهێنن، بەڵام وای بەسەرنەهات".

روم کردە مەسعود بارزانی و گوتم: "لەبیرتە لەو بارەیەوە نامەیەکم بۆ تۆ و

نەوشیروان نوسی"؟ گوتی: "بەڵێ نامەکەم ئێستاش ماوە"، تاریق عەزیز گوتی ئەوەچیە گوتی: "ئەبو شەلال منین عرفت؟" گوتم: (من نفس المصدر اللی انت عرفت منهم) ئیتر بو بە پێکەنین.

# کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی لە بەیروت

*** لە ٩ی مارتی ١٩٩١ دا لە بیروت، کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی گیرا، رۆڵی یەکێتی لەو کۆنگرەیەدا چی بو؟**

- دەتوانم پێت بڵێم دەوری سەرەکی رێکخستنەکە هی یەکێتی بو، رۆژێکیان عبدولحەلیم خەدام هەواڵی بۆ ناردبوم و گوتبوی سەرۆک سڵاوی بۆی هەیە و دەڵێت کۆنگرەیەکی بەو جۆرە هەر بەو دەکرێت، چونکە پەیوەندی لەگەڵ هەموان باشە، با هەوڵ بدات و یەکیان بخات.

منیش بە خەدامم گوت: "کاتێ سەرۆک داخوازی وای هەبێت، من هەمو هاوکاریەک دەکەم، بەڵام منیش مەرجم هەیە، ئەوەیش ئەوەیە، کە تۆ دو بەعسی عاقڵم بدەیتێ و کارەکەم لێ تێکنەدەن"! چونکە بەعسیەکان دەوریان هەبو لە تێکدانی کاری لەو جۆرەدا، ئەویش گوتی: "ئەو داخوازیەی تۆ مانای ئەوەیە کە نایکەم، کاکە ئێوەی عێراقی هەموی دو عاقڵتان تێیدانیە، من دو بەعسی عاقڵ لە کوێ بێنم"؟.

ئێمە دەورمان هەبو لە کۆکردنەوەی هێزەکاندا و لە کاروباری ناو کۆنگرەکەدا، بۆ نمونە، بۆ یەکەمجار ئیسلامی و کۆمۆنیستمان بەیەکەوە دانابو، وێنە گیران، لە وێنەکەدا بە دەستێک دەستی عەزیز محەمەدم گرتوە و بە دەستەکەی تر دەستی مودەریسیم گرتوە.

ئەوکاتە ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی قسەکانیان توندبو، واتا ئێمە هەوڵماندا خاوبکرێتەوە، بەڵام سەری نەگرت. من پێموایە ئێمە دەورێکی گرنگمان هەبو لەو مەسەلەیەدا، ئێمە نەبوینایە رەنگە بریارەکانی وانەبوایە، چونکە ئەو چەپ و راستە زەحمەتبو وا کۆبکرێنەوە .

*** بەڵام ئەنجامێکی گرنگ و کاریگەری لێدەرنەچو؟**

– بەو شێوەیەش نەبو، توانرا بەرەیەک پێکبێت و بوبەبریار، لەو کاتانەدا ڕاپەرینی هەمو عێراق بو، بەڵام ئەمەریکیەکان وازیان لە ڕوخاندنی ڕژێم هێنا. ئەو بەرەیە بەتەمای ئەوەبو ئەمەریکا سەدام بروخێنێ و ئەو بچێتە جێی، بەڵام کە ئەمەریکا شەڕەکەی ڕاگرتو و نەچوە پێشەوە، گروپە ئیسلامیەکان توندرەوبون لە سەرەتای ڕاپەریندا و ویستیان خۆیان هەمو شتەکان بگرنەدەست.

*** کەواتە هەڵەی ڕاپەرین لە خواروی عێراق دەستپێیکرد، بە تایبەتی هەڵەی گروپە ئیسلامیە شیعیەکان؟**

– ئیسلامیەکان، نا شارەزایانە مامەڵەیانکرد، ئەوە لە نەوشیروان بپرسە، بزانە چۆن پاشقولیان لێگرتبوین، چونکە ئەوانە زۆر دروشمی زەقیان بەرزکردەوە کە خەڵکە عەرەبە سونیەکانیش ترسان. من دەمەوێت شتێکت بۆ بگێڕمەوە لەو بابەتە، لەکاتی گفتوگۆدا لە بەغدا، ئێمە میواندارەکەمان لیوا وەفیق سامەرائی بو، من وەفیقم پێشتر دەناسی و ڕۆژێک پیاسەمان دەکرد، چونکە لە ژورەکان نەم دەوێرا بە ئاشکرا قسە بکەم، چونکە قسەکان بە نهێنی تۆماردەکران، گوتم: "ئەرێ ئەبو نەوال بۆ ئەوەندە بە توندی دژی ڕاپەرین بون، خۆ ئێوە لای خۆی بە نهێنی دژی (سەدام) بون"، ئەویش گوتی: "ئێمە ئەوەمان کرد وەک بەرگری لە خۆمان، ئەوان وا هاتن کە مناڵیشمان لەسەر لانک بکوژن و هەرچی سونی هەیە لایبەرن، لەبەرئەوە ئێمە بەرگریمان لە سەدام نەکرد، بەڵکو بەرگریمان لە بونی خۆمان کرد".

# بەرەی کوردستانی و گەڕانەوە بۆ کوردستانی ڕزگارکراو

*** ئایا بەرەی کوردستانی توانی ڕۆڵی گرنگی خۆی ببینێ؟**

– کە بەرەی کوردستانی دروستبو، من ڕام لێ نەبو، بەڵام لەبەرئەوەی وامدەزانی نەوشیروان کردویەتی، ناڕەزاییم دەرنەبڕی، بەڵام خۆی وەڵامی نامەیەکی دامەوە و گوتی: "مام جەلال منیش وەکو تۆ ڕازی نیم، ئەوە فەرەیدون عەبدولقادر کردویەتی".

دوای ماوەیەک فەریدون هات بۆ شام و ئیعتیرافی کرد و گوتی: "من کردومە بەبێ ئەوەی بۆچونی کۆتایی برادەران وەرگرم و لەسەر مەسئولیەتی خۆم ئیمزامکردوە".

*** چۆن و کەی گەڕانەوە بۆ کوردستان؟**

- من لەپاش ئەوەی کۆبونەوەی بیروت تەواوبو، بەتەما بوم بگەڕێمەوە بۆ کوردستان و دەمەویست زو بگەڕێمەوە و هیچ دوانەکەوم، بەڵام لە تورکیاوە دەعوەت کرابوم، چونی تورکیام بەلاوە گرنگ بو، پرسی برادەرانیشم کرد، چونکە دەنگی ئەوە هەبو ڕەنگە تورکیا تەدەخول بکات، بۆئەوەی ئێمە هەوڵ بدەین کەمێک (دڵنیاییان) بدەینێ کە ئێمە دەوڵەتی کوردیمان ناوێ و ئینفیسالی نین.

کە چوم بۆ تورکیا، هێشتا ڕاپەڕین لە کوردستاندا دەستی پێنەکردبو، بەڵام لە خواروی عێراق دەستی پێکردبو، لەبەرئەوە چونەکەم دو سێ ڕۆژی پێ چو.

لە ڕێگای سوریاوە هاتمەوە کوردستان، کە هاتمە زاخۆ پێشوازییەکی گەورە و گەرمیان لێکردین، خەڵکێکی زۆر هاتبون بە پیرمانەوە، یەکەم وتاری ڕاپەڕینم لە زاخۆ خوێندەوە، شەو لەوێ مامەوە، بۆ بەیانی کە هاتمە دهۆک، هێرشی عێراق دەستی پێکردەوە بۆسەر دهۆک.

*** مام جەلال هەستت چی بو کە یەکەمجار دوای چەندین ساڵی خەبات، بگەڕێیتەوە کوردستانی ئازاد و رزگارکراو؟**

- لەو کاتانەدا ئەتوانم هەستم بەو شێوەیە دەربڕم:

یەکەم: مرۆڤ بەڕاستی هەست بەخۆشی و سەرکەوتن دەکات، خۆشی و سەرکەوتن زۆر شتێکی خۆشە، بەتایبەتی بۆ ئێمەمانان کەوا چەندین ساڵە توشی چەندین شکست بوین و ئاشبەتاڵ لەدوای ئاشبەتاڵ توشمانبوە و بڵاوەی پێکردوین و جۆرەها کۆسپی بۆ دروست کردوین.

ئەوە ساتێکی زۆر دڵخۆشکەرە، یەکەمجار هاوڵاتیانی میللەتەکەمان دەبینین ڕاپەڕیون و ئازاد و سەرفرازن، بەڕاستی زۆر دڵخۆشبوم.

دوەم: پیاو شانازی دەکات بەوەی کە خۆمان ئەو ڕاپەرینەمان ئەنجامداوە، واتا ئەو ڕاپەڕینە هی میللەتی خۆمانبوە، بەهێزی خۆمان و بە پشتوانی خۆمانبوە، نەهێزی بێگانە هاتوە و نە هیچ سوپایەک یارمەتی داوین، خەڵکی وڵاتەکەمان بەهێزی خۆی ڕاپەرینەکەی ئەنجامداوە.

سێیەم: زۆر دڵخۆشبوم، کە ڕێبەر و ئەندازیار و هەڵسوڕێنەری ئەو ڕاپەرینە، یەکێتی بوە، کەرکوک رزگارکرا، دەمزانی نەوشیروان مستەفا ڕێبەرەکەی بوە. هوشیار زێباری لە ڕونکردنەوەیەکی رۆژنامەنوسیدا، گوتی: "مەسعود بارزانی خۆی بە شەخسی سەرکردایەتی شاڵاوی رزگارکردنی کەرکوکی کردوە"، و من قسەکانیم بەدرۆ خستەوە.

دەمەوێ لێرەدا مەسەلەیەکی گرنگ بگێڕمەوە، ڕاپەڕین دەستی پێکرد لە ١٣ -١٤ی مانگی مارتدا، نوێنەرانی حکومەت لە دەرەوە و لەناوەوە پەیوەندییان پێوەکردین. نامەیەک بەخەتی سەدام هاتبو، بەڵام بەبێ ناونیشان و دەڵێ: "ئێمە ئامادەین لەگەڵتاندا دانیشین و باسی کێشەکان بکەین".

بەرزانی برای سەدامیش لە سویسرا داوای بینینی منی کرد، ئەمە یەکێک بو لە هۆی دواکەوتنم لە گەرانەوەم بۆ کوردستان، گوتی: "لەکوێ تۆ دەتەوێ لە سویسرا، لە ئوردون ئێمە ئامادەین دابنیشین و هەموو مەسەلەیەک قابیلی باسکردنە، بە فیدراڵیشەوە".

ئێمەش برادەرانی پارتیمان ئاگادارکردەوە، لەوکاتەدا هوشیار زێباری و موحسین دزەیی سەفەرێکی سعودیەیان بەدەستەوەبو، بۆ خاتری سەفەرەکە، داخوازیەکەی بارزانیان رەتکردەوە و نەهاتن بەیەکەوە بچین بیانبینین.

بەڕای من ئەگەر ئێمە ئەوکاتە گفتوگۆکەمان بکردایە، رەنگ بو مەسەلەی کەرکوکیش وەک خۆی بمایەوە، ئەو وەختە خۆمان تەسبیتدەکرد، بەڵام لە ڕاپەڕینەکەدا خۆمان لە شارەکاندا نەچەسپاندبو.

## پەراوێزەکان:

١- چەتەم هاوس، دەزگایەکە سەر بە ئینستوتی مەلکی بۆ پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکانی ئینگلتەرایە، شوێنکی دیارە بۆ کۆبونەوەی تایبەتی سیاسی، بناغەی ئەم دەزگایە ئەوەیە، کە نابێت ناوی قسەکەرەکان، یان ئەوانەی کە وتار دەخوێننەوە، یان ناوی بەشداربوان ئاشکرابکرێت.

٢- ئەدوارد مورتیمر، رۆژنامەنوسێکی ئینگلیزە، لە رۆژنامەی فینانشل تایمزی ئینگلیزی دەنوسی، دوایی لە نەتەوە یەکگرتوەکان دەستی بەکارکرد و شارەزای ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە.

# کۆنگرەی یەکەمی یەکێتی

*** بۆچی ویستان کۆنگرە بگرن و ئایە خۆتان ئامادە کردبو؟**

– پاش ڕاپەڕین، پاش ئەوەی هەمو باڵەکانی ناو یەکێتی لەیەک نزیکبوبونەوە، هەمو دەیانویست لەسەر شێوەیەکی نوێ بۆ ڕێکخستن پێکبێن و ئەم بیروبۆچونە گەلاڵە بوبو لەناو زوربەی زۆری کادێرەکاندا. هەروەها بۆ دارشتنی سیاسەتی نوێ لە سەردەمی نوێدا، بە پێویست زانرا کۆنگرەیەک ببەسترێ کە ئەو ئەرکانە بێنیتەدی لەبەردەمماندا بون، وەکو یەکخستنی کۆمەڵە لەگەڵ شۆڕشگێڕان و لایەنگرانی تری ناو یەکێتی، هەڵبژاردنی سەرکردایەتیەکی نوێ و دانانی سیاسەت و تاکتیکی نوێ، بە پێی قۆناغی نوێ کە لەگەڵ سەردەمدا بگونجێ.

مەبەست لە هەڵوێستی تازە، هەڵوێست بو لە حیزبە کوردستانیەکانی تر و شێوەی هاوکاری لەگەڵ پارتی و دارشتنی سیاسەتێک کە کوردستان بەرەو کوردستانێکی دامەزراوەیی و بەرە و هەڵبژاردنی پەرلەمان و بەرەو دانانی حکومەت بەرێت، ئەوە ئەرکە گرنگەکانی کۆنگرەبو، ئەو کۆنگرەیە بۆ ئەم ئەرکانە بەسترا.

# کۆنگرە و تەکەتول و ڕاپۆرتی سیاسی

*** ئێوە چۆن کۆنگرەیەکتان ئەویست؟**

– من خۆم چەند خواستێکم هەبو:

یەکەم: بەش بە حاڵی خۆم پێم خۆشبو، کۆنگرەیەک بێت کە بەڕاستی هەڵبژێردراو بێت لەلایەن هەڤاڵانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە. بەداخەوە

هەندێک شتی تێیدا هەبو، من بە کەموکورتیم ئەزانی، ئەوەبو برادەران هەریەک لە ناوچەی خۆیان ژمارەی زیادیان پێشکەشکردبو، بۆئەوەی نوێنەری زیادیان هەبێت لە کۆنگرەکەدا.

دوەم: لەناو کۆنگرەدا تەکەتولات هەبو، بەڕاستی ئەو تەکەتولاتانە شێوەیەکی نامەبدەئی بەخۆیەوە گرتبو، بەشێوەیەک کاردەکرا، هەر کەسە دەیویست باڵی خۆی و جەماعەتی خۆی دەسەڵاتداربێت و نوێنەری زۆربێت، لەناو کۆمیتەی داهاتوی سەرکردایەتی یەکێتیدا.

جگەلەوە بیر و بۆچونێک هەبو، کەوا دەستەڵاتی مام جەلال کەمبکرێتەوە و بە ئیستڵاحی خۆیان تەحدید و تەحجیمی مام جەلال و دەستەڵاتی مام جەلال بکرێت لە کۆنگرێس، ئەو بۆچونە هەبو و بەڕادەیەکیش هەبو، لەخۆپاڵاوتندا، هەرکەسە دەهات خۆی تەرشیح دەکرد، دەیویست ببێتە سەرکردایەتی بێ ئەوەی حیسابی ئەوەبکات کە ئایا توانا و لێوەشاوەیی هەیە و ئەتوانێت ببێت بە ئەندامی سەرکردایەتی.

لەگەڵ هەمو ئەوانەشدا، چونکە ئەم کۆنگرەیە هەڵبژاردەی بەشی هەرە زۆری ئەندامانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بو، جەوێکی زۆر ئازادانەی دیموکراتیانەی تێیدا زاڵ بو، چونکە شازاد سائیب هەڵبژێردرابو بۆ سەرپەرشتی کۆنگرێسەکە، زۆر بە ژیرانە و بەوەستایانە کارەکانی بەڕێوە دەبرد، من پێموایە کارێکی زۆر باشبو و سەرکەوتنێکی باشی بەدەستهێنا.

ئەوەی من داکۆکیم لەسەردەکرد و لەسەری سوربوم، پەسەندکردنی ڕاپۆرتی سیاسی بو کە من نوسیبوم و تێیدا هەڵوێست لە حکومەت و لە گفتوگۆ و لە پەرلەمان و لە حکومەتی داهاتو رونکرابۆوە و پاش هەندێ گۆڕان، گەشەی پێدرا و چاککرا و قبوڵکرا.

کە ڕاپۆتە سیاسیەکە پەسەندکرا، ئیتر مەسەلەکانی تر بەلامەوە زۆر گرنگ نەما، تەنانەت مەسەلەی کەمکردنەوەی دەستەڵاتەکانی سکرتێری گشتی و ئەوەی پێیان دەگوت (تەحجیم کردنی و تەحدید کردنی مام جەلال)م بەلاوە گرنگ نەبو.

*** ئایا نەتوانرا سەرکردایەتیەکی باشتر هەڵبژێردرێ؟ ئەگەر نەتوانرا بۆ نەکرا؟**

– نەدەتوانرا، پێکهاتەی کۆنگرێسەکە لەوەدابو کە لەوجۆرە قوڕە هەرئەوەندە تۆز هەڵدەستا!.

بەتایبەتی دەمەوێت شتێک بڵێم، لەناو یەکێتیدا ئازادیەکی زۆر هەبو و ئەوکاتە زۆرتریش بو، تا ڕادەیەک بەرەڵایی هەبو. تاقمێکی زۆر لە لاوەکان و لە

تێکۆشەرانی شاخ هەمو خۆیان بە شایستەی سەرکردایەتی دەزانی، لەبەرئەوە خۆیان پاڵاوتبو، بێ ئەوەی هیچ گوێ بدەنە توانا و شارەزایی و هوشیاری و ڕۆشنبیری و لێزانین و کارایی بۆ ئەم پۆستە گرنگە.

*** لە کۆنگرەدا چەند توانرا ئەو بۆ چونانەت بچێتە قالبی بڕیارەوە؟**

– من وەکو بۆم باسکردی، ڕاپۆرتەکەم قبوڵکرا، من ڕاپۆرتەکەم هەمو ئەو بیروبۆچونانەی خۆمی تێدابو، کە ئەوە پەسەندکرا ئیتر بەلای منەوە هیچ شتێک گرنگتر نەبو، بەلای منەوە سەرکەوتنی گەورەم لە قبوڵکردنی ڕاپۆرتەکەدا بەدەستهێنا، ئەوەم بەسەرکەوتنی گەورە زانی، بۆیە کە ئەوە جێبەجێ بو، خاڵەکانی ترم بەلاوەکی و سانەوی دائەنا.

# گەڕانەوەی (ئاڵای شۆڕش – ئاش) بۆناو یەکێتی

*** دوای کۆنگرە، پرۆسەی هاتنە ناوەوەی هێزە چەپەکان بۆناو یەکێتی هاتەکایەوە، لەوانە کۆمەڵی (ئاڵای شۆڕش)کە بە ئاش ناسرابون، ئایا کاریگەریی هاتنە ناوەوەی (ئاش) بۆناو یەکێتی چیبو؟**

– بەڵێ من دەمەوێ شتێک بڵێم، یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەسەرەتای دامەزراندنیەوە چەند سیمایەکی تایبەتی شۆڕشگێڕانەی نوێی هێناوەتەکایەوە، یەکێک لەو خەسڵەتانە وەفاداریە، یەکێک لەو خەسڵەتانە ڕاستگۆییە لەگەڵ مێژودا. من لەبیرمە، جارێکیان نەوشیروان مناقەشەی دەکرد لەگەڵ هەندێک لە برادەرانی ئەوەی دوایی (ئاڵای شۆڕشیان) پێکهێنا، پێیگوتن ئێوە وا تێدەگەن کە مێژوی خەبات لە ڕۆژی دامەزراندنی کۆمەڵەوە دەستی پێکردوە، کەچی وانیە میللەتی کورد دەیان ساڵە بەردەوامە لە خەبات، ئێمە درێژە بەو خەباتە ئەدەین، ئێمە پێویستە ڕێزی هەمو تێکۆشەرانی پێش خۆمان بگرین.

بەڕاستی ئێمە ئەوەمان کرد، بەتایبەتی من و نەوشیروان ئەوەمان کرد و جێبەجێمان کرد، خەباتی تێکۆشەرانی دێرینمان لانەبرد و ڕەتمان نەکردەوە.

ئێمە تەماشای ئەو برادەرانەمان دەکرد، کە لێمان جیابونەتەوە و دابڕاون، بەڵام حیسابمان بۆ دەکردن ڕۆڵێکیان هەبوە، بۆیە بۆ کۆنگرەی یەکێتی گەڵێک لەسەرکردەکانی ئاڵای شۆڕشمان وەک میوان دەعوەت کردبو، وەکو سالار عزیز، مەلا بەختیار، گوتمان فەرمون وەرن لەکۆنگرە بەشداربن و ببینن کە یەکێتی گەیشتۆتە کوێ.

ئەوەی کە گوایە ئەوانە هاتونەتەوە ناو یەکێتی، بەناوی ئاڵای شۆڕشەوە، وانەبو، چونکە برادەرانی ئاڵای شۆڕش چوبون لەگەڵ (حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان) بوبون بەیەک، لەوێ مەسەلەکە بەناوی هاتنەوەی زەحمەتکێشان بو بۆ ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ئەوەبو، بەڵام بەشی زۆری ئەو کەسانە هاتنەوە ناو یەکێتی نیشمانی کوردستان و بەشی هەرە زۆریان هاوڕێیانی کۆنی ئاڵای شۆڕش بون کە لەوێ لەگەڵ زەحمەتکێشان یەکیان گرتبوە، ئینجا هاتنەوە ناو یەکێتی.

ئەوان ژمارەیان زۆر کەم نەبو، لەچەند سەدێک تێدەپەڕین و بگرە دەتوانم بڵێم بەگشتی ئەوانەی کە هاتنەوە زیاتر لە هەزار ئەندام بون. کادێری زۆر باشیان هەبو کە تا ئێستاش لەناو یەکێتیدا کادێری چاک و هوشیار و تێکۆشەرن و جێی باشیان بۆ پڕکردوینەتەوە، لە دەزگا جیاجیاکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا.

*** لەدوای کۆنگرە، ئێوە چەند سەفەرێکتان کرد بۆ دەرەوەی وڵات و چەندەها کەسایەتی و سەرکردەی وڵاتانتان بینی، ئایا ئەوانە هیچ کاریگەریەکیان هەبو بۆ ئەو تاقیکردنەوە نوێیەی کوردستان؟**

- لە کۆن زەمانەوە داگیرکەرانی کوردستان هەوڵیانداوە، مەسەلەی کورد لەناو چوارچێوەیەکی زۆر تەسکدا بهێڵنەوە و دەرگای لێ دابخەن و نەیەڵن دەنگی کورد بگاتە دەرەوە و پەیوەندی لە نێوان خەڵکی کوردستان و دەرەوە نەمێنێت، تەنانەت ئەو مەسەلەیە باوبو لە کوردستاندا، کورد پشت و پەناکەی تەنها چیاکانی کوردستان خۆیەتی. ئێمە بەو هەوڵەی کە دامان لە پەیوەندیکردن بە پارتە سۆسیال دیموکراتەکان و بە بەشداری لە کۆنگرەی پارتی کرێکارانی بەریتانیادا، ئەو ساڵە تاکە کەسی بێبگانە بوم کە ڕێمدرا لەو کۆنگرەیەدا وتار بخوێنمەوە.

لەوێ گوتم جاران خەڵکی کوردستان دەیانگوت هەر شاخەکانی کوردستان پشتیوانتانە، بەڵام ئەوا من ئەمڕۆ دور لە شاخەکانی کوردستان، لەناو دۆستان و پشتیوانانی خەڵکی کوردستاندام، چەپڵەیەکی زۆریان بۆ لێدام و ئەو رستەیەیان پێ دوبارەکردمەوە.

لەپاشان، پەیوەندیمانکرد لەگەڵ حکومەتەکانیش، پێویستە بڵێین، یەکەم سەرۆک حکومەتی ئەوروپا کە پێشوازی لە ئێمە کرد و خۆت(مەبەست لە ئەنجامدەری چاوپێکەوتنەکەیە) بەشداربویت لە وەفدەکەدا، (ڤلاسلاف هاڤڵ)ی سەرۆک کۆماری چیکۆسلۆڤاکیا بو. ئەوە پێش سەرکەوتنمان بو، لە کاتێکدا بو کە باری سیاسی و پێشمەرگانەی ئێمە زۆرباش نەبون، بۆیە پێویستە چاکەی ئەو پیاوەمان لەبیرنەچێ،[1] هەروەها چاکەی ئەو کەسانەی کە تۆ ناوتهێنان.

ئەو پەیوەندیانەی تۆ باستکردن، دوای ڕاپەڕین بون، دوای ئەوەبون کە ئێمە ناوچەکانمان ڕزگارکرابو و ئێمە هاتبوینە ناو ئاستی سیاسەتی نێودەوڵەتیەوە. ئێمە لە کوێت دەعوەت کرابوین، ئەویش پاش ڕزگارکردنی کوێت بو، چوین پیرۆزباییان لێ بکەین و پەیوەندیان لەگەڵ دروست بکەین.

پاشان ئێمە لە کۆنەوە پەیوەندیمان لەگەڵ ئێراندا هەبو کە چومە ئێران هەم جەنابی ڕەفسەنجانیمان بینی و هەم دکتۆر عەلی ولایەتی و چەند کاربەدەستێکی دەسەڵاتداری تر، وەکو ئاغای موحسینی ڕەزایی و چەند لێپرسراوێکی تر.

## فرەنسوا میتەران و مەسەلەی فیدرالیزم

*** ئایا بینینی فرەنسوا میتەران، وەک سەرۆک کۆماری فەرەنسا، چ کاریگەریەکی هەبو بۆ سەر مەسەلەی کورد؟**

- بێگومان، دیداری سەرۆک فرەنسوا میتەران بەلای ئێمەوە گرنگیەکی زۆر گەورەی هەبو، چونکە فەرەنسا دەوڵەتێکی گرنگ و گەورەی ئەوروپا بو، بێجگە لەوەی دەوڵەتێکی گەورەبو، ئەندامێکی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایشە و لە ئەوروپا و جیهاندا ڕۆڵێکی گرنگی هەیە.

کە ئێمەی بینی، ئەوە خۆی لەخۆیدا بەرزکردنەوەی کێشەی کوردبو لە دنیادا و بەرزکردنەوەی ورەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بو کە پیاوێکی وەکو فرەنسوا میتەران پشتیوانیمان لێدەکات و قسەی زۆر باشمان بۆدەکات. یەکێک لەو ساتانەی کە قەت لەبیرم ناچێتەوە، ئەوەبو، گوتی: "ئێوە قوربانی و مەزڵومی

مێژون، ئێوە ڤیکتمی زوڵمی مێژون و مافی خۆتانە، بە هەمو خواستەکانی خۆتان شادبن، لە وڵاتی فرە نەتەوەدا مەسەلەی نەتەوەیی بە دیموکراسی و بە فیدڕاڵیزم چارەسەر دەکرێ، دەنا بەهیچ شێوەیەکی کە چارەسەر ناکرێ"، پشتیوانی ئەوەی کردین کە ئێمە سیستەمی فیدڕاڵ لە عێراقدا رەچاوبکەین.

دوای ئەوە، جارێکی تر لەگەڵ مەسعود بارزانی دیمانەوە کە پشتیوانی لە فیدراڵ کرد، ئینجا ئێمە هاتینەوە ئەو بۆچونەمان (فیدرالیەت) بۆ پەرلەمانی کوردستان پێشنیازکرد.

دیتنی کەسانی تریش بەڕاستی هەموی لەو بوارەدا بو کە دەمانویست دەنگی گەلی کورد، بە دنیا ڕابگەیەنین و چی تر نەڵێین (گەلی کورد هەر کێوەکانی کوردستان پشتیوانێتی) بەڵکو دنیاشی لەگەڵدایە و مەسەلەکەی کەوتۆتە ناو کێشە نێونەتەوەییەکانەوە و پشتیوانی بۆ پەیدابوە، هەم لەلایەن دەوڵەتی گەورەی وەک فەڕەنسا و ئەمەریکاوە و هەم ڕێکخراوە گەورەکانی وەک سۆشیال دیموکراتەکان. هەروەها ناشبێت ئەوەمان لەبیربچێت کە پارتی سۆسیالیستی فەڕەنسا یەکەمین پارتی سۆسیالیستی ئەوروپایە، مافی چارەی خۆنوسینی بۆ کورد لە کۆنگرێسی خۆیدا سەلماندوە.

*** دوای ئەم قۆناغە، کاتێک بیری هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان هاتەکایەوە، هەڵوێستی یەکێتی چی بو؟**

– ئەو بۆچونە لەکاتی کۆنگرەی یەکێتیەوە دروست بوبو، ئێمە لە پێشەوە لایەنگری کوردستانێکی ئەنجومەنی بوین و لایەنگری ئەوەبوین کە لە دێهات و ناحیە و قەزاکان و پارێزگاکاندا ئەنجومەن هەڵببژێرێت. هەروەها ئەنجومەنێکی نیشتمانی لە کوردستانیش هەڵبژێردرێ، بەڵام چۆن مەسەلەی هەڵبژاردن و یاساکەی هاتەکایەوە، من دەمەوێ بۆ مێژو ڕاستیەکەی بڵێم: ئەو سەردەمە ناکۆکی پەیدابوبو لەناو بەرەی کوردستانیدا، بە تاقی تەنیا مەسعود بارزانی دەیگوت: "من ئەو ڕێکەوتنامەیە کە لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا نەکراوە، ئیمزای دەکەم تەنانەت دەیگوت ئەگەر بەتەنیاشبم و پارتیشم لەگەڵدا نەبێت هەر ئیمزای دەکەم".

لەراستی دا ئەو ڕێکەوتنامەیە هیچی تێیدانەبو، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، تەنها سەلماندنی سەرکردایەتی بەعس بو، هەتا ڕۆژی قیامەت سەلماندنی شۆڕشی بەعس و سەرکردایەتی سەدام حسێن بو. باسی کەرکوک نەکرابو، گەشەکردنێک نەبو بە حوکمی زاتی، بۆیە ئێمە و هەمو لایەنەکانی تر، دژی ئەو جۆرە ڕێکەوتنەبوین.

# مەسعود بارزانی و مەسەلەی کورد

*** بۆچی مەسعود بارزانی زۆر مەبەستی بو لەگەڵ حکومەت ڕێک بکەوێت، ئایە ئەو بێ هیوابو لە شۆڕش و خەڵکی کوردستان و هێزی پێشمەرگە، یان هۆی تری هەبو؟**

– مەسعود بارزانی، لە کۆبونەوەی خەلیفاندا سوربو لەسەرئەوەی، ڕێکەوتن لەگەڵ حکومەتدا مۆربکات و گوتی: "من بە تەنیا ئیمزای دەکەم، من هیچ باوەڕم بە خەڵکی کوردستان نەماوە، من باوەڕم بە پێشمەرگەی پارتی نەماوە! کە لێمان قەوما لە هەمو ئەو پێشمەرگانەی پارتی کە لەگەڵمدابون، چل کەسم لەگەڵدا مایەوە! ئەگەر لەبەرخاتری گۆڕی بارزانی و بیری بارزانی نەبوایە، ئەو جەمەدانیە سورەم دەخستە ژێر قۆندەرەکەم و هیچ باوەڕیشم بە پێشمەرگەی یەکێتی نیە کە لێمان قەوما تەنها دەستەکەی کۆسرەت و دەستەی حەسەن کوێستانی و چەند کەسێکی کەم مانەوە لە کۆڕێ. باوەڕم بەوەنەماوە، خەڵکی کورد مقاوەمەت و خەبات بکات و جارێکی تر نامەوێ ببمەوە بە پەنابەر لە ئێران، لەبەرئەوە باشترین چارەسەر ئەوەیە، ئەو ڕێکەوتنامەیە ئیمزا بکەم".

دوای ئەوەی مەسعود ئەو قسانەی کرد، عەزیز محەمەد تکای کرد و گوتی: "کاک مەسعود من دەمەوێ داوات لێبکەم، تۆ کوڕی بارزانیت، خەباتتان کردوە، گەلی کورد تێکۆشەرە و ئامادەی فیداکاریە، من تکات لێدەکەم ئەوە مەڵێ و مەیکە"!.

# هەڵبژارنی پەرلەمانی کوردستان

*** هەڵوێستی پارتی یان مەسعود بارزانی، چی بو دەربارەی هەڵبژاردن؟**

–مەسعود بارزانی، سوربو لەسەر قسەکانی خۆی، من لە پاشاندا قسەیەکم کرد و گوتم: من نامەیەکم بۆهاتوە، بێگومان هەمان نامەش بۆ مەسعودیش هاتبو، بەڵام من نەمگوت کە هەمان نامە بۆ مەسعودیش هاتوە، نامەیەکم لە دۆستێکەوە بۆهاتوە و دەڵێت: "ئەوروپا یان دەوڵەتە گەورەکان وەک ئینگلیز و ئەمەریکا ئامادەن ئەگەر ئێمە هەڵبژاردنێک بکەین و حکومەتێک دروست بکەین دان بەو حکومەتەدا بنێن، ئەوان تورکیا قایل دەکەن کە دژایەتی کورد نەکەن".

کاک مەسعودیش گوتی: "وەڵا ئەو نامەیە بۆ منیش هاتوە"، ئیتر ئەو هەواڵە جەوی دانیشتنەکەی گۆڕی و گوتیان، جا باشە کەواتە با ئێمە هەڵبژاردن بکەین. گوتیان: "با لە هەڵبژاردندا، مەسەلەی حکومەت و گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتدا باس بکرێت، ئەو حیزبەی زوربەی لە هەڵبژاردن بەدەستهێنا، با ئەو لەگەڵ حکومەتدا رێکەوتن مۆربکات، ئەگەر هیچ حیزبێک زوربەی نەهێنا، با مۆرکردنی ئەو رێکەوتنە بخرێتە دەستی ئەو پەرلەمانەی کە هەڵدەبژێرێت"، بەوجۆرە مەسەلەی هەڵبژاردنی پەرلەمان هاتەکایەوە و بڕیاری لێدرا .

*** ئێوە پێش هەڵبژاردن چ پێشبینیەکتان دەکرد بۆ ئەنجامی هەڵبژاردنەکان؟.**

– ئێمە پێمان وابو، یەکێتی زوربەی دەنگەکان بەدەست دێنێ، هەڵبژاردنەکە لە پێشەوە گیروگرفتی لەسەربو، لایەک دەیگوت هەڵبژاردنی رێژەیی بێ، ئەوی تر دەیگوت بازنەیی بێت، یەکێتی بازنەیی پێباش بو، حیسابی کردبو ئەگەر بازنەیی بێت، رەنگە زۆربەی دەنگەکان بەدەست بهێنێت. ئێمە دڵنیابوین زوربەی دەنگ لە ناوچەی کەرکوک و سلێمانی بەدەست دێنین، کە دیکردە نیوەی دائیریەکان، لە هەولێریش نیوەی دەنگەکانمان دەبردەوە، ئەوە زوربەی دەنگەکانی کوردستان بو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لە هاوڕێیانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، وەکو

دکتۆر کەمال فوئاد و هەندێ لە برادەرانی تر سوربون لەسەرئەوەی ڕێژەیی بێت و با حیزبەکانی تر بەشداربن و با هەمو لایەنەکانی تر بەشداربن. [۱]

ئەوەبو برادەرانی پارتی یەکەمجار دائیریان پێباش بو، بەڵام دوایی کە هەستیان کرد یەکێتی دەیباتەوە، ئەوانیش هاتنە سەر ڕێژەیی، بەڵام ڕێژەی ٧٪ یان دانا و لەو سەدا حەوتە نەدەهاتنە خوارێ، ئێمە پێمانوابو ئەگەر هەڵبژاردنێکی ئازادبکرێ، ئێمە دەیبەینەوە و بەشی زۆر دەنگەکان دەهێنین، بەڵام پێموایە ئێمە هەندێ هەڵەمان لە هەڵبژاردنەکەدا کرد، وەک:

یەکەمیان: لە دانانی پاڵێوراوەکان (کاندیدەکانمان) ئێمە لەسەر بنەمای خەباتی تێکۆشانی پێشمەرگە و شاخ دامانئنان، نەک لەسەر بنەمای ئەوەی کە ڕوی کۆمەڵایەتی بن و لە خەڵکەوە نزیک و خۆشەویست بن.

دوەم: ئەوەی بە تایبەتی لە هەولێر کاسبکارانی زۆر دەترسان، دروشمی ئێمە بو، دروشمی (مافی چارەی خۆنوسین) و ڕەتکردنەوەی گفتوگۆکردن بو لەگەڵ حکومەت.

ئەو کەس و تاقمانەی دەستیان بە کڵاوی خۆیانەوە گرتبو، پێیانوابو کە پارتی دەیەوێت لەگەڵ حکومەت گفتوگۆ بکات و حوکمی زاتی دەوێت، چونکە دروشمی پارتی حوکمی زاتی بو، دروشمی ئێمە، مافی چارەی خۆ نوسین بو، ئەمە وایکرد زۆر کەسی (موحافین) دەنگ بە پارتی بدەن.

سێیەم : ئێمە سیاسەتێکی توند و تیژمان هەبو بەرامبەر بە جاشەکان، برادەرانی ئێمە هەندێ چەپرەویان دەکرد بەتایبەتی لە بادینان، کە کۆمەڵێک سەرۆک عەشیرەت لەگەڵ ئێمەبون و وایان لێکردن کە لە ئێمە دوربکەونەوە، ئەوکارەش لە دەنگداندا زیانی بە ئێمە گەیاند .

چوارەم: ئێمە شارەزایی تەواوی هەڵبژاردن نەبوین، لەبەرئەوە سندوقی کەممان بۆ ناوچەکانی خۆمان دابینکردبو، ئەگەر بهاتبایە و سندوقی تەواومان لە پارێزگای سلێمانی و کەرکوک دابنایە، ئەوە بەلای کەمەوە حەفتا تا هەشتا هەزار دەنگی تر بۆ یەکێتی مسۆگەردەبو.

هەزاران هاووڵاتی دەنگیان سوتا و نەیان توانی دەنگ بدەن لەبەر کەمی سندوقی دەنگدان، بە شایەتی ڕۆژنامەنوس دیڤید پێرس کە لە سلێمانی بو، ئەو دەڵێت "دەیان هەزار کەس لە کۆڵان بون و بێبەشکرابون لە دەنگدان، ئەوانە بەشی زۆریان سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بون".

بێجگە لەوە، ئێمە پێمانوابو کە لە هەولێریش ئێمە دەنگ زیاتر دێنین لەوەی

کە هێنابومان.

هەروەها ئەو مەرەکەبەی لای پارتیەوە هاتبو، دەسرایەوە، ئەو سرپینەوەیە کاری کردەسەر (تەزویر) و لەزۆر شوێن، وەکو برادۆست، کە ناوچەی یەکێتی بو، بە لۆری پارتی خەڵکی دەنارد و لەوێ دەنگیان دەدا.

بۆیە کەس ڕازی نەبو لە ئەنجامی هەڵبژاردن، یەکەم کەس کە لە ئەنجامی هەڵبژاردن گلەیی کرد، مەسعود بارزانی بو. بروسکەیەکی لێدا و گوتی: "من ئیعتیراف بەم هەڵبژاردنە ناکەم". دوایی یەکێتی بە هەلی زانی و بۆئەوەی ئەو قسەیە بێتەدی، کورد ئەتوانێت بۆخۆی هەڵبژاردن بکا، ئەوەبو بریاردرا بە نیوە بە نیوە هەمو کارەکان بە ئەنجام بگەینرێت.

*** کێ مەسەلەی ڕابەری هێنایە کایەوە؟**

- دکتۆر مەحمود عوسمان، مەسەلەی ڕابەری هێنایە کایەوە.

*** چۆن ئەم بیرۆکەیەی بۆ هات کە لەناو خەڵکدا ڕابەر هەڵبژێرن؟**

- ئەو پێشنیاری ئەو مەسەلەیەی کرد، ئێمە پێمانوابو، کە ئەو بۆچونە لە بنەڕەتدا باوەڕێکی نا دیموکراتیە، نەوشیروان زۆر باش باسی ئەو مەسەلەیەی کرد، کە ئەوە کارێکی ناڕاستە، بەڵام دکتۆر مەحمود هێنایەکایەوە و پارتیش و ئێمەش بۆئەوەی نەڵێن، کە دەترسێین لەوەی کە لەناو خەڵکدا هەڵبژاردن بکەن، ناچاربوین پێشنیازەکە قبوڵ بکەین.

*** تۆ لەکوێ دەنگتدا بۆ پەرلەمان؟**

- لە قەڵاچوالان.

*** کاتێ کە ئەنجامی کۆتایی هەڵبژاردن ئاشکراکرا، تۆ لەکوێ بویت و چ هەستێکت هەبو؟.**

- لە هەولێر بوم، بەڵام زۆرمان پێناخۆش بو، چونکە ئێمە لە دو مەسەلەدا زۆر مافی خۆمان نەدرایە :

یەکەم: لەبەرئەوەی حەفتا — هەشتا هەزار کەسمان لە سلێمانی و ڕانیە و قەڵادزێ و گەرمیان و چەمچەماڵ، بێبەشکران لە دەنگدان و ئەوەمان بە ناهەقزانی.

دوەم: هەڵبژاردن لە بادینان تەزویری زۆر ئاشکرای تێیداکرا، بە شایەتی سامی عەبدولڕەحمان کە ئێستا جێگری سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستانە لە

هەولێر و ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتیە. بە شێوەیەک لە بادینان دەستێوەردان و تەزویرکرا، هەمو کەسێک دەیزانی بە زۆری زۆردار سندوقەکان پڕکرانەوە بە دەنگدان بۆ پارتی، هەتا دەنگی مردوشیان حیساب کردبو. بۆ نمونە هەمو بادینان سەدو حەفتا و هەشت هەزار دەنگدەری هەبو، بەڵام بە تەنها مەسعود بارزانی زیاتر لەو ژمارەیە دەنگی بەدەست هێنابو! بێجگە لەوەی من سی چل هەزار دەنگم هێنا و حیزبە ئیسلامیەکان و سامی عەبدولرەحمان ئەوانیش دەنگیان هێنا، بەراستی تەزویرێکی زۆر گەورە کرا لە بادینان، ئەگینا پارتی دەنگی زۆر کەمتری دەهێنا لەوەی کە هێنابوی.[٢]

*** ئایا یەکێتی لە ناوچەی سلێمانی و ناوچەکانی تری ژێر دەسەڵاتیدا تەزویری کرد؟**

– نەخێر، باوەڕ ناکەم ئەوەندەی من زانیبێتم، تەزویر نەکراوە، چونکە خۆم لە قەڵاچوالان بوم و ئاگاداربوم، بۆیە باوەڕناکەم.

*** دوای هەڵبژاردنەکان و دەرکەوتنی ئەنجامە فەرمیەکان، چۆن گەیشتنە فکرەی سیستەمی (٥٠٪) واتا فیفتی فیفتی؟**

– مەسعود بارزانی، هەڵبژاردنەکەی ڕەتکردەوە و بەیانی دەرکرد و گوتی: "من ئەو هەڵبژاردنە بەڕاست نازانم"، دۆستانی دەرەوە پێیان دەگوتین بەهەر جۆرێک بێت، باشە کە لەسەر ئەو هەڵبژاردنە پێکبێن، من چومە لای مەسعود و قسەم لەگەڵ کرد و زۆر لە دۆستانیش پێیان گوتبو باش دەبێت رێکبکەون.

ئێمە لەسەرئەوە ڕێکەوتین، کۆبونەوەیەک بکەین و ئەنجامی هەڵبژاردن قبوڵ بکەین، هەرچۆنێک بێت ٤٤٪ و شتێک بۆ پارتی ٤٤٪ شتێک کەمتر بۆ یەکێتی، واتا یەکی ٤٤ کورسی بۆ پارتی ٤٤ کورسی بۆ یەکێتی، ١٢ کەی تریش بۆ حیزبەکانی تر.

حیزبەکانی تر ئەو دابەشکردنەیان قبوڵ نەکرد و گوتیان، یان ٢٤ کورسیمان دەدەنێ، یان نامانەوێت. ئەگەر بیانویستایە هەریەکەیان چەند دانەیەکیان پێ دەبڕا، بۆ نمونە، حیزبە ئیسلامیەکان چوار، پێنج دانەیان پێدەبڕا و سۆسیالیست یەک دویەکی پێدەبڕا و حیزبەکانی تر، وەک شیوعی دانەیەکی پێدەبڕا.

لەبەرئەوەی ئەوان قبوڵیان نەکرد، وای لێهات پەنجا بە پەنجا بێت، واتا لەنێوان یەکێتی و پارتیدا دابەشکرێت، بە مەرجێک پاش چەند مانگێکی تر هەڵبژاردنێکی

تر بکرێتەوە و ئەوە بە شتێکی کاتی دانرا، بۆئەوەی لەبەرچاوی دنیا نەڵێن کورد هەڵبژاردنیان پێناکرێت و ناتوانن ئیدارەی خۆیان بکەن و هەمیشە لە فەوزا و گێژاوی دەستەڵاتدا دەژین.

# مەسەلەی رابەر، سەرۆکی حکومەت و پەرلەمان

**※ حکومەت لەسەر چ بناغەیەک دروست بو؟ چۆن سەرۆکی حکومەت هەڵبژێرا؟**

– برایانی پارتی پێیانوابو لەبەرئەوەی نە من و نە مەسعود بارزانی رێژەیەکی دەنگی پێویستمان نەهێناوە بۆ رابەری، پێویستە یاسای پەرلەمان وا لێبکرێت کە سەرۆکی پەرلەمان ببێتە رابەر.

پارتی ئەیویست ئەو سەرۆکایەتی پەرلەمان وەربگرێت، ئەوان پێیان وابو کە حکومەت مەسەلەیەکی جدی نیە و پێیان وابو ئەو حکومەتە سەرناکەوێت و ناژی، چونکە ئەوان وایان دەزانی زورووفی سیاسی و ئابوری، ئەوەندە لەبارنیە حکومەت تێیدا بژی و گەشەبکات.

ئێمە بە زۆر ئەو ناوانەمان پێ گۆڕین لە (مەجلیسی تەنفیزی) یەوە بۆ (ئەنجومەنی وەزیران) و بە موناقەشەی زۆر و بە ماندوبونی زۆر پێمان سەلماندن، ئەو ناوانە دانەنێین، برادەرانی پارتی لە سەرەتادا وەزارەتەکەشیان پێ گرنگ نەبو، بۆیە ئیتر ئێمە پۆستی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانمان وەرگرت و ئەوانیش سەرۆکی پەرلەمان.

# دانانی وەزیری دارایی

*** دانانی دکتۆر فوئاد مەعسوم، یان وەزیرەکان، یان بریکاری وەزارەت لەسەر چ بنەمایەک بو؟ بە تایبەتی ئەوانەی یەکێتی؟**

- ئێمە، لە یەکەم کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسیدا نەوشیروانمان هەڵبژارد بۆ سەرۆکی حکومەت، بەڵام نەوشیروان نەی کرد و گوتی من نایکەم، بۆیە دکتۆر فوئادمان دەستنیشان کرد و بە گشتی دەنگمان پێدا کە ببێتە سەرۆکی حکومەت.

وەزیرەکانیش هەموی بە زوربەی دەنگ لە مەکتەبی سیاسی هەڵبژێران، تەنها وەزیری دارایی نەبێت کە بۆچونی جیاوازی لەسەربو، بەشی زۆری مەکتەبی سیاسی دەیانویست نەژادی ئەحمەدی عەزیز ئاغا ببێتە وەزیری دارایی، تەنها دکتۆر کەمال فواد بەتەنیا دەیویست دکتۆر سەلاح حەفید هەڵببژێرێت. بۆ هەڵبژاردنی دکتۆر سەلاح حەفید، مناقەشەیەکی زۆرمان کرد و خستمانە دەنگەوە، ئەنجامەکەی پێنج بۆ نەژاد و دو بۆ سەلاح حەفید، بریارماندا نەژاد ببێت بە وەزیری دارایی، بەڵام کە لیستەکە دەرچو تەماشامان کرد دکتۆر سەلاح دانراوە. کاتێ لە دکتۆر فواد مەعسوممان پرسی، بۆچی ئەو ناوە گۆڕاوە، گوتی: "کاک کەمال فواد ئەو لیستەی بۆمن هێناوە و منیش ئەو لیستەم پێشکەشکردوە"، لە کاک کەمالمان پرسی کە بۆچی وایکردوە؟ گوتی: "غەڵەتەکەی من لە ڕاستەکەی ئێوە باشترە"، ئیتر بەو شێوەیە وەزیرەکان دانران.

*** ئەگەر سبەی پەرلەمان هەڵببژێرێتەوە، چی پێویستە نەکرێ و پێویستە ڕەچاوی چی بکرێت، بۆئەوەی پەرلەمانێک بێت کە ئاوێنەی ڕاستەقینەی خەڵکی کوردستان بێت؟**

- دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی بەپێی ڕێکەوتنامەی واشنتن دەستنیشانکراوە، ئەم ئەنجومەنە کۆمەڵێک دەستەڵاتی نیە، لە پەرلەمانی دنیادا هەیە، وەکو دانانی یاسا، وەکو هەڵبژاردنی سەرۆکی حکومەت و وەزیرەکان.

لەبەرئەوە ئەو پەرلەمانەی کە هەیە، پێویستە ئەو ئەرکانە بەجێ بهێنێت

کە لە ڕێکەوتنامەکەی واشنتندا هاتوە. من ئاواتم ئەوەیە کە هەڵبژاردنێکی ئازادبکرێت لە سەر تاسەری کوردستاندا و ئەنجومەنێکی نیشتمانی کوردستانی یەکگرتو هەڵبژێرێت و ڕێژەی ئەو ٧٪ ە بێتە خوارێ بۆ یەک، دو، سێ، بۆئەوەی هەمو حیزبەکان بتوانن تێیدابەشداربن و بەپێی قەبارەی خۆیان، نوێنەری خۆیان دیاری بکەن و پەرلەمانێک بێت کە تورکمان و ئاشوری تێیدا بەشداربێت.

# شەهیدکردنی سادقی شەرەفکەندی

*** لە ١٩٩٢/٩/١٧ کۆنگرەی سۆسیالیستی جیهانی لە بەرلین بەسترا و ئێوەش سەرۆکایەتی شاندی یەکێتیتان دەکرد، لەهەمان کاتدا شاندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە سەرۆکایەتی سادقی شەرەفکەندیش لەو کۆنگرەیە بەشداربون، لە ڕۆژانی کۆنگرەدا شەرەفکەندی تیرۆرکرا، ئەو کارە تێرۆرستیە چەند کاریکردە سەر ئێوە؟**

– تۆ خۆت یەکێک بویت لە ئەندامانی وەفدی ئێمە و تۆ خۆت یەکەم کەس بویت کە تەلەفۆنت بۆ کردم و هەواڵی تێرۆری ئەوت پێڕاگەیاندم، من ئاگام لێنەبو، لە ئوتێل نوستبوم.

لەو کاتەدا، ئێمەش دەترساین لە خۆمان و داوای ئیحتیاتات و حەراسەتمان کرد، ئێمە کە کۆبونەوەکە تەواوبو لەگەڵ سادق شەرەفکەندی قسەمان کرد، وێنەشمان پێکەوە گرت. هەتا من پێم گوت، وابزانم تۆش لەوێ بوی، گوتم: "کاکە گیان ئەگەر کۆبونەوە دەکەی جێگامان هەیە، ئەوە ماڵی کاک سەلاح لێرەیە، ئەتوانن لەوێ کۆبونەوە بکەن، وەکو تر ئاگاتان لە خۆتان بێت".

سادق شەرەفکەندیش گوتی: "نا، من هەمو ئامادەیەکم کردوە و ئێمە ئاگادارین"، ئەگەر بە قسەی ئێمەیان بکردایە و بهاتنایە ماڵی ئێوە، ئەوە نەدەقەوما. بەداخەوە ئەو شەهیدبونە کاری زۆری کردەسەر ئێمە، چونکە ئێمە زۆر خێرا ئیدانەمان کرد، بە تایبەتیش باسکرا ئێران لە پشت کارەکەوەیە.

بەڕاستی سۆسیال دیموکراتی دنیا قەرزاری ئەوانن، لە ئەنجامی ئەو تێرۆرە حیزبی دیموکرات قبوڵکرا بە پاڵێوراو لە سۆسیالیستی جیهانیدا و ئیدانەی

ئەو تاوانەیان کرد و پاشان ئەوەبو بە دادگایەکی مەشهور لە بەرلین دانراو و دادگایکردنەکە بەناوی (میکۆنۆس)ەوە ناوی دەرکرد، ئێران لەو کارەدا زیانێکی سیاسی گەورەی لێکەوت.

***هەر لەو ساڵەدا شەڕی لە نێوان PKK و یەکێتی و پارتی رویدا، هۆی ئەو شەڕە چی بو؟**

- هۆی ئەو شەڕە ئەوەبو کە PKK هێزەکانی خۆی هێنابوە کوردستانی عێراقەوە و دەیویست لە کوردستانی عێراقدا حوکم بکات، بەیانی دەرکردبو دژی حکومەتی هەرێم و دەیگوت: "حکومەتی هەرێم، حکومەت نیە و پەرلەمانیش، پەرلەمان نیە"، داوای کردبو حکومەتی شەعبی دابمەزرێت و خەڵک هەڵسێت و کۆمیتە و ئەنجومەن دابنێت و ئەو حکومەتە لابەرن! لەبەرئەوە بۆ بەرگری لەو حکومەتە، ناچار توشی شەڕ هاتین لەگەڵیاندا، ئەوان ئەو شەڕەیان بەسەردا سەپاندین، ئەگینا ئەوکاتە کەس شەڕی نەئەویست.

ئێمە هاوکاریمان کردن و هێنامانن بۆ ناوزەنگ و من بارەگاکان و بیناکانی خۆمان وماڵی خۆم و بینای مەکتەبی سیاسیمان دانێ، نەخۆشخانەیەکی زۆر باشمان هەبو کە ئەڵمانەکان بۆیان دروستکردبوین، ئەوەشمان دانێ، لەو ناوچەیە بۆخۆیان دانیشتبون و هەمو ئازادیەکیان هەبو.

ئەوەبو تورکیا بۆردومانی کردن و هەموو خانوەکانی و نەخۆشخانەکەمان کاولکرا و ئەوانیش چونە شوێنی تر و بڵاوبونەوە.

# گەڕانەوەی ڕەسوڵ مامەند بۆ ناو یەکێتی

*** لە١٠ شوباتی ١٩٩٣ دا پارتی سۆسیالیستی کوردستان بە سەرۆکایەتی ڕەسوڵ مامەند گەڕانەوە ناو یەکێتی، هۆی ئەو هاتنە و سودەکەی چی بو؟**

- ماوەیەک بو لەناو کادیر و سەرکردەکانی حیزبی سۆسیالیستی کوردستاندا، گفتوگۆیەک و مناقەشەیەک دەستی پێکردبو لەسەرئەوەی ئایا ئەوان لەگەڵ کامڵادابن، بچنە لای پارتی یان بچنە لای یەکێتی نیشتمانی کوردستان. ئەوان

بون بە چەند گروپێک و بەشی هەرە زۆریان کە سۆسیالیستە ڕەسەنەکان بون، بە سەرۆکایەتی ڕەسوڵ مامەند کە کۆنیش یەکێتی بون، پێیان باشبو بێنە ناو یەکێتیەوە.

دەستیان بە گفتوگۆکرد لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی بۆئەوەی بێنە ناو یەکێتیەوە، هەندێکیشیان بێلایەن مانەوە وەکو دکتۆر مەحمود و عادل موراد و عەدنان موفتی، دوایی عەدنان و عادل مورادیش هاتنەوە ناو یەکێتی. بەڵام بەشە زۆرەکە بە ڕێبەری ڕەسول مامەند هەوڵیان دەدا بۆ هاتنەوەیان بۆ ناو یەکێتی، بە ئیعتیباری ئەوەی، کاتی خۆشی هەر یەکێتی بون، لەوانە شێخ محەمەدی شاکەلی و بەهرۆز گەلاڵی بون. لە ئەنجامدا بەشی هەرە زۆریان هاتنە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە و بەشێکیشیان وەکو سەید کاکە و هەندێ برادەری تری هەولێریان، چونە ناو پارتی دیموکراتی کوردستانەوە.

ئەوانە کە هاتنە ناو یەکێتیەوە، لە ڕوی فیکری و سیاسی و دروشمەوە لە یەکێتیەوە نزیکتربون وەک لە پارتی، هۆیەکی تر ئەوەبو، ئەوانە کۆن یەکێتی بون. ڕەسول مامەند هەر لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتیەوە، ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوە و لە سەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشەوە لەگەڵ بوە، لەبەرئەوە خۆیان بە نزیکتر دەزانی لە یەکێتی و لە بیروباوەڕی یەکێتی.

ئێمەش هاتنەوەی ئەو برادەرانەمان پێباشبو، چونکە هەم جەماوەرێکی باشیان لەگەڵ بو، و هەم کۆمەڵێک کادیری باشی عەسکەری و سیاسیان لەگەڵ بو وە ژمارەیەکی زۆری خەڵکیان گەڕاندەوە بۆ ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

# دکتۆر فواد مەعسوم و کۆسرەت رەسوڵ بۆ سەرۆکایەتی حکومەت

*** لە هەمان ساڵدا و لە مانگی چواردا دکتۆر فوئاد مەعسوم لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران کشایەوە و کۆسرەت رەسوڵ چوە جێگاکەی، هۆی کشانەوەی دکتۆر فوئاد چی بو؟ بۆ کۆسرەت هەڵبژێردرا؟**

- دەربارەی سەرۆکایەتی وەزیران، دەمەوێ زۆر بەڕاشکاوی باست بۆ بکەم. لەسەرەتای دامەزراندنی حکومەت، سەرۆکایەتی ئەنجومەن بە ئێمە درا، من پێشنیازەکەم ئەوەبو کە نەوشیروان سەرۆکایەتی وەزارەت بگرێتە ئەستۆ، نەوشیروان پێی خۆش نەبو ئەوکارە بکات، ئەگەر چی زۆریشمان هەوڵدا لەگەڵیدا، بەڵام نەیویست، کە ئەو رەتیکردوە، ئێمە دکتۆر فوئادمان هەڵبژارد، دکتۆر فوئاد وەک سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران دەست بەکاربو.

دوای ماوەیەک گلەیی پەیدابو، هەم لەناو یەکێتی و هەم لەناو پارتیدا لە دکتۆر فوئاد، یەکێتیەکان دەیان وت ئەو نەرمونیانە و زۆر یەکێتیانە کارناکات، چونکە بەڕاستی تەبیعەتی دکتۆر فوئاد پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆیە و لایەنگری ئەو هەمو داخوازیانە نەبو کە کادێرەکانی یەکێتی پێشکەشیان دەکرد و هەندێکیان بەسەردا دەسەپاند. بۆ نمونە، کۆمەڵێک لە پۆلیسەکانی یەکێتی و پارتی چون لەناو خۆیاندا رێکەوتن کە هەرچی عەریف و رەئیس عورەفا و خەڵکانی لەوجۆرەبون، هەمو بون بە لیوا و عەقید و عەمید کە ئەوە مخالیفی هەمو یاسایەکی سەربازیە لە دنیادا، بەبێ کولیە و بەبێ دەورە و بەبێ زانیاری، بەوشێوەیە هیچ کەسێک ناچێتە پێشەوە.

دکتۆر فوئاد یەکێک بو لەو کەسانەی ئەوجۆرە کارانەی زۆر لا پەسەندنەبو، لەبەرئەوە هەندێک لە کادیرەکانی ناو یەکێتی کەوتبونە پرتەوبۆڵە کە دکتۆر فوئاد زۆر بۆ یەکێتی کارناکات، هەروەها ئەندامانی پارتیش گلەییان لەو هەبو. من

خۆشم لەو کەسانە نەبوم کە گلەییم هەبێت، بەڵام لەو کەسانە بوم باوەڕم بەوە هەبو کە ئێمە لەو ماوەیەی دەسەڵاتی کوردستان دەکەین، پێویستە کۆمەڵێک سەرۆک وەزیر و وەزیر پەروەردە بکەین.

من خۆم لایەنگری ئەوەبوم، جارێکیش پێشنیازمکرد بۆ سەرکردایەتی، هەر سەرۆک وەزیر و وەزیری ئێمە، تەنها یەک ساڵ بمێنێتەوە پاش ئەو ساڵە بیانگۆڕین، تا کۆمەڵێک کادێر رادەهێنین و پەروەردەیان دەکەین. لەئەنجامدا بۆماندەردەکەوێت کە هەر یەک لەو برادەرانە تواناکانیان چەندە و بەکەڵکی کام کار دێن و لە داهاتودا ئەتوانین، کابینە لەسەر بناغەی (الرجل المناسب في المكان المناسب) دابنێین.

من خۆم بەو نیازە دەنگمدا کە دکتۆر فوئاد لابچێت، کە ئەو لاچو دیسانەوە هاتینەوە سەرئەوەی کێ بکەین بە سەرۆک ئەنجومەنی وەزیران.

من و نەوشیروان رامان وابو، لە نێوان دکتۆر کمال فوئاد و کۆسرەت یەکێکیان تەکلیف بکەین بۆ سەرۆکایەتی وەزیران، بەشی زۆری برادەران دەنگیان بۆ کۆسرەتدا، گوتیان: "کۆسرەت چالاکە و مەشاعیری زۆر یەکێتیانەیە و خەڵکی هەولێریشە" و ئێمەش ئەوکاتە لە هەولێر بوین و ئەو دەتوانێت کاربکاتە سەر خەڵکی هەولێر و هەولێریەکان، بەو جۆرە دەنگ بۆ کۆسرەت درا.

هۆیەکی تری هەڵبژاردنی کۆسرەت ئەوەبو کە مەسعود بارزانی بەلایەوە زۆر باش بو ئەو هەڵببژێرێت، کۆسرەت خۆی چو بۆ لای مەسعود بارزانی و گوتبوی: "تەکلیفێکی وام لێکراوە، بەڵام ئەگەر تۆ بەتەواوەتی پشتیوانیم نەکەی نایکەم"، ئەویش زۆری پێخۆش بو، گوتبوی: "من بەتەواوی پشتیوانیت دەکەم و بڕۆ بیکە".

# شەڕی ئێران و یەکێتی

*** هەر لەو ساڵەدا و لە مانگی ئابدا کێشە و ناکۆکی نێوان یەکێتی و ئێران زیادی کرد، ئێران دەستیکرد بە تۆپبارانی ناوچەکانی یەکێتی لە پێنجوین و قەڵادزێ، هۆی ئەو دوژمنایەتیەی ئێران چی بو و چۆن کۆتاییهات؟**

– خۆی ئەوەی ڕاستی بێت بەوبۆنەیەوە دو قسە لەسەر پەیوەندی نێوانی یەکێتی و ئێران دەکەم:

ئەو جارەیان هۆی سەرەکی دەست تێوەردانی ئێران، ئیسلامیەکان بون، واتا بزوتنەوەی ئیسلامی شەڕ و تەشقەڵەیەکی بە یەکێتی فرۆشت، یەکێتی توانی زو بەسەریاندا زاڵ بێت و سەرکەوێت، بەشێکیانی چەک کرد و ئەوی تر هەموی ڕۆشتن بۆ ئێران.

ئێران ئەوانەی هەمو هێنایەوە بۆ کوردستان، ئەوانە بەتەنیا نەیان دەتوانی بێنەوە، بۆیە هێزی ئێران و چەکداری ئێران هاتن لەگەڵیاندا، هەم بە تۆپ و هەم بە کاتیۆشا. ویستیان لەو شوێنانە بیان چەسپێنن، کاتێ نەیان توانی لەو شوێنانە بیان چەسپێنن، هەستان بە تۆپبارانی شاری هەڵەبجە و قەڵادزێ و پێنجوین، بەڵام پێشمەرگەی یەکێتی خۆیان گرت و ئەوانیان لەو شوێنانە دەرپەڕاند.

دوای ئەوەی ماوەیەک بەسەر ئەو ناکۆکیانەداچو، توندوتیژیی نێوان یەکێتی و ئێران کەمێک ئارام بۆوە و هەندێک دۆست کەوتنە نێوان یەکێتی و ئێرانەوە، بە تایبەتی سەماحەتی سەید محەمەد باقر ئەلحەکیم هەوڵی زۆریدا کە پەیوەندیەکە ئاسایی بکاتەوە. لای خۆمانەوە کەسانێک هەبون وەک محەمەدی حاجی مەحمود، ئەوانەش هەوڵیاندا ئەو ناکۆکیە نەمێنێت. ئێرانیش و ئێمەش قازانجمان لەوەدابو، ئەو ناکۆکیە نەمێنێت، بەڵام مەرجەکانی ئێران قورس بون و بە یەکێتی قبوڵ نەدەکران، وەکو ئەوەی دەیانگوت دەبێ هەمو هێزە کوردیەکانی ئێران لە ناوچەکانی خۆمان دەربکەین و ئەگەر دەریشیان ناکەین، ئەوا پێویستە چەکیان کەین و ڕادیۆکەیان دابخەین و چالاکییان زۆر کەمبکەینەوە.

دیارە ئێمە ئەو داخوازیانەی ئێرانمان پێ جێبەجێ نەدەکرا و لەگەڵ سیاسەتی یەکێتی و لەگەڵ سەرەتاکانی یەکێتی نەدەگونجا، پاشان هەردولا گەیشتینە رێکەوتنێک کە ئێمە تکا لە برادەرانی کوردی ئێرانی بکەین، لە ناوچەکانی ئێمەدابون، چالاکی چەکدارانە نەبەن بۆ دیوی ئێران و بێینەوە.

هەردو لایەن، هەم حیزبی دیموکرات و هەم کۆمەڵە، دوربینانە و ژیرانە بارودۆخی ئێمەیان هەڵسەنگاند و بریاریاندا ئەو داوایە و ئەو تکایەمان لێپەسەندبکەن، بەرامبەر بەوە، ئێرانیش وازی لەوەهێنا کە لە ناوچەکانی ئێمە شوێنیان بکەون و بیانکوژن.

هۆیەکی تر بۆئەوەی کەوا پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئێران زو ئاسایی ببێتەوە، چالاکیەکەی مارتی ١٩٩٥ بو کە ئێمە دەستمان کرد بە کارکردن و مەبەست رزگار کردنی عێراق بو، بۆ ئەوکارە پەیوەندیمان بە سەماحەتی سەید حەکیمەوە کرد و هەروەها ئێرانیشمان ئاگادارکرد، کە ئێمە کارێکی وامان بە دەستەوەیە و ئەوان زۆر بە منەتەوە تەحلیلیان کرد کەوا ئێمە دەمانەوێ ئاگاداریان کەینەوە لە رووداوێکی گەورەی لەو جۆرە و سەید حەکیمیش لەوکارەدا بەشداربێت، ئەو ئاگادارکردنە وایکرد ئەوان کارئاسانیمان بۆ بکەن و پەلە بکەن لە ئاسایی کردنەوەی پەیوەندیماندا.

ئەو رێکەوتنە، گرنگی یەکێتی لە ناوچەکە زیادکرد، دوای ئەو رێکەوتنە، ئێران کەوتە ناوبژی لە نێوان ئێمە و بزوتنەوەی ئیسلامیدا و توانیمان ئەو رێکەوتنە لە تاران ئیمزا بکەین بە هاوکاری ئێران.

## پەراوێزەکان:

١- (سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی لە زنجیرەیەك کۆبونەوەدا لە رۆژانی ٧ تا ٨ نیسانی ١٩٩٢، پرۆژەی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستانی پەسەند کرد... پارتی لایەنگیری سیستەمی دائیری و خۆ هەڵبژاردنی تاك بو، شیوعی و گەل و زەحمەتکێشان و سۆسیالیست لاینگیری سیستەمی نیسبی و لیستی داخراو بون. نوێنەری یەکێتی لەم ناکۆکیەدا بێلایەن بو، لایەنگیرانی سیستەمی نیسبی هەرەشەی بایکۆتی هەڵبژاردنیان کرد و ئەگەر دائیری بێ. پارتی رەزامەندی بۆ سیستەمی نیسبی دەربریوە بەو مەرجەی لایەنی کەمی دەنگەکان لە ٧٪ کەمتر نەبێ، حیزبەکان هیچیان قەوارەی راستەقینەی خۆیان نازانن، هەمویان پێیان وایە ئەگەر لەو رێژەیە زۆرتر نەهێنن، کەمتر ناهێنن و، کەسیان خۆیان لە کەسیان بە لاوازتر نازانن، کۆن وتویانە: "تۆ نۆ مەنی، من نۆ مەنم بێجگە لە گورز و کەمەتم). (خەون یان مۆتەکە. ل. ٤٨. نەشیروان مستەفا).

٢- سامی عەبدولرەحمان و کۆمەڵێك لە سەرکردەکانی پارتی و یەکێتی لە ١٠ی شوباتی ٢٠٠٥ لە کاتی پیرۆزبایی جەژنی قورباندا لە هەولێر لە ئەنجامی دو تەقینەوەی خۆکوژیدا شەهیدکران.

# شەڕی ناوخۆی ١٩٩٤

*** لە بەهاری ١٩٩٤ دا ئێوە سەفەرێکتان کرد بۆ ئەوروپا و لە ئیتاڵیاوە ئەتانویست بچن بۆ ژاپۆن بۆ بەشداری لە کۆنگرەی سۆسیالیستی جیهانیدا، ئەوەبو شەوێک تەلەفۆنتان بۆکرا کە لە قەڵادزێ شەڕ لەنێوان یەکێتی و پارتیدا ڕویداوە، هۆی ڕاستی ئەو شەڕە چی بو، نە ئەتوانرا زو بکوژێنرێتەوە؟؟ بۆ وادرێژەی کێشا؟**

- من پێموایە، هۆی سەرەکی ئەو شەڕە ئەوە بو، لە قەڵادزێ لە نێوان دو گروپی یەکێتی و پارتی شەڕێک ڕویدا و پەرەیسەند بۆ ڕانیە. بەلای منەوە هەردولا هەڵەیانکرد، هەم برادەرانی پارتی کە چوبون لە قەڵادزێ بە زۆر خۆیان بسەپێنن و هێزی خۆیان نیشان بدەن، هەم برادەرانی یەکێتی زۆر توند وەڵامی ئەو کێشەیان دایەوە و ژیرانە و دوربینانە مەسەلەکەیان چارەسەرنەکرد کە لە قەڵادزێ شەڕەکە قەوما و پەرەیانپێدا بۆ ڕانیەش، لەوێش تەشقەڵەیەکیشیان بە پارتی کرد.

من پێموایە هەردولایان لێپرسراون بەرامبەر بەوکارەی کە تاکو ئێستاش پاشماوەی ماوە. ئەگەر بە ویژدانەوە قسە بکەین هەم پارتیەکان و هەم یەکێتیەکان بەرپرسن بەرامبەر بەو کێشەیە، بەڵام بەڕاستی جێی داخ ئەوەیە، نە من لێرە بوم و نە نەوشیروان. بەڕای من، هەردو سەرکردایەتیەکە بەپەلە مەسەلەکەیان چارەسەرنەکرد و برادەرانی پارتی وەک تۆڵە سەندنەوە لەوەی کە زیانیان لێکەوتبو لە ڕانیە و قەڵادزێ چەک کرابون، لەوکاتەدا ئەوان پشتیوانی ئێرانیشیان هەبو و وەعدیان پێدابون، ئەگەر لەگەڵ ئێمە کەوتنە شەڕەوە، ئەوا یارمەتیان بدەن و چەک و تەقەمەنیان بدەنێ.

هاندانی ئێران هۆیەک بو بۆ پەرەسەندنی ناکۆکیەکان، هەرچەندە من و نەوشیروان و بە شایەدی خۆشت لە ڕۆماوە تەلەفۆنمان بۆ کۆسرەت و برادەران کرد و ئەوانمان ڕاسپارد کە بچنە لای مەسعود بارزانی دڵی بدەنەوە و بە قسەی بکەن و گوێ ڕایەڵی بکەن، بەڵام بەداخەوە سەری نەگرت. ئەوان وردە وردە پاش

ئەوەی ئێمە کە کارئاسانیمان دەکرد، توندوتیژتر دەبون و لە نەرمی ئێمە سودیان وەردەگرت، بۆ ئەوەی هەندێ زەبرەمان لێبدەن.[1]

تەنانەت ئەگەر لە یادتبێت، ئێمە شەقڵاوە و سەفینمان لەدەست بو، من بۆ دڵنیاکردنی مەسعود بارزانی سەفین بەسەر سەری ڕەشدا دەڕوانێت، یەک لایەنە سەفینم چۆڵکرد بۆئەوەی باوەڕبکات کە ئێمە ئاشتیمان بەڕاستیە و نامانەوێ گیروگرفت لە نێوانماندا روبدات.

بەداخەوە برادەرانی پارتی بەدەم هاوکاری ئێمەوە نەهاتن، بەنیازی تۆڵەسەندنەوە لەگەڵ ئێمە ڕەفتاریان دەکرد، بۆیە ئەو ناکۆکیە پەرەیسەند تا ١٩٩٥.

لەدوای روخانی بەعس، بەڵگەنامەیەک دەری دەخا، کە ڕژێمی عێراق حەمەی هەمزەی باپیر ئاغای تەکلیف کردوە لە قەلادزێ ئەو شەڕە دروست بکات.

*** یەکێتی لە شەقڵاوە و لە بادینان دەرکرا و پارتیش لە سلێمانی، ئایا ئەوە نەبوبەهۆی دروستکردنی دو ناوچە، بادینان بۆ پارتی و سۆران بۆ یەکێتی، ئەم دوپارچەییە، تا ئێستاش بەردەوامە و لە بواری سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی ڕەنگی داوەتەوە؟.**

– برادەرانی پارتی سودیان لە هەڵوێستی ئێمە وەرگرت، بە تایبەتی کە ئێمە لەسەر داوای مەسعود بارزانی ئەوێمان چوڵکرد، ئێمە لە شەقڵاوە دو بارەگای بچوکمان هێشتەوە، بارەگای مەڵبەند و ماڵەکەی خۆم، پارتی کەڵکیان لەوەوەرگرت. ئەمە دوای ئەوەی کە نێچیرڤان بارزانی چو دەستی گرت بەسەر پارەکەی ئیبراهیم خەلیلدا، مەسعود بارزانی بەڵێنیدا کە ئەو پارەیە دوای ئەوەی بارەگای پارتی لە سلێمانی دەکرێتەوە بیداتەوە بە حکومەتی هەرێم.

نەوشیروان، پێشنیازیکرد هەردو کارەکە لە یەک کاتدا ئەنجامبدرێت، مەسعود بارزانی منی جیاکردەوە و بەڵێنی شەرەفی دامێ، یەکەمجار بارەگای پارتی بکرێتەوە و دوای ئەوە راستەوخۆ من پارەکە بەدەستی خۆم دەیهێنمەوە و دەتاندەمەوە، پارەکە چەند ملیۆن دینارێک و چەند ملیۆن دۆلارێک بو.

کە من هاتم لە سلێمانی بارەگای پارتیم کردەوە، ئینجا داوامان لە مەسعود بارزانی کرد، بەشی دوهەمی ڕێکەوتنەکە جێبەجێ بکات و مەسعود بارزانی چو بۆ دهۆک و ناردی بە دوای کۆسرەت و ڕۆژ نوری شاویسدا کە پارەکەیان بداتێ کە ئەوان چون، گوتی: "وەڵا پارەکە هەموی نێچیرڤان بردویەتی و تازە ناگەڕێتەوە"،

ملیۆنێک دیناری لێ مابۆوە، وتی ئەوەتان دەدەمێ، کاک کۆسرەتیش ئەوەی نەهێنایەوە.

*** چۆن ئاگری شەڕی ناوخۆ کلپەی سەند و هەمو ناوچەکانی گرتەوە؟**

- دیارە پارتی لە ژێرەوە خۆیان بۆ کاری تری دژی یەکێتی ئامادەدەکرد. پاش ماوەیەک کۆسرەت بە مەسعود بارزانی گوت: "ئەگەر ئێوە شەقلاوە بگرن، ئەوا ئێمە هەولێر دەگرین، دەبێت ئاگاتان لەوەبێت، دەبێت دڵنیابن لەوە ئێمە قبوڵ ناکەین ئێوە شەقلاوە بگرن".

ئەوان گوتیان باشە، لەپڕ هێزێکیان هاتە ناو شاری شەقلاوە و پەلاماری ماڵەکەی منیان دا، من ویستم تەلەفۆن بۆ مەسعود بارزانی بکەم و دەربارەی ئەوکارە قسەبکەین. ئەو وەکو خۆی دوایی باسی کردبو، ڕوی نەهاتبو قسەم لەگەڵدا بکات، بە ئیعتیباری ئەوەی ماڵی من پەلاماردراوە و پێی ناخۆشە و کاک فازیل میرانی قسەی لەگەڵ کردم.

بە فازڵ میرانیم گوت: "کاکە گیان ئەوە ماڵەکەی منتان تاڵان کردوە، بەڕاستی زۆر عەیبە بۆ ئێوەش و بۆ منیش، بەڵام قەیناکە با لەو سنورەدا بوەستێ، بەڵام مەیەڵن پەلاماری مەڵبەند بدەن"، ئەویش گوتی باشە. دوای ئەوە مەسعود بارزانی هاتە سەر تەلەفۆن و گوتی: "مادام تۆ ئەو پیاوەتیەت کردوە، ئێستا من ڕوم دێت قسەت لەگەڵ بکەم، من بەڵێنت ئەدەمێ ئێستا من هێزی خۆم دەنێرم بۆئەوەی مەڵبەند نەگرن و دوایش ماڵەکە بدەنەوە".

لە جیاتی ئەوەی ماڵەکەم چوڵبکەن، چون مەڵبەندیشیان گرت. دوایی حیزبی شیوعی تەدەخولی کردبو، بۆ وادەکەن ئاخر ئەوە ماڵی مام جەلالە، ئەوانیش وەڵامیان دابونەوە و گوتبویان: "نەخێر ئێمە ئەمری سەرکردایەتیمان پێیە".

دوایی دەرکەوت ئەوە بۆ چاوبەستەکی بوە، ئەگینا لە ڕاستیدا ئەوان فەرمانیان پێکرابو ماڵی من و بارەگای مەڵبەند بگرن. ئیتر کە بارەگایان گرت، کارلەکار ترازا و ئێمەش بارەگای سلێمانیمان گرتو و دەرمانکردن. بەڵام ئێمە بەڕاستی بە ڕێزەوە ڕەوانەی هەڵەبجەمان کردن و دوایش ئەوەبو هەولێر گیرا، ئیتر مەسەلەکە تۆختر بو.

# کۆبونەوەی پاریس و دبلن

*** لە ماوەی شەڕی ناوخۆدا زۆر لایەنی جیاواز (کورد، عەرەب، بێگانە) کەوتنە بەینەوە لە نێوان یەکێتی و پارتی ، بۆ وەستانی ئەو شەڕە، بۆ گوێیان لێنەگیرا؟ ئایا ئەو شەڕە بۆ ئەوەندە درێژەی کێشا، کێ شەڕی نەدەوەستاند، یەکێتی، یان پارتی، یان هەردولا؟**

- ئێمە وەک یەکێتی هەمو هەوڵەکانمان قبوڵکرد بۆ وەستانی شەڕ، بەتایبەتی دو ئەمریکی هاتن یەکێکیان مستەر (ئالیستەر ماکفیلد) ئەوی تریان (ڕۆبێرت دۆیچ). هەمو پێشنیازەکانی ئەوانمان قبوڵکرد، بەڵام پارتی قبوڵیان نەکرد، پارتی گرەوی کردبو دەیگوت: "هەردەبێت هەولێر چۆڵکەن".[٢]

ئەوکاتە پارتی پشت ئەستوربو بە پشتیوانی ئێران و تورکیا، لەبەرئەوە هەوڵی ئاشتی ڕەفزدەکرد، ئەگینا جگە لە ئەمریکیەکان، حیزبە کوردستانیەکان هاتن و پێشنیازەکانی ئەوانیشمان قبوڵکرد. پەرلەمانتارەکانی کورد هەمویان مانیانگرت و پێشنیارەکانیانمان قبوڵمان کرد، حیزبەکان هەمویان لە هەولێرەوە هاتن بۆلام، ئەوکاتە من لە کۆیە بوم، من وەرەقەی سپیم بۆ ئیمزاکردن، وتم بڕۆن چیتان دەوێت بیکەن، بەڵام پارتی قبوڵی نەکرد!.

*** دو هەڵی مێژویی هاتە پێشەوە بۆ وەستانی شەڕی ناوخۆ (کۆنگرەی پاریس و کۆبونەوەی دبلن)، هیچ کام لەو هەلانە سەری نەگرت، هۆی چی بو، خەتای کێ بو؟**

- ئێمە لە پاریس ڕێکەوتین و هەردولامان ڕەزامەندبوین، پارتی چو نهێنی ڕێکەوتنامەکەی بە تورکەکان گەیاند. درکاندنی ئەو نهێنیە، مسیۆ میتەرانی زویر کرد، چونکە گوتبوی جارێ دەنگ مەکەن هەتا مەسعود و جەلال دێن بۆ ئەوێ و بە ئامادەبونی ئەوان ئەوکاتە ڕێکەوتنامەکە ئیمزا دەکەین.[٣]

ئەوەبو مەسعود بارزانی نەهات و بەهانەی هێنابۆوە و گوتبوی بە تورکیادا

ناتوانم بچم، بە سوریادا ناکرێ، بە ئێراندا چۆن بچین و ئێمە گوتمان با هەرودکمان پێکەوە بچین، لە ئەنجامدا نەهات.
پارتی نەیانویست بچن و لەوێ ئیمزای بکەن، هەمو ئەو کەسانەی ئاگایان لێیەتی، دەزانن خەتای پارتی بو، پارتی نەی دەویست ئەو رێکەوتنامەیە ئیمزا بکات.[٤]

# رۆڵی PKK لە شەڕی ناوخۆدا

*** ئەی کۆبونەوەی (دبلن) بۆ سەری نەگرت، لە کاتێکدا هەوڵێکی نێوندگیری نێودموڵەتی بو؟**

- لە دبلن، رێکەوتنامەکە کرا، من پێموایە ئێمە هەڵەمان کرد. من خۆم یەکێک بوم لە لێپرسراوانی ئەو هەڵەیە، ئەویش ئەوەبو: ئەمەریکا و ئینگلیز و تورکیا لەوێ داوایان دەکرد ئێمە بڵێین (PKK هێزێکی تیرۆریستە)، بێگومان پارتی دەیگوت هێزێکی تیرۆریست و دوژمنی کوردە، ئێمە هەمو ئەوەمان ڕەتکردەوە، نەوشیروان بە پێی ئەو تەعەلیماتەی لەلایەن ئێمەوە پێی بو، قبوڵی نەکرد بڵێت PKK تیرۆریستە.
ئەمریکیەکان دڵنیا نەبون، ئایا ئەوە هەڵوێستی کۆتایی یەکێتیە، بۆیە تەلەفۆنیان بۆ خۆمکرد، من ئەوکاتە لەشام بوم و تکایان لێکردم هەڵوێستی خۆمان بگۆڕین و ڕێکەوتنەکە قبوڵ بکەین، منیش قبوڵم نەکرد. من پێموایە ئێمە وەک یەکێتی هەڵەمان کرد، دەبوایە ڕێکەوتنامەکە قبوڵ بکەین.
ئەمریکیەکان بەڵێنی گەورەیان بە ئێمەدا، هەر سێ لایان، ئینگلیز، تورکیا و ئەمەریکا گوتیان: "ئەگەر ئێوە لەگەڵ پارتی رێکەون، ئەوا نیوەی داهاتی ئیبراهیم خەلیلتان دەدەینێ و خاڵێک لە سلۆپی دادەنێین و داهاتەکە لە نێوان پارتی و ئێوە و تورکمان و ئاشوری بەش دەکەین"، ئەوەبو ئێمە ئەوەمان رەتکردەوە و دوای ئەوە ئاوا PKK چاکەی داینەوە و بەناحەق هات بە گژماندا.[٥]

# سەرۆکی پەرلەمان و حکومەت
# لە نێوان مام جەلال و مەسعود بارزانیدا

*** پێش هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ، کاروباره گرنگەکانی حکومەت و پەرلەمان بە رەزامەندی تۆ و مەسعود بارزانی ئەنجام ئەدرا، بۆچی ئێوە راستەوخۆ بەشداریتان نەکرد لەو دەزگایانەدا، واتا یەکێکتان ببێتە سەرۆکی پەرلەمان و ئەوی تر ببێتە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران؟**

– پارتی نەیکرد، ئێمە ئەو پێشنیازەماندا بە مەسعود بارزانی و گوتمان: "کام لێپرسراوێتی هەڵدەبژێری و پێت خۆشە بیکەیت، ئەوا سەربەستیت، یان سەرۆکی پەرلەمان بیت، یان سەرۆک ئەنجومەنی وەزیران بیت، من کاری دوەم دەکەم"، واتا ئێمە ئامادەییمان هەبو.

من ویستم بە کردەوە دەریبخەم، نەک هەر لە پشت پەردەوە، کارەکان دەکەم، بەڵکو بە کردەوە و بە ئاشکرا یەکێک لەو پۆستانەی وەردەگرم، کە پارتی یاخود مەسعود بارزانی ئەیەوێت وەریبگرێت، واتا پارتی کام پۆستی هەڵبژارد، ئەوی تر بۆ ئێمە بێت.[٦]

*** لەکاتی شەڕی ناوخۆدا پەرلەمان هەرمابو، بۆچی یەکێتی نەیتوانی فراکسیۆنی سەوز لەگەڵ هەندێ لە پەرلەمانتارانی بێلایەن و هەندێکی تری فراکسیۆنی زەرد، کۆبکاتەوە و کار و چالاکی پەرلەمان زیندوبکاتەوە؟ وەکو چۆن پارتی دوای ٣١ی ئاب کردی!.**

– یەکێتی نەیویستوە بە تەنها کاری پەرلەمان بەرێوەبەرێت، دەنا دەیتوانی، یەکێتی کە لە هەولێر بو، پانزە کەس لە فراکسیۆنی پارتی ئامادەبون بەشداری بکەن، لە بنەوە قسەمان لەگەڵ کردبون، بۆ مێژو کۆسرەت پێشنیازیکرد و گوتی:

"با پەرلەمان کۆ ببێتەوە، پانزەی ئەوان پەنجای خۆمان شەست و پێنج و پێنجی ئاشوریەکان شەست و نۆ، زوربەی زۆری پەرلەمان دەکات"،بەڵام برادەران گوتیان: "ئەوە دەبێتە هۆی دابەشکردنی یەکجارەکی، پارتی بە یەک جاری دەتۆرێ و جارێکی تر پێکنایەتەوە. با ئێمە لە پێناوی یەکێتی ریزەکانی کورد، ئەو هەنگاوە نەنێین"، من پێموایە ئێمە لە ئەوەدا وردبین نەبووین و دەبوایە بیکەین.

# ٣١ ئابی ١٩٩٦

*** ٣١ی ئابی ١٩٩٦ بەرهەمی شەڕی ناوخۆ بو، هۆی ئەو کارەساتە چی بو، هۆ چی بو کە مەسعود بارزانی وا لێبکات بە پاسەوانی کۆماری هەولێر داگیربکات؟**

- ئەوە خۆی دەبێت ئەو پرسیارە لە مەسعود بارزانی بکەیت. بەڵام بە بۆچونی ئێمە، ئەوە دەمێک بو برادەرانی پارتی ئەو هەڕەشەیەیان دەکرد، تەنانەت هانی فکێکی لەگەڵ لێپرسراوێکی گەورەی پارتی قسەی کردبو کە ئایا INC بکەوێتە نێوان ئێوە و یەکێتیەوە، ئەویش گوتبوی: "مایحل المشکله الا دبابات ابو عدی".[٧]

پارتی دەمێک بو لەگەڵ عێراقدا پەیوەندی باشی سیاسی هەبو، بەداخەوە پارتی بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی هەمو شتێکی دەکرد، واتا نەئەسڵەمیەوە لە هیچ هەنگاوێک جارێک ئێرانیان هێنایە سەرمان، جارێک سوپای تورکیا و جارێک سوپای عێراق، ئەوان دەڵێن: "پارتی وەسیلە نیە، بەڵکو هەدەفە".

*** بەڵگەتان چی بو کە مەسعود بارزانی پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا هەبو؟**

- پارتی لەوە نەسڵەمیەوە، هاوکاری سوپای عێراق بکات و بیهێنێت بۆ داگیرکردنی کوردستان. من دو، سێ مەسەلە لەو بارەیەوە هەیە بۆت دەگێڕمەوە: ئێمە دەمانزانی عێراق دێت، پێش ئەوە بە حەفتەیەک دەمانزانی، عێراق لەگەڵ مەسعود بارزانی دێت، بەڵام لە هێزی پارتی سڵمان نەدەکردەوە.

پارتی زۆر هەوڵیدا خۆی بە تەنها هەولێر بگرێت، بەڵام سەرکەوتونەبو. هەتا جارێکیان دکتۆر مەحمود و وەفدێکی بێگانە لە هەولێر بون و سەردانی مەسعود

بارزانیشیان کردبو، بۆ مەسەلەی ئاشتی هاتبون. ئەو شەوەی ئەوان لە هەولێر بون، پارتی هێرشێکی گەورەی کردە سەر هەولێر بە نیازی ئەوەی بیگرێت، لە ئەنجامی ئەو هێرشە زیانێکی زۆریان لێکەوت و شکانێکی خراپ شکان و هەولێریان پێ نەگیرا.

ئەم شکستە، بێ هیوایکردن کە ئەوان بە تەنها ناتوانن هەولێر بگرن، لەبەرئەوەی زۆر گرنگ بو بەلایانەوە هەولێر بگرن. ئەوەبو چون سوپای عێراقیان هێنا و وەکو تاریق عەزیز لە کتێبەکەیدا باسدەکات "مەسعود داوای لێکردین و گوتی کە هەولێر لەژێر دەسەلاتی ئێرانیەکان دایە و جەلال و ئێرانیەکان هەوڵی لەناوبردنی من ئەدەن، منیش داوای یارمەتی دەکەم". هەروەها باسی ئەوەیان کردبو کە ئۆپۆزسیونی عێراقی لەوێیە و پیلان دائەنێ بۆ گۆڕینی ڕژێم و بۆ لەناو بردنتان.[٨]

*** ئەگەر نەتانزانی کەوا پارتی و ڕژێم هێرش دەکەن، بۆچی پیلانی گونجاوتان دانەنا و بەو شێوە خێرایە هەولێرتان چۆڵکرد؟**

- پێشئەوەی سوپای عێراق هێرش بکات، ئێمە لەگەڵ ئەمریکیەکاندا قسەمان کرد و ئەوان بەڵێنیاندا و گوتیان "ئەگەر عێراق هێرش بکات، ئەوا ئێمە لێیان دەدەین"، ئێمە پێمان وابو ئەگەر سوپای عێراق هێرش بکات و ئەمەریکا لێیان بدات، ئەوا ئێمە نەک هەر دەیانشکێنین، بەڵکو دەچین چەکەکانیشیان کۆدەکەینەوە، ئێمە پیلانەکەمان لەسەر ئەو بۆچونە دارشتبو.

## ڕۆڵی ئەمەریکا لە ٣١ ئابدا

*** واتا ئێوە دەتانزانی کە سوپای عێراق هێرش دەکات و هەولێر داگیردەکات؟**

- بەڵێ دەمانزانی و کاتی هێرشەکەشمان دەزانی، ئیحتیاتمان لەهەمو جێگایەکدا کردبو، بەلام ئیحتیاتەکەمان لەسەر ئەو ئەساسە بو، ئەمەریکا بێتە کایەکەوە، لەبەرئەوە ئێمە هێڵێکی بەرگریمان بەرامبەر بە پارتی دروستکردبو وە هێڵێکی بەرگری ترمان بەرامبەر بە عێراق دروستکرد.

گوتمان: ئەگەر ئەمەریکا بێتە کایەکەوە، ئەوا بە دڵنیایەوە عێراق دەشکێنین، چونکە ئەگەر بە فڕۆکە لێیبدات، ئەوا ئێمە دەیانشکێنین. هەتا بەتەمای ئەوەبوین، چەکیشمان دەست بکەوێت و بەتەمای ڕزگارکردنی مەخمور و هەندێ ناوچەی تریش بوین.

هەڵەکەی ئێمە ئەوەبو کە پێویست بو ئێمە حیسابی ئەوە بکەین، ڕەنگە ئەمەریکا لە سوپای عێراقی بدات یاخود لێی نەدات. ئەگەر ئێمە بمانزانیایە ئەمەریکا لێیان نادات، ئەوا بە جۆرێکی تر شەڕەکەمان دەکرد، بەو جۆرەی کە تەنها بە خۆمان بکرێت.

ئێمە هێزەکانمان بە شێوەیەک دانابو کە ڕۆژهەڵاتی هەولێرمان دەگرت و ناوچەی قوشتەپەمان تا بێستانە بەهێز دەکرد و هەمو هێزەکەمان دەهێنایە دەرەوەی هەولێر، مەکاتیب و بارەگاکانمان دەگواستەوە و چەکی قورسمان دەخستە دەرەوەی شار. تەنانەت من ڕۆژێک پێشتر لە قەڵاچوالانەوە قسەم لەگەڵ ڕۆبێرت پێلترۆ کرد، وەک نوێنەری ئەمریکا و پێی گوتم: "دڵنیابە ئێمە لێیان ئەدەین، و ئاگامان لێیانە"، هەتا گوتی: "پێت خۆش بێ عێراق دێتەکایەوە، ئەوە فرسەتێکە بۆئەوەی ئێمە لێیان بدەین".

من شەوێ عومەر فەتاحم لە قەڵاچوالانەوە ناردەوە بۆ هەولێر بۆئەوەی بە برادەران بڵێ، ئەمریکیەکان لێیان ئەدەن. لەوکاتەدا قوبادی کورم لێرەبو، ئەوە خۆی لەگەڵ پێلترۆ تەلەفۆنی کرد و ئەوان دوپاتیان کردەوە و پێیان گوتین: "مەترسن ئێمە لێیان دەدەین و تەمێیان دەکەین".

*** کەواتە ئەو بڕوا بەتینە، بە قسەکانی ئەمریکیەکان، ئێوەی خستە هەڵەوە؟**

– هەڵەکەی ئێمە لەوەدابو، نە دەبوایە ئێمە ئەوەندە خۆش باوەڕبین بە ئەمەریکا و حسابی هەردو ئیحتیمالمان بکردایە. بۆ مێژو دەیڵێم، کۆسرەت پێشنیازی کرد و گوتی: "با مەکتەبەکانمان لەناو شارەوە بگوازینەوە بۆ دەرەوەی هەولێر"، ئەگەر مەکتەبەکانمان بگوازایەتەوە، ئەوا زۆربەی شتەکانمان نە دەگیرا، و پیلانمان بەوشێوەیە دائەنا، ئەمەریکا هێرش ناکات و دورە پەرێز ئەوەستێت.

ئێمە لە نزیک کەڵەکی یاسین ئاغاوە گرتبومان هەتا لای قوشتەپە، ئەو پێشمەرگانەمان دەهێنایەوە بۆ ناوشار و شەڕی ناو شارمان لەگەڵ دەکردن. شەڕی ناوشار بۆ ئێمە زۆر ئاسانترە، وەک لە شەڕی بەرەیی و بەرامبەر دەبابە و تۆپ و کاتیۆشای عێراق.

ئەگەر ئەو پیلانەمان جێبەجێ بکردایە، ئەوکاتە ئەو ژمارە زۆرە پێشمەرگەیەمان پێویست نەدەبو و ئەو ژمارەیەش نەدەگیران، بەڵکو ئەمانتوانی بە هێمنی و بەرێکوپێکی بکشێینەوە، بەڵام ئەوەی کارەکەی لە ئێمە تێکدا، پەیمانەکەی ئەمەریکا بو.[٩]

*** بۆچی ئەمەریکا بەڵێنەکەی جێبەجێ نەکرد و یارمەتی ئێوەی نەدا و بێ هەڵوێستی هەڵبژارد لە داگیرکردنی هەولێردا؟**

– من خۆم نازانم هۆی چیی بو و بۆچی یارمەتیان نەداین؟ بەڵام بە بۆچونی خۆم، دەیگێرمەوە بۆ چەند خالێک:-

یەکەم: سیمای ئیدارەی کلینتۆن شەڕانی نەبو، زیاتر خۆی لە سیاسەتی (ئیحتیوا) و تەمێکردنی عێراقدا دەبینی. لە جیاتی توڵە لە ڕژێم بکاتەوە، هیچی نەکرد و تەنها دو سارۆخیان گرتە بینایەکی کۆنی چۆڵکراو، ئەو نەرم و نۆڵیە لە سودی ئێمە نەبو.

دوەم: گوتیان: "ئەوە شەڕی نێوان دو هێزی کوردییە، یەکێکیان دەعوەتی حکومەتی عێراقی کردوە، حکومەتی عێراق خۆی بە ڕەسمی ئاشکرایکرد کە مەسعود بەرزانی خۆی داوای لە (سید الرئیس) کردوە هێز بنێرێت و هەولێر ڕزگاربکات"، ئەمریکیەکان ئەمەیان کردە بیانو .

سێیەم: ئەوکاتە نەجمەدین ئەربەکان، سەرۆک وەزیرانی تورکیا بو، باسدەکرێت ئەربەکان ڕێی نەداوە بنکەی ئەنچەرلیک لە دژی عێراق بەکاربێت، چونکە ئەربەکان پێی خۆشبو کە یەکێتی لە هەولێر نەمێنێت، ئەوکاتە سیاسەتی تورکیا ئەوەبو، مەسعود بارزانی دەسەڵاتی بەسەر هەولێردا هەبێت نەک ئێمە، ئەوەش دوای ئەوەی ئێمە تاوانبار کراین کە دۆستی PKKین و هاوکاریان دەکەین.

ڕەنگە لە پاشە ڕۆژدا تیشک بکەوێتە سەر هەندێ تاریکی لەوبارەیەوە، ئەوکاتە زیاتر تێدەگەین کە مەسەلەکە چیە و بۆچی ئەمەریکا ئەو هەڵوێستەی وەرگرت.

# هەرەسهێنانی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی

*** دوای گرتنی هەولێر، هێزەکانی یەکێتی بە ماوەیەکی زۆر کورت پەرش و بڵاوبونەوە و هەرەسیان هێنا و لە ئەنجامدا یەکێتی لەسەر سنوری ئێران خۆی گرتەوە، هۆی ئەم شکستە گەورەیە چی بو؟**

- نا ئەو ماوەیە زۆر کورت نەبو، پێشمەرگەکانمان ماوەیەکی چاک لە هەولێر و دەوروپشتی و لە چەند شوێنێکی تر شەڕیان کرد.

هۆیەکی تر کە ئەو هێزانە بۆ وا زو پەرت و بڵاوەیان لێکرد، هەڵەی سەرکردەکان بو. ئەوان نەیان توانی بەرێکوپێکی بکشێنەوە، ئێمە دو هەڤاڵمان هەبو ناویان نابەم، ناردبومانن بۆ ڕانیە و ڕەواندوز کە هێزەکانی ئەو ناوچەیە بکشێنەوە، کەچی هەستان هێزەکانیان بەجێ هێشت و ڕۆشتن بۆسەر سنور.

هەندێ برادەر هێزەکانی خۆیان نەکشانەوە، دەنا دەتوانرا ئەم هێزانە کۆبکرێنەوە، چونکە ئێمە شەڕمان لەسەرنەبو، دەیانتوانی هەنگاو بە هەنگاو ئەو هێزەی هەمانبو لە هیران و نازەنین بیهێنین بەرەو سلێمانی و بەرەو خەلەکان. ئەو هێزەی لە دۆڵی بالیسان و ڕەواندوز هەمان بو بیانهێنین بەرەو باڵەکایەتی و پشدەر، بەڵام ئەوانە هیچ ئەوەیان نەکرد، هەڵسان ڕاست خۆیان ڕۆشتن بۆسەر سنور و پێشمەرگەکانیان بێسەروبەر بەجێهێشت.

# هاوکاری ئێران بۆ گەڕانەوەی یەکێتی

*** لە ماوەیەکی کورتدا، یەکێتی لەسنورەوە گەڕایەوە شوێنەکانی خۆی و شار و شارۆچکەکانی خۆیانی گرتەوە، ڕۆڵی ئێران چی بو لە هاوکاریتاندا بۆ گەڕانەوە و گرتنەوەی ئەو شوێنانە؟**

– ئێمە نەمانتوانی هێزەکانمان لە کشانەوەدا چاک ڕێبەری بکەین، ئەوەبوبەهۆی ئەوەی کە لەسەر سنوری ئێران خۆ بگرینەوە، بەباشمانزانی بچینەوە سەرسنورەکان و بچینەوە ناوزەنگ کە مەڵبەندی دێرینی خۆمان بوە، بۆئەوەی سەرلەنوێ هێزەکانی خۆمان کۆبکەینەوە.

ئەوەبو توانیمان بە ماوەیەکی کەم چەند هەزار پێشمەرگەیەک کۆبکەینەوە، کە کۆمانکردنەوە، دو، سێ هێرشمان هاتە سەر و ئێمە هێرشەکانمان شکاند.

پێشتر ئێران بەڵێنێکی پێدابوین، بەڵام بەڵێنەکەیان جێبەجێ نەکرد، پێشتر کۆسرەت چوبو بۆ ئێران پێمان گوتن: "کەوا پارتی لەگەڵ عێراق ڕێکەوتوە و هێرشمان ئەکەنە سەر"، ئێرانیەکان گوتیان: "مەترسێن، ئێمە ئەو چەکەی عێراق بەکاری دەهێنێت ئەو چەکەتان دەدەینێ دەبابە بو، دەبابەتان دەدەینێ، هێز بو، هێزتان دەدەینێ و لەسەرتان هەڵ ئەدەینێ، هەرکاتێ عێراق پەلاماری ئێوەبدات، ئێمەش پاسدار دەنێرین بۆ پشتگیریتان".

وەکو بیستمان دوای ئەوەی کە عێراق هەولێری داگیرکرد، ئاغای موحسین ڕەزایی دەستبەجێ بڕیاری دابو، بە موشەک لەسەری ڕەش بدات و موشەکەکانی (توجیە) کردبو بۆئەوێ، سەرکردایەتی ئێرانی بڕیاریاندابو، ئەو هێرشەی عێراق ڕەنگە پیلانێک بێت لە ئەمەریکاوە بۆئەوەی ئێران بۆ شەڕەکە رابکێشێت.

سەرکردایەتی ئێران، نەیان هێشتبو هێرش بکرێتەسەر سەرێ ڕەش، ئەگینا هەندێ لێپرسراوی ئێرانی پێشنیازیان کردبو و گوتبویان ئێمە هێزی پاسدار دەبەین لەگەڵ خۆمان و دەچین شەڕ دەکەین، نابێت عێراق زاڵ بێت بەسەر یەکێتیدا.

ئێران زۆری پێ ناخۆشبو ئێمە هاتوینەتەوە بۆ ناوزەنگ، وای بۆ چوبو کە ناوچەکانی سنوری ئەو دەکەوێتە دەست دوژمنەکانی و دەکەوێتە دەست عێراق و ئینجا ڕەنگە جەماعەتی موجاهیدینی خەلق و کوردەکانی ئێران بێنە سەرسنورەکان، لەبەرئەوە، ئێران کەوتە خۆی و هات بۆئەوەی یارمەتیمان بدات.

*** هاوکاری و کۆمەکی ئێران بۆ ئێوە چی بو؟**

- یارمەتیەکانیان بریتی بو لەوەی چەکیان پێ فرۆشتین، هەروەها پێیان گوتین: "ئێمە پشتیوانیتان دەکەین، ئێمە هەڵەمان کردوە کە هاوکاریمان نەکردون، ئێستا لەسەرتان دەکەینەوە"، وورەی پێشمەرگە بەرزبۆوە کە بیستی ئێران هاوکاریمان دەکات:

بۆ گەرانەوە و شێوەی شەرکردن، دو بۆچون لە لامان دروست بوبون:

یەکەم: یەکێتی شەری پێشمەرگانە لەگەڵ پارتی بکات.

دوەم: بە هێرش ناوچەکانی خۆمان رزگار بکەین.

پاسدار لەگەڵ ئێمە نەبون، بەڵام بۆ رێێ نیشاندان و دانانی (خدعه) هەندێ شارەزا هاتن و یارمەتیاندان. هەروەها هەندێک کاتیوشایان داینێ، چونکە ئێمە چەند کاتیوشایەکی کەممان هەبو کە لەوانمان وەرگرتبو.

ئەوەبو ئێمە هێرشێکمان دەستپێکرد و سنوری شاناخسێ و باسنێ و ناوچەی گمۆمان لێگرتنەوە، برادەرانی ئێمە هێزەکانی پارتیان لەو ناوچانە وردوخاش کرد، برادەرانمان گەیشتنە چوارتا و شەرێکی گەرم لە نێوان قەڵاچوالان و چوارتادا کرا و ئەوان لە شەرەکەدا شکان و رایانکرد.

لە پێنجوینیشەوە دیسان ئێران یارمەتیان داین و چەک و تەقەمەنیان دابوینێ و هێزەکانمان لەوێشەوە هاتنە پێشەوە، فەرەیدون و شەوکەتی حاجی موشیر، هاتن پێنجوین و ناڵپارێزیان گرتەوە.

فەریدون عەبدولقادر، مەلا بەختیار، سالار عەزیز، مولازم عومەر، مستەفا چاورەش و مستەفای سەید قادر، هەمو برادەرەکانمان ئازایانە لە ریزی پێشەوە بون.[١٠]

# تێشکاندنی پارتی و هەڵهاتنیان بەرەو کەرکوک

*** پارتی بۆ وا زو لەو شەڕانەدا شکا و بەرەو کوێ هەڵهاتن؟**

- پارتی کە بینیان جوڵە بە هێزەکانمان کرا، چەندین هێرشیانکرد بۆسەر ئەو هێزەی کە کۆسرەت و برادەرانی تر سەرکردایەتیان دەکرد لە چوارتا، بەڵام هێرشەکەیان شکا و پێشمەرگەی ئێمە ڕاویاننان. پارتی بەرەو ئەزمر و سلێمانی هەڵات، هەستیان کرد ئێمە هەر بە دوایانەوەین، لە ترساندا شاخەکانیان چۆڵکرد، زۆریش ترسابون وایانزانی بو ئێرانیشمان لەگەڵدایە، لەبەرئەوە لە سلێمانیش خۆیان نەگرتەوە.

ئێمە نەخشەکەمان دانابو کە جەبار فەرمان لە دیوی لای سەرتەکی بەمۆوە بێتە دەربەندیخان و بیگرێت، فەرەیدون و شەوکەتی حاجی مشیریش پێنجوین بگرن و بێنە خوارێ، کۆسرەت و برادەرانی تری کە ناوم هێنان هاتبون چوارتا بگرن و بەرە و سلێمانی بڕۆن، هێزێکیشمان دانا بۆئەوەی ڕێگای دوکان بگرێت و بەوجۆرە چواردەوری پارتی بگرین.

هێزێکمان لە قەرەداغ لە سەرەتاوە نەکشابۆوە و لەوێ مابۆوە، من ڕەئیم وابو ئەو هێزە بێت بازیان بگرێت. ئەگەر ئەو پیلانە سەری بگرتایە، ئەوکاتە چواردەورمان دەگرتن، بەڵام ئەو هێزەی بازیان بە پێچەوانەی ئەو نەخشەیەی من دامنابو، جێبەجێ نەکرا (نامەوێ بڵێم کێ لە برادەران بەرپرس بو)، بۆیە بۆشاییەک پەیابو، پارتی لە سلێمانی شکا و هەڵهات، وا بە شپرزەیی هەڵاتن، ڕێگای دوکان گیرابو، بە ڕێی کەرکوک و بە چەمچەماڵدا ڕۆیشتن. لەچەمچەماڵیش خەڵک لە هەمو جێگایەک لێیان هەڵسابو، خۆت ئەزانی کە ئینسان شکا و توشی نوشستی بو، چی لێدێت.

خەڵکی خۆشمان لەو ناوچانە، ورەیان بەرزبوبۆوە و ڕاویاننان، تەنانەت ئەوەندە بە شپرزەیی لە سلێمانی ڕایانکردبو، فایلەکانی ڕێکخستنی سلێمانیان پێ کۆنەکرابۆوە و لە ماڵەکەی من بەجێیان هێشتبو. هەموی کەوتە بەردەستی خۆمان.[11]

هەر ئەوەش ڕاستە، ئەوان شکان و بەرەو کەرکوک هەڵهاتن، بەناو کەرکوکدا هەڵاتن، واتا هەمو هێزەکەیان بە سەرۆکایەتی مەسعود بارزانی بەرەو کەرکوک هەڵهات و لە کەرکوکەوە چونەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان.

ئەوان پروپاگندەی زۆریان بڵاوکردەوە، ئێمە دەهەزار پاسدارمان لەگەڵە، بۆ مێژو ئەیڵێم و لەسەرم تۆمار بکە، هیچ پاسداریک وەکو شەڕکەر لەگەڵمان نەبوە. چەند فەرماندەیەکی پاسدارمان لەگەڵ بون بۆ پیلان دانان و نەخشەکێشان و هێنانی کۆمەک و فیشەک لە دیوی ئێرانەوە، بەڵام شەڕکەر یەک پاسدارمان لەگەڵ نەبو.

لێرە دەمەوێ ئەوە بڵێم، وەکو جۆرە ڕێکەوتنێک لە نێوان عێراق و ئێران هەبوبێت، چونکە لێرە کە برادەرانی ئێمە هێزەکانیان کۆکردەوە، بەشێکیان بەرەو هەڵەبجە ڕۆشتن بۆئەوەی هەڵەبجە بگرنەوە، بەشێکی تریان بەرەو هەولێر و سەری ڕەش ڕۆشتن و دوکانیان گرت. هێزێکیش بە سەرۆکایەتی حەمەی حاجی مەحمود و مستەفای سەید قادر لە ناوزەنگەوە هاتبو، ڕانیە و کێوەڕەشیان ڕزگارکرد و بەرە و هیران ڕۆشتن. پیلانیان وابو لە هیرانەوە بەرە و شەقڵاوە بڕۆن، لەوکاتانەدا تەدەخولات دەستی پێکرد: یەکەم تەدەخل عێراق بو، عێراق لە کفری یەوە نامەیەکیان بۆ جەبار فەرمان نووسیبو، دەڵێت: "بۆ جەبار فەرمان، ئاگادارتان دەکەینەوە کەئەگەر ئێوە بچنە هەولێر ئێمە لێتان دەدەین، جارێکی تر تەدەخول دەکەینەوە". لەهەمانکات دا، ئەمەریکیەکان تەلەفۆنیان بۆ کردم و تکایانکرد و گوتیان: "ئەگەر بچنە هەولێر، ئەوا عێراق تەدەخول دەکاتەوە، ئەوکاتە ئێمە ناچاردەبین بێ دەنگ نەبین، ئێستا کاتی هەڵبژاردنە لە ئەمەریکا و کلینتۆنی دۆستان لە کاتی هەڵبژاردندایە، ئەوکارە ئیحراجی دەبێت بۆ ئەو".

لەهەمانکات دا ئێرانیەکانیش گوتیان: "لەو سنورە تێ مەپەڕن"، ئەگینا دەمانتوانی بە ئاسانی بچینەوە هەولێر و شەقڵاوەش بگرین.

هێزی پارتی بە تەواوی ڕوخابو، واتا ئەوەی بەسەر ئێمەدا هاتبو، خراپتر بەسەر ئەوان هاتبو، لە کاتی ئەو شکستەی پارتیدا، ئێمەیان ڕاگرت، ئێمە کۆبونەوەمان کرد و گوتمان: "ئەوە ناکرێ بە قسەی ئەو هەمو دنیایە نەکەین و بە تەنیا ئەو شتە بکەین کە خۆمان بە باشی دەزانین، ئەوەبو لەو سنورەدا ڕاوەستاین".

دوایی پارتی هێرشی کرەوە و شکانمانەوە و هێزەکانیان تا لای دوکان هاتن، ئەو جارەش لەوێش شکان و ئیتر لەوێ ڕۆشتنەوە و لەو سنورەی ئێستا جێگیر مانەوە.

# هۆی هەرەسهێنانی هێزی یەکێتی

**٭ ئایا خۆت پێشبینیت دەکرد کە یەکێتی بەو خێراییە رابکاتە سەرسنور و پارتی بەو خێراییە ناوچەکانی یەکێتی بەجێ بهێڵێت و بچێتەوە هەولێر؟**

– بە نیسبەت ئەوەی خۆمانەوە پێشبینیم نەدەکرد، بەو خێراییە بچینەوە سەرسنور، چونکە ئەگەر ئەو پیلانەی دامان نابو جێبەجێبکرایە و بە رێکوپێکی بکشاینایەوە، ئەوا پێویست نەدەبو بچینە سەرسنور، بەڵکو بە پێچەوانەوە سلێمانیشمان دەپاراست و لە سلێمانیەوە دەمانتوانی بۆ شوێنەکانی تر بچین.

بەڵام پێشبینیم دەکرد بەو خێراییە بگەڕێینەوە. من رۆبێرت پیلیترۆ بەشایەت دێنمەوە، لە وتارێکدا نوسیویێتی و دەڵێ: "لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا تەلەفۆنم کرد، – من لە ناوزەنگ بوم – وتم تکات لێدەکەم شەڕ مەکەن، بەڵکو بە ئاشتی چارەسەری بکەین و ئێمە دەکەوینە بەینتانەوە بۆ چارەسەری گیروگرفتەکان"، منیش پێم گوت: "گوێ بگرە جارێک بە قسەم کردیت و فێڵت لێکردین، جاری دوەم بە قسەت ناکەین، ئەوە ئێمە خۆمان ئامادەدەکەین و هێرشیش دەکەین و ناوچەکانی خۆشمان دەگرینەوە، ئەوکاتە ئێوە وەرن بکەونە بەینەوە".

هەروەها دەڵێت: "کارەکە وەک ئەوەی بە تەلەفۆن پێی گوتم، رویدا، ئەوان هاتن ناوچەکانی خۆیانیان گرتەوە و سودیان لە تەکتیکە کۆنەکانی خۆیان وەرگرت لە شەڕەکەدا".

هەمو برادەران گەشبین بون کە ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ ناوچەکانی خۆمان، یەکێک لە برادەران مەلا بەختیار بو، گوتی: "من پێموایە ئەوە کورتترین شکست و نوشوستی یەکێتی دەبێت لە مێژودا، خێراترین هەستانەوە دەبێت"، سالار و کۆسرەت و ملازم عومەر هاتن و گوتیان با ئێمە نەخشەیەک دانێین بۆ گرتنەوەی ناوچەکانمان، نەک بە شەڕی پارتیزانی، بەڵکو بەو نەخشەیەی دامانڕنابو.

# هەڵسەنگاندنی ٣١ی ئاب

*** یەکێتی لیژنەی دانا بۆ هەڵسەنگاندنی کارەساتی ٣١ ئاب، ئایا ئەنجامی ئەو هەڵسەنگاندنە چی بو؟، هیچ ئیجرائاتێک کرا بەرامبەر ئەو کەس و تاقمانەی کە کەموکوریان هەبو؟**

- نەخێر هیچ ئیجرائاتێک نەکرا.

*** ئیجرائات بۆ نەکرا بەرامبەر ئەوانەی، ڕاستەوخۆ بەرپرسبون بەرامبەر ئەو کارەساتە؟**

- لەبەر دو هۆ:

یەکەمینیان : کۆمەڵێک لە سەرکردەکانی دەگرتەوە، ئەوکاتە وەختی ئەوەمان نەبو ئەو هەمو سەرکردانە زویرکەین و دەریان پەڕێنین.

دوەم: پەیوەندی بە تەکەتولاتەوە هەبو، نەمان دەویست تەکەتولێک بەسەر تەکەتولێکدا زاڵ بێت.

# شەڕی گەردەلولی تۆڵە

*** لەسەرەتای تشرینی دوەمی ١٩٩٧دا یەکێتی هێرشێکی گەورەی کردە سەر پارتی بەناوی (گەردەلولی تۆڵە)وە، بۆچی یەکێتی سەرنەکەوت لەو هێرشەدا؟ بۆچی تورکیا هاوکاری پارتی کرد؟**

- جارێ یەکەم، ئەوە ڕاست نیە کە یەکێتی سەرنەکەوت، یەکێتی سەرکەوت، ئەو هێرشەی کە کردمان هەمو ئەو شوێنانەی کە دامانتابو بە یەک سەعات

گرتمان، بە کەپکی حەمەد ئاغاوە بە سەفینەوە، بە پەنای سەرکردایەتی مەسعود بارزانیەوە بو، هەمو ئەو شوێنانەی دامانابو لەو نەخشەیە بەیەک سەعات هەموویانمان گرت.

بۆچی تەوامان نەکرد، چونکە تورک تەداخلی کرد، ڕۆژی یەکەم دیڤید وێلش (دێڤید وێلش یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بو، بۆ خۆرهەڵاتی نزیک) تەلەفۆنی لەگەڵ کردم و گوتی: "شیریک بیڵ لەسەر خەتە پێم دەڵێت: جەلال با شەڕەکە ڕاوەستێنێت، چیتر نەچنە پێشەوە". ئێمە بەتەمای گرتنی سەری ڕەش بوین، سەفینمان گرتبو، تکایانکرد کە سەری ڕەش نەگرین، چونکە ئەوکاتە موشکیلەکە قوڵ دەبێتەوە، گوتی: "منیش بەڵێن دەدەم کێشەکە بەپێی ڕێکەوتنامە کۆنەکان چارەسەر بکەم".

حکومەتی عێراق هەواڵیان بۆ ناردین و گوتیان: "مەسعود بارزانی (دەخیل)ی سەرۆک بوە، سەری ڕەش هی ئێمەیە، سەرۆک تکات لێدەکات مەچنە سەری ڕەش و سەری ڕەش مەگرن، چونکە لەوکاتەدا سەرۆک ناچارە بەرگری لە سەری ڕەش بکات، ئێمە ئەمجارە نامانەوێت بەشداری شەڕ بین لە دژتان، چونکە ئێوە بەرامبەر بە تورکیا وەستاون، بۆیە تکاتان لێدەکەین نەچنە سەری ڕەش".

بەهۆی گوشاری تورکیا و تکای ئەمەریکا و داخوازی عێراقەوە، ئێمە هەڵوێستەیەکمان کرد، ئەو هەڵوێستەیە لەڕوی عەسکەریەوە هەڵە بو، بەڵام لە ڕوی سیاسیەوە دەبوایە بیکەین، چونکە ئەو هەمو هێزە هاتبوە کایەوە، ڕۆژی دوەم و سێهەم فڕۆکەی تورک هاتە شەڕەکەوە و لە خەلیفان فڕۆکەی تورک زیانێکی زۆری لێداین. لە ئاسمانەوە بە فڕۆکە چەندین ئوتومبێلی سوتاندین بۆئەوەی نەگەینە ئەوێ، هەمو ڕۆژێک فڕۆکەی تورک دەهاتە سەرمان، پاشان دەبابەی تورک و ئەوجا سوپای تورک هاتن. ئەگەر سوپای تورک نەهاتنایە، ئەوا بە تەواوی سەرکەوتنمان بەدەستدەهێنا و پارتی لەشەڕەکەدا بەرامبەرمان خۆی نەئەگرت.

# ڕۆڵی تورکیا لە شەڕی ناوخۆدا

*** واتا کشانەوەتان لە ئەنجامی بۆردومان و هێرشی تورک بو، یان هۆکاری تری هەبو؟**

- کشانەوە نەبو، هەنگاو بە هەنگاو پاڵیان پێوە ناین و بست بە بست شەڕمان کرد، لە یەک شوێن نەکشاینەوە، (دیڤید ویڵش) زۆر تکای لێکردم و گوتی: "تەنها گردێک یان شاخێکم بۆ چۆڵکە، بۆئەوەی بیکەم بە بیانو بۆ گفتوگۆ لەگەڵ تورکیادا"، ئێمە گوتمان: "نەخێر ناکشێینەوە، شاخ بە شاخ و سەنگەر بەسەنگەر شەڕمان کردوە"، بەڵام بەرامبەر بە دەبابەی تورک کە هاتبوە سەر شاخ، بۆ نمونە، دەبابەی تورکی کەپکی حەمەدئاغای لە ئێمە گرتەوە، دەبابەی تورک هیرانی لە ئێمەی گرتەوە، لەولاوە لەلای هەولێرەوە دەبابەی تورک هاتە دۆڵی سماقولی، دەبابە بۆ هەمو جێگایەک دەهات، دەبابەی تورک رەواندزی لە ئێمە گرتەوە.

کۆماندۆ و تۆپ و کاتیۆشا و فڕۆکەی تورک بەردەوام لەسەرسەرمان بون، چاکترین فڕۆکەی پەیمانی ناتۆ (F 15) و (F 16)ە لە بەیانیەوە تا ئێوارە بۆردومانی دەکردین.

## پەراوێزەکان:

١- لەم سەفەرەدا، لە ٢٢ نیسانی ١٩٩٤ جگە لە مام جەلال و نەوشیروان مستەفا، شازاد سائیب و سەلاح رەشید بەشداربون، مام جەلال و نەوشیروان مستەفا، لە ٢ حزیران ١٩٩٤ بە هەلیکۆپتەر لە تورکیاوە هاتنەوە هەولێر.

٢- رۆبیرت دۆیچ، بەڕێوەبەری بەشی باکوری کەنداو بو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و ناوبژیکەری ئەمریکایی بو، بۆ چارەسەری کێشەی ناوخۆی کورد.

٣- گفتوگۆی پاریس لە ١٩٩٤/٧/١٦ دەستپێکرد، نوێنەرانی یەکێتی بریتی بون لە: نەوشیروان مستەفا، د.فواد مەعسوم، قادر حاجی عەلی، د.بەرهەم سالح، د.محەمەد سابیر.. وەفدی پارتی دیموکراتی کوردستانیش پێکهاتبو لە: سامی عەبدولرەحمان، د.رۆژ نوری شاویس، هوشیار زێباری، موحسین دزەیی، پیرۆت ئیبراهیم و جەعفەر گلی. گفتوگۆ تا ٢٢ هەمان مانگ درێژەی خایاند.

٤- (کۆبونەوەی دبلن لە ئیرلەندا بە دو خول گیرا، خولی یەکەم لە نێوان ٩-١١ ئەیلول و خولی دووەم لە نێوان ١٢-١٥ ئەیلولی ١٩٩٥ بو، لە نێوان یەکێتی نیشتیمانی و پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرپەرشتی ئەمریکا و چاودێری تورکیا و بەریتانیا کرا، نوێنەران و بەرنامەی هەردو خولەکە وەك یەك وابون. نوێنەرانی یەکێتی بریتی بون لە: د.فواد مەعسوم، بەرهەم سالح، سەعدی ئەحمەد پیرە و نەوشیروان مستەفا، وەفدی پارتیش بریتی بون لە: سامی عبدولرەحمان، جەوهەر نامیق، هوشیار زێباری و موحسین دزەیی، وەفدی ئەمریکی، بریتی بون لە: رۆبیرت دۆیچ، ستیڤن گرۆمۆن، بروس جۆنسۆن، سۆزان ماك کرۆمیك. وەفدی تورکی: ئیگۆر دۆغان، محەمەد ئەیمور و ئەجوەد تەزجان، وەفدی مونتەمەر بۆ چاودێری، د.ئەحمەد چەلەبی، هانی فکیکی، تۆفیق یاسری، ئەبیل موسەوی. بابەتەکانی کۆبونەوەکە بریتی بو لە: چەکداماڵینی هەولێر، گێڕانەوەی داهاتەکانی گومرگ بۆ حکومەت، و بەگەڕخستنی پەرلەمان و پێکهێنانی کابینەیەکی نوێ) (خەون یا مۆتەکە — نەوشیروان مستەفا. ل. ١٦١).

٥- لەنێوان ١٢-١٥ ئەیلولی ١٩٩٥ کۆبونەوەیەکی تری ئاشتی لە نێوان پارتی و یەکێتیدا لە دبلن (ئیرلەندا) گیرا، وەك درێژکەرەوەی کۆبونەوەکانی شاری دروگیدا کە لە نێوان ٩-١١ ئاب ١٩٩٥ دا بەسترابو. ئەم کۆبونەوانەش ئەنجامیان نەبو، لە هەمو کۆبونەوەکاندا نوێنەرانی ئەمریکا و تورکیا بەشداربون.

٦- فەرەنسۆ حەریری وتارێکی نوسی لە گۆڤاری گوڵانی ژمارە ٢٤ی ١٩٩٤/٩/٢٩ دا لە ژێر ناوی "ئایەڵین پیرۆزی و گەورەیی کاك مەسعود بشکێت" کە تێداهاتبو کە "مەسعود بارزانی بەرزتر و گەورەترە

لەوەی پۆستی سەرۆکی پەرلەمان یان حکومەت وەربگرێت".

هۆمەر دزەیی بە ناوە راستیەکەی خۆی (عومەر حەمە ئەمین)، لە ١٩٩٤/١٢/١٢ وەڵامی وتارەکەی فەرنسۆی دایەوە لەژێر ناوی "ماسی گرتن و قون تەرنەبون ناکرێت" گۆڤاری گوڵان بۆیان بڵاونەکردەوە، باس لەوە دەکات کە سەرکردەکانی کورد پێویستە لە خزمەتی مەسەلەی رەوای میلەتدا بن، نابێت سەیری ئەو پۆستانە بە بچوك بکرێت و سەرکردەکان بە گەورە و پیرۆز! دوای مانگی ناردی بۆ رۆژنامەی کوردستانی نوێ و لەوێ بۆیانبڵاوکردەوە.

٧- هانی فکیکی، لە ساڵی ١٩٣٦ لە بەغدا لەدایك بوە و لە ١٩٥٤، چۆتە ریزەکانی حیزبی بەعس و بەشداربوە لە کودەتای ١٩٦٣دا، دوای ساڵێك لە حیزبی بەعس دەرکراوە و لە ١٩٧٩ چۆتە لەندەن و تا کۆچی دوایی لە ١٩٩٧ لەوێ ژیاوە و لە دیمەشق نێژراوە.

٨- دەربارەی پەیوەندی پارتی و حکومەتی عێراق، تاریق عەزیز، لە کتێبەکەیدا دا نوسیویەتی: "لەکانونی دوهەمی ١٩٩٢دا، مەسعود بارزانی سەردانێکی نهێنیی کردین و سەرۆکیشی بینی و گوتی ئێمە رێکەوتنمان قبوڵکرد، بەڵام جەلال تاڵەبانی بە هاندانی ئەمەریکا رەتیکردەوە.." هەروەها نوسیویەتی.. "مەسعود داوای لێکردین و گوتی: هەولێر کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئێرانیەوە، ئێرانیەکان و جەلال دەیانەوێت لەناوم بەرن، داوای هاوکاریتان لێدەکەم. ئێمەش ئێمەش چوینە ناو هەولێرو تاڵەبانی چوە دەرەوە لێی و لەنابی ١٩٩٦ تەسلیمی پارتی دیموکراتی کوردستانمان کردو هێزەکانی عێراقی کشانەوە بۆ شوێنی خۆیان.(طاریق عەزیز، الرجل والقضیة، ل. ١٦١).

هەروەها مەسعود بارزانی بە ئاشکرا باس لەو پەیوەندیە دەکات لەگەڵ سەدامدا، ئەویش لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەی (شرق الاوسط)ی لەندنی ژمارە ٦٥١٢ی ١٩٩٦/٩/٢٦.

مەسعود بارزانی خۆی لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەی خەباتی ژمارە ٧٩٨ ی ١٩٩٦/١٠/٧ دا دەڵێی(کاتێ هەستم بە مەترسی دەرەوە کرد، لە ١٩٩٦/٨/٢٢ دا نامەیەکم بۆ سەرۆك سەدام حسین نوسی و ئەویش وڵامێکی ئیجابی دامەوە). (التیارات السیاسیة.ل. ٥٥٥).

٩- (جون دویچ، سەرۆکی دەزگای هەواڵگری ئەمریکی CIA لە ١٩٩٦/٩/١٩دا بەرامبەر بە لیژنەی هەواڵگری ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکی گوتی: (سەدام حسین، رۆژی پێش ٣١ ئابی ١٩٩٦، باش خۆی بۆ هێرشەکە ئامادەکردبو، ٣٠٠ تۆپ و زیاتر لە ٣٥٠ دەبابە و لە نێوان ٣٠ تا ٤٠ هەزار سەرباز، کە زوربەیان لە لەشکری حەرەسی کۆماری بون، هێرشێکی سەرکەوتویان کردە سەر هەولێر) (أمە فی شقاق .ل. ٣٩٨).

١٠- مولازم عومەر، ئەندامی کارگێری ئەو کاتەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، باس لە گەرانەوەی یەکێتی بۆ سلێمانی بەم شێوەیە دەکات: "ئێمە هەموی نزیکی مانگێ لە سلێمانی و ناوچەکانی خۆمان دابراین و دورکەوتینەوە" یەکێتی سلێمانی لە ٩ ئەیلول بەجێ هێشت و لە ١٣ تشرینی یەکەم گەرایەوە" لە کۆبونەوەیەکدا لە خێمەکەی مام جەلال، بریارماندا کە وەك جاران بارەگا لە قەزاکان دابنێین، وەك قەڵادزێ، رانیە و ماوەت و لەوێوە پێشمەرگە چالاکی بکات و بچنە ناوچەکانی تر، وەك جاران کە هەمان بو. ئێمە کۆتایمان بە کۆبونەوەکە هێناو ویستمان هەریەکە بگەرێتەوە خێمەی خۆی. کاك کۆسرەت پێشنیازی کرد گوتی: "بۆ نایەن لای من نانی نیوەرۆ بخۆن"، ئێمە پێمان باشبو. لە کاتی نان خواردندا کاك سالار عەزیز

گوتی: "باشە ئێمە کە دەمانەوێت هێز کۆبکەینەوە و پەلاماری قەزاکانی سەرسنور بدەین، بۆ پەلاماری سلێمانی نەدەین"؟ ئێمەش هەمو پێمان باشبو، گوتمان کە نانەکەمان خوارد دەچینەوە لای مام جەلال و ئەم پێشنیازەی لەگەڵدا باس دەکەین. ئیتر ئێمە دوای نانخواردن چوینەوە بۆلای مام جەلال، پێشمەرگەکانی گوتیان ئێستا کەمێ ئیسراحەت دەکات، ئێمەش چاوەڕێمان کرد تا هەڵسا و پێشنیازەکەی کاک سالارمان بۆ باسکرد، مام جەلال پێکەنی و گوتی: "بەخوا خەونێکی خۆشە و با هەمو قۆڵی لێهەڵماڵین". ئیتر دەستمان کرد بە خۆئامادەکردن و داواش لە ئێرانیەکان کرا کە نیسنادی مەدفەعیمان بکەن و بەوشێوەیە دەستمان پێکرد و لە ماوەی چەند رۆژێکدا گەیشتینەوە سلێمانی. دوای دەستپێکردنی هێرش بە دو شەو گەیشتینە سلێمانی، شەوی یەکەم لە ناوەکورتێ حەواینەوە و شەوی دوهەم لە قەڵاچوالان بوین و هەر ئەو شەوە پارتی بێ شەڕ سلێمانی بەجێ هێشتبو. (چاوپێکەوتن لەگەڵ مولازم عومەر- ٢٠١٦/٢/١٦ سلێمانی).

١١- لەو بارەیەوە تاریق عەزیز لە کتێبەکەی نوسیویەتی:-

"عندما تأكد جلال إن الجيش العراقي غير موجود في السليمانية فقال لماذا لا أخذها أنا وعاد وأحتل سليمانية بدون قتال. عندما عاد من الحدود، مجموعة مسعود هربت. وحاول أيضا أستعاده أربيل ولكن نحن تدخلنا و منعناه، لم يكن تدخلنا مباشراً ولكن أرسلنا بإشارات أنه إذا دخل أربيل فسوف نضربه وفهم جلال ذلك". (طارق عزيز ..رجل و قضية، ل. لاپەرە ١٦٢).

# ڕێککەوتننامەی واشنتۆن

*** دوای شەڕی گەردەلولی تۆڵە لە ۱۹۹۷دا، گفتوگۆکانی ناوخۆی ئاشتی دەستپێیکردەوە، دوای دەیان کۆبونەوە لە ناوخۆ، کەڵکی نەبو، ئەمریکا خۆی ڕێککەوتنی ئامادەکرد، دێینە سەر مەسەلەی ڕێککەوتنامەی واشنتن لە ۱۷ ئەیلولی ۱۹۹۸، چۆن ئەو ڕێککەوتنە هاتەکایەوە و چۆن هەڵیدەسەنگێنن؟**

- ئەو ڕێککەوتنە، بە دەستپێشخەریی ئەمەریکیەکان هاتەکایەوە، ئەمەریکیەکان پێشتریش لە نێوان یەکێتی و پارتیدا زۆر هەوڵیاندابو، چەندینجار وەفدیان هاتە کوردستان بەتایبەتی (ڕۆبەرت دۆیچ) زۆر هەوڵیدا و گەلێک ماندوبو لە بەینماندا. ئێمە هەمو ئەو پێشنیارانەمان قبوڵکرد کە ئەمەریکا دابویان، بەڵام پارتی قبوڵی نەکرد. دوای ئەوەی ڕێکەوتنامەی ئەنقەرەش لە ۱۹۹٦/۱۰/۳۱ لە نێوان وەفدی پارتی و یەکێتیدا ئیمزاکرا، دیسان پارتی پەشیمان بۆوە.[1]

ئەو ڕێککەوتنامەیەی ئەنقەرە، لە شانزە، حەڤدە فەقەرە پێکهاتبو، ئێمە قبوڵمان کردبو لەوێ سەرۆکی وەفدی پارتیش سامی عەبدولرحمان قبوڵی کردبو، بەڵام مەکتەبی سیاسی پارتی لە کوردستان قبوڵی نەکرد. ئیتر ئەمەریکیەکان کەوتنە خۆیان کە دەبێ شتێک بکەن بۆئەوەی پەیوەندی نێوانمان چاکببێتەوە، بە پێویستیانزانی بۆئەوەی ئەو ئەزمونەی کوردستان نەفەوتێ و عێراق لەو نێوانەدا سودمەند نەبێت. بە تایبەتی کە پارتی دوای داگیرکردنی هەولێر، عێراقی هێنابوە ناو کێشەکەوە و ئەیویست دەورێک ببینێ.

ئەمەریکا دەیویست ئەو دەورە لە عێراق بسێنێتەوە بۆ ناوبژیکردنی ئێمە و پارتی، لەبەرئەوە هەردولامانی بانگکرد بۆ واشنتن بۆ گفتوگۆ.

من لەبیرمە، یەکەم دانیشتن کە مەسعود بارزانی و من پێکەوە بوین، ئەو لە ژورێک دانیشتبو، لەگەڵ من چومە ژورەوە زۆر بەگەرمی چاک و چۆنیمانکرد و پێکەوە دانیشتین، ئەوان سەریان سوڕما و چاوەڕێیان نەدەکرد، ئێمە بتوانین ئەو جەوە گەرمە دروستبکەینەوە.

لەپاش گفتوگۆیەکی زۆر لە نێوان ئێمە و پارتیدا، گەشتینە قبوڵکردنی ئەو پرۆژەیەی ئەمریکیەکان ئامادەیان کردبو. یەکەمجار ئەمریکیەکان پرۆژەیەکی تریان هێنابو، ئەو پرۆژەیە زۆرتر داخوازیەکانی ئێمەشی تێیدا دیاربو، بە تایبەتی مەسەلەی دەرامەت و پارمەتی و گەڕانەوە بۆ هەولێر.

هەندێک لە برادەرانی پارتی، پێیان وابو ئەو پرۆژە ئەمریکیە لە نوسینی دکتۆر بەرهەم بوە، بۆیە ئەوان قبوڵیان نەکرد. جارێکی کە پرۆژەیەکی تر هاتەوە، ئاخر پرۆژە ئەوە بو بەو سیغەیەی ئێستا دەرچو و هەردولامان قبوڵمان کردوە و ئیمزامان کرد. کە رێکەوتنامەکەمان ئیمزا کرد، بردیان بۆ (مەدام ئۆڵبرایت)،[٢] ئەویش لە دوی ناردین، هەردوکمان مەسعود بارزانی و من لەگەڵ بەرهەم و هۆشیار زێباری چوینە ژورەوە. لەوێ (مەدام ئۆڵبرایت) پیرۆزبایی لێکردین و گوتی: "ئەم رێکەوتنامەیە شتێکی زۆر باشە، من بەڵێنتان دەدەمێ کە ئەگەر ئێوە ئەو رێکەوتنامەیە جێبەجێ بکەن، ئەوا ئێمە پشتیوانی و بەرگریتان لێدەکەین و یارمەتیتان ئەدەین بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەتان. من خۆم ئامادەم لەبەرچاوی ئاژانسەکان، ئەم رێکەوتنامەیە ئیعلان بکەم و پشتیوانی ئەمەریکای بخەمە پاڵ، بەڵام چەند مەرجێکم هەیە، ئێوەش بەڵێنم بدەنێ ئەو مەرجانە قبوڵ بکەن:

یەکەم : ئێوە هەردولاتان بەڵێن بدەن، بارودۆخەکە ئاسایی بکەنەوە، شارەکانی هەولێر و دهۆک و سلێمانی ببێتەوە بە شاری هەموان .

دووەم: ببنەوە بەشەریک لەو دەرامەتەی کە هەیە و بەش بکرێت لە نێوانتاندا.

سێیەم: ئێوە هەردولاتان هەڵبژاردن قبوڵ بکەن .

چوارەم: حکومەتەکە یەک بخەن، ئیدارە یەک بخەن .

ئەگەر ئەم چوار مەرجەتان قبوڵکرد، ئەوا من دێم لەگەڵتان رێکەوتنامەکە ئیعلان دەکەم".

پێش من مەسعود بارزانی وەڵامی دایەوە و گوتی: "هەمویمان قبوڵە بەزیادیشەوە"، منیش گوتم: "دەنگی خۆم دەخەمە پاڵ دەنگی کاک مەسعود و مەرجەکانتان قبوڵ دەکەین".

ئینجا هاتینە دەرێ، ئەوەبو بە ئامادەبونی مەدام ئۆڵبرایت رێکەوتنامەکە ئاشکرا کرا.

# کەموکورپیی ڕێککەوتننامەی واشنتۆن

*** بە هەڵسەنگاندنی تۆ، کەموکورییەکانی ئەو ڕێکەوتنامەیەی چی بو؟**

– من پێموایە ئێمە هەندێک کەلەبەرمان تێیدا هێشتبۆوە کە نە دەبوایە تێیدابێت، لەوانە:

هەندێ خاڵ هەروا مابۆوە، بۆ نمونە، مادەی یەکەم لە ڕێکەوتنامەکەدا دەڵێ: "دەبێ پارتی لە بەرامبەردا لە برایم خەلیل بەشی یەکێتی بدات"، دەبوایە بەشی یەکێتی چەندە دیاری بکرێت، چونکە کە هاتە سەر ئەوە بە بیانوی ئەوەی کە چەند و چۆنە، خۆیان لێ کێشایەوە، یەکەمجار گوتیان ٣٠ ملیۆنە و دوای گوتیان ١٠ ملیۆنە! ئەگەر ئێمە لە ڕێکەوتنامەکەدا بماننوسیایە، ئەوا پارتی ناچاردەبو جێبەجێ بکات، ئەگەر بهاتبایە و ئێمە ئەوەمان دیاری بکردبایە، ئەوا توشی ئەو هەمو گیروگرفتە نەدەبوین. یان باس لە (پەرلەمانی ئینتیقالی) کراوە، ئەگەر شەرحی ئەوەمان بکردبایە، کە ئایا ئەو پەرلەمانە نوێکردنەوەی کۆنەکەیە، یان شتێکی تازەیە، ئەوا توشی ئەو بۆچونە جیاوازانە نەئەبوین.

بۆ پاراستنی ئاسایش لە هەولێر، هەیئەتێک پێکبێت لە پارتی و یەکێتی و تورکمان و ئاشوری، ئەگەر بە ورد تر ماوەی ئاساییکردنەوەمان دەستنیشان بکردایە، ئەوا زوتر پرۆسەی ئاسایکرنەوە دەچوە پێشەوە.

بێگومان هەندێ وردە کەلەبەری هەبون، دەبوایە ئەو کەلەبەرانە پێش ئەوەی ئیمزای بکەین، پڕی بکەینەوە و دەبوایە بەڕونی و بە ئاشکرایی هیچ شتێکی نادیار نەهێڵینەوە، بۆئەوەی هیچ لایەک بۆچونی تایبەتی خۆی تێکەڵاوی ڕێکەوتنامەکە نەکات و بەپێی بەرژەوەندی خۆی لێکی نەداتەوە و هیچ لایەک، بەهانە و بیانوی بەدەستەوە نەبێت بۆ جێبەجێ نەکردنی.

*** ڕێکەوتنامەی واشنتون، چ گرنگیەکی سیاسی هەبو بۆ مەسەلەی کورد؟**

– سەرەڕای کەموکوریی ئەو ڕێکەوتنامەیە، پێموابو ئەوە هەنگاوێکی گەورەبو.

ئەگەر بە چاویلکەی نەتەوایەتی و دوربینی تەماشای بکەین، یەکەمجارە چارەسەری کێشەی ناوخۆی کورد لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا و لەلایەن وەزیرەی کاروباری دەرەوەی ئەمەریکاوە رادەگەینرێت. یەکەمجارە لەو ئاستە بەرزەدا، وەزیرەی دەرەوەی ئەمەریکی بێت و پیرۆزبایی لە یەکخستنی ریزی کوردایەتی بکات و پیرۆزبایی لە یەکخستنەوەی، دو هێزی کوردی بکات و بەڵێن بدات پشتیوانی لە رێکەوتنامەکە دەکات.

ئەو رێکەوتننامەیە خاڵی گرنگی تێدا دیاریکراوە، وەک فیدراڵی و دیموکراسی بۆ عێراق و رێگەنەدان بەدەستێوەردانی بێگانە.

رێکەوتنی واشنتۆن، خۆی لە خۆیدا سەرکەوتنێکی گەورە بو بۆ کێشەی کورد، ئێستا تۆ تەماشاکە، هەتا ئەمەریکا بۆ چارەسەرکردنی هەندێ کێشەی ولاتان، نوێنەرێک دەنێرن، ئێمە لە ئاستی وەزیرەی دەرەوەی ئەمەریکادا ناوبژیمان بۆکرا.

بەرای من، سەرەرای ئەو کەموکورتیانەی گوتم، ئەو رێکەوتنە بەرزکردنەوەی کێشەی کورد بو بۆ ئاستی نێودەوڵەتی و سەلماندنی گرنگیی خەباتی کورد و کێشەی کورد و نیشاندانی گرنگیدانی زیادی ئەمەریکا بو، بە یەکێتی ریزەکانی کوردایەتی و بە دوارۆژی کوردستان و بە خەڵکی کوردستان.

بۆیە پێموایە ئەو رێککەوتنامەیە، گرنگیەکی نێودەوڵەتی هەبو. ئەگەر بە چاویلکەی خۆمانیش تەماشای کەین، کۆمەڵێک هەنگاوی ئیجابی بەدواداهات:

بەیەکجاری شەری ناوخۆ برایەوە، چی تر شەر و پێکادان و کوشت و کوشتار رووینەدا و پاشان بۆماوەیەک شەرە جنێو و موهاتەرات کۆتاییهات، لە پاشان وردە وردە دەستکرا بەگەرانەوەی ئاوارەکان، ئینجا دەستکرا بە کشانەوەی هێزی پێشمەرگە لە بەرامبەر یەک. ئنجا دەستکرا بە ئاسایی بونەوەی نێوانی هەردو سەرکردایەتی.

مەسعود بارزانی، هەمیشە باسی لەوە دەکرد، پێویستە باوەر لە نێواندا بگەرێتەوە، ئەوەبو خۆی دوایی گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە بەڵێ "من بروام هەیە بەوەی مام جەلال بە راستێتی و دەیەوێت لەگەڵمان پێکبێت، هەتا هەمو ئەو شەرانەی کە کراوە نە من و نە مام جەلال پێمان خۆش نەبوە و نەمانویستوە و بەسەرماندا سەپاوە"، ئەوەش خۆی لە خۆییدا دەستکەوتێکە.

دوایی توانیمان بگەینە کۆمەڵێک رێکەوتن، وەکو بوژانەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان و کۆمەڵێک کاری تر کە لە دواییدا کرا.

# دوارۆژی ململانێی نێوان یەکێتی و پارتی

*** لەم قۆناغەدا، زیاتر لە دوساڵ بەسەر ڕێککەوتنامەی واشنتۆن تێپەڕیوە، بەرای ئێوە، ئایا ململانێی یەکێتی و پارتی بەرەو کوێ دەچێت، لە ململانێی سەربازییەوە ناگۆڕێت بۆ ململانێی مەدەنی؟**

– ئێمە لای خۆمانەوە وەکو یەکێتی نیشتمانی کوردستان بڕیارمانداوە ململانێی ئێمە و پارتی ململانێی نمونەیی بێت، لە جیاتی شەڕ و هێرش کردنە سەر یەکتر و جنێودان و موهاتەرات، بە نمونە، ململانێ بکەین. مەسەلەن حیزبەکەمان بکەینە نمونە، سیاسەتەکانی نیشتمانی، نەتەوایەتی، ناوچەیی بکەینە نمونە، حکومەتەکەمان بکەینە حکومەتی نمونە، هێزی پێشمەرگەمان بکەینە هێزی پێشمەرگەی نمونە، ڕێکخراوە دیموکراتیەکانمان بکەینە نمونەیی، ڕەفتارمان، خزمەتکردنی کۆمەڵانی خەڵکمان بکەینە نمونەیی. بەنمونە ململانێ بکەین لەگەڵ پارتی، کێ نمونەی باشتر، سیاسەتی باشتر، خزمەتی باشتری نیشاندا و دیموکراسی باشتر و زۆرتر سەریەستیە دیموکراتیەکانی هێنایەکایەوە، ئەو سەرکەوتن بە دەست دەهێنێت و یاری خۆی دەباتەوە لە مەیدان دا.

*** زۆرجار باس دەکرێت کە یەکێتی زۆر نەرمیی بەرامبەر بە پارتی ئەنوێنێت و مام جەلال زۆرجار تەنازول دەکات بۆ بنەماڵەی بارزانی، ئایا ئەو نەرمیەی باس دەکرێت، سودی هەیە بۆ ئاشتی؟ ئایا پارتی و بنەماڵەی بارزانی ئەو نەرمیە بە لاوازی تێناگەن؟**

– من پێموایە ئەو نەرمیە هەیە، ئەوە ڕاستە و من ئینکاری ناکەم، من پێموایە ئەم نەرمیە بۆ دەسکەوتی نەتەوەی کوردە و بۆ جێبەجێکردنی خاڵە گرنگەکانە، بۆ بەدیهێنانی ئاشتیە کە ئامانجی گەلی کوردە، بۆ پێکهاتنەوەی تەواوی نێوانمانە. ئەم برادەرانە هەندێکجار هەندێ هەڵوێستیان دەوێت کە ئێمە بۆئەوەی دڵنەواییان بدەینەوە بۆئەوەی متمانەیان وەرگرینەوە بۆئەوەی بیانخەینە سەرکار، ئاوا بۆیان دەکەین.

بەش بەحاڵی خۆم لە مێژەوە پەیوەندیەکی دور و درێژم هەبوە لەگەڵ بنەماڵەی بارزانی، هەر لە زەمانی مەلا مستەفا و پاشان نێوانێکی خۆشم هەبوە لەگەڵ شێخ ئەحمەدی خودانی بارزان و ئینجا لەگەڵ گەلێک کەس لە رۆڵەکانی بارزان، بۆ نمونە، لەگەڵ شێخ سادقی شێخ ، نێوانمان زۆر باشبو، لەگەڵ عوبەیدوڵڵا بە هەمان شێوە.

هەروەها لەگەڵ کۆمەڵێک لە پێشمەرگەکانی دەورو بەری مەلا مستەفاش هەر نێوانمان باشبوە. من پێم شتێکی خراپ نیە ئەو پەیوەندییە باشە لەگەڵ بنەماڵەی بەرزانی کە خۆت دەزانی بنەماڵەی بەرزانی، رێبەر و سەرۆک و بەرێوەبەری پارتی دیموکراتی کوردستانن و ئەوان سەرکردەی راستەقینەن بۆ پارتی، بۆیە باشکردنی نێوان لەگەڵیاندا، مەرجێکە بۆ باشکردنی پەیوەندی نێوان پارتی و یەکێتی.

پێموایە مام جەلال، ئەوە دەکات لەبەر شتێکی تایبەتی خۆی نییە، لەبەر دەسکەوتی گشتی کوردستانە، لەبەر بەدیهێنانی ئاواتەکانی گەلی کوردستانە. من پێموایە هەمو کوردیش ئێستا لەوە گەیشتوە و بە خاڵی لاوازیشی نازانم، برادەرانی پارتی وەختی خۆی چۆنیان لێکداوەتەوە ئەوە شتێکە، بەڵام برادەرانی پارتی هیچ نەبێ ئێستا بۆیان دەرکەوتوە کە یەکێتی لە خاڵی هێزەوە ئەو هەنگاوانە ئەنێت .

ئێمە وەزعی پێشمەرگەمان لە هی ئەوان خراپتر نیە، حکومەتەکەمان لە هی ئەوان خراپتر نیە، پەیوەندی یەکێتی لەگەڵ جەماوەر زۆر باشە، پەیوەندی نێودەوڵەتیمان زۆر باشە، پەیوەندیمان لەگەڵ ئەمەریکا، تورکیا و ئێران و وڵاتانی عەرەب زۆر باشەو لە گەشەکردندایە.

پەیوەندیمان لەگەڵ سۆسیال دیموکرات کە بوین بە ئەندامی پاڵێوراو گەشەی کردوە، لەبەرئەوە مەسعود بارزانی و برادەران تێگەیشتون ئەو هەڵوێستەی ئێمە لە لاوازیەوە نیە، بەڵکو بەپەرۆشەوەین بۆ چارەسەری گونجاو بۆ کێشەی کورد.

*** ئایا لەو بروایەدان دوای ئەو هەمو شەڕ و کوشتنەی یەکتر، بتوانرێ حکومەتێکی هاوبەش لە نێوان یەکێتی و پارتی دروست ببێت؟**

- دەربارەی دروستکردنی ئیدارەی هاوبەش، پێموایە لەلای پارتیەوە هێشتا نەگەیشتوە و پێنگەییوە و وەختی نەهاتوە. خۆت دەزانی ئێمە کە نێچیروانیان تەکلیف کرد بە دروستکردنی حکومەت لە هەولێر، من لە وتارێکدا گوتم "ئێمە ئامادەین لە حکومەتی نێچیرواندا بەشداربین و ئەو بە سەرۆکی ئەنجومەنی

وەزیران قبوڵ بکەین"، بەڵام ئەوان نەیانکرد، من پێموایە هێشتا برادەرانی پارتی نەهاتونەتە سەر ئەو باوەڕەی حکومەت یەک بخەین. هەرچەندە خۆشیان بێزاریەکیان هەیە لەو دابەشبونە، بەڵام هێشتا نەهاتونەتە سەر ئەو باوەڕەی دەبێت حکومەت و ئیدارەکان یەکخەین.

## جیاوازی نێوان یەکێتی و پارتی

*** ئەگەر باسی جیاوازی نێوان یەکێتی و پارتی بکەیت، چۆنی دەنوسیتەوە؟**

– یەکەم جیاوازی، پارتی حیزبی بنەماڵەیە، پارتی حیزبی بنەماڵەی بارزانییە، سەرکردایەتی و لێپرسراوێتی تێیدا بە پشتاوپشتە (وراسەیە)، لە کوڕەوە بۆ باوک و بەوجۆرە. ئەوەی بڕیاردەری سەرەکیە، لە ئەندامانی بنەماڵەی بارزانییە.

یەکێتی حیزبێکە لە کۆمەڵانی خەڵکەوە هاتوە و حیزبێکی مۆدێرنە.

دوەم: سروشتی پێکهاتەی پارتی لەگەڵ پێکهاتەی یەکێتی جیاوازە.

سێیەم: پارتی بەخۆی دەڵێت حیزبێکی دیموکرات و نیشتیمانی، یەکێتی بەخۆی دەڵێت سۆسیالیست و دیموکرات.

چوارەم: ئینجا دێتە سەر خەڵکەکانی، کادیرەکانی، ئەندام و دۆستەکانیان کە هەریەکەیان شێوەیەکی تایبەتی هەیە و نامەوێ زۆرتری لەسەر بڕۆم.

## پەراویزەکان:

١- (لە ١٩٩٦/١١/٤ سەرۆك كۆماری ئەمریکا لە راپۆرتێکدا بۆ كۆنگرێس رایدەگەیەنێت کە: ..جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ کاروباری رۆژهەلاتی نزیك، بەرێز رۆبێرت پیلیتر لە ١٨ی ئەیلول و ٢١ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٦ لە تورکیا لەگەڵ مەسعود بارزانی، رێبەری پارتی دیموکراتی کوردستان و لە ٢٢ی تشرینی یەکەم لەگەڵ جەلال تالەبانی رێبەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان دیداری کردوە و پاش ئەوەش لە ٣٠ و ٣١ی تشرینی یەکەم لەگەڵ نوێنەرانی PDK و PUK لە ئەنکەرە کۆبونەوەی کردوە. لەم کۆبونەوەیەدا و کۆبونەوە بەرزەکانی تردا، حکومەتی ئەمریکا بەردەوام هۆشداری بەم دو گروپە داوە کە بەردەوام بونی جەنگ لە باکوری عێراق تەنها بە قازانجی سەدام حوسێن تەواو دەبێت) ( مێژووی پەیوەندیەکانی کورد و ئەمریکا – ئامادەکردنی وریا رەحمانی، چاپی یەکەم ٢٠١٢ .ل. ٥٠٥).

٢- مادلین ئۆلبراید، لە ٢٣ کانونی دوهەمی ١٩٩٧ تا ١٩ کانونی دوهەمی ٢٠٠١ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بو لە سەرۆکایەتی بیل کلینتۆن.



له راسته‌وه؛ د.فواد مه‌عسوم. مام جه‌لال, کۆلۆنێلی ئه‌مریکی ریشارد ناب و مه‌سعود بارزانی, سه‌ره‌تای راپه‌ڕین



سه‌ره‌تای ڕاپه‌ڕین



باس و خواسی هاوبەش ١٩٩٢



**کاتی راگەیاندنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی ١٩٩٢**



دروگیدا- ئیرلەندا ۱۹۹٥/۸/۱۱ - لە راستەوە؛ د.بەرهەم ساڵح، سەعدی ئەحمەد پیرە،
سامی عەبدولرەحمان، د.فواد مەعسوم، جەوهەر نامیق، نەوشیروان مستەفا، هوشیار زێباری، موحسین دزەیی



لەگەڵ مەسعود بارزانی و مادام ئۆلبراید لە کاتی مۆرکردنی رێککەوتنامەی واشنتۆن ۱۹۹۸/۹/۱۷



ڕێکەوتنامەی واشنتۆن- ١٩٩٨/٩/١٧



کاتی مۆرکردنی ڕێکەوتنی ئستراتیجی نێوان یەکێتی و پارتی ٢٠٠٧/٧/٢٧

# کۆنگرەی دوەمی یەکێتی

*** بابێینەوە سەر کۆنگرەی دوەمی یەکێتی لە شوباتی ۲۰۰۱دا، چۆن ئەو کۆنگرەیە هەڵئەسەنگێنی؟**

– پێموایە کۆنگرەیەکی زۆر باش بو، سەرەتایەکی زۆرباش بو بۆئەوەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ببێتە یەکێتی نیشتمانی کوردستانی ڕاستەقینە. پێموایە هەنگاوی باشی نا لە بەرەسمی بنبڕکردنی تەکەتول، بەرەسمی ئیدانەکردن و دزێوکردن و رەتکردنەوەی تەکەتولات لەناو یەکێتیدا.

دەرسێکیدا بە هەمو ئەو کەسانەی کەوا ڕێبەری دەستە گەریەکەیان دەکرد، بەوەی هەم خۆیان کەم دەنگیان هێناو هەم ئەو لیستانەی دەیانویست دەرنەچون. ئەمەش نیشانەی ئەوە بو کە بەشی زۆری ئەندامانی کۆنگرە دەستەگەرێتیان پێخۆش نەبو، دژی دەستەگەریی بون. جگە لەوە، پەیڕەوپرۆگرامی یەکێتی چاککرا، جگە لەوە سیاسەتی گشتی یەکێتی کە لە ڕاپۆرتەکەی مندا هاتبو، پەسەندکرا و ڕێبازی یەکێتی دەستنیشانکرا.

بێگومان کۆمەڵێک بڕیاری باشدرا لەسەر پێشمەرگە، بەڵام شان بەشانی ئەوەش من پێموایە کەم و کورتیشی تێدابو، پێموایە کەموکورتی هەبو لە هەڵبژاردنی سەرکردایەتیدا، هەندێک هەڤاڵی شایستە دەرنەچون، هەندێک هەڤاڵ دەرچون ئیحتیرامم هەیە بۆیان و بۆ ئەو کەسانەی دەنگیان داونەتێ، بەڵام لەوان خەڵکی هوشیارتر و کارامەتر و بە تواناتر هەبون. کەموکورتیەکی تر ئەوەبو کە ژنان بەشدارنەبون لە سەرکردایەتی یەکێتیدا، نەبونی ئەوانیش کەلەبەرێکی هێشتۆتەوە لە ڕیزەکانماندا، لە ڕیزی سەرکردایەتیماندا.

دیارە دەکرا کۆنگرەکەش باشتر بێت، بەڵام ئەو هەلومەرجەی تێیدا ڕێکخرا، ئەوەیهێنایە کایەوە. پێموایە ئەو کۆنگرەیە کۆنگرەیەکی باشبو، بەڵام ئەو کۆنگرە نمونەییە نەبو، کە خەونی پێوە دەبینین. هیوادارم کۆنگرەی داهاتو لەمە باشتربێت و کۆنگرەی سێیەم، ئەو کۆنگرە نمونەییەبێت کە دەمانەوێت.

# سەرکردایەتی نوێ لە کۆنگرەی دووەمدا

*** وەکو خۆتان باستانکرد هەندێ کەس دەرنەچون بۆ سەرکردایەتی و هەندێکی دیکە دەرچون، ئاشکراشە مام جەلال ویستویەتی هەندێ کەس دەربچن، بەڵام دەرنەچون. هۆی ئەوە چییە کە سکرتێری گشتی یەکێتی بیەوێت هەندێ خەڵک دەربچێ و دەرنەچن؟ ئایا ئەوە نیشانەی ئەوەیە کۆنگرە ڕەچاوی خواستی ئێوەی نەکردوە؟ یاخود ئەندامانی یەکێتی نیشتمانی زۆر دیموکراتن و سەربەستانە دەنگی خۆیانداوە؟**

- تۆ گوێت لێبێت، یەکەم، ئەوەی من ویستم دەرچو، من خۆم هاتم چەند برادەرێکم هەڵبژارد، ئەوانە بەکۆی دەنگ چەپڵەیان بۆ لێدراو و دەرچون. ئەوانەی تر ڕاستیەکەی بەجێم هێشتبو بۆ ئەندامانی کۆنگرە، واتا هەمو ئەوانەی خۆشم دەویستن، پێم خۆشبو دەرچن، بەڵام نەچوم دیعایەیان بۆ بکەم. من پێموایە دیعایەم بۆ بکردنایە دەردەچون، بۆ نمونە لیستم بۆ بکردنایە و بمگوتایە ئەوە پێشنیازی منن، ئەوا ئەندامان گوێیان دەگرت، بەڵام من هەندێ برادەرم مەتڵەب بو، لە دەستەی دامەزرێنەر و هەردو سەرۆک وەزیرەکان، ئەوەبو بە گشتی و بە چەپڵە ڕێزانەوە قبوڵکران.

منیش لەگەڵ کۆسرەت رێککەوتم، ئەو جەبار فەرمان پێشنیاز بکات و ئەویش بە گشتی دەنگ قبوڵکرا. من پێم وایە ئەگەر من دەستنیشانی برادەرانم بکردبایە و بمگوتبا فلانە کەس باشە و دەبێ دەنگی بۆ بدەن، دەنگیان بۆ دەدا، بەڵام ئەوەم نەکرد.

ئەوەم لەبەر دو هۆ نەکرد:

یەکەم: بۆئەوەی خەڵک ئازادی هەبێت لە هەڵبژاردن و ئەندامان بزانن کە دەتوانن نوێنەری خۆیان هەڵببژێرن.

دووەم : نەم ویست ئەندامان وا تێبگەن کە هەمو شتێک لەناو یەکێتی، بە قسەی مام جەلال و بەویستی مام جەلال دەبێت.

# جێگری سکرتێری گشتی

*** وا زیاتر لە دو ساڵ بەسەر کۆنگرەی دوەمی یەکێتیدا تێپەڕیوە، تا ئێستا جێگرێکتان بۆخۆتان دانەناوە، ئایە مەترسی ئەوە نییە دوای چەند ساڵێک، یەکێتی لەناو خۆیدا دوچاری ململانێ و ئینشیقاق و ناکۆکی بێت؟**

- نەخێر خۆت دەزانی لە مێژوی یەکێتیدا، وەختی خۆی کاکە نەوە جێگری سکرتێری حیزب بو، لەدواییدا خۆی نەیکرد کە کاکە نەوە نەیکرد بە دیدی من هەلومەرجێکی بابەتی و تایبەتی نەهاتەکایەوە بۆ هەڤاڵێک کە بتوانێت ئەو جێیە پڕکاتەوە و بەگشتی دەنگ بێت، یاخود بەڕێژەی هەرە زۆری دەنگ ئەو جێگایە وەربگرێت.

تۆ خۆت دەزانی، ئێستا جۆرە ڕێکەوتنێک لەناو یەکێتیدا هەیە لەسەر من و بە گشتی دەنگ برادەران پێیان خۆشە، هەتا ئەوانەی سەردەمێک لاریان هەبو، ئەوانیش گوتیان: "بابە ئەومان هەر پێویستە، با مام جەلال بمێنێتەوە وەک سکرتێری گشتی".

هێشتا لەناو یەکێتیدا ئەکسەریەت دروست نەبوە لەسەر هەڤاڵێکی تر کە بێت و ئێمە بیکەینە جێگر. من چاوەڕوانی ئەوەمە هەڤاڵێکی شایستە پەیدابێت، لە ڕوی هۆشیاری و خوێندەواریی و تێگەیشتن و خەبات و تێکۆشان و ڕاستی ڕێبازەکەیەوە شایستەی ئەو جێگایە بێت، ئەو هەڤاڵە زۆربەی زۆری برادەران بەدڵیان بێت.

مەسەلەی جیابونەوە و ئینشیقاق لە هەمو حیزبێکی سیاسی گەورەدا پێشبینی دەکرێت، من ناتوانم بڵێم هەتا ڕۆژی قیامەت یەکێتی ئاوها دەمێنێتەوە، زۆرجار بوە لە حیزبی گەورەی دنیاشدا، لە حیزبە سۆسیالیستەکان لە حیزبە نیشتیمانی و دیموکراتیەکان و کۆمنیستەکان و نیشتیمان پەروەرەکان زۆر جیابونەوە بوە، ئێستا تەماشاکەین حیزبە ناسرییەکان هەر لە میسر چەند حیزبن، یان بەعسیەکان بون بە چەند پارچەوە، یان شیوعیەکان چۆن دابەشبون.

حیزبێکی گەورەی وەک یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، سەدان هەزار ئەندام

و لایەنگری هەیە، بەدوری نازانم ڕۆژێ لەڕۆژان، تەنانەت ئەگەر جێگریش هەبێت دووبەرەکی تێیدا دروستببێت، بەڵام هیوادارم ئەو دووبەرەکیە نەکەوێتەوە. من هیواداری ئەوەمە کە بەتایبەتی دوای نەهێشتنی تەکەتولاتەکان، دوای ئەوەی ڕێبازی ڕاستی یەکێتی چەسپا، هیوادارم ئەو یەکێتیە بپارێزن لەناو یەکێتیدا.

# تەکەتولاتی ناو یەکێتی

*** ئایا تەکەتولات و باڵباڵێن لەناو یەکێتیدا بنبڕبوە؟ ئەگەر بنبڕنەبوە، بۆ نەبوە، کەی بنبڕدەبێت؟**

- تەکەتولات لە ڕوی سیاسیەوە، دیموکراسیە، لەڕوی ئەوەی وەکو مەرکەزی هێزیش، ئەوا کارێکی بە پێچەوانەوەیە، لەڕوی ئەوەی هەمو کەس دەیسەلمێنێت تەکەتول خراپە و نابێت تەکەتول بکەین، ئەوا بەڵێ بنبڕبوە، بەڵام هێشتا ماوە، هێشتا شوێنەواری ماوە، هێشتا هەندێک لەبرادەران هەر هەلیان بۆ ڕێکبکەوێت، دەستەگەریی ئەکەن. هۆی ئەوەی تەکەتول ماوە چەند هۆیەکە:

یەکەم: لەدەستدانی ئیمتیازاتە، زۆر سەیرە تەکەتول لەناو یەکێتیدا، نە لەسەر بیروباوەڕ بو، نە لەسەر سیاسەت بو، نە لەسەر جیاوازی فیکریی بو، بەڵکو لەسەر وەرگرتنی ئیمتیازات و خەڵک ڕاکێشان و وەرگرتنی پلەوپایە بۆ خەڵکانی نەشیاو بە شوێنی خۆیان. بەداخەوە ئەم نەخۆشیە کادێرە گەورە و باشەکانیشی گرتبوەوە.

دوەم: هێشتا ڕادەی هۆشیاری سیاسی بە تەواوەتی نەچەسپاوە، زۆر کادێر لەجیاتی تەکەتولی گەورەی یەکێتی بێت، ئەو دێت ئەبێت بە تەکەتولی چەند کەسێکی دیاریکراو.

سێیەم: هۆیەکی تر، دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتەی جەماوەر، پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردی کە هێشتا شار و دێ و هۆز هۆزێنەی تێیداماوە، عەشیرەتگەریی و برادەرگەری تێیداماوە، ئەوەش کاتێکی دەوێت. خۆت دەزانی پێکهاتەی کۆمەڵگا زۆر کاریگەری هەیە، لەسەر پێکهاتەی ئەو حیزبانەی لەو کۆمەڵگایەدا دروستدەبن.

بۆ نمونە، کۆمەڵگای ئەڵمانی پێکهاتەی حیزبێکی یا کاریگەری حیزبێکی

وەکو پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردی یا عەرەبی نیە، ئینجا هەندێک لەو هۆیانەی دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتەی ئەو کۆمەڵگایە و هەندێکێشی دەگەڕێتەوە بۆ دەستکەوتی تایبەتی، یاخود خەونی تایبەتی ئەو کەسە.

*** پێتانوایە یەکێتی بوە بە حیزبی دامەزراوەیی و کارەکانی بە سیستەماتیک بەڕێوە دەبات؟**

– بەرەو ئەوە دەچێت، من پێموایە یەکێتی هەنگاوی گرنگی ناوە بۆئەوەی ببێتە حیزبی موئەسەسات، هێشتا بەتەواوی نەبوە، بەڵام ئەگەر بەراوردێک بکەیت لەگەڵ ساڵێک لەمەوپێش، دەبینین هەنگاوی باشی بۆ پێشەوە ناوە.

نەوشیروان مستەفا، یەکێکە لە سەرکردەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، من هەمیشە بە یەکێک لە هەڤاڵە هەرە نزیکەکانی خۆمی دەزانم و پرس و ڕاشی پێدەکەم. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمڕۆ لێم پرسی: "کە ڕات چیە لەسەر هەندێک وەزیر و لێپرسراوی حکومی، کاتیان تەواوبوە و کێ لە شوێنەکانیان دابنرێت"، ئەو ڕای وابو، "ەبەرئەوەی ئێستا حکومەت کەوتۆتە سەر سکەی خۆی و شکڵی موئەسەساتی بەخۆیەوە گرتوە، بەلامەوە گرنگ نیە کێ دائەنێن و کێ دانانێن، چونکە هیچ شتێک تێک ناچێتەوە".

کارەکان قاڵبی موئەسەساتی بەخۆیەوەگرتوە و گوتی: "کێ دادەنێیت من ڕازیم"، جاران نەوشیروان دەیگوت ئەمە باشە ئەوە خراپە، ئەمە نابێ، ئەوە دەبێ، ئێستا هۆشیارێکی وەکو نەوشیروان گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی، حکومەتەکەمان بۆتە موئەسەسە و لەسەر سکەی خۆی دانراوە و کەوتۆتەگەڕ.

لەبەرئەوە کێ دەبێت و کێ نابێت بە وەزیر، ئەوەندە گرنگ نیە و من پێموایە لە دەزگای تریش وایلێهاتوە. من ئێستا خۆم لەناو فەرماندەیی هێزی پێشمەرگەی کوردستانم، ئێستا ماوەیەکە ئیشەکانم داوەتە دەست لێپرسراوانی ئەوێ، لە دورەوە چاودێریان دەکەم، ناوبەناو مانگی جارێک لەگەڵیان کۆدەبمەوە یاخود ئەگەر لادان بو یان ئامۆژگاری بو، ئەوا دەیکەم، بەڵام خۆیان ئیشەکان دەکەن، تەماشایان دەکەم ئیشەکان باشتر ئەبەن بەڕێوە.

*** دەڵێن مام جەلال لەناو یەکێتیدا چی بوێ ئەوەدەکات، زۆرجار لە خەڵک ئەپرسێ و پرسیار بە لێپرسراوان دەکات، بەڵام کەم بە قسەیان دەکات.**

– وەڵاهی وانیە، من لە یەکێتیدا ئاخر قسە دەکەم، لە کۆبونەوەکاندا ڕەئی هەمو برادەران وەردەگرم، بەڵام لەسەر دو، سێ شت پێدادەگرم، شتی مەبدەئی

پێدادەگرم، لەسەر دژایەتی تەکەتول پێدادەگرم، لەسەر مەسەلەی فەساد و بەدڕەوشتی و ئەوانە پێدادەگرم، لەدژی مەسەلەی نەهێشتنی ئیمتیازات پێدادەگرم. بەڵام من پێموایە هەتا ئێستا من شتێکم نەسەپاندوە، بەڵکو یا بە ئیقناع، یان بە پشتگیری خوارەوە و کادیرەکان کارەکان سەپاوە و جێبەجێکراوە.

# ڕۆڵی مەکتەبی سیاسی لەناو یەکێتیدا

*** مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی لەناو یەکێتیدا، چەند ڕۆڵیان هەیە لە بڕیاری سیاسی و چارەنوسی ناو یەکێتیدا؟**

– من پێموایە مەکتەبی سیاسی دەوری زۆری هەیە لە یەکێتیدا، مەکتەبی سیاسی بە دەرەجەی سەرەکی هەمو مەسەلەیەک باسدەکات و لەسەر هەمو مەسەلەیەک مناقەشە دەکات و لەسەر هەمو مەسەلەیەک بڕیار دەدات.

لەناو مەکتەبی سیاسیدا هەندێک برادەر هەیە، لە داڕشتن و پێشکەشکردنی پێشنیازی باشدا کاریگەری زۆریان هەیە. بۆ نمونە، بڵێین لەو برادەرانەی کە هەمانە و زۆرجار ڕەئی دەدەن و موناقەشەدەکەن، دەتوانین ناوی نەوشیروان، ئەرسەلان، عومەری سەید عەلی، دکتۆر کمال فوئاد و دکتۆر بەرهەم بێنین، برادەرانی تریش هەر یەکەیان قسەی خۆیان دەکەن و ڕەئی خۆیان دەڵێن. کەمجار بینیومە کۆ هەبێت لە نێوان ڕەئیەکاندا، موناقەشات دەکرێ دوایی پوخت دەکرێتەوە و بە زۆرینەی دەنگ بڕیاری لەسەر ئەدرێت.

هیچ بڕیارێکی گرنگی سیاسی نەدراوە لە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، بەبێ ڕەزامەندی بەشێکی زۆری مەکتەبی سیاسی، دوای مەکتەبی سیاسی ئینجا کۆمیتەی سەرکرایەتی و ئینجا کادێرەکان. من بەش بە حاڵی خۆم گلەیم هەیە لە کۆمیتەی سەرکردایەتی، من هەمیشە لە هەمو کۆبونەوەیەکدا دەڵێم: کۆمیتەی سەرکردایەتی دەبێ لە وەختی خۆییدا کۆبکرێتەوە و مەسەلەکانی بخرێتە بەردەم و ڕای وەربگیرێت، لە هەمو کارەکاندا وا ناروات، زۆربەی ئیشەکان مەکتەبی سیاسی دەیکا .

*** زۆر کەس گلەییان لەوە هەیە، ئەڵێن لە مێژوی یەکێتیدا لێپرسینەوە کەم رویداوە، بۆ نمونە لێپرسینەوە لە لادانی سیاسی، لە هەڵەی عەسکەری، لە گەندەڵی و فێڵی دارایی، ئەم بارودۆخە، زەمینەیەکی خۆشکردوە، جیاوازی کادێری دەست پاک و دز، ترسنۆک و ئازا، چاک و خراپ کەم بێت؟**

- من لەگەڵ نیوەی ئەو قسەیە موافیقم و لەگەڵ نیوەی موافیق نیم، لەگەڵ ئەو نیوەیە موافقم کە دەڵێت: "لێپرسینەوە نەبوە، زۆر جار لێپرسینەوە نەبوە! لە هەڵەی سیاسی و عەسکەری و مالی".

لێپرسینەوە لە کەموکوڕی عەسکەری و سیاسی نەبوە، ئەوە ڕاستە و ئەوە یەکێکە لە کەموکورتیەکانی دیاری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان. ئەگەر باس لە کەموکورتی بکەین، ئەمە لە کەموکورتیە دیارەکانی یەکێتیە، بەڵام ئەمە نەبۆتە هۆی ئەوەی لایەنە خراپەکە زاڵ بێت بەسەر چاکەکەدا.

تۆ تەماشاکە، ئێستا بۆ نمونە، هێزی پێشمەرگە باس بکەین، دەتوانین بڵێین لە دو ساڵی ڕابوردودا گوڵ بژێرێکی هێزی پێشمەرگە کراوە. هەمو فەرماندەکان ئەوانەن کە خوێندەوارن، کوللیەیان تەواوکردوە، تەدریبیان دیوە، ئیشیان کردووە و دزی و بەدرەوشتی و کاری خراپەیان لەسەرنیە ئەمە خۆی لە خۆییدا دەزگایەکی زۆر گرنگە لەناو یەکێتیدا. لە حکومەتدا، من پێموایە بە هەمان شێوەیە، حکومەتێکی نمونەیمان هێنا کە ئیمتیازات و مشەخۆری پەسەندنەکات و ڕەتی بداتەوە، لە ڕێکخستنی حیزبیشدا، بەهەمان شێوەیە.

من پێموایە ئەوە ڕاستە کە لەناو یەکێتیدا، لێپرسینەوە لەسەر کەموکوری و هەڵەی سیاسی و کەموکوری و هەڵەی عەسکەری نەکراوە و ئەوە زۆر جاریش زیانی لە یەکێتی داوە.

*** باسی گەندەڵی دارایی ئەکرێت، ئەڵێن دەزگای چاودێری دارایی راپۆرت ئەدات بە ئێوە، یان ئەیدات بە سەرکردایەتی یەکێتی، بەڵام هیچ لێپرسینەوەی بەدوادا نایەت؟**

- هەر راپۆرتێکی دەزگای چاودێری دارایی هاتبێت، لێمان کۆڵیوەتەوە، ئەو کەسەی لەسەری بوبێت، یان لامان داوە، یان سزامان داوە، یان شتەکەمان لێ وەرگرتۆتەوە. لەوەتەی دەزگای چاودێری دارایی هەیە، ئێمە هەتا هەندێک گۆڕینی حکومەتیمان لەسەر ئەو ئەساسە کردوە، هەندێک برادەرمان لابرد لە لێپرسراوێتی و هەندێک برادەرمان دانا لەسەر بناغەی راپۆرتی دەزگای چاودێری دارایی.

*** مام جەلال لە كۆبونەوەی گشتیدا حەز ئەكات قسەی گەشبینی بۆ بكرێت، ئەوە وایكردوە هەندێک خەڵک نەتوانێ یان نەیەوێت ڕای خۆی بە ڕاشكاوانە بڵێت، بەڵكو زیاتر بە دڵی تۆ قسە دەكەن، ئەو وەزعە وای لێدێت كە ئەو كەسانە نەتوانن ئەو ڕاستیانەی ئەیانەوێت دەری ببڕن .**

- من ئەوە تازە یەكەم جارمە لە تۆی دەبیستم!، ئەمن هەمو جارێ كە لەگەڵ برادەران كۆدەبمەوە، پێیان دەڵێم چیتان هەیە لە دڵی خۆتاندا بیڵێن. لەوەتەی ئەمن دەیبینم لە هیچ كۆبونەوەیەكدا قسەی گەشبینیم بۆ نەكراوە، یان داخوازی یان ڕەخنەیان هەبوە.



راپۆرتی مام جەلال لەکۆنگرەی یەکەمی یەکێتی، ١٩٩٢/١/٢٧ سلێمانی



بەشێ لە دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی لە کۆنگرەی دوهەم- کانونی یەکەمی ٢٠٠١



پێشمەرگە سەرەتاییەکانی ١٩٧٦ی یەکێتی لە کۆنگری دوهەمدا - کانونی یەکەمی ٢٠٠١



ئەوانەی خۆیان بۆ سەرکردایەتی یەکێتی لە کۆنگرەی یەکەمدا هەڵبژارد. ١٩٩٢/٢/٩- هەولێر

# هێزە ئیسلامییە کوردەکان

*** با بێینە سەر مەسەلەی حیزبە ئیسلامیەکان، لە کەیەوە گروپە ئیسلامیەکان خۆیان وەک هێزی سیاسی رێکخستوە، بۆچونی تۆ لەسەریان چیە و چۆن هەڵیان دەسەنگێنیت؟**

- هێزی ئیسلامی لە کوردستان، بەناوی (ئیخوان موسلیمین) لەکۆنەوە، لەپەنجاکانەوە، هەبون، ئەوان ژمارەیان کەم بون، لە شەستەکاندا دیسان سەریان هەڵدایەوە، بەڵام دیسان کەمبون. گروپی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق، ئەوەی پێیان دەڵێین (ئیخوان موسلیمین) وردە وردە خۆیان رێکخستوە و گەشەیان کردوە، لەناو خوێندەوار و دەستەیەک لە خەڵکی شاردا و ئاخری خۆیان کرد بە یەکگرتوی ئیسلامی.

لەبەرئەوەی ئەوانە توندڕەونین و هێمنانە ئیشدەکەن و کاری چەکداری ناکەن و کاری خێرخوازیان زۆر کردوە، پارەیان لە خەلیجەوە هێنا بۆ خزمەتی خەڵک. توانیان گەشەبکەن لەناو خەڵکی کوردستاندا، بەتایبەتی لە وەختی گرانی و کەم دەرامەتیدا.

جگە لەوە، ئەوانە زۆر خۆیان بە مۆدێرن نیشان ئەدەن، کوردایەتی دەکەن و ئەڵێن کوردایەتی حەڵاڵە، ئەو تەتەڕوف و ڕیشداریە سیمای ئیسلامی نیە، بۆیانباخ دەبەستن، پێیانوایە لەگەڵ کۆمەڵ دەبێت بژێن. واتا ئەو تەتەڕفی گروپە سەلەفیەکان هەیانە، ئەمانە نیانە. لەبەرئەوە زیاتر لەلاکانی تر گەشەیانکردوە.

دەمێنێتەوە بزووتنەوەی ئیسلامی، بزوتنەوەی ئیسلامی ئەوانیش لە کاتی شۆڕشی کوردستاندا و لە دوای هاتنە کایەی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە گەشەیانکردوە. یەکەمجار لەسەر دەستی شێخ محەمەدی بەرزنجی، ئەو فکرەیە هاتەکایەوە. دوای ئەوە وردە وردە گەشەیانکرد، مەلا عوسمانیان کردە ڕابەری خۆیان. لە سەرەتادا ئێمە پشتیوانیمان لێکردن، واتا پشتیوانیمان لێکردن و دەمانویست ئەو بزوتنەوە ئیسلامیە کە چەکدارە و بەشدارە لە شەڕ، پێشمەرگەی هەبێت و بەشداری خەبات بێت و تەنانەت جارێکیان بۆ نوکتە

گوتم: "ئەرێ مامۆستایان ئێمە زۆر پۆستەر بۆ شەهیدان دروست دەکەین، وانەکەن دو، سێ مەندیل بەسەریش پەیدابیێت و بیانخەینە ناو شەهیدەکانی خۆمانەوە".

ئەوانە بە کۆمەکی کۆماری ئیسلامی گەشەیانکرد و کۆماری ئیسلامی بەتەواوی پشتیوانی لە بزوتنەوەی ئیسلامی دەکرد، نەک لە یەکگرتوی ئیسلامی، بەڵام چونکە ئەوانە مەسەلەکەیان لەسەر بناغەی بیروباوەڕ نەبو، زۆربێ و بۆربێ بو، هەمو جۆرە کەسێکیان کۆدەکردەوە، بۆیە جۆراوجۆر خەڵکیان کەوتەناو، بەهۆی ئەوەی کە هەندێکیان ڕێیاندا بچنە ئەفغانستان و لەگەڵ تالیبان و قاعیدە پەیوەندی بکەن.

*** ڕۆڵی ئەو گروپە ئیسلامیانە لە کاتی خەباتی چەکداریدا دژی ڕژێم چی بو؟**

- یەکگرتوی ئیسلامی لە شارەکاندا هەبون، نازانم دەوریان چی بوە؟ بەڵام بزوتنەوەی ئیسلامی پێشمەرگەیان هەبو، ناو بەناو دەهاتنە ناوچەکانی ئێمە، ئێمە لە ناوچەکانی خۆمان ڕێمان دابون، هەندێ جاریش بەشداریان لە شەڕیشدا دەکرد، بەڵام بە ژمارەیەکی کەم.

*** هۆی چی بو ئیسلامیەکان دوای ڕاپەڕین بەخێرایی گەشەیانکرد؟**

- کۆمەڵێک هۆ هەبون بۆ گەشەکردنیان:

یەکەم: پشتیوانی کۆماری ئیسلامی بو بۆیان.

دووەم: شەڕی نێوان یەکێتی و پارتی .

سێیەم : هەژاری خەڵکەکە، ئەوان ئیمکانیاتیان هەبو، یارمەتی خەڵکیان ئەدا.

چوارەم : ئەو مەدە ئیسلامیەی لە دنیادا هەبو، لێرەش دەنگی دایەوە.

*** هۆی توندڕەوی هەندێ گروپی ئیسلامی چی بو؟ وەکو (ئەنساری ئیسلام) کە وایان لێبکات کارەساتی وەک خێڵی حەمە ئەنجام بدەن؟**

- توندڕەویی ئەو گروپە فیکری بوە، ئەوانە جەماعەتێکن لەسەر نەهجی (خەواریج) دەڕۆشتن. حادیسەیەکی مەشهور هەیە لەسەر خەواریجیەکان لێیان دەگێڕنەوە، دەڵێن (ئیبن قوتەیبە) یەکێکە لە ئەسحابەکانی پێغەمبەر لە نزیک دێیەک بە تەنیشت هەندێ خەوارجدا تێدەپەڕێت، دێیەکە هی مەسیحیەکانە، لێی

دەپرسن: ڕەئیت چیە لەسەر ئەبوبکر؟ دەڵێ خەیرەن، دەڵێ ڕەئیت چیە لەسەر عوسمان؟ دەڵێ خەیرەن، ڕەئیت چیە لەسەر عومەر؟ دەڵێ خەیرەن، دەلێ ڕەئیت چیە لەسەر عەلی؟ دەڵێ عەلی لە ئیسلامدا زۆر شارەزا بوە، لە قورئاندا زۆر شارەزابوە، ئنجا دەیکوژن لەسەرئەوەی گوتویەتی، عەلی لەمەسەلەی خەواریجدا، خەواریجەکان دەیڵێن، هودنەی کرد لەگەڵ معاویە شەڕەکەی نەکرد لەسەرئەوە، دەیکوژن. دوایی دەچن ترێ دەکڕن لە مەسیحیەکە، دەڵێ پارەکە چەندە، نامەوێ بەدیاری، نانا ئیلا دەبێ پارەکە وەرگریت، گوناحە، ئێوە ئیبن خوبابی سەحابەی پێغەمەر دەکوژن گوناح نیە، بەڵام ترێی من بەخۆڕایی بەرن گوناحە! ئەمە لەو عەقڵیەتانەن.

ئەمانە جەماعەتێک بون، کوێرانە سواری عەقڵیان بون، ئەو عەرەبانە موتەتەڕیف و سەلەفین، لەو کەسانەنە هەمو کەسیان پێ کافرە جگە لە خۆیان و ئەوانە نەبێت وەکو ئەوان خەواریجن. سەید قوتب کە بە مفکری بیری ئەمان دائەنرێت، دەڵێت دەبێ خەڵک موسوڵمان کەینەوە، ئەم سەلەفیانە زۆر توندڕەون.

دووەم: نەزانینە، کۆمەڵێکی ساوای کوردی قوڕبەسەریان کەوتبوە بەردەست، بەشی زۆریان هەژار و نەخوێندەواربون.

هەندێ بۆچونی خورافیان بەناوی ئیسلامەوە بڵاوکردبۆوە، مێشکیان پڕکردبوون لەو خورافەتانە، بۆ نمونە، وەکو ئەو کوڕەی لە هاوینی ۲۰۰۳ گیرا لە کاتێکدا کە دەویست کارێکی تیرۆریستی بکات و خۆشی بتەقێنێتەوە، بێیان گوتبو ئەگەر بتەقێیتەوە، ئەوا ۷ پەری لەبەهەشت چاوەڕوانت دەکەن.

بەو جۆرە خەڕافیاتانە خەڵک فریودەدەن. کەواتە تەتەڕوفی فیکری لای سەلەفیەکان، لە جەهالەت و سادەیی خەڵکەکەوە هاتوە.

*** مەترسی گشتی ئەو گروپە ئیسلامیانە، بەتایبەتی موتەتەڕیفەکان بۆ دوارۆژی گەلی کورد چیە؟**

– مەترسیەکە ئەوەیە، ئەو گروپانە تیرۆریستن، سەرۆکەکانیان گرێدراوی چەند دەزگایەکی دەرەوەن و بەکاریان دێنن بۆ کاری تیرۆر و ئاژاوەنانەوە و تێکدانی ئاسایشی ناوچەکە. ئەگینا هیچ قابیلیەتی گەشەکردن و بونیان نیە، بە بزوتنەوەیەکی جەماهیری دانانرێن.

# هێزە کوردی و کوردستانیەکان

*** یەکێتی و پارتی هەریەکەیان کۆمەڵێک حیزبی بچوک و گروپی کوردی و کوردستانیان لە دەوری خۆیان کۆکردۆتەوە، ئایا ئەوانە چەند سەربەخۆن و چەند ئەتوانن رۆڵی تایبەتی خۆیان ببینن؟**

– حیزبەکانی کوردستانی عێراق، بەڕای من دو بابەتن، بابەتێکیان حیزبی ڕەسەنن، هەن و بونە و ڕەگیان هەیە، وەکو حیزبی زەحمەتکێشان، یا سۆسیالیست، ئەوانە هەبون و لەکاتی شۆڕش و لە ئێستادا درێژە بە خەباتیان ئەدەن. هەندێکیان تازە پەیدابون وەکو پارتی پارێزگاران، هەندێکیان لە ئەنجامی جیابونەوەی حیزبەکان دروست بون، وەک حیزبی ڕزگاری.

هەندێ هێزی تر هەن، لە ئەنجامی جیابونەوە لە هێزی تر، یان یەکگرتنەوەی چەند هێزێکی بچوکی تر، حیزبێک یان ڕێکخراوێکی سیاسیان پێکهێناوە، ئەوانە زۆربەیان ڕێکخراوی بچوکن، لەبەرئەوەی بچوکن توانای دارایی و ئیدامەی خۆیان نیە و توانای سەربەخۆیی تەواویان نیە.

ئەوانە هەندێکیان لەگەڵ یەکێتیدا هاوپەیمانن و یەکێتی مەرجی لەسەر دانەناون، بەڕاستی یارمەتیان دەدا بەبێ مەرج، ئەوان دەتوانن هەڵوێستی سەربەخۆیان هەبێت.

ئەوانە دو جۆریان هەیە، هەندێک هەنە فۆتۆکۆپی کراون، بەتایبەتی لە هەولێر، کۆمەڵێک خەڵک هەبون، لەبەر ئەوەی حیزبی سۆسیالیست لای ئێمە هەیە، ئەوان هەستاون دوسێ کەسیان لە سۆسیالیست فۆتۆکۆپی کردوە و گوتویانە ئێوە سۆسیالیستن. یان مادەم ڕزگاری لای ئێمە هەیە، شتێکیان دروستکردوە بەناوی ڕزگاری، واتا لە ناوچەی پارتی کۆمەڵێک خەڵک فۆتۆکۆپی کراون، دژی حیزبە ڕەسەنەکان کە لای ئێمەن، بەڵام بچوکن.

*** بۆ یەکێتی هەوڵ نادات، ئەو حیزبە بچوکانە بکات بەیەک، ئەوکاتە مەعقولتر دەبن و بەیەکەوە گەورەتر و بەهێزتردەبن؟**

- یەکێتی هەوڵ دەدات و هانیان ئەدات، یەکبگرن و ببنە یەک حیزب، ئەوانە هەمویان لەیەک نزیکن، بەڵام خۆت دەزانی بارودۆخەکە هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو قۆناغەی قەناعەتیان بێت کە یەکتربگرنەوە.

*** بونی ئەو هێزە کوردییە بچکۆلانە سودیان بۆ ئێستای کۆمەڵگای کوردی چییە، لە کاتێکدا کە ناتوانن خۆیان بژێنن و هەمیشە چاوەڕێی هاوکاری و یارمەتی هێزە سیاسییە گەورەکانن؟**

- بێگومان هەمو شتێک لایەنی باشی و خراپی هەیە، شتێک نیە لە دنیا هەموی باشی بێت، یان هەموی خراپ بێت. لەو بوارەدا کە خەبات دەکەن و هاوکاری یەکێتی و میللەت دەکەن، ئەوە بێگومان سودیان هەیە، لەلایـەکی تر کە بە پچرپچری لە ناو بزوتنەوەی کوردیدان، ئەوە جۆرێکە لە پەشێوی و ئاژاوە، بە زیان دەگەڕێتەوە.

*** یەکێتی نیشتیمانی یارمەتی ماددی زۆر ئەو پارتانە ئەدات، بۆچی ئەو یارمەتیە لەسەر بناغەی ئەوە نەبێت کە ئایا ئەو حیزبانە چەند چالاکن لە گۆرەپانی خەباتدا، چەند کارئەکەن، چەند پێشمەرگەیان هەیە، چەند ئەندامیان هەیە، چەند ئەتوانن لە گۆڕانی کۆمەڵگادا ڕۆڵ ببینن؟**

- ئەو یارمەتیە لەسەر ئەو بناغەیەیە، واتا ئەگەر پارتێک بچوک بێت، ئەوا ڕەنگە مانگی دەهەزار دینار وەربگرێت، حیزبێکی تر کە پێشمەرگەی هەیە و موچەی ٧٠٠ پێشمەرگەی وەردەگرێت، بەڵام ڕەنگە خۆی سێ سەد هەزاری بدرێتێ لە ڕاستیدا ڕەچاوی ئەوەکراوە لە یارمەتیەکاندا.

*** ئەو گروپانە چەند بەشداربون لە پرۆسەی ئاشتی نێوان یەکێتی و پارتیدا؟**

- بەنیسبەت ئەو حیزبانەی کە لە ناوچەی ئێمەن، هەموویان لە ٣١ ی ئابدا هەڵوێستیان هەبوە، هەمویان دژی ئەو هێرشەی عێراق بون، دژی هاوکاری پارتی بون لەگەڵ حکومەتی بەعس. هەندێکیان بەر شاڵاوی ئەو هێرشە کەوتن و پارتی بارەگاکانی گرتن و لە ناوچەی خۆیان لێیاندان، چونکە دژی داگیرکردنی هەولێربون لەلایەن حکومەتی عێراقەوە و دژی هاوکاری پارتی بون لەگەڵ حکومەتی عێراق.

ئەوانە بڵاوکراوەیان دژی هاوکاری بەعس و پارتی دەرکرد و هەڵوێستیان وەرگرت.
ئەوانە بەپێی توانای خۆیان بەشداریانکرد لە شەڕی ڕزگارکردنی ناوچەکانماندا، وەک هێزەکانی حیزبی زەحمەتکێشان، لە هەندێک جێگادا، بۆ نمونە، حەمەی حاجی مەحمود بەخودی خۆی بەشداری لە شەڕەکاندا دەکرد. بەهادین نوری خەڵکی نەبو، بەڵام خۆی هاتەدەرێ و هەڵوێستی وەگرت، ئەوەشی هەبو خستیە مەیدانی شەڕەکەوە، واتا هەریەکە بەگوێرەی توانای خۆی بەشداریکرد.

# تورکمان لە عێراق و کوردستاندا

*** دێینە سەر مەسەلەی تورکمان، ڕێژەی تورکمان لە عێراق و کوردستاندا چەندە؟**

- ئەگەر بێت و ورد ببینەوە لە سەرژمێریە کۆنەکانی کاتی عوسبەت ئومەم، کاتێ کە ئینگلیز لە عێراق دەسەڵاتداربوە، تەماشا دەکەین لە هەمو ناوچەی عێراقدا، ژمارەیان لە سنوری سەد هەزارێک دەبێت. ئەو کاتە کە عێراق بە سێ ملیۆن دادەنرا، ئێستا ئەگەر عێراق هەشت جار زیادیکردبێت، ئەوانیش هەشت جار زیادیان کردوە. دەبێ لە سنوری حەوت سەد، هەشت سەد هەزارێک بن لە کوردستان. بە بۆچونی من، تورکمان لە عێراقدا ناگەنە ملیۆنێک، ڕەنگە لە نێوان ٧٥٠ تا ٨٠٠ هەزاردابن.

*** بۆچی تورکمانەکان پێش ڕاپەڕین وەکو هێزی سیاسی نەهاتونەتە ناو گۆڕەپانی خەباتەوە؟**

- چەند هۆیەک هەیە بۆئەوە:

یەکەم : تورکمانەکان حیزبیان نەبوە، حیزبی ئەوتۆیان نەبوە، بتوانن سەرکردایەتی خەباتیان بکات.

دوەم: تورکمانە توندڕەوەکان هەمیشە چاویان لەوەبوە، لەدەرەوە، لە تورکیاوە یارمەتی وەربگرن، بەپێی سیاسەتی تورکیا خۆیان گونجاندوە، سیاسەتی تورکیاش سیاسەتێک بوە لەگەڵ عێراقدا تەبابوە.

سێیەم: تورکمانەکان دو گروپ بون، ئیسلامی شیعە دژی ڕژێمی عێراق بون و خەباتیان کردوە و قوربانیانداوە و سەدان شەهیدی تورکمان هەیە، حکومەت زۆری لێ ئیعدامکردون و لێی کوشتون.

تورکمانەکانی تریش، بە تایبەتی ئەوانەی لەگەڵ ڕژێمدا هاوکاریان نەکردوە، حکومەتی عێراق ئازاری داون و چەوسانونێتیەوە.

چوارەم: گیروگرفتی تورکمان ئەوەیە کە پەرتوبڵاون، لە یەک ناوچە ناژین. بۆ نمونە، لە تەلەعفەر هەن، دوسەد کیلۆمەتر لە پردێوە دورە، لەوێ هەن، لەپردێ تێپەڕە دێیتە کەرکوک، لە کەرکوک هەن، لە کەرکوک برۆ لە دوز هەن، لە دوز بازدە بۆ کفری، لەوێ هەن. لە کفری سەد کیلۆمەتر بازدە لە خانەقین هەن، لە بەغدا هەن و بەو شێوەیە.

ئەوەنیە بڵێین لە ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراو ژیابن، ئەو پەرتوبڵاویەیان یارمەتی ئەوەی نەداون هەمو یەکبن.

پێنجەم: ناکۆکی هەیە لە نێوان شیعە و سونەی تورکماندا، شیعەیان جۆرێک بیردەکاتەوە، سونەیان جۆرێکی تر بیردەکاتەوە.

شەشەم: لەناو تورکمانەکاندا جوڵانەوەیەکی هەڵقوڵاو لەناو جەماوەرەکەیاندا پەیدانەبو کە بتوانێ خەڵکی تورکمان بۆلای خۆی رابکێشێت و بتوانێ جەماوەر کۆبکاتەوە، بۆیە نەیانتوانیوە ئەو دەورەی پێویستە و شایستەی ئەوانە بیبینن، بە تایبەتی لە پێش ڕاپەڕینەوە.

*** تورکیا چۆن دەڕوانێتە رۆڵی نوێی هێزە تورکمانیەکان؟**

- ئەوە هەندێ هۆی هەیە، یەکەم: زوڵم و زۆرێکی زۆریان لەسەرە، وەکو کورد دەربەدەربون و ڕاگوێزراون، تەعریب کراون، حکومەتی عێراق دانی بە بونی تورکماندا نەناوە و گوتویەتی تورکمان نییە و ناچاریان کردون بڵێن، یان ئێمە کوردین یان عەرەبین. کە زوڵم هەبو، ڕەد فیعل دەبێ، موبارەزەیە خەبات دژی زوڵم لە زوڵم کردنەوە پەیدادەبێت.

دوەم: کە چاو لە کورد دەکەن و دەڵێن برا کوردەکان ڕاپەڕیون و حیزبیان هەیە و ڕێکخستنیان هەیە و ئەوانیش خۆیان بە دواکەوتو دەزانن، ئەوانیش وەک کورد هێزی سیاسی خۆیان نەبێت.

سێیەم: هەموو دنیا باس لە مەسەلەی مافی مرۆڤ دەکات، ئەوان ئومێدیان بەوەهەیە، ئەگینا بەڕاستی من دەوری تورکیا زۆر بە گرنگ نابینم.

تورکیا تا پێنج، شەش ساڵ پێش ئێستا، باسی تورکمانی نەدەکرد!. من لە بیرمە، چوم بۆ تورکیا، ئەو وەختە خانم چیلەر سەرۆک وەزیران بو، پێم گوت، "ئێوە بۆ بەرگری لە تورکمان ناکەن؟ بۆچی لە سەریان هەڵنادەنێ"؟.

جاران تورکیا لەسەر تورکمانی ژێر دەسەڵاتی رژێم هەڵی نەئەدایە، تورکیا هەر باسی تورکمانی ناوچەی کوردستانی دەکرد، ئێستا ١٠٪ تورکمانی عێراق لە ناوچەکانی ئێمەن، ٩٠٪ لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراق بون، باشە بۆچی تورکیا دژی چەوسانەوەی تورکمان لە عێراق نارەزایی دەرنەئەبرێ، تەنها باسی کەمایەتیەکی تورکمان دەکەن، لە هەرێمی ئازادکراوی کوردستانن و بە ئازادی و سەرفرازی دەژین.

*** بەپێی ئەو پێکهاتەیان کە باسکرد، ئایا تورکمان لە دوارۆژی عێراقدا ئەتوانێ چ رۆڵێ ببینێ؟**

– دیارە تورکمان چ رێگایەک دەگرێ، ئەگەر رێگای دیموکراسی و رێگای مافی مرۆڤ بگرێت، ئەوا دەتوانێ پارسەنگ بێت لەگەڵ کورد و هێزە دیموکراتەکانی عێراق بۆ پێشخستنی رەوتی دیموکراسی. ئەگەر لایەنی ئیسلامی بگرێت، دەتوانێ دەور ببینێ لە پێشخستنی کۆمەڵگای ئیسلامی. بە چ رێیەک دەڕوات و چ رێبازێک هەڵدەبژێرێ، ئەوە بریاری ئەوە دەدات چ دەورێک بتوانێ ببینێ .

بەڵام بەرژەوەندی کورد لەوەدایە، لەگەڵ تورکمان تەبابێ و پێکەوە گیروگرفتەکان چارەسەر بکەن و پێکەوە خەبات بکەن بۆ نەهێشتنی زوڵم و زۆری نەتەوایەتی، بۆ نەهێشتنی پاکتاوکردنی رەگەزی، بۆ گەڕانەوەیان بۆ ئەو شوێنانەی، لێی دەرکراون. پێویستە کورد هەوڵ بدات، تورکمان ڕابکێشێ بەلای خۆیدا، بۆئەوەی کورد و تورکمان وەک برا بەیەکەوە بتوانن بەرگری لە مافەکانی خۆیان بکەن.

# کەرکوک و تورکمان

*** گیروگرفتی تورکمان بە کەرکوکەوە بەستراوە، بەڕای تۆ ئایا کەرکوک کوردستانە، یان شاری برایەتیە، یان شارێکی عێراقییە، یان شاری کورد و عەرەب و تورکمانە، چۆن ئەتوانرێت ئەو پێکەوەژیانە بێتەکایەوە؟**

– خۆی شک لەوەدانیە کە کەرکوک شارێکە لە کوردستان، ئەگەر بگەڕێینەوە مێژو، تەماشا دەکەین، کەرکوک شارێکە لە کوردستان، ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئەو گەڕیدانەی کە هەر لە دێر زەمانەوە دەهاتن بۆ ناوچەکە، هەمویان گوتویانە کەرکوک شارێکی کوردستانیە. هەتا لە زەمانی عوسمانلیدا و لە ئینسکلۆپیدیای عوسمانی کە بە (قاموس الإعلام) ناسراوە، باسی کەرکوک دەکات، دەڵێت (کەرکوک شارێکە لە شارەزوری کوردستان، سێ لەسەر چواری کوردە و چارەکەکەی تری تورکمان و عەرەب و خەڵکی ترن). لە کاتی ئینگلیزدا ئەوان سەرژمێریان کردوە، لەوێشدا بەشی زۆری کەرکوک کورد بوە، عوسبەت ئومەم هاتوە لیژنەی عوسبەت ئومەم ئینگلیز و تورک و عێراق سەرژمێریان کردوە، لە هەمویاندا کورد بەشی هەرە زۆرەکەی ناوچەکە بوە.

بەڵام جیاوازی لە نێوان ئەو سێیە لەسەر ژمارەی تورکمانە، لەسەر ژمارەی زیادەی کوردیشە، بۆنمونە، ئینگلیز و عێراق و تورکیا هەرسێک لەسەرئەوە رێکەوتون کە بەشی زۆری خەڵکی ناوچەکە کوردن.

بریاری عوسبەت ئومەم کە داویتی، بریارێکی نێودەوڵەتیە، دەڵێت: "پاش ئەوەی موراجەعەی هەمو کتێبی جوگرافیەکانی کۆنمان کردەوە، هەمو ئەتڵەسەکانمان بینی، بۆمان دەرکەوت رۆژێک لە رۆژان ئەو ناوچەیەی کوردستانە، عێراق نەبوە، سنوری عێراق لە تکریت تێنەپەڕیوە، لە جەبەل حەمرین بەرەو هەورازەوە ئەوە کوردستانە".

بڕیارێک هەبوە لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە، بۆئەوەی کە رێژەی کورد لە کەرکوک کەمبکرێتەوە، کۆمەڵێک کاریان بۆ ئەو بڕیارە کردوە:

پیلان ئەوەبو، کە لیوای هەولێریان دروستکرد، هەولێر قەزایەکی سەر بە کەرکوک بو، کۆیەش قەزایەکی سەر بە کەرکوک بو، لە زێ بەولاوە لێیان کردەوە، لە دوکانەوە بەولاوە کە دێتەخوارێ، لێیانکردەوە، هەولێر و کۆیە و مەخمور و شەقڵاوە و ئەوانەیان لێکردەوە، تەنها بۆئەوەی نیسبەتی کورد کەمبێتەوە، دوای ئەوە لە سالانی سیەکانەوە عەرەبیان هێنا بۆ حەویجە و ئاوەدانیان کردەوە.

شەریکەی نەوت، هەمیشە هەوڵی داوە هەتا بکرێ کورد دانەنێن، عەرەب و ئاسوری و تورکمان دابنێن، دوای ئەوە ویستویانە وردە وردە ژمارەی کورد کەمیکەنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر کورد بە زۆرینە ماوەتەوە، لیوای کەرکوک هەتا لە سەرژمێری ١٩٥٧ دا، بەشی زۆری هەر کوردبوە.

*** گرنگی کەرکوک بەنەوتەکەوەیە، ئەگەر دەرکەوت ماوەیەکی تر نەوت لە کەرکوکدا نامێنێت، نەوت لە سلێمانی دۆزرایەوە، ئایا گرنگی کەرکوک یان کوردستانیەتی کەرکوک، یان ئەم هەمو شەڕەی لەسەر کەرکوک ئەکرێ و کرا، ئەمێنێت؟**

- من پێموایە حکومەتی عێراق گرنگی داوە بە نەوتی کەرکوک، بۆ نمونە، لە ١٩٨٣ و ١٩٨٤ کە گفتوگۆمان هەبو لەگەڵ حکومەتدا، سەدام لە کۆبونەوەیەکی ڕەسمی بە ئێمەی گوت: "من ناڵێم کەرکوک شارێکی عەرەبیە و ناشلێم شارێکی کوردیە".

مێژونوسە عێراقییەکان وەک (عەبدولرەزاق ئەلحەسنی) نوسیویەتی دەڵێت: "سنوری کوردستان لە شاخی حەمرینەوە دەست پێدەکات، بەڵگەنامەیەک، کە ناسریەکان و بەعسیەکان و قەومیەکان لە ١٩٦٢ داویانەتە عەبدولناسر، نوسیویانە کە سنوری کوردستان لە شاخی حەمرینەوە دەست پێدەکات".

سەدام حسێن خۆی لە وتارێکیدا، کە لە هەولێر خوێندویتەوە، باس لە مافی کوردی دەکات، کەرکوک دەخاتە ناو کوردستانەوە، بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کە دەڵێن: "کەرکوک دەبێتە بناغەیەکی ئابوری بۆ ڕزگار بون، بۆ دروستکردنی دەوڵەتی کوردی"، ئەوە لە لایەک، لە لایەکی ترەوە، نەوت لە کوردستان گەلێک زۆرە، ئێستا ئەو نەوتەی کە لە کۆیە و شیواشۆک و لە هەولێر هەیە، لەو سێ سوچی پردێ و هەولێر و دوکان هەیە، گەلێک زۆرترە لە نەوتی ئیحتیاتی کەرکوک، جۆرەکەشی لە نەوتی کەرکوک باشترە، بۆیە حکومەتی عێراق هەوڵیداوە هەر جێگەیەکی نەوتی تێیدایە کوردی لێ دوربخاتەوە.

بۆ نمونە، چاڵی مەخمور و دەشتی دزەیی و قەراج بە بڕیاری حکومەتی عێراق خرایە سەرسنوری حوکمی زاتی، بەڵام لە دوایی کە نەوتی تێیدا دەرکەوت، لە سنوری حوکمی زاتی لایانبرد.

سیاسەتی شۆڤێنی ئیستیعماری داگیرکەرانەی عێراق، هەمیشە هەوڵیانداوە کورد لە بناغە ئابوریەکەی ببڕێت، هەوڵیانداوە ناوچە کوردیەکان، بە کەرکوکیشەوە، لە ناوچەی کوردستان دابڕێت.

گرنگی کەرکوک هەر ئەوە نیە کە شارێکە نەوتی تێیدایە، بەڵکو پێش ئەوەش شارێکی دێرینی کوردستانە. شارێکە لە زەمانی گۆتی و لۆلۆوە ناسراوە، شارێکە لە ناوچەیەکی زەراعی باشدا، شارێکە لە ڕوی مێژویەوە پەیوەندییەکی ڕۆحی بە کوردستانەوە هەیە، بۆماوەیەکی زۆریش پایتەختی شارەزور بوە.

# حیزبی شیوعی عێراقی

*** با بێینە سەر مەسەلەی حیزبی شیوعی عێراقی، ئایا هیچ کاتێ لە ژیانتا ویستوتە ببیت بە ئەندامی حیزبی شیوعی عێراقی؟**

- من لە هیچ کاتێکی ژیانمدا، نەمویستوە ببم بە ئەندامی حیزبی شیوعی، بە تایبەتیش پاش ئەوەی هەندێک فامم کردەوە و زیاتر لە حیزبەکە گەیشتم.

لە سەرەتای ژیانی سیاسیم، لە ساڵی ١٩٤٦ وە، پەیوەندییەکی زۆر توندوتۆڵم لەگەڵ یەکێک لە کادێرەکانی حیزبی شیوعی هەبو، ناوی فاتیح ڕەسوڵ بو. ئەوکاتە فاتیح ڕەسوڵ چەند قوتابیەکی سەرەتایی کۆدەکردەوە، یەکێکیان من بوم و ناوبەناو قسەی بۆ دەکردین و هانی ئەداین کە بچین لە کتێبخانەی کۆیسنجەق لە کۆیە بخوێنینەوە و کتێب وەربگرین و ببین بە مشتەری. ئەو کتێبخانەیە سەر بە حیزبی شیوعی عێراقی بو، هەرچەندە من زۆر لە کتێبەکان نەئەگەیشتم، بەڵام زوربەیان دەربارەی یەکێتی سۆڤیەت و فکری چەپ بون، لەوانە کتێبی (صديقنا الاتحاد السوفيتي) بو.

فاتیح ڕەسوڵ، وردە وردە باسی حیزبی شیوعی و بیروباوەری پێشکەوتوخوازی بۆ دەکردین، یەکەم گیروگرفتی فکریم لەوێوە دەستی پێکرد، گەیشتینە سەر مەسەلەی

(ئومە). لەوەوپێش من هەندێ قسەم بۆ کرابو لەسەرئەوە، بۆیە لێم پرسی: "ئایا حیزبی شیوعی کورد بە میللەت دەزانێ یان نا"؟ گوتی: "نەخێر کورد میلەت نیە و مەرجەکانی ستالینی تێیدا نییە"، گوتم: "باشە میللەت، گەل نیە"؟ گوتی: "نەخێر ئەویش نیە، تەنها کەمایەتییەکی نەتەوایەتیە، وەکو لە بەرنامەکەی فەهدا هاتوە".

ئەو وەڵامەی فاتیح ڕەسوڵ سەرەتای دابڕان و ناکۆکی بو لەگەڵ ئەو و حیزبی شیوعیدا و ئیتر ناکۆکی کەوتە نێوانمانەوە و لەیەک جیابوینەوە و ئەو کتێبانەی لای من بون بۆم گەڕاندەوە.

*** کەریم ئەحمەدی سکرتێری حیزبی شیوعی کوردستانی لە یەک دو شوێندا گوتویەتی: "ئەگەر ئەو وەڵامەی فاتح ڕەسوڵ بەو شێوەیە نەبوایە، ئەوا ئێستا مام جەلال ئەندامێکی حیزبی شیوعی دەبو"**

- نازانم چۆن دەبو، بەڵام ئەگەر وەڵامەکەی فاتیح ڕەسوڵ بەو شێوەیە نەبوایە، نزیکتر دەبومەوە لە حیزبی شیوعی، چونکە من بیروباوەڕی مارکسیم پێباشبو، ئەو وەختەش یەکێتی سۆڤیەت پشتگیری کوردستانی ئێرانی دەکرد و دەنگی دابۆوە و بەسایەی سۆڤیەتەوە، کۆماری کوردستان دامەزرابو. ئەو بۆچونە لە کوردستاندا باوبو، سۆڤیەت و مارکیسیزم، کوردستان ڕزگاردەکات و ئەوە تەنها ڕێگای ڕزگارییە، بەڵام ئایا ئەبوم بە ئەندامی حیزبی شیوعی یان نا؟ ئەوەیان نازانم.

*** جگە لە بیروباوەڕی چەپڕەوی، چی تر لەگەڵ حیزبی شیوعیدا گرێدەکردیتەوە؟**

- دو سێ شت هەیە، دەمەوێ پێتبڵێم. ئێمە لەناوپارتیدا، نزیک بوین لە فکری چەپ و مارکسیەتەوە، ئەوکاتە پارتی خۆی بە چەپ دەزانی و نوسینەکانی هەمزە عەبدوڵڵا مارکسیانەبو، بەبۆنە جیاوازەکانەوە وتاری مارکسی زۆر دەنوسرا، بە تایبەتی لە یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەردا. ئێمە خۆمان لە یەکێتی سۆڤێت بە نزیک ئەزانی و خۆمان بە دۆستی سۆڤێت دائەنا.

لەبەرئەوەی مەلا مستەفا، وەک سەرۆکی پارتی چوبو بۆ ڕوسیا، سۆڤێتمان بە دۆستی خۆمان ئەزانی. لە کۆنگرەی دوهەمی پارتیدا کە لە ئازاری ١٩٥١ لە ماڵی عەلی حەمدی لە بەغدا گیرا، بەشی زۆری لایەنگری ئەوەبون، پارتی بیروباوەڕی مارکسیەت- لینینیەت تەبەنی بکات. من بەش بەحاڵی خۆم، پەیوندیەکی ترم لەگەڵ حیزبی شیوعیدا هەبو، ئەویش بەشداریم بو لە کۆنگرەی یەکێتی قوتابیانی گشتی عێراقی لە ١٩٤٨دا، شیوعیەکان ڕێبەریان دەکرد و ئێمەش تێیدا بەشداربوین.

شیوعیەکان لەناو خۆیاندا پارچە پارچە بون، ئەوسەردەمەی من لە زانکۆی بەغدا بوم، نزیکترین کۆمەڵ لە ئێمەوە، کۆمەڵی عەزیز شەریف بو، بەناوی (وحدة الشیوعیین العراقیین) کاریان دەکرد و ڕۆژنامەی (النضال) یان دەرئەکرد، هۆی ئەو نزیک بونەوەیە دو خاڵ بون:

یەکەم: عەزیز شەریف کتێبێکی نوسی بو (المسالة الكردية في العراق) و بەشێوەیەکی مارکسی لینیی، باسی لە مافی گەلی کورد کردبو.

دوەم: لە زینداندا عەبدولرەحیم شەریفی برای لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم و جەلیل هوشیار لە یەک شوێن بون، بەهۆی ئەوەشەوە پەیوەندی خێزانی دروست بو، بۆ نمونە کە لەسەردانی خێزانیی نێوان گەلاوێژخان و منداڵەکان لەگەڵ خێزانی عەزیز شەریف پەیوەندی دروست بوبو.

دوای ئەوە، بەهادین نوری هات و بو بە سکرتێری حیزب. بەهادین نوری تەبەنی مارکسی دیموکراتی شەعبی کرد، لە میساقی بەناو (باسم) دا دایڕشتبو، باس لە مافی چارەنوس دەکات بۆ گەلی کورد. لەبەرئەوە ئێمەش دیموکراتی شەعبیمان تەبەنی کردبو و لە بەرنامەی خۆماندا دامان ڕشتبو، بەوهۆیەوە نزیک بوونەوەیەک دروستبو.

هەروەها ئێمە ڕۆڵێکمان بینی لە یەکخستنەوەی حیزبە شیوعیەکان، یەکەم دەستپێشخەری بۆ یەکخستنەوەیان لەماڵێکی ئێمە بو، لەلایەن پارتیەوە من و حەبیب کەریم تێیدا بەشداربوین

لەلایەن شیوعیەکانەوە سەلام عادل هاتبو، لەلایەن (راية الشغيلة) و هەمزە سەلمان و لەلایەن (وحدة النضال) یشەوە عەبدولرەحیم شەریف هاتبو، ئێمە ئەوانەمان کۆکردەوە لە ئەنجامدا (وحدة النضال و القاعدة) یەکیانگرتەوە، حیزبی شیوعی مایەوە.

*** حیزبی شیوعی پێش و دوای چواردەی تەمموز، یەکێک بو لە حیزبە هەرە بەهێز و کاریگەرەکانی عێراقی. بۆچی دوای ئەو هەمو ساڵە، وا بچوک بونەوە و بون بە حیزبێک کە ڕۆڵیان نەبێت لە گۆڕانی بنەڕەتی لە عێراقدا؟**

- پێشی چواردەی تەمموز، حیزبی شیوعی دەورێکی گەورەی نەبو، بچوک بون، حیزبی شیوعی لە چلەکاندا لە ١٩٤٨ –١٩٤٩ گەورە و بەهێز بوبو، پاشان شکان و توشی نوشستی هاتن. زۆر لە سەرکردەکانی خیانەتیانکرد، ئەوانە بون بەهۆی ئەوەی نوشستی بهێنن.

هەتا بەهادین نوری بو بە سکرتێر و مەسەلەی ئیعترافی راگرت، هەرچەندە حەمید عوسمان لە زینداندا، ئیعتیرافی نەکرد، ئەوەی ئیعتیرافاتی لە دادگا ڕاگرت، بەهادین نوری و حەمید عوسمان بون، حیزبیان سەرلەنوێ بیناکردەوە.

حیزب دوای چواردەی تەمموز زۆر بەهێزبو، ئەندام و دۆست و لایەنگیری زۆربو، جەماوەرەکەی ئێجگار زۆربو. باوەڕکە بەبێ زیادەڕەوی سەدی شەست و پێنجی عێراق لەگەڵ حیزبی شیوعی بو، هەتا لەکوردستان ئەوان لە پارتی زۆرتربون.

*** بەدەر لەمانە، چ خالێکی هاوبەشت لەگەڵ حیزبی شیوعی هەبو؟**

- چەند شتێکی تریش هەبون، منی لەگەڵ حیزبی شیوعیدا کۆدەکردەوە: لە ساڵی ١٩٤٨ لە پۆلی یەکی ناوەندی بوم و هەڵیان بژاردم بە نوێنەری یەکێتی قوتابیانی کۆیە. لە کۆنگرەی یەکێتی قوتابیانی گشتی عێراق کە بە سەرپەرشتی حیزبی شیوعی بو، لەوێ ئێمە وەکو پارتی هاوکاریمان هەبو لەگەڵ خوێندکارانی شیوعی، ئەوکاتە لە عێراق دو بەرە هەبون، بەرەی قەومیەکان و بەرەی دیموکراتییەکان. بەرەی دیموکراتیەکان، بریتی بون لە: حیزبی شیوعی، حیزبی وەتەنی دیموکراتی، حیزبی شەعب و پارتی، نوێنەری ئەم حیزبانە لە کۆنگرەدا بەشداربون.

من لە قۆناغی ناوەندی، وەک نوێنەری قوتابیان دایانابوم، لەناو قوتابیاندا نیوەی ئێمە بوین و نیوەی حیزبی شیوعی بون، بەڵام هاوکاریمان هەبو. هەروەها لە کۆنگرەی یەکێتی گشتی خوێندکارانی عێراقیدا (الاتحاد العام لطلبة العراق) بەشداربوم کە بە کۆنگرەی (سباع) ناوی دەرکرد.

ئێمە هاوکاریمان هەبو لەگەڵ حیزبی شیوعی، تا توشی نوشستی هاتن و لێپرسراوەکانی دەرەوەیان خیانەتیان کرد و هەرچی نهێنی هەبو بە حکومەتیان گوت.

*** کێ بون ئەوانەی خیانەتیان کرد، شایەتیان لەسەر کێدا، دوای ئەوە چارەنوسی حیزبی شیوعی بەچی گەیشت؟**

- ئەوانەی خیانەتیان کرد، بریتی بون لە عەبدولرەزاق عەبد، مالیک سەیف و ئەوانە شایەتییاندا لەسەر یەهودا سدیق و ئەوانەی خیانەتەکەیان کرد، شایەتیان لەسەر فەهد و محەمەد حسین شبیبی و محەمەد زەکی بەسیمدا و لە ئەنجامدا هەرسێکیان بە ئیعدامکردن دران و بەوهۆیەوە، حیزبی شیوعی توشی نەکسەیەکی

زۆر گەورە هاتن.[1]

ئەوکاتە ناکۆکی لە نێوان پارتی و حیزبی شیوعی سەری هەڵدابو، لەسەر مەسەلەی ئەوەی کە ئایا کورد دەبێت حیزبی سەربەخۆی خۆی هەبێت؟

لە کاری ڕۆژانەی خوێندکاراندا، هاوکاری باشمان لە نێواندا هەبو، من خۆم هەمیشە لایەنگیری ئەوەبوم، ئێمە و حیزبی شیوعی پێویستە بەیەکەوە هاوکاری بکەین، چونکە چومە جامیعە لە بەغدا، لەناو قوتابیە چالاک و ڕۆشنبیرە پێشکەوتوخوازەکاندا، شیوعیەکان زوربەی قوتابیانیان پێک دەهێنا و ڕۆڵی دیاریان دەبینی.

هەرچەندە ناکۆکیشمان هەبو، بەڵام بەیەکەوە هاوکاریمان دەکرد و لەسەر بنەمای (الوحدة و الصراع) کارمان دەکرد. لەسەر مەسەلەی یەکێتی قوتابیانی کوردستان، گیروگرفتیان لەگەڵدا دروستکردین و هاتن بە گژماندا کە دروستکردنی ئەو ڕێکخراوە، دەبێت بەهۆی پارچە پارچەکردنی قوتابیانی عێراق.

*** بەڵام حیزبی شیوعی بەهۆی کێشە ناوخۆییەکانیەوە، لەو ساڵانەدا توشی پارچە پارچە بون.**

- بەڵێ لە ساڵانی ١٩٥٣ - ١٩٥٤ حیزبی شیوعی بو بە سێ ڕێکخستنی شیوعی، یەکێکیان حیزبی شیوعی بە ناوی (القاعدة) کە خۆی بە حیزبە ڕەسەنەکە دائەنا و حەمید عوسمان سکرتێریان بو، حیزبێکی تر هەبو، بەناوی حیزبی شیوعی عێراقی (راية الشغيلة) کە عەزیز محەمەد و جەمال حەیدەری ڕێبەریان دەکرد، حیزبێکی تری شیوعی هەبو بەناوی (وحدة الشيوعيين) بە سەرۆکایەتی عەزیز شەریف.

ئێمە وەکو پارتی لەگەڵ حیزبەکەی عەزیز شەریف نزیک بوین، چونکە عەزیز شەریف کتێبێکی زۆر نایابی بە ناوی (المسالة الكردية في العراق) نوسی، دەربارەی مافی کورد و مافی چارەی خۆنوسین و دەربارەی یەکێتی عێراق، یەکێتیەکی بە زۆر سەپێنراوە، ئەو ناوی لێنابو (وحدة السلاسل و القيود) و بەرگریەکی زۆر ئازایانەی لە مەسەلەی کورد کردبو.

لە هەمان کاتدا ئێمە پەیوەندی خۆشمان نەبریبو، نە لەگەڵ (القاعدة) و نە لەگەڵ (راية الشغيلة) کە تازە دامەزرابو. ئەوان زۆرتر پێویستیان بەوەبو، لە ئێمە نزیک ببنەوە، لە کولیەی حقوق عەبدولرەزاق سافی لە من نزیک بو، سەردەمێک هەر من قسەم لەگەڵ دەکرد و شیوعیەکان مقاتعەیان کردبو.

لەگەڵ (القاعدة)ش، حەمید عوسمان سکرتێریان بو، پەیوەندیمان پەیداکردبو.

حەمید عوسمان ئەوکاتە سکرتێربو، ئەویش لەگەڵ پارتی بە هۆی نەژادی ئەحمەی عزیز ئاغاوە پەیوەندی پەیداکردبو و زۆر نزیک بوەوە، هەتا وا کاری تێکردبو، حیزبی شیوعی بەجێ هێشت و هاتە ناو پارتییەوە.

لە دوای ئەو، سەلام عادل بو بە لێپرسراوی یەکەمیان، لەگەڵ سەلام عادل نێوانمان باشبو. ئێمە لەو ساڵەدا ڕۆڵێکی زۆر باشمان بینی، لە نزیکردنەوەی هەر سێ پارچەکەی حیزبی شیوعی.

ئێمە وەک پارتی و هەر سێ حیزبە شیوعیەکە، خۆمان بە چەپ و مارکسی دەزانی، چەند کۆبونەوەیەکمان لە ماڵی ئەحمەد حەمەئەمین دزەیی کرد.

چەندین کۆبوونەوەمان کرد و هانمان ئەدان یەک بگرنەوە. توانیمان پەیوەندی نێوان (وحدة الشیوعین) و (القاعدة) زۆر نزیک بکەینەوە، عەزیز شەریف ڕاوبۆچونی مامۆستا ئیبراهیمی زۆر بەلاوە گرنگ بو، مامۆستا ئیبراهیمیش ئامۆژگاری کرد و هانی یەککگرتنەوەی ئەدان و گوتی: "ئێوە لەگەڵ حیزبی شیوعی یەکبگرنەوە، ئەوان بە ناوی حیزبی شیوعیەوە پێشتر ئیشیانکردووە، باشترە ئێوە بچنە ناو ئەوان و حیزبێکی بەهێزتر دروستدەکەن".

عەزیز شەریف، ئەو ئامۆژگاریەی مامۆستا ئیبراهیمی قبوڵکرد، حیزبی (وحدة الشیوعین)، تێکەڵ بو لەگەڵ حیزبی شیوعیە ئەسلییەکە (القاعدة). ئەوە هەنگاوێک بو لەپێناو یەکێتی شیوعیە عێراقیەکان و سەلام عادلیش نەرمیەکی زۆر باشی نواند، هەمیشە ئەوان پێیان دەگوتن ئینشیقاقی وخائین و ئینتهازی، ئەوانیش بە نەرمی وەڵامیان ئەدانەوە، ئەوانە سەهویان کردوە و هەڵەیان کردوە. ئەیان گوت: "کە دروست کردنی حیزبێک بەناو شیوعیەوە هەڵە بوە، بەڵام ئەوانە خەڵکی تێکۆشەرن و پێویستە ئێمە ڕێز لە خەباتیان بگرین"، ئەوەبو لە سەرکردایەتی حیزب قبوڵکران.

بەڵام (رایة الشغیلة) ئامادەنەبون یەکبگرن، تا خالد بەکداش سکرتێری جارانی حیزبی شیوعی سوریا، کەوتە بەینەوە و یەکی خستنەوە.

*** بەدەر لە کێشە ناوخۆییەکانی شیوعی، پەیوەندی پارتی و شیوعی بەرەو کوێ چو؟**

- دەربارەی پەیوەندی پارتی و شیوعی، دو پێشنیاز هەبون: یەکێکیان هی سەلام عادل بو کە دەیگوت: "ئێمە هەمو ئەو کوردانەی کە ئەندامی حیزبی شیوعین، دەنێرینە ناو پارتیەوە و پارتی دەکەینە حیزبی پێشرەوی خەڵکی کوردستان، بە مەرجێک هەندێک لە کادرە پێشکەوتوەکانی خۆمان بمێیننەوە بە

ئەندام لە حیزبی شیوعیدا، هەروەها هەندێک لە کادرە مارکسیەکانی پارتیش ببنە ئەندام لە حیزبی شیوعی" هەتا بەناو دەیگوت "یەکێکی وەکو مامۆستا ئیبراهیم ببێتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی"، یاخود ڕوی دەکردە من و ئەیگوت "لاوێکی وەکو تۆ بێتە سەرکردایەتی حیزبی شیوعیەوە".

بەڵام پارتی ئەی گوت: "با هەمو شیوعی و مارکسیەکان لەناو پارتێکدا یەکبگرن و سەرکردایەتیەکی هاوبەش دروستبکەن"، واتە حیزبی شیوعی حیزبێکی سەربەخۆبێت لە کوردستان و سەرکردایەتیە هاوبەشەکە هەردولا ئیدارە بکات. هەروەها لەناو پارتیدا ئەو بۆچونە هەبو، سەلام عادل، زەمانەیەک بدات بۆئەوەی ئەو حیزبە بە هەڵە نەچێت و لانەدا و کادێرە سەرەکیەکانی ئەندام بن لە حیزبی شیوعیدا.

ئێمە لە میهرەجانی ١٩٥٥ دا لەگەڵ شیوعیەکان هاوکاریمان کرد و من کرام بە جێگری سەرۆکی وەفدی عێراقی، هەروەها لە میهرەجانی ١٩٥٧ دا، واتا ئێمە دۆستایەتییەکی باشمان لە نێواندا هەبو، تا لقی کوردستانی حیزبی شیوعی بە سەرۆکایەتی کەمال فوئاد و حەمید عوسمان و ساڵح حەیدەری هاتنە ناو پارتیەوە، ئەو هاتنە ناوەیە، ماوەیەک ساردی لەنێوانماندا دروستکرد.

*** ئایا بەشداری تۆ لە کۆنگرەی سباعدا بەناوی پارتییەوە بو، یان وەک کەسایەتی مام جەلال و خوێندکارێکی کورد بو؟**

- کۆنگرەی سباع، کۆنگرەی یەکێتی خوێندکارانی عێراق بو، لە نوێنەری قوتابیانی قوتابخانە ناوەندی و ئامادەییەکان پێکهاتبو. من بەناوی کۆیەوە چوبوم، بەڵام هەمو کەس دەیزانی من پارتیم، هەروەها من هەڵبژێرام لەسەر نسبەتی پارتی بو، چونکە نسبەتێک درا بە پارتی و من وەک ئیحتیات دانرام و وەک پارتی تەرشیح کرابوم. کۆنگرەی سباع کۆنگرە نەبو، تەنها یەک کۆبوونەوەی کردنەوەی کۆنگرەکە بو لە گۆرەپانی سباع لە بەغدا.

*** لەو سەردەم و قۆناغەدا، حیزبی شیوعی ئەو جەماوەر و دەسەڵاتەی هەبو، بۆچی سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەست نەهێنا و نەیانتوانی دەسەڵات بگرنەدەست؟**

- بۆچی حیزبی شیوعی سەرنەکەوت؟ بەڕەئی من ڕێبازەکەی نەگونجاو بو، هەروەها سەرکردایەتیەکی نەبو، ڕێبازی ڕاست دەستنیشان بکات. سەردەمێک زۆر ڕۆیشت بەدوای کەریم قاسمدا، دروشمی (ماکو زعیم الأ کریم) یان هەمیشە

دوپاتدەکردەوە، دروشمێک بو عەبدولسلام دایهێنابو و ئەوان کردبویان بە دروشمی خۆیان. هەروەها لە کاتێکدا حەملەیەکی توند و تیژ هەبو لەسەر عەبدولکەریم، ئەوان بەوەوە نەئەوەستان کە تەنها بڵێن (الزعیم) بەڵکو دەیانگوت (الزعیم الأوحد..).

بە ڕای من، حیزبی شیوعی ئەو قۆناغەی تێیدابو باش هەڵی نەسەنگاند کە لە قۆناغی گۆرانی نیشتمانی دیموکراتیدایە. دەبوایە حیزبی شیوعی هەوڵ بدات لە واقیعەکە تێبگات و بزانێت ناتوانێ ئەو حوکم لە عێراق بگرێتە دەست، چونکە هەمو وڵاتانی دراوسێ و ناوچەکە دەکەونە دژی و روسیاش ئامادە نەبو شەڕی لەسەر بکات.

دەبوایە حیزبی شیوعی ئەو وەختە سیاسەتێکی نەرمونیانی بگرتایەبەر، سیاسەتی بەرەی نیشتمانی و لەگەڵ حیزبەکانی تر هاوکاری بکردایە و لەگەڵ کەریم قاسمدا شتێک نەکات بیترسێنێت، چونکە عەبدولکەریم قاسم زۆر یارمەتی حیزبی شیوعی ئەدا.

لە پاشان حیزبی شیوعی چەند هەڵەیەکی کرد، لەوانە ئەوان خۆیان بە کوێخای هەمو حیزبەکان دائەنا، هەروەها لەناو هەمو حیزبێکدا جەماعەتێکیان دروست کردبو سەربەخۆیانبون، بۆ نمونە، لەناو حیزبی (الوطني الدیمقراطي) جەماعەتێکیان دروستکرد، لەناو پارتیدا، هەمزە و نەژادیان دروستکردبو کە سەربەخۆیانبون. ئەمە وایکرد لەگەڵ بەشی زۆری پارتی و (الوطني الدیمقراطي) نێوانیان خراپ بێت و دەیانویست شتی کارتۆنی دروست بکەن، ئەو سیاسەتە زیانێکی زۆری لێدان.

*** لە ناکۆکی نێوان مەکتەبی سیاسی و بارزانی، حیزبی شیوعی پشتگیری بارزانی کرد و دوای دروستبونی یەکێتی، هەتا ئیمڕۆش حیزبی شیوعی زیاتر پشتگیری پارتی کردوە، هۆی ئەو هەڵوێستە یەک لایەنیە چییە؟**

- ئەزانی چی؟ لێردا ئەبێ شتێک بڵێم، لە ساڵی ١٩٦٤ کە ڕێککەوتنی (مشیر - بەرزانی) ئیمزا کرا، رای حیزبی شیوعی وەکو رای مەکتەبی سیاسی وابو. ئەو سەردەمە لایەنگری ئەو ڕێککەوتنە نەبون و بە پێچەوانەوە، بەیانێکیان بەناوی لقی کوردستانەوە دژی ئەو ڕێکەوتننامەیە دەرکرد.

لەو کاتانەدا، بروسکەی پیرۆزبایی خروشۆف (سکرتێری جارانی حیزبی شیوعی سۆڤیت) هات بۆ عەبدولسلام عارف کە ڕێککەوتنامەکە بە کارێکی باش باسدەکات و مەدحی دەکات و بە کاری دەوڵەتی ناودار دائەنێت، ئیتر حیزبی شیوعیش دوای

ئەو بروسکەیە هەڵوێستیان گۆڕا و پشتگیری رێککەوتنامەکەیان کرد.

هەروەها دەربارەی هەڵوێستی حیزبی شیوعی، مەسەلەیەک هەیە پێویستە باسی لێوەبکرێت، ئەویش ئەوەیە کە بەهادین نوری دەڵێت: "نوری شاوەیس ئەندامی حیزبی شیوعی بوە و خۆمان هێشتبومانەوە لەناو پارتیدا"، کاتی خۆی لە ١٩٥٩ دا نوری شاویس لەگەڵ ئەوانەبوە بەڵام لەگەڵ ئەوان نەچو، لەناو پارتی ماوەتەوە.

ئەگەر ئەو بۆچونەی بەهادین نوری ڕاست بێت، ئەوا نوری شاوەیس دەورێکی زۆر توندی بینی لە ناکۆکی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی و هانی ئەو ناکۆکیەیداوە. من پێموایە ئێستا کاتی ئەوەهاتوە قسەیەک بکەم و هیوادارم کە حەمید عوسمان و عەلی عەبدوڵلا و ئەوانەی ئاگاداری مەسەلەکە هەن، قسەی لەسەر بکەن، چونکە ئەگەر وابێت، ئەوا بەشێکی ئەو ناکۆکیە و زیادکردنی ئاگری دوبەرەکیە، دەگەڕێتەوە بۆئەو.[٢]

واتا، ئەگەر نوری شاویس ئەندامی حیزبی شیوعی بوبێت و بەنهێنی هاتبێتە ناو پارتیەوە، ئەوا بێگومان بەشێکی زۆری ناکۆکیەکە ئەگەڕێتەوە بۆ حیزبی شیوعی، مەبەستی بوە ناکۆکی بخاتە ناو ریزی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردەوە.

هۆیەکی تر کە حیزبی شیوعی زیاتر بەلای بارزانی و پارتیدا دایشکاندوە، دەگەڕێتەوە بۆئەوەی حیزبی شیوعی ناکۆکیە ئایدۆلۆجییەکەی لەگەڵ مەکتەبی سیاسی و پاشان لەگەڵ یەکێتی بو، چونکە مەکتەبی سیاسی و دوایی یەکێتی باڵی چەپی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد بون و خۆیان بە مارکسی-لینینی دەزانی، بە تایبەتیش کۆمەڵەی رەنجدەران کە رێکخستنێکی چەپ بو. بۆیە ئەوان لەو رێکخستنە چەپە دەترسان، لە هەمو شوێنێک منافەسەی فکریشمان لەگەڵیاندا دەکرد و ئێمە خۆمان بە نوێنەری ڕەشوڕوتی کوردستان دەزانی، بۆیە ئەوان سڵیان لە ئێمە دەکردوە، نەک لە پارتی کە بنەماڵەیەک سەرکردایەتی دەکات.

جگە لەوەی ڕۆڵی یەکێتی سۆڤیەت، تا ئەم ماوانەش، پەیوەندیان لەگەڵ پارتی باشتربو لە ئێمە.

*** بۆچی حیزبی شیوعی لە کاتی دو حکومەتیدا لە کوردستان، تەنها بەشداری حکومەتی هەولێریان کرد؟**

- هۆی ئەوەبو، ئێمە کاتێک لە هەولێر بەهۆی دەبابەی سەدام حسێن و هێزی سوپای عێراقیەوە دەرکراین، حیزبی شیوعی وای هەستکرد، ئیتر یەکێتی بو بە هێزێکی لاوەکی و وا بە ئاسانی ناگەڕێتەوە سەر ساحەی خەبات، بۆیە خێرا

بریاری بەشداریدا لە حکومەتی هەولێردا. حیزبی شیوعی هەمیشە هەوڵیداوە، لەگەڵ ئەو لایەدابێت کە هێزی هەیە، وەک چۆن لە دوای هەرەسەوە بە تەواوی هاوکاری بەعسیان کرد.

*** بە بۆچوونی تۆ، حیزبی شیوعی ئەتوانێ لەم عێراقە تازەیەدا کە ئەمەریکا دەسەڵاتی تێیدا هەیە، ڕۆڵێکی دیاربببینێ؟**

– بە ڕەئی من، حیزبی شیوعی لەم عێراقەدا دەتوانێ ڕۆڵی هێزێکی دیموکراتی پێشکەوتوخواز ببینێ. ڕۆڵی هێزێکی دۆستی کورد ببینێت، چونکە لایەنگیری مافی چارەی خۆنوسین و مافی فیدراڵە و دەتوانێ ڕۆڵێکی گرنگ لە دوارۆژی عێراقێکی دیموکراتدا ببینێ. گرنگە ئێمە یارمەتی حیزبی شیوعی عێراقی بدەین، بۆئەوەی بەهێز ببێتەوە و ببوژێتەوە و جێگەی خۆی لەناو جوڵانەوەی دیموکراتی عێراقدا بکاتەوە.

## هێزی بەربەرەکانی عێراقی

*** ئایا هێزی بەربەرەکانی عێراقی جاران، چەند توانیان ڕۆڵی گرنگ ببینن لە دژایەتی سەدامدا؟**

– ئەو مەسەلەیە دەگەڕێتەوە بۆ دو خاڵ، یەکەم: توانای حیزبەکان، دوەم: جدیەتی حیزبەکان، هەندێ حیزب وەکو ئێمە، سەرسەخت و ڕاست و ئازابوین لە دوژمنایەتی کردنی حکومەتی بەعس و زیانی زۆر و گرانمان لێداوە، تەماشای ئەو بەڵگەنامانەی حکومەت بکە کە گیراوە، بزانە چەند دژمنایەتی ئێمەیان کردوە.

هەندێ هێزی تر، وەک ئەنجومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامی کە هێزێکی گەورەی کاریگەربون لە دژی سەدام و ڕژێمەکەی و زیانی زۆریان لێکەوتوە، یاخود هێزێکی وەک حیزبی دەعوە کە خەباتی کردوە و قوربانی زۆریانداوە و زیانی زۆریان لە حکومەتداوە.

هەندێ لەو هێزانە لە دەرەوەی عێراق، توانیویانە چالاکی دژی ڕژێم بکەن،

من خەباتی دەرەوەشم بەلاوە زۆر گرنگە، چونکە پێموایە لەم سەردەمەدا ڕۆڵی کاری دەرەوە حاسم و چارەنوسسازە لەبەرئەوە کەسانی وەکو دکتۆر چەلەبی، یان دکتۆر ئەیاد علاوی و چەندەها کەسانی تر لە دەرەوە کاریان کردووە. بۆ نمونە لە ئەمەریکا لە کۆنگرێس و دەزگا جیاوازەکانی دەوڵەت خەڵکیان هانداوە لە دژی سەدام، ئەو کارەی ئەوان زۆر کاریگەرتر بوە لە کاری هەندێ حیزبی تر کە لە عێراق بون، ئەو کارانە بون بە یەکێ لە هۆکانی ئەوەی کە زیاتر هانی ئەمەریکایاندا دژ بە عێراق بۆ ڕوخاندنی سەدام، لەبەرئەوە نابێت ڕۆڵی دەورەوەش لەبیربکەین.

*** باشە ئەو حیزبانەی تاکو ئێستا زیاتر لە دەرەوە بون، ئەتوانن لە عێراقی تازەدا چ ڕۆڵێک ببینن، بە تایبەتی کە لە عێراقدا هیچ قورساییەکی سیاسیان نییە و خەڵکی عێراق ئەوەندە نایان ناسێ و ئەوان لە وڵاتانی دراوسێ و ئەوروپا کاریان کردوە.**

– ئەوە بەندە بەوەی ئەو هێزانە چەند دەتوانن جەماوەر لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە، ئەگەر بتوانن جەماوەری زۆر کۆبکەنەوە، ئەوا ئەتوانن رۆڵی باش و کاریگەر لە داهاتوی عێراقدا ببینن.

هەر هێزەش بەقەدەر خۆی ئەتوانێت ڕۆڵی خۆی ببینێ، بۆ نمونە حیزبی ئیسلامی عێراقی یەکێکە لەو حیزبانەی کە حیزبێکی سونیی ئیسلامیە و توانیویەتی خەڵکێکی زۆر لە خۆی کۆبکاتەوە. هەروەها حیزبی شیوعی وردە وردە خەریکە خەڵک لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە، بزوتنەوەی ئیشتراکی عەرەبی بە سەرۆکایەتی عەبدول ئیلا نەسراوی، دەستی کردوە و وردە وردە خەڵک لە خۆی کۆدەکاتەوە و دەیان و دەیان حیزب و گروپی بچکۆلەش لەملا و لەولا دروست بون کە ئەگەر هەمویان کۆبکەیتەوە، هێزێکی گەورەیان لێدروست دەبێت.

*** کۆبوونەوەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە لەندەن و سەلاحەدین لە ٢٠٠٣ دا، چ ڕۆڵێکیان هەبو بۆ داهاتوی عێراق؟**

– ئەو دو کۆنگرەیە، چەند کاریگەریەکیان هەبوە لەسەر باری ئێستای عێراق:

یەکەم: ئێستا ئەو مەجلیسە حوکمەی عێراق کە دروست بوە، بەری ئەو دو کۆبونەوەیەیە و زوربەی زۆری سەرکردەکانی هی ئەو دو کۆبوونەوەیەن کە لە لەندەن و سەلاحەدین پێش لێدانی عێراق لە بەهاری ٢٠٠٣ دا ئەنجامدرا.

دوەم: بەرنامەی لەندەن و سەلاحەدین رۆڵی گرنگیان هەبو لە داڕشتنی بەرنامەیەکی دیموکراتی پەرلەمانی فیدراڵی بۆ عێراقێکی یەکگرتو، هەروەها ئەو بەرنامەیەی سەلماند بەسەر بزوتنەوەی دیموکراتی ئیسلامی و نەتەوایەتی عەرەب لە عێراقدا، هەڵگرتن و سەپاندنی ئەو دروشمانە فەزڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆنگرەکانی لەندەن و سەلاحەدین.

سێیەم: ئەو تەباییەی لە نێوان حیزبەکاندا هەیە، ئەوەش لە ئەنجامی ئەو دو کۆنگرەیە دروست بوە.

چوارەم: ئەو تەباییەی گوایە لە نێوان ئەندامانی مەجلیسی حکوم پەیدابو، بەری ئەو کۆبونەوانەیە. جگە لەوەی ڕۆڵی بینی لە ڕوخاندنی ڕژێم، ئاسانکردنی کاری هاوپەیمانانیش بو بۆ سەرنگوم کردنی سەدام.

*** بێجگە لە حیزبەکانی بەشداربوی لەندەن و سەلاحەدین، ئایا کام لەو حیزبانەی ئێستا لەسەر گۆڕەپانی سیاسی عێراقن، ئامادەن پشتگیری مەسەلەی فیدراڵی هەتا جیابونەوەی کورد بکەن لە عێراق؟**

- هیچ حیزبێک نیە پشتگیری جیابونەوەی کورد بکات، هیچ حیزبێکم نەدیوە پشتگیری جیابونەوە بکات، بەڵام چ بەشداربوانی کۆنگرەی لەندەن و سەلاحەدین و چ ئەوانەی لە دەرەوەی کۆنگرەکان بون، وەکو حیزبی ئیسلامی عێراقی کە لەگەڵ ئێمە پرۆتۆکۆڵی ئیمزاکرد و داوای عێراقێکی دیموکراتی پەرلەمانی فیدراڵی دەکەن، بۆ نمونە سەرۆکەکەیان دکتۆر موحسین عەبدولحەمید لە کۆبوونەوەی مەجلسی حوکمدا پرۆژەیەکی پێشکەشکرد و قبوڵکرا، کە دەڵێ: "ئێمە عێراقێکی دیموکراتی پەرلەمانی فیدراڵی و سەربەخۆمان دەوێ کە ڕێز لە ئیسلام و بیروبڕوای زوربەی عێراقیەکان بگرێت".

هەروەها بزوتنەی سۆسیالیستی عەرەبی، لە بەرنامەکەیدا نوسیویەتی: "دەبێ ئیقلیمی کوردستان، فیدراڵی بدرێتێ لەسەر بناغەی ئیقلیمی و بەشەکانی تری عێراق لەسەر بنەمای لامەرکەزی".

هەروەها حیزبی شیوعیش، بەشداریی کۆبونەوەکانی لەندەن و سلاحەدین نەبوە، بەڵام پشتگیری ئەوەی کردوە کە گەلی کورد پێویستە مافی چارەنوس وەربگرێ و داوای عێراقێکی فیدراڵی کردوە.

*** لە ئێستادا ئەبێت مەرجی کورد چی بێت، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هێز و لایەنە سیاسیە جیاوازەکانی عێراق؟**

– ئەبێ دو شت بێت، یەکەم: ئایا ئەو هێزانە تا چ ڕادەیەک دیموکراتی بۆ عێراق دابین دەکەن، دوەم: تا چ ڕادەیەک فیدراڵی دەسەلمێنن بەو شێوەیەی خۆمان دەمانەوێت، واتا فیدراڵێکی ئیقلیمی خاوەن دەسەڵاتی تەواو لە خاکی تەواوی کوردستانی عێراقدا.

*** ئایا بۆ ئەو مەبەستەی ئاماژەت پێدا، ئەتوانرێت بەرەیەکی فراوان لە نێوان هێزی کوردی و عەرەبیدا دروست بکرێت؟**

– من پێم وایە ئێستا جۆرێک لە ڕێکەوتن هەیە لە نێوان هێزە کوردی و عەرەبیەکاندا، بۆنمونە ڕێکەوتنێکی مۆرکراو هەیە لە نێوان ئێمە و ئەنجومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامی عێراقی کە تێیدا باسی عێراقێکی دیموکراتی فیدراڵی و پەرلەمانی کراوە، هەروەها باسی ئەوەکراوە کە مافی چارەنوس بۆ گەلی کورد لە چوارچێوەی عێراقدا دابینبکرێت.

هەروەها لەگەڵ حیزبی ئیسلامی و حیزبی شیوعی، هەمان ڕێکەوتنی دوقۆڵیمان مۆر کردوە. کەواتە گرنگە ڕێکەوتنی لەو جۆرە لەگەڵ زوربەی زۆری هێزە عەرەبی و عێراقیەکاندا مۆربکرێت.

## پەراوێزەکان:

١- هەر سێ سەرکردەی حیزبی شیوعی عێراقی، (یوسف سەلمان یوسف (فهد)، محەمەد زەکی بەسیم، محەمەد حسێن شەبیبی) لە ١٤ شوباتی ١٩٤٨ لەلایەن دەسەڵاتدارانی پاشایەتی عێراقەوە ئیعدام کران.

٢- بەهادین نوری، لە ١٩٢٧/٣/١٦ لە قەرەداغ لە پارێزگای سلێمانی لە دایك بوە و لە ١٩٤٦وە بوە بە ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی، لە ١٩٤٩ تا ١٩٥٣ سکرتێری ئەو پارتە بوە. لە ١٩٩٤ رێکخراوێکی بەناوی "بزوتنەوەی دیموکراتی" دروستکرد، دەربارەی ئەندامێتی نوری شاویس نوسیویەتی (بۆ قبوڵکردنی لە ح.ش.ع. جگە لە من، هەریەکە لە سەلام عادل، زەکی خەیری و ئەبو عیس، ئاگاداربون و ئەندامێتیان قبوڵکرد. لە هەمان شوێندا دەڵێت، ئاخر جار لە شوباتی ١٩٧٩دا لە بەرلینی رۆژهەڵات بینیمەوە، گوتی: ئێستاش هەروەك جارانی کاتی قاسم، مەبەستی پەیوەندیەتی بە حیزبەوە"، بەهادین نوری نوسیویەتی و دەڵێ ئەم چاوپێکەتنەم بۆ عەزیز محەمەدیش گێرایەوە. بیرەوەریەکانی، چاپی یەکەم - تشرینی دوهەمی ١٩٩٢ - لاپەرە ١٨٤.

# کوردی تورکیا

*** کوردی تورکیا چ کاریگەرییەکیان هەبوە لەسەر کوردی عێراق؟**

- من هیچ نەم بیستوە، کوردی تورکیا کاریگەری بوبێت لەسەر کوردی عێراق، بەڵام کوردی عێراق، کاریگەری هەبوە لەسەر کوردی تورکیا. بۆ نمونە، یەکێتی رۆڵی گرنگ و کاریگەری هەبوە لە دامەزراندنی پارتی کرێکارانی کوردستاندا و یەکێتی ماڵ و بارەگاکانی خۆی بۆ (ئاپۆ) و لێپرسراوەکانی تریانی لە شام کردەوە و هاوکاری زۆری کردون، لە سەرەتای دروستبونیاندا و بەهێزە فەلەستینیەکانی ناساندن و چەکی دانێ و یارمەتی زۆری داون.

*** هۆی چیبو بزوتنەوەی کورد لە کوردستانی تورکیا لە پەنجاکان هەتا ناوەڕاستی حەفتاکان، کپ بو و هیچ جوڵانەوەیەکی سیاسی دیاری نەبو؟**

- کاک سەلاح، وەڵامی ئەو پرسیارە، باسێکی مێژویی ئابوری و سیاسی دەوێت، ئێستا ناتوانم وەڵامێکی تێر و تەسەل بدەمەوە، بەڵام شتێکی ئاشکرایە، تورکیا زۆر زەختی کردۆتە سەر کورد، لەبەرئەوە نەیتوانیوە وەک پێویست چالاک بێت. بۆ نمونە، هەتا ناوی کوردی و زمانی کوردی قەدەغە کردبو، هەمو رێگاکانی لە هێزە سیاسیە کوردەکان داخستبو، ماوەی نەهێشتبو حیزبێک، یان جوڵانەوەیەکی کوردی دروست ببێت. لەگەڵ ئەوەشدا سەرەتای جوڵانەوەی کوردی هەبو، کورد دەگیران و زیندانی دەکران.

*** کەی تۆ بۆ یەکەمجار بیستت، هێزێک هەیە بە ناوی (پ.ک.ک) و سەرۆکێکیان هەیە بەناوی ئاپۆ؟**

- مێژوەکەیم لەیادنیە، بەڵام دوای کودەتاکەی تورکیا بو لە ١٩٨٠ دا، ئێمە لە سوریا بوین، بیستمان جەماعەتێک کوردی تورکیا هاتون و ناویان لەخۆ ناوە (ئاپۆچی) و دوایی بەناوی (PKK) ناویان دەرکرد. هەر لەوێ ناکۆکیان لەگەڵ

کۆمەڵێکی تری کوردستانی تورکیا هەبو، ئێمە لە ڕێگای نەجمەدین بویکایە، بە سەلاح ناسرا بو لەگەڵ کەریم ئەحمەد کەوتینە نێوانیانەوە، شەڕەکە ڕابگرن و یەکتری نەکوژن، بە تایبەتی هەردولایان هەڵهاتبون و هاتبونە سوریا، ئەوکاتە زانیم، گروپێک بەناوی پکاکاوە هەیە.

*** بۆچی لەناو هەمو گروپەسیاسیەکانی کوردستانی تورکیادا، پکاکە توانی زیندوبێ و گەشەبکات و بەرەو پێشەوە بچێ؟**

- بەڕەئی من، یەک هۆی سەرەکی هەیە، ئەویش ئەوەیە، کە پکاکە، یەک خاسیەتی گەشەکردنی کۆمەڵگای کوردی گەیشتبو، ئەویش ئەوەبو لە کوردستان لە چەرخی بیستەمدا و بۆئەوەی هەر حیزبێک گەشەبکات، پێویستە خەباتی چەکداری بکات، بێ خەباتی چەکداریی و تەنها بە خەباتی سیاسی و ڕێکخستن و ئیعلامی، کاری سیاسی ناچێتە پێشەوە.

پەکەکە ئەو ڕێگایەی گرتەبەر، ڕێگای خەباتی چەکداری و هێزەکانی بردە شاخ و چالاکیەکانیان دەنگی دایەوە لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا، بو بەهێزێکی گەورە. ئەو حیزبانەی زۆر گەورەتربون لە پەکەکە، چونە ئەوروپا و ساحەی کارکردنیان لە کوردستان و شاخی کوردستانەوە گوێزایەوە بۆ ئەوروپا و لە خەڵکی وڵاتەکەیان دور کەوتنەوە، ئەو سیاسەتە بوەهۆی کزبوونیان و وردە وردە هێزیان نەما.

مانەوە لە کوردستان، وای لە پکاکە کرد کە بەهێزبێت. پکاکە ئەو ڕاستیەی زانی، بۆ گەشەکردنی هێزێکی سیاسی لە کوردستان، خەباتی چەکدار پێوستە و ئەوانیش کۆمەڵێ دروشمی ڕەنگاو ڕەنگ و جوانیان هەڵگرت، خەڵکی بەلای خۆیاندا ڕاکێشا.

*** دەوترێت، پکاکە و ئاپۆ تەنها وەک حیزب و سەرۆکی حیزب نین بۆ کوردی تورکیا، بەڵکو وەکو گروپێکی دینیان لێهاتوە و سەرۆکەکەیان زۆر پیرۆز دەکەن، بێ گوێدانە هەڵوێستی سیاسی؟**

- من پێموایە، ئەو خەباتەی پکاکە کردی، بوەبەهۆی ئەوەی پکاکە ببێتە حیزبێکی گەورە لەناو جەماوەری کوردستانی تورکیادا. ئەو حیزبە گەورەیە، ڕێگایەکی تایبەتی هەبو لە ئیشکردندا، ئەویش لەسەر بناغەی (عیبادەتی فەردی) بو، ئەو عیبادەتە وای خەڵک پەروەردە کردوە، بەبێ ئاپۆ نە حیزب دەبێ، نە شۆرش دەبێت، نە کورد دەمێنێ.، وای لە کوردی تورکیا گەیاندبو کوردایەتی لە

ئاپۆدا خۆی دەنوێنێ. وایان نیشان ئەدا، ئاپۆ قارەمانێکی بێ وێنەیە، هیچ هەڵە ناکات و هەرچی بکات حیکمەتێکی تێیدایە.

***دوا ڕۆژی کوردستانی تورکیا چۆن دەبینی؟ ئایا بەئەندامبونی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپادا، باشە بۆ کورد یاخود خراپە؟**

- من زۆرم پێباشە من پێموایە دواڕۆژی خەڵکی کوردستانی تورکیا لە دیموکراسی و دەوڵەتێکی دیموکراسی تورکیادایە. من پێموایە ئیمکانیەتی جیابونەوەی کوردی تورکیا لەم قۆناغەدا نیە، لەبەر چەند هۆیەک، گرنگترینیان بریتیە لەوەی کە کورد وا پەرش و بڵاو بۆتەوە لە تورکیادا، هەمو لە یەک ناوچە نیشتەجێ نین، واتا ئێستا کوردی دەرەوەی کوردستان زۆرترن لە هەندێ لەو شوێنانەی پێیدەگوترێ کوردستان. لەو شوێنانەش کە پێیدەگوترێ کوردستان، ژمارەیەک زۆر غەیری کوردی لێیە. کۆمەڵگایەکی تێکەڵاو دروستبوە، هەتا لە ڕوی گوزەرانەوە و لەڕوی ئابوریەوە سەرمایەی کورد زیاترە لە ئەستەمبوڵ و ئەزمیر و ئەنقەرە، وەک لەوەی لە دیاربەکر و وان و بەتلیس بێت. ئەمەش وایکردوە، بەرژەوەندی ئابوری کورد، لە دەرەوەی کوردستان بێت.

بۆیە من پێموایە کە بۆ کوردی تورکیا باشترە، تورکیا ببێتە وڵاتێکی دیموکراتی ڕاستەقینە و ئەو دەوڵەتە دیموکراتیە واز لە سیاسەتی ئازاردانی جیاوازی نەتەوایەتی بهێنێت. ئەمەش بە چونە ئەوروپا دێتەدی، بۆیە من لایەنگیری ئەوەم، تورکیا بچێتە ناو یەکێتی ئەوروپاوە.

# کوردی ئێران

*** کەی یەکەم هاوڵاتی و کەسایەتی کوردی ئێرانتان ناسی و لە کوێ؟**

– ساڵی ١٩٥٢ بو، وا بزانم کاتێ بو، من قوتابی بوم لە پۆلی یەکی حقوق و مامۆستا زەبیحیم ناسی. دیارە پێشتر هەژارم دەناسی، بەڵام هەژار وەکو شاعیرێک ناسرابو، مامۆستا زەبیحی زیاتر وەک سکرتێری ژ.ک و سیاسیەکی چالاک ناسرابو. ئەوم لە سەفارەتی سۆڤیەتی ناسی، سەیرەکە ئەوەبو کە یادی جەژنی ئۆکتۆبەر بو، من بانگ کرابوم و چومە سەفارەتی سۆڤیەتی، هەرچەندە چون بۆئەوێ مەترسیدار بو.

زەبیحی لای کابرایەک بە ناوی عەبدوڵڵا کاری دەکرد، ڕیستۆرانێکی هەبو لە بەغدا، عەبدوڵڵا بە ڕەگەز مهابادی بو، زەبیحی گرتبوە خۆی و لەوێ کاری دابویە. لەو یادەی سەفارەتی سۆڤێتیدا زەبیحی لەوێ بو، ئیدارەی دەعوەتەکەی دەکرد، بۆیە من لەوێ بینیم و ناسیم، بەڵام پێش ئەوە ناویم بیستبو.

یەکەم کەسیش کە بەناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بینیم، غەنی بلوریان بو، هاتبو بۆ عێراق، وابزانم ئەویش ساڵی ١٩٥٣ بو، هاتبو بۆئەوەی پەیوەندی لەگەڵ هێزە سیاسیە عێراقیەکان و بە تایبەتی حیزبی شیوعی دروست بکات. من خۆم مەترجمی بوم بۆلای عەزیز شەریف و چەند لێپرسراوێکی تری حیزبی شیوعی.

دوای غەنی بلوریان، ئینجا عەبدولڕەحمانی قاسملۆ هات بۆ کوردستانی عێراق و ئینجا ئەحمەد تۆفیق و دواتر مەلا عەبدوڵڵای حەسەن زادە و بەو شێوەیە.

*** کاریگەریی کۆماری کوردستان، لەسەر گەشەکردنی فیکری تۆ وەکو گەنجێک چی بو؟**

– لە ڕاستیدا، من کۆماری کوردستان ڕای کێشام بۆناو سیاسەت. کۆماری مهاباد لە کۆیە زۆر دەنگی دابۆوە، ئەویش بەهۆی ئەوەی چەند کۆییەک چوبون بۆ مهاباد، وەک ڕئیس عەبدولکەریم حەوێزی، مستەفا خۆشناو، تۆفیق وردی و

دڵشادی ڕەسوڵی، ئەوانە کەسانی ناسراو و ڕۆشنبیر و سیاسەتمداری کۆیە بون.

لە یادمە، وێنەی مەلا مستەفا و قازی محەمەد پێکەوە لە کۆیە بڵاوبوبۆوە، عومەر دەبابە وێنەیەکی دامێ، ئەوکاتە قوتابی سەرەتایی بوم. ئەو ڕوداوانە کاریگەریەکی زۆریان هەبو لەسەر گەشەکردنی بۆچونی سیاسیم.

شتێکی تریش هەبو، بۆچونی ئێمەی بەلای چەپدا ڕاکێشا، ئەویش ئەو دەنگوباسەبو، مهاباد بە یارمەتی یەکێتی سۆڤێت دەبێتە کۆماری کورد، کەواتە سۆڤیەتیش دۆستی نزیکی کوردە. ئەوکاتە شیعرەکانی هەژار بەسەر ستالین و سۆڤێتدا، لە هەمو لایەک بڵاوبوبۆوە و زۆری خەڵک لەبەریکردبو.

جگە لەوە سەلاحەدین، شتێک تریش هەیە کە ئەمەوێ بیڵێم، ئەویش ئەوەبو من خوێندکارێکی زیرەک بوم و هەموساڵێک بە یەکەم دەردەچوم و لەو قوتابیانە بوم کە شیعرم زۆر لەبەربو، هەروەها ئەوکاتە قوتابیان بەیانیان ریز دەکران و یەک، دو کەسیان بانگ دەکرد، شیعر بخوێننەوە. من یەکێک بوم لەو قوتابیانەی کە هەمو ڕۆژێک بانگ دەکرام بۆ شیعر خوێندنەوە، بۆیە ناچاربوم شیعر لەبەربکەم. هەروەها ئەو شیعرانەی لەبەریشم دەکردن، شیعری کوردایەتی و کورد پەروەروەری بون و سەرنجی مامۆستاکانم ڕاکێشابوون.

ئەوەی زۆریش منی بە کۆماری مهاباد ئاشناکرد، عومەر دەبابە بو. کاکە دەبابە هەرچی کتێب و وێنەی تازەی لەو بارەیەوە هەبو، زو ئەیدامێ لەوانە ڕۆژنامەی کوردستان. کاکە دەبابە پەیوەندی لەگەڵ کوردستانی ئێران هەبو، چونکە ئەوان بە ڕەگەز مهابادی بون و لە مهاباد خزمیشیان هەبو و هاتوچۆیان دەکردن.

*** هۆی چی بو لە ساڵانی پەنجا و شەستەکاندا، کوردی ئێران نەهاتنە ناو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقەوە، ئایە خۆیان حیزب و بزوتنەوەی سیاسیان نەبو؟**

- کوا..؟ هاتنە ناوەوەی کوردی ئێران بەو شێوەیە نەبوە، خەڵکانی وەک زەبیحی، دوای روخاندنی کۆماری کوردستان هاتنە سلێمانی و لای شێخ لەتیف مانەوە و هەوڵیاندا حیزبی دیموکرات ببوژێننەوە، بەڵام سەرینەگرت و حیزبی دیموکراتی بۆ نەژیایەوە، لەبەرئەوە کەوتە چالاکی لەناو پارتیدا، ئەوەبو دوایی لەگەڵ هەمزە عەبدوڵڵا تێکچون و هەمزە دایشکاندەوە بەلای حیزبی شیوعیدا.

جگە لە زەبیحی، دڵشادی ڕەسوڵی، هەژار، حەسەنی قزڵجی، هاتنە ناو پارتیەوە، قزڵجی زیاتر لایەنگری حیزبی شیوعی گرت. لەو کاتانەدا کوردستانی

عێراق بو بە مەیدانی خەبات و کاری سیاسی، بۆ هەمو پارچەکانی کوردستان، بۆیە ئاسایی بو کە کوردێک ببێت بە ئەندامی پارتی.

*** ئەی کەواتە بۆچی خەباتی چەکداری لە شەست و حەفتاکاندا، لە کوردستانی ئێران زو هەرەسی هێنا؟**

- ئەوە چەند هۆیەکی هەبو:

یەکەم: ئەو بزوتنەوە چەکدارانە دەستیان پێکرد، هەمویان بچوک بون، ئەوە نەبون حیزبێکیان لە پشتەوە بێت و حیزبەکە پێشرەویان بکات.

دوەم: پەلە کردنیان، ئەوانە چاوەڕێیان نەکرد هەتا هەمو پێکەوە بزوتنەوەیەکی باش و گەورە و ڕێکوپێک دروست بکەن، جەماوەر بیانناسێت و پشتگیریان بکات.

سێیەم: سیاسەتی هەڵەی مەلا مستەفا، ئەوەبو کە شەڕی کردن، هێزی نارده سەریان و هەندێکیانی گرت و هەندێکیانی کوشت، ئەوە کاریگەریەکی زۆری هەبو بۆ بێهێزکردنیان، چونکە شۆڕشی کوردستانی عێراق و سەرۆکەکەی و سەرکردایەتیەکی وەکو مەلا مستەفا کەوتە دژیان، ئەمە لە هەمو ڕویەکەوە زیانی لێدان.

چوارەم: شای ئێران زۆر بە دڕندانە و بە توندی لێیدان، بێگومان ئەگەر سەرکردەی وەک مەلا ئاوارە و ئیسماعیلی شەریف زادە، زو نەکوژرانایە، دڵنیام بزوتنەوەکە بە شێوەیەکی تر دەڕۆیشت.

هەروەها شتێکی تریش هەیە دەمەوێت بیڵێم، بەڕاستی سیاسەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بریتی بو لە ئەحمەد تۆفیق، بە عەبدوڵڵا ئیسحاقی ناسراوە، سیاسەتێکی ناڕاست و گێرەشێوێنانەی گرتەبەر و ڕۆڵێکی زۆری هەبو، لە ڕێگرتن لە پێشکەوتنی جوڵانەوەی کوردستانی ئێران.

*** بۆچی خەباتی سیاسی و جەماوەری لە کوردستانی ئێراندا، هەڵنەچوە و گەشەی نەکرد؟**

- چەند هۆیەک هەن، لەوانە:

یەکەم: کۆمەڵگای کوردستانی ئێران دو جۆرە، بەشە پێشکەتوەکەی لەڕێی کار و خوێندەواریەوە چونەتە پێشەوە و بە مەزهەب، شیعەن و لە ناوچەی کرماشان دەژین. ناوچەکانی بۆکان و مهاباد، پیشەسازی و خوێندەواری کەمتر

تێیدابوە، شاری وەک کرماشان لەژێر کاریگەری شیعەگەریدابوە و کەمێ دوربون لە کوردایەتیەوە و زیاتر ئێرانچێتیان کردوە، یاخود دەچونە ناو حیزبە ئێرانیەکانەوە، وەک حیزبی تودە، یان بەرەی میللی یان چوونەتە حیزبەکانی تری ئێرانیەوە، ئەوان کەمتر هاتوونەتە ناو حیزبە کوردستانیەکانەوە. بۆ نمونە، هەستی نەتەوایەتی ناوچەی ئەردەڵان بە شاری سنەشەوە، پێش دروست بونی کۆمەڵە زۆر کزبوە.

نزیکەی نیوەی کوردی ئێران شیعەن، ئەوە کاریگەریەکی گەورەی هەیە لەوەی، کە لە ڕوی کوردایەتیەوە زۆر نەچۆتە پێشەوە. هۆیەکی تریش ئەوەیە کە کوردستانی ئێران لە ڕوی خوێندەوارییەوە لە پاشبوە، لەم ساڵانەی دوایدا، کوردستانی ئێران وەک کوردستانی عێراق قوتابخانەی زۆری تێیدا بڵاوبۆتەوە.

دوەم: هۆیەکی تر، ئەوەبو کوردی عێراق مافی زیاتری هەبوە لە کوردی ئێران، بۆ نمونە سەربەستی لە کاری سیاسی و ڕۆشنبیریی و فەرهەنگی، هۆبون بۆئەوەی هەستی نەتەوایەتی لە کوردستانی عێراقدا زیاتربێت.

سێیەم: هۆیەکی تریش ئەوەیە، هەر لە دور تێیدەگرم و نازانم چەند ڕاست دەردەچێ ئەویش ئەوەیە، کوردستانی ئێران هەزاران ساڵە لەگەڵ ئێرانە، بەڵام ئێمە هەموی حەفتا ساڵە لەگەڵ عەرەب داین، ئێران لەو هەزار ساڵە کە کورد و غەیری کورد پێکەوە ژیاون، جۆرێک لە کولتور و خوڕەوشت و عادەت و ڕۆشنیری هاوبەشیان پێکەوە دروستکردوە و وەکو یەکی لێهاتوە و گەڵێک هەستی ئێرانچێتی دروست بوە لەناو خەڵکی کوردستاندا.

چوارەم: بێگومان لە ئێران ئەو سیاسەتە شۆڤێنیەی کە تورکیا و عێراق، بەرامبەر بە گەلی کورد گرتویەتیەبەر، ئەو واینەکردوە، ئێران نەی گوتوە، ئێران وڵاتی فارسە، هەر بۆیە وڵاتەکەش ناوی ئێران بوە، چونکە ویستویەتی نیشانی بدات کە ئێران، کورد و فارس و عەرەبیش دەگرێتەوە. هەروەها وشەی کورد و کوردستانی قەدەغە نەکردوە، بە پێچەوانەوە ناوچەیەکی ناوناوە (کوردستان) هەرچەندە ئەوە زۆرزانیەکی تێیدایە، ئەویش بۆئەوەی ناوچەکانی تر خۆیان بە کوردستان نەزانن.

پێنجەم: هەروەها کاریگەریی فەرهەنگی ئێرانی لەسەر هەمو میللەتان هەیە، لەوانەش لەسەر کورد، ئەو کاریگەرە ئەوەندە زۆربوە، وایکردوە هەمو ئەو میللەتانە ئەو فەرهەنگە بە هی خۆیان بزانن.

شەشەم: هۆیەکی تریش ئەوەیە، حیزبی تودە، حیزبێکی چەپی چالاکی

گەورەرە بوە و دەسەڵاتێکی زۆری هەبو لە کوردستان و زۆر لە ڕۆڵەکانی کوردی بەلای خۆیدا ڕاکێشابو و نەیدەهێشت کوردایەتی بکەن.

*** هۆی چیە کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، دوای شەهیدبونی قاسملو و شەرەف کەندی، نەیتوانی سکرتێرێکی کاریزما، یان کەسایەتیەکی وەکو ئەوان بێنێتە کایەوە؟**

- من پێموایە کاڵا بەقەد باڵایە، حیزبی دیموکرات ئەم کەرەستەیەی هەیە، لەم کەرەستەیە ئەمەی لێدەردەچێت، بۆ نمونە دکتۆر سادقی شەرفکەندی لەو کەرەستەیەدا هاتەکایەوە و دوای ئەویش عەبدوڵڵای حەسەن زادە هاتەکایەوە و بەوشێوەیە.

خۆشت دەزانی، سەرکردەیی کاریزما و هەڵکەوتو لە پرۆسەیەکی مێژویدا دروست دەبێت. بۆ نمونە هەر سەرکردەیەک وەرگری، لەوانە باسی خۆم بکەم، من لە دوێنێوە دروست نەبوم، ئەوە چل تا پەنجا ساڵە ئەو شکڵەم وەرگرتوە، ئێستا هەمە. یا بنەماڵەی بارزانی، لە پرۆسەی خەباتی درێژدا ئەو شکڵەیان وەرگرتوە. حیزبی دیموکراتی کوردستانیش بە هەمان شێوە لە پرۆسەی ژیانەکەیدا، ئەو شکڵەی وەرگرتوە کە هەیانە.

*** هەڵەکانی حیزبەکانی کوردستانی ئێران چی بون، دوای شۆڕشی ئێران؟**

- من پێم باشە برادەرانی کوردستانی ئێران، یان حزبی دیموکرات خۆیان وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە!

*** بۆچی یەکێتی هاوکاری چەکداری کوردی ئێرانی کرد؟ ئایا ئەوە بە خاڵێکی سلبی نەشکایەوە بۆ پەیوەندی یەکێتی لەگەڵ حکومەتی ئێراندا؟**

- بەڵێ ڕەنگە بە سلبی شکابێتەوە لای حکومەتی ئێران، بەڵام ئەو کارە هەڵە نەبو، بەڕای من مەرجی ئەو سەردەمە ئەوەی دەخواست، یا دەبوایە لەبەرچاوی خۆمان قبوڵ بکەین کە کوردی ئێران دەربەدەر بکرێ و سەرببڕێ و تێدابچێت، یان دەبوایە بچین بە فریایانەوە، ئێمەش بریاری دوەممان هەڵبژارد کە بچین بە فریایانەوە، ئەگینا ئەوکاتە هەمویان لێیان قەومابو هاتبونە تورەڵە و ناوزەنگ. واتا بستە زەوییەکیان بەدەستەوە نەمابو، ئێمە ناچاربوین شان بدەینە بەریان، یان کە چونەوە دیسان یارمەتیماندان. من پێموایە ئەوە یەکێکە لە شانازییەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەرامبەر بە کوردی ئێران کردویەتی.

*** دوای شۆڕشی ئێران، یەکێتی لە کوردستانی ئێران جەماوەرێکی زۆری هەبو، بۆچی لەوێ لقێکی یەکێتیتان دروست نەکرد؟**

– چونکە باوەڕمان بەوەنەبو، لە بەشەکانی تری کوردستان لق دروست بکەین. من پێموابو ئەگەر دروست بکرایە باشتردەبو، واتا یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەوڵی بدایە یەکێتی نیشتمانی کوردستانی لە ئێران دروست بکات، ئەوکاتەش لەگەڵ کۆمەڵە یان هەندێ هێزی تر یەکیان بگرتایە، ئەوا هێزێکی باش و گەورەی لێدروست دەبو. من ئەگەر ئێستا بگەڕێمەوە ئەو سەردەمە، دەنگ بەوە دەدەم، لەوێ وەکو یەکێتی نیشتمانی کاربکەین.

*** یەکێتی زیاتر لە پارتی هاوکاری حیزبی دیموکراتی کردوە، بۆچی لێپرسراوانی حیزبی دیموکرات زیاتر دۆستایەتی پارتی دەکەن، یاخود هەر هیچ نەبێ وەکو یەک سەیری هەردولا دەکەن؟**

– من پرسیارەکەت بە کەمدەزانم! یەکێتی تەنها یارمەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی نەداوە، یەکێتی شەهیدی داوە لەسەر حسابی حیزبی دیموکراتی کوردستان. پارتی دیموکراتی کوردستان خەڵکی لە حیزبی دیموکراتی کوردستان شەهیدکردوە و لێی کوشتون و شان بەشانی پاسداران شەڕی کردون.

لە سەردەمی شادا، ڕاوی کادێرەکانی کردون و ئێمەش بە پێچەوانەوە لەسەر ئەوان لەگەڵ دەوڵەتی ئێران و لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران دۆستایەتیمان هەبوە تێکمانداوە، هەتا ناویان لە ئێمە نابو (هێزی پشتیوان) کە پشتیوانیمان کردون.

نازانم نمەکمان سوێرە و بەدبەختین، چۆنی تەفسیریکەم و بلێم چی؟ ئەوە بێوەفاییە! ئێمە ئەو هەمو هاوکاریانەمان کردوە، هەتا ئێستاش لەگەڵ حیزبی دیموکرات دۆستین، بەڵام بەداخەوە کە حیزبی دیموکرات بەو شێوەیەیە، باشدەبێت ئەو پرسیارەش لەوان بکرێت.

*** ئەگەر وایە، بۆچی یەکێتی لە کۆتایی تەمووزی ١٩٩٦دا ڕێگای دا هێزی ئێرانی هێرش بکەنە سەر بارەگای حیزبی دیموکراتی ئێران لە کۆیە؟**

– ڕێگادانی بەم شێوەیەبو: ئەوکاتە ئێران بڕیاری دابو، بێتە سەر حیزبی دیموکرات، ئێمە دەمانزانی کە دێن، بۆیە چوین حیزبی دیموکراتمان ئاگادارکردەوە کە فلان ڕۆژ هێزی ئێرانی دێتە سەرتان و ئاگاتان لە خۆتان بێت و جێگاکانتان چۆڵکەن و دوایی بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆتان.

ئەوەبو کە ئێران هات و چەند تۆپێکیان پێوەنان، هیچ زیانێکی گیانیان نەبو، ئەوە لە ئەنجامی ئەوەبو کە سیاسەتەکەی ئێمە شتێکی ڕاست بو.

*** بەو پێیەی ئێوە دۆست و هاوخەباتتان لەناو کوردستانی ئێران، کەم نەبون، بۆچی لەناو سەرکردایەتی یەکێتیدا کوردی ئێران یان سیاسەتمەداری چەپی کوردی ئێرانی دروست نەبو؟ وەک چۆن عومەر شێخ موس کە کوردی سوریا بو، بو بە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی؟**

- هۆکەی ئەوەبو، کوردی ئێران لە وڵاتەکەی خۆیان خەباتیان دەکرد و تێکۆشانیان هەبو، حیزبیان هەبو، بەڵام لە سوریا شتێکی بەو شێوەیە نەبو. بۆنمونە عومەر شێخ موس حیزبێکی نەدەدۆزییەوە لە سوریا، شایستەی ئەوەبێ بچێ کاری لەگەڵدا بکات. بەڵام کوردی ئێران، ئەهاتنە کۆڕی خەباتەوە، چ ئەوانەی کۆمەڵەیان دانا و چ ئەوانەی دیموکرات، حیزبی تایبەت بە خۆیان هەبو، لەوێ خەباتی سیاسیان دەکرد.

*** داوارۆژی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە ئێراندا بەرەو کوێ ئەچێت؟**

- من پێموایە جوڵانەوەی ڕزگاری کوردستانی ئێران بەرە و دو دەربەندی سەرەکی دەچێت، حیزبی دیموکراتی کوردستان، لەسەر شێوەی دێرینی خۆی و کلاسیکی خۆی درێژە بە خەبات دەدات و جەماوەری خۆی هەیە، ئەوی تر کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانە، بە شێوەیەکی نوێ هاتۆتە مەیدانەوە. من پێموایە دو هێزی گەورەو چەپ و دیموکرات لە کوردستاندا گەشە دەکەن وەکو ئێمە و پارتی، چۆن دو هێزی سەرەکین ئەوانیش دو هێزی سەرەکین لە کوردستانی ئێراندا و لە ئایندەدا گەشەدەکەن.

# کوردی سوریا

*** دەوترێت کە کوردەکانی سوریا لە روی سیاسیەوە خۆیان رێکنەخستوە، بەڵکو بەسەر حیزبەکانی کوردستانی عێراق و تورکیادا دابەشبون، ئەم بۆچونە چەند راستە؟**

– ئەوە راست نیە، حیزبەکانی کوردی سوریا بە یارمەتی کوردی عێراق و ئێران دروست بون، لە سەرەتادا زەبیحی و هەژار و من، رۆڵمان هەبو لە دروستکردنی حیزبەکانی سوریادا و دوایی ئەوانیش کەوتنە ژێر کاریگەری پارتی و بارزانیەوە. لە سایەی سیاسەتی جەلالی و مەلایەوە، ئەوانیش بونە سێ، چوار پارچەوە. پێموایە دوایی وردە وردە کاربەدەستانی سوریاش، ئیشی تێیداکردن و کردنی بە گروپی بچوک بچوکەوە.

ئێستا هەشت، نۆ حیزبی کوردی سوریا هەیە، بەڵام بەداخەوە هێزێکی سەرەکی دیاریان تێیدانیە. بەڵام وا پەرتوبڵاو بونەتەوە کە ناتوانیت بڵێیت یەک ریزن، یاخود یەکێتی ریزی کوردەکانی کوردی سوریا هەیە.

*** بۆچی کوردی سوریا نەیتوانیوە خۆی وەک کوردی عێراق، لە هێزی سیاسیدا خۆی رێک بخەن؟**

– سەردەمێک لە کوردستانی عێراقیش کە ئازادی سیاسی نەبو و زوڵم و چەوسانەوە هەبو، بە هەمان شێوەبو، بۆئەوەی جەماوەری زۆرت لێکۆبێتەوە، پێویستت بە ئازادی سیاسی هەیە، پێویستت بەچالاکی هەیە، چونکە خەڵک هەروا لە هیچ هێزێک کۆنابێتەوە.

*** داخوازی کوردی سوریا زۆر دژوارنیە، بۆچی حکومەتی سوریا داخوازییەکانیان بۆ جێبەجێ ناکات؟**

– بەرای من سوریا لە سەرەتاوە سەرچاوەی جوڵانەوەیەکی ناسیۆنالیستی عەرەبی بوە، ئەم جوڵانەوەیە لەژێر سەرکردایەتی میشێل عەفلەق و چەند

کەسانێکی مەسیحی بوە. ئەوانە بۆئەوەی خۆیان نیشان بدەن، تەتەرفیان کردوە لە عەرەبچێتیدا و تەتەرفیان کردووە لە زیاتر خۆ بەعەرەب ناساندن و سیاسەتێکیان دارشتوە بۆ بزوتنەوەی نەتەوەیی عەرەبی، شۆڤێنیە، ئەو سیاسەتە تاکو ئێستا بەردەوامە.

تەنها جیاوازیەکی هەیە، ئەویش ئەوەیە دەڵی: "ئەو کەسانەی عەرەب نین، بەڵام لە وڵاتی عەرەبیدا نیشتەجێن، ئەبێ دەربکرێن"، ئەم سیاسەتە شۆڤێنیە عەرەبیە لە سوریا لەناو عەرەبە سونیەکاندا بەهێزە، بەڵام عەرەبە عەلەویەکان بەو شێوەیە شۆفینی نین بەرامبەر بە کورد و عەتفیان لەسەر کورد هەیە.

بۆ نمونە، ئەگەر دو فەرمانبەر هەبن، یەکێکیان سونی و ئەوەی تر عەلەوی بێت، راستەوخۆ هەست دەکەیت، عەلەویەکە مامەڵەی لەگەڵ کورد باشترە لە سونیەکە.

*** تۆ پەیوەندییەکی کۆن و بەهێزت لەگەڵ لیپرسراوانی سوریا و بە تایبەتی سەرۆکی جاران حافز ئەسەد هەبو، ئایا چەند توانیوتە ئەو پەیوەندیە لە بەرژەوەندی کوردی سوریا بەکاربهێنیت؟**

- من ئەوەندەی توانیومە ئەو پەیوەندیەم بەکارهێناوە، بۆ خزمەتی کوردی عێراق و کوردی تورکیا. راستیەکەی ئەوەیە قەناعەتێکم هەیە ئێستاش دەمەوێت بیلێم، من لە کۆنەوە پێموابو مەسەلەی کوردی سوریا بەستراوە بە کوردی تورکیاوە.

لەروی خاکەوە، کوردی سوریا یەک پارچە زەوی دیاریان نیە، ئەگەر سەیری نەخشەی ئەو ناوچەیە بکەیت، دەبینی کە کورد لە یەک پارچەدانین، بۆ نمونە لە ناوچەی حەسەکە کوردی لێیە، دوایی لە تەنیشت ئەوانەوە عەرەب نیشتەجێن و بەو شێوەیە لە زوربەی شوێنەکان. ئەو شوێنانەی کوردی لێ نیشتەجێن، پارچە پارچە بون و لەیەک دابراون و عەرەب لە نێوانیاندا دەژین.

بەشی هەرە زۆری کوردی سوریا، لە تورکیاوە هاتونەتە سوریا، بۆیە من پێموابوە، مەسەلەی کورد لە سوریا وەکو مەسەلەیەکی نەتەوەیی، بەندە بە رزگار بونی کوردستانی ژورووەوە. بۆیە من هەوڵم داوە، دەسەڵاتدارانی سوریا والێبکەم، پشتیوانی جوڵانەوی کوردی تورکیا و خۆشمان بکەن. ئەو پشتیوانیەم پێگرنگتر بوە لەوەی بیکەم بە مەسەلەیەکی رۆژانە داوای داخوازی کوردی سوریا بکەم، من ناو بەناو قسەم کردوە لەسەر کوردی سوریا لە سنورێکی گونجاودا.

# مەسەلەی عەرەب و فەلەستین

*** تۆ بە دۆستی عەرەب دادەنرێیت و زۆر جاریش دەڵێن، عەرەبچێتیش دەکەیت، ئەم بۆچونە چەند ڕاستە و لە کوێوە سەری هەڵداوە؟**

– ئەگەر مەبەست لە عەرەبچێتی ئەوەبێت، من پشتیوانی لە خەباتی گەلی عەرەب دەکەم و پێم خۆشبوە، کە خەباتی گەلی عەرەب لە پێناوی سەربەخۆیی و دیموکراتی و یەکگرتنەوەیەکی دیموکراتیانە سەربگرێت، وەڵامەکەی ئەو پرسیارە وا دەدەمەوە و دەڵێم (اتهام لا انفیه و شرف لا ادعیه).

من زۆر لە زوەوە، لە کاتێکدا کە لە کولیەی حقوق بوم، پەیوەندیم باشبو لەگەڵ کۆمەڵێک لە خوێندکارانی عەرەب کە سەر بە بیروباوەڕی جیا بون، باوەڕم بەوە هەبو، مەسەلەی کورد تەنها لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتدا چارەسەر دەکرێت، بۆ ئەو چارەسەرەش پێویستیمان بە هاوکاری و پشتیوانی گەلانی عەرەب هەبوە، بەتایبەتی دوای پەرەسەندنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی عەرەب بە سەرۆکایەتی عەبدولناسر. پێموابو ئەوە بۆتە مەرجێک لە مەرجەکانی ڕزگاری عێراق و کوردستان کە پێویستە پەیوەندییەکی باشمان هەبێت، لەگەڵ جوڵانەوەی ڕزگاری خوازی عەرەبی.

لەو کاتەوەی کە کورد تەنها پەیوەندی لەگەڵ حیزبی شیوعیدا هەبو، ڕێچکەیەکی ترم داهێنا کە پەیوەندی بە غەیری حیزبی شیوعیەوە بکرێت، بەتایبەتی بە قەومییەکانی عەرەبەوە. پێموایە بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٥٤ پەیوەندیمانکرد بە حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیەوە، ئەویش لە (دار المعلمین العالي) بو، چەند کەسانێکیان هەبو. بۆ یەکەمجار لە کۆبوونەوەیەکی ئەواندا بەشداریمانکرد کە بۆ خوێندکارانی خۆیان کردبویان و من لەوێ، لەسەر برایەتی کورد وعەرەب قسەم کرد و نیشانمدا بەردی بناغەی ئەو برایەتیە، لەسەر ئەوە دادەمەزرێت کە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە کتێبەکەیدا (الاکراد و العرب) نوسیبوی کە مافی چارەی خۆنوسین بۆ هەردو گەل بسەپێنرێت و بسەلمێنرێت و ئەو دو گەلە لەجیاتی

یەکگرتنێکی بە زۆر سەپێنراو بە سەریاندا، یەکگرتنێکی بە ئارەزو لەناو خۆیاندا دروستبکەن و پێکەوە بژین.

لە ساڵی ١٩٥٥ کە بۆم ڕێکەوت و چومە دەرەوەی عێراق، لە سوریا هەوڵمدا پەیوەندی لەگەڵ حیزبە قەومیە سوریەکانی ئەو سەردەمە دروست بکەین، لەو کارەدا سەرکەوتنێکی ئەوتۆمان بەدەست نەهێنا.

بەڵام ساڵی ١٩٥٧ کە لە سوریا بوم و لە هەمان کاتدا، دکتۆر کەمال فوئاد و زەبیحی و هەژاریش لەوێ بون و بەیەکەوە پیاسەمان دەکرد، ڕوبەڕوی سدیق شەنشەل و فوئاد سامەڕایی بوینەوە، یەکەمیان سکرتێری بەعس و دوەمیان جێگری سەرۆکی حیزبی ئیستقلال بو، ئەوان هاتبون بۆ کۆنگرەی ناوچەیی عەرەبی و زەبیحیان دەناسی، پاش چاک و چۆنی ئێمەی بەوان ناساند.

لە شوێنێک دانیشتین و پرسیاریان کرد، "بۆچی پەیوەندی لەگەڵ هێزە نەتەوەییە عەرەبیەکان ناکەین"؟ ئێمەش گوتمان: "زۆر حەز بەو پەیوەندیە دەکەین، بەڵام چۆن ئەو پەیوەندیە بکەین"، گوتیان: "باشە ئێمە بۆتان سازدەکەین".

ئەوان زنجیرەیەک کۆبوونەوەیان بۆ ڕێکخستین، کۆبونەوەیەکیان لەگەڵ ئەکرم حۆرانی بو، ئەوکاتە سەرۆکی پەرلەمانی سوریا بو. من لەگەڵ زەبیحی و دکتۆر کەمال فوئاد چوین بۆلای، لە ماڵێکی سادەدا دەژیا و پیاوێکی سادە و زۆر قسە خۆشمان هاتە بەرچاو و وای نیشاندایین، ئەو ئاشنایی لەگەڵ کورد هەیە و گوتی: "من لە ناوچەی خۆم لە حەما کە کوردی زۆری لێیە، لەگەڵ ئەو کوردانە بەینم باشە و هەتا گەلێکیان کە کاتێ من لە حیزبێکی عەرەبی بوم و هێشتا حیزبی بەعس دروست نەبوبو، ئەوانە لەگەڵ من و حیزبەکەی من بون".

هەروەها چوینە لای عەقید عەبدولحەمید سەراج کە ئەوکاتە لێپرسراوی ئیستخباراتی سوری بو و یەکێک بو لە ئەفسەرە ئازادەکان و دەست ڕۆشتوبو لەوێ، هەروەها عەبدولحەمید سەراج پەیوەندییەکی لەگەڵ کورد هەبو، چونکە ژنەکەی کورد بو.

*** ئایا ئەوان پلانیان هەبو بۆ کاری هاوبەشی نێوان کورد و عەرەب؟**

- بەڵێ، بۆ نمونە عەبدولحەمید سەراج پیلانێکی لە مێشکدابو، بۆ هاوکاری کورد و عەرەب، قسەکەی بەو شێوەیە بو: "پێویستە ئێمە پشتیوانی لە خەباتی کوردی عێراق و ئێران و تورکیا بکەین، هەر جۆرە خەباتێک دەکەن، بۆئەوەی

لەسەر ئاستی نەتەوەیی کورد و عەرەب رێکەوتنێک دروست ببێت".

هەروەها لەو بوارەدا پرسیاری کرد، ئێمە چیمان پێباشە، بۆئەوەی ئەوان هاوکاریمان بکەن؟ ئێمە پێشنیازمانکرد، کە سەرۆک عەبدولناسر دەچێتە مۆسکۆ، با لەوێ جەنەراڵ بارزانی ببینێت ئەوجا پێکبێن لەسەر ئەو ئاستە. ئەوکاتە ئێمە پێکهاتنەکەمان ئاسان دەبێت، ئەو ئەوپێشنیازەی زۆر پێباشبو، گوتی، "من ئەوە بە میسر دەگەیێنم".

بۆ سوریاش پێشنیازێکی هەبو، ئەی گوت: "کوردی سوریا لە یەک پارچە زەوی گرێدراودا بەیەکەوە ناژین و پچڕ پچڕن و ژمارەیان کەمە، بەڵام ئەتوانن رۆڵێکی زۆر گەورە ببینن ئەگەر بێت و خۆیان لەناو حیزبێکی کوردستانی تورکیا و سوریادا ببیننەوە". پێی وابو باش دەبێت، حیزبێک هەبێت بۆ کوردستانی تورکیا و با بنکەکانی لە سوریا بێت و کوردە سوریەکان بگرێتە خۆی و بە ئازادی کادر پەروەردە بکات، هەروەها حیزبێکی لەو جۆرە ئەتوانێت لە تورکیا یارمەتی و پشتیوانی سوریاش بکات.

عەبدولحەمید سەراج پێیوابو ئەو رۆژەی کوردستانی تورکیا رزگاردەبێت، مەسەلەی سنوری نێوان سوریا و ئەو کوردستانە دێتە کایەوە، عەرەب داوای ناوچەی ئەسکەندەرونە دەکات، ئەوە رەنگە بکەوێتە بن دەستی کوردەوە، کوردیش داوای ئەو داخوازیانە دەکات، لە سوریا دەیەوێت، ئیتر یان پێکی دەگۆڕینەوە، یا بۆ یەک تەنازول دەکەین، ئێمە لە ئەسکەندەرونە و ئێوەش لە قامیشلی و جزیرە.

دەربارەی عێراق، پێی باشبو ئێمە خەباتی چەکدار دەست پێبکەین و ئەوان ئامادەبون، چەکمان بدەنێ و خەڵکمان بۆ تەدریب بکەن، ئێمە هانی کوردەکانی سوریامان ئەدا بۆ خۆکۆکردنەوە لە حیزبێکدا.

بەنسبەت کوردستانی عێراقەوە، پێکهاتین بگەڕێینەوە و بیر لە هەڵگیرساندنی شۆڕشێک بکەینەوە دژی حکومەتی نوری سەعید، ئەوان لەگەڵ کۆماری عەرەبی میسر پشتیوانیمان بکەن هەتا باسی وردەکاری کارەکانمان لەگەڵدا دەکردن کە ئەوە شەڕی پێشمەرگانەیە و پێویستییەکانی چی دەبێت لە چەک و پارە و شتی تر، گوتی: "ئێمە هەموویتان بۆ دابین دەکەین و خۆشمان قاچاغچیمان هەیە، دەتوانێت هەتا ناو سنوری عێراقیش بۆتان بێنین".

بێگومان هەرسێکمان زۆرمان پێ باشبو، رامان سپارد کە پەیوەندیی لەگەڵ میسر دروست بکەین و زەبیحیمان راسپارد، کە ئەو بەو کارە هەڵبستێت و لەوێش داوامانکرد هاریکارمان بێت لە پەیوەندییەکانی ئێمەدا.

*** جگە لەم کارانە ئایا هیچ کارێکی سیاسی ترتان ئەنجامدا؟**

- بەڵێ لەو سەردەمەدا دو کار ئەنجامدرا، یەکێک لە یۆنان کۆنفرانسێک بەسترا بۆ نەتەوە بێ مافەکان، ڕەوشەن بەدرخانمان نارد بۆئەوێ بۆ بەشداری لەو کۆنفرانسەدا، ئەو لەوێ بەناوی کوردەوە بەشداریکرد. هەروەها میشێل عەفلەقیش بەناوی سوریاوە لە هەمان کۆنفرانس بەشداربو، لەوێ عەفلەق قسەی باشی کردبو، ڕەوشەن خان هاتەوە و بۆی گێڕاینەوە، زۆرمان لا سەیر بو، میشێل عەفلەق قسەی چاکی لەسەر مەسەلەی کورد کردوە.

کاری دوەم، بریار بو کۆنگرەیەک لە ساڵی داهاتودا لە قاهیرە ببەسترێت، ئەوە یەکەم (کۆنگرەی هاوکاری ئاسیا و ئەفریقا) بو، ئێمە زەبیحیمان پێشنیازکرد کە بە ناوی کوردەوە بەشداری بکات و ئەو چو بۆ قاهیرە، بەڵام نەیتوانی وەکو نوێنەری کورد بەشداربێت، بەڵام ئەنوەر سادات کە سەرۆکی کۆنگرەکە بو، بینیبوی و پەیوەندی لەگەڵ نوێنەرانی چەند لایەک کردبو و باسی کورد و مەسەلەکەی و داخوازییەکانی دابو بە زوربەی بەشداربوان.

هەر لەو بوارەدا، ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ میسریش پەیداکرد و لە هەمان ساڵدا، واتا لە ساڵی ١٩٥٧ دا قسەمان لەگەڵ کەمالەدین ڕەفعەت کرد، یەکێک بو لە سەرکردەکانی ئەفسەر ئازادەکانی میسر و دۆستی نزیکی عەبدولناسر بو. ئەو پەیوەندیە بو بە سەرەتای دانانی ڕادیۆی کوردی لە میسر، ئەو ڕادیویە ڕۆڵێکی باشی هەبو لە کوردستان و لە ناوچەکەدا و ئەوکاتە تاکە ڕادیۆی کوردیی بو لە جیهانی عەرەبیدا، نیشتمان پەروەرانە و شۆڕشگێڕانە قسەی دەکرد وکوردی هاندەدا و دیعایەی بۆ برایەتی کورد و عەرەب دەکرد.

بەم چەشنە، دەبینی من پێش شۆڕشی ١٤ تەمووز هەمیشە لایەنگیری ئەو خەتە بوم کە کورد وعەرەب پێکەوە لەسەر بناغەی وەک یەک و لەسەر بناغەی یەکگرتنی ئارەزومەندانە (ئیتحادی ئیختیاری) و مافی چارەی خۆنوسینی هەردو نەتەوە کاربکەن و لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی فیدراڵی یان کۆنفیدراڵیدا بژین.

من پێموابو، دەبێت کورد پەیوەندی باشی هەبێت لەگەڵ گەلانی عەرەب و بەتایبەتی لەگەڵ ئەو هێزە عەرەبە نیشتمانپەروەرانەی، لە میسر و سوریا کاربەدەست بون.

ناسر پاش سەرکەوتنی لە تەئمیمی قەناتی سوێس و خۆڕاگرتنی بەرامبەر هێرشی سێ دەوڵەتەکە، بوبو بە قارەمانی نەتەوەی عەرەب، بۆیە پەیوەندیکردنمان لەگەڵ ئەودا بە کارێکی گرنگ و باش دەزانرا و زۆر سودی هەبو بۆ مەسەلەی

کورد و برایەتی کورد و عەرەب.

لەبەرئەوە دەتوانم بڵێم کە هەمیشە لایەنگیری برایەتی کورد و عەرەب و هاوخەباتی کورد و عەرەب و پەیوەندی کورد و عەرەب بوم، تاکو ئێستاش لەسەر ئەو هێڵە ڕۆیشتوم.

*** بە پێچەوانەی ئەم هەستە مرۆڤدۆستانە تۆ، هەڵوێستی میللەتانی عەرەب بە گشتی و وڵاتانی عەرەبی بە تایبەتی، بەرامبەر مەسەلەی کورد هەتا ئەمڕۆ زۆر ئیجابی نەبوە، ئایا ئەو هەڵوێستانە هیچ کاریگەریەکیان نەکردۆتە سەر بۆ چونی تۆ؟**

- نەخێر! چونکە من پێموایە وڵاتانی عەرەب، هەڵوێستی جیا جیان هەیە و حیزبی جیاجیایان هەیە و بیروباوەڕو و بۆچونی جیاجیایان هەیە. بۆ نمونە لە سوریا، لەناو عەرەبە سونییەکاندا، شۆڤێنیزمی عەرەبی بەهێزە، بەڵام لەناو عەرەبە عەلەوییەکاندا شۆڤێنزمی عەرەبی بێهێزە و زۆر کەمە. هەروەها شۆفینیزمی عەرەبی لە میسر بەرامبەر بە کورد تەقریبەن نیە.

بێگومان هەندێ هەڵوێستی ناڕەوا و شۆفینیانە هەیە، هەندێ لە حیزبە قەومییەکانی عەرەبی و هەندێک لە وڵاتانی عەرەبی بەرامبەر بە کورد وەریان گرتوە، بەڵام هەڵوێستی راست و ڕەوای عەرەبیش هەبوە و هەیە بەرامبەر بە مەسەلەی کورد. بۆ نمونە کە ئێمە بە ئامادەبونی وەفدی عێراقی و فواد عارف لە ١٩٦٣ دا چوینە لای عەبدولناسر، گوتی: "ئەو ڕونکردنەوەی جەلال تاڵەبانی بۆمنی باسکرد لەسەر ئۆتۆنۆمی بو کوردی عێراق، پێم قبوڵە"، هەروەها لە ڕۆژنامەی لیمۆندی فەرەنسی هەمان قسەی کردو و ڕۆژنامەکە کاتی خۆی بڵاویکردەوە.

ئەگەر کتێبەکەی (طالب شبیب) بخوێنیتەوە لەوێ دەڵێت: "عەبدولناسر بە ئێمەی گوت، ئێوە لاوانی عەرەب، چاو لە جەلال تاڵەبانی بکەن و باشە ئەوەی لەومان دیوە، لە ئێوەشی ببینین"، واتا منی بە نمونە هێنابۆوە.[1]

ئەوەبو کە ناسر گەورەبو، بو بە سەرۆکی هەمو عەرەب، لەو ڕۆژەدا پێشوازی لە وەفدی کوردی کرد و ئامادەیی دەربڕیی، کورد مەکتەبی هەبێت لە قاهیرە و بە ئاشکرا دژی شەڕی کورد قسەیکرد.

ئەمە مانای ئەوەیە، لەناو عەرەبدا هەمو یەک ڕەنگ نەبون، پیاوێکی مەزنی وەکو عەبدولناسر دژی شەڕ بو و پشتگیری کوردی کردوە، بۆ ئۆتۆنۆمی و لایەنگری ئەوەبو مەسەلەی کورد لە عێراق، بە شێوەی ئاشتی ودیموکراتیانە چارەسەر بکرێت.

جگە لەوە هەندێ حیزبی عەرەبی هەبون، بەهۆی پەیوەندی منەوە لەگەڵیان

و ڕونکردنەوەی کێشەی کوردی بۆیان، ڕاوبۆچونیان دەربارەی کورد بە باشی گۆڕاوە، وەک (حركة القوميين العرب) کە بزوتنەوەیەکی گەورەبو لە دنیای عەرەبیدا و بە نزیک بونەوەم و پەیوەندیم لەگەڵیاندا و بەهۆی عەبدوئیلا نەسراوی و هانی هندی و موحسین ئیبرایم و دکتۆر ئیدریس، توانیمان مەسەلەی کوردیان بۆ ڕونبکەینەوە و ئەوان پشتگیری مەسەلەکە تاکو مافی چارەنوس بکەن.

پەیوەندییەکانمان لەگەڵ عەرەب، کەڵکی هەبوە بۆ ڕونکردنەوەی ڕاستییەکان و ڕاکێشانی عەتفیان بەلای خۆماندا. دیارە لەهەمولایەک هەتا لەناو خۆشماندا، هەوڵێستی ناجۆر و ناخۆشمان بینیوە، جاشی کورد هەبوە کە دژی کورد کاری کردوە.

من پێموابوە ئەو پەیوەندییە و ئەو عەتفە لەگەڵ عەرەب، مەسەلەی کوردی بۆ پێشەوە بردوە و مەسەلەی کوردی لای عەرەب گەشتر و ڕونترکردۆتەوە. بۆیە من هیچ پەشیمان نیم لەوەی کە ئەو هەڵوێستەم هەبوە.

*** تۆ لە ژیانتا هاوکاری مەسەلەی فەلەستینت کردوە و لە حەفتاکاندا زۆر نزیک بوی لە هێزە فەلەستینیەکان و بەتایبەتی لە بەرەی میللی و کارت لەگەڵ کردون و لە گۆڤاری (الهدف) ئەندامی دەستەی نوسەرانی بویت، ئایا لە هەڵوێستی فەلەستینییەکان بەرامبەر بە مەسەلەی کورد ڕازیت؟**

- کاکە سەلاحەدین، هەقە فەلەستینیەکان جیا جیا بکەینەوە و نابێ سەیری هەمویان وەکو یەک بکەین. ڕۆژانێک بو، من زۆر نزیک بوم لە بەرەی میللی و هەروەها دۆستایەتیم هەبو لەگەڵ بەرەی دیموکراتی، هەردوکیان هەڵوێستیان لە مەسەلەی کورد هەڵوێستێکی ڕاست و ڕەوابو. هەردوکیان تەنانەت لایەنگری مافی چارەنوسبون و دژی شەڕبون لەگەڵ کورد و لایەنگری ئەوەبون، کورد لەناو عێراقدا ئۆتۆنۆمیەکی ڕاستەقینەی بدرێتێ.

بە گشتی لەناو بزوتنەوەی فەلەستینیدا، دژایەتی کورد نەبوە، بە پێچەوانەوە، هەتا لەناو هەندێ سەرکردەی ڕێکخراوی فەتحیشدا، دۆستایەتی هەبو لەگەڵ کورد و عەتفیان هەبوە لەسەر کورد و ئەوانە لایەنگیری ئەوەبون , کورد مافی خۆی هەبێت لەناو عێراقدا.

ئەو ڕۆژەی فەلەستینیەکان هەڵوێستیان باشبو، پەیوەندیان لەگەڵ حکومەتی عێراق باش نەبو، لەبەرئەوە هەڵوێستیان زۆر چاک بو دەربارەی مەسەلەی کورد!. من زۆرتر لە دوساڵێک لەگەڵ بەرەی میللیی ئیشم کردوە , لە دەستەی نوسەرانی

گۆڤاری هه‌ده‌ف به‌شداریم کردوه و وتارم نوسیوه.

من چاوه‌ڕێم له فه‌له‌ستینیه‌کان ئه‌وه‌بوه، پشتگیری ته‌واوی مه‌سه‌له‌ی کورد بکه‌ن، به‌داخه‌وه ئه‌و پشتگیریه‌م لێ نه‌بینین.

*** ستراتیجیه‌تی کارکردنی فه‌له‌ستینیه‌کان بۆ به‌ده‌ستهێنانی مافه‌کانیان چۆن هه‌ڵده‌سه‌نگێنیت؟**

- به ڕای من فه‌له‌ستینییه‌کان گیروگرفتی گه‌وره‌یان ئه‌وه‌یه، ئیستراتیجی جوڵانه‌وه‌ی فه‌له‌ستینی له سه‌ره‌تاوه هه‌ڵه‌بوه تاکو ئێستا. له ساڵانی سیه‌کاندا، دایانشکاند به‌لای نازییه‌کان و فاشیسته‌کاندا و شێخ ئه‌مین حسینی ڕایکرد بۆ ئه‌ڵمانیا و ئیتاڵیا، له‌وکاته‌دا گه‌لی جوله‌که عه‌تفی جیهانی وه‌رگرت و ئه‌وان توڕه‌یی جیهانیان وه‌رگرت.

له ساڵانی چله‌کاندا، سه‌رکردایه‌تی فه‌له‌ستینی، هه‌مو شتێکی ڕه‌تکرده‌وه و دروشمه‌که‌ی ئه‌وه‌بو، یا هه‌مو شتێکمان ده‌وێته‌وه یان هیچ!! که مه‌سه‌له‌ی دابه‌شکردنی فه‌له‌ستین هاته‌کایه‌وه، به‌شی زۆری زه‌وی فه‌له‌ستین درابو به عه‌ره‌ب و به‌شی زۆری ناوچه‌که له‌ده‌ست عه‌ره‌ب بو، به شاری قودسه‌وه، به‌ڵام ئه‌وان هیچیان قبوڵ نه‌کرد.

فه‌ڵه‌ستینیه‌کان له یه‌ک شت نه‌گه‌یشتبون، ئه‌ویش ئه‌وه‌بو که مه‌سه‌له‌ی دابه‌شکردنی فه‌له‌ستین و دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌تی ئیسرائیل، بریارێکی نێوده‌وڵه‌تیه و شتێک نیه به ئاسانی بگۆڕێت، وه‌کو ئه‌وی ئه‌وان تێگه‌یشتبون، وا تاقمێک جوله‌که هاتون و ده‌وڵه‌تێک دروست ده‌که‌ن. نه‌خێر، ئه‌وه بریارێکی نێوده‌وڵه‌تی بو، بۆ یه‌که‌مجاربو ئه‌مه‌ریکا و روسیا له‌سه‌ر ئه‌و بریاره یه‌ک بن.

ئه‌وه‌بو هه‌ردو زلهێزی دنیا له نه‌ته‌وه‌یه‌کگرتوه‌کان، ده‌نگیان بۆ بریاره‌که‌دا، ده‌وڵه‌تی جوله‌که له فه‌له‌ستین دابمه‌زرێت و ئه‌و بریاره به‌پێی میزانی هێزه‌کانی ئه‌و سه‌رده‌مه به وڵاتانی عه‌ره‌بی نه‌ده‌گۆڕا. هه‌روه‌ها له‌وه چاک نه‌گه‌یشتبون، ده‌وڵه‌ته عه‌ره‌بییه‌کان پیاوی ئه‌وه‌نین فه‌له‌ستین به شه‌ر رزگاربکه‌ن و له‌شکربنێرن، ئه‌وان ته‌نها یاریان به فه‌له‌ستین ده‌کرد و بازرگانیان به فه‌له‌ستینه‌وه ده‌کرد، بۆیه ئه‌و هه‌ڵه‌یان کرد و هه‌مو داخوازیه‌کانیان ڕه‌تکرده‌وه.

ئه‌گه‌ر ئه‌وڕۆژه بریاره‌کانیان قبوڵ بکردبایه، ڕه‌نگبو که سێ له‌سه‌ر چواری فه‌له‌ستین بکه‌وتایه ده‌ستیان و پێموایه ئیسرائیل به‌و به‌شه که‌مه‌ی پێیدرابو، نه‌ی ئه‌توانی به ئاسانی و بێ گیروگرفت بژی، چونکه که‌م و بچوک بو، ئیمکانی

گەشەکردنی ئاسایی نەبو!.

پاش ئەوە لە ساڵانی پەنجاکاندا، دروشمی مته‌تەرفیان هەڵگرت و هەندێکیان داوایان دەکرد جولەکە فرێ بدەنە دەریاوە، ئەو هەڵوێستە وایکرد جولەکە بتوانێ عەتفی جیهانی وەربگرێت.

لە شەست و حەفتاکاندا، دەستیان بە خەباتی چەکداریکرد، بە کاری تیرۆریستی دەستیان پێکرد، ئەویش بە فڕاندنی فڕۆکە و کوشتنی وەرزشوانی ئیسرائیلی و شەر دژی دەوڵەتە عەرەبیەکانی وەک ئەردەن و سوریا.

لە کۆتایی هەشتاکاندا، بەتەنیا چون و لەگەڵ ئیسرائیل لە نەرویج رێکەوتن. تەماشاکە ئیستراتیجیەتی سەرکردایەتی فەلەستینی لە هەر دە ساڵێکدا هەڵەیەکیان کردوە، سەرکردایەتیەکی ئەوتۆنەبوە، بتوانێ ئیستراتیجێکی ڕاست بۆ شۆڕشەکەیان و خەباتەکەیان دانێ و لەوەشەوە تەکتیکی ڕاست هەڵبێنجێنێت.

بۆیە تەماشا دەکەین تا جێگیربونێک لەهەڵوێستیاندا هەبوە. بۆ نمونە ئەو ڕۆژەی لەگەڵ عێراق دۆست بون، عێراقیان بردۆتە ئاسمان، ئەو ڕۆژەی دۆستایەتیەکە زۆر تۆخ نەبوە، عێراقیان بردۆتە ناخی ئەرزەوە. سەردەمێک عێراق دژیان بو، خەڵکی لێ دەکوشتن، هەمو رێکخراوە فەلەستینیەکان دژی حکومەتی عێراق بون و پشتیوانیان لە کورد دەکرد، لەگەڵ عێراق چاکبونەوە، پشتیوانیان لە حکومەتی عێراق کرد و کوردیان بەلاوەنا.

زوربەی هێزە فەلەستینیەکان، لەژێر پەردەی دوژمنایەتی ئیمپریالیزم و مەترسی سەرەکی ئیمپریالیزم و ناکۆکی سەرەکی ئیمپریالیزمدا، پشتیوانی دیکتاتۆرێکیان کردوە کە زۆر خراپتربوە بۆ گەلانی خۆی لە ئیمپریالیزم کە ناویان بردوە!! بەڵام تاکو ئێستاش لە فەلەستین، هێشتا خەڵک ماوە کە پشتیوانی لە خەباتی گەلی کورد دەکات.

*** عەرەب بەگشتی و فەلەستینیەکان بە تایبەتی، تا نەمانی سەدام لە مانگی نیسانی ٢٠٠٣ پشتگیریان لەو دەکرد و رۆژێک لە رۆژان باسی کورد و مافی چارەی خۆنوسین و باسی ئەنفال و هەڵەبجەیان نەکرد، هۆی ئەو بێ دەنگییەیان چی بو؟**

– من لەسەر ئەو تەعمیمە رازی نیم، عەرەب هەبوە باسی کوردی کردوە، ئەحزاب هەبون، کەسایەتی عەرەبی ناسراو هەبون و وتاریان نوسیوە و دەنگی ناڕەزاییان دەربریوە، بەڵام بەگشتی وابو وەکو تۆ دەیڵێیت. بە گشتی هێزە عەرەبییەکان و دەوڵەتە عەرەبییەکان و تەیارە سەرەکیەکانی ناو کۆمەڵگای

عەرەبی، پشتیوانیان لە سەدام کردوە. بۆ نمونە دەوڵەتی کوێت، کاتێ هەڵەبجە بە چەکی کیمیاوی بۆردومان کرا.

ئێمە لە دنیادا هەڵڵایەکمان نایەوە، ئەوکاتە من لە لەندەن بوم، وەفدی سەفیرە عەرەبیەکان، بە سەرۆکایەتی وەفدی کوێتی ماڵ بەماڵ دەگەڕا و دەیگوت مەسەلەی هەڵەبجە درۆیە و عێراق کاری واینەکردوە و عێراق پەیوەندی بەوکارەوە نیە، ئەوە بوختانە کورد بۆی هەڵدەبەستێت!.

بێگومان، ئەو هەڵوێستەی عەرەب بەرامبەر بە کێشەی کورد و بەرامبەر بە عێراق، لەسەرتاپادا هەڵەبو، تەنها سوریا هەمیشە دەیگوت، سیاسەتی سەدام هەڵەیە و ئەو سیاسەتە دژی نەتەوەی عەرەبیشە و دژی سوریاشە، بەڵام لەوکاتەدا دەوڵەتەکانی تر پشتیوانیان لە عێراق دەکرد. من پێموایە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەندێک خاڵ:

یەکەم: بۆئەوەی کە هەستی نەتەوایەتی عەرەبی لەو روانگەیەوە دەروانێتە مەسەلەکان (انا و اخي على ابن عمي و انا و ابن عمي على الغريب) ئەو چ دەبێت ببێت ئەوە قاعیدەیە.

دوەم: سەدام بەرتیلی دابو بە زۆر لە سەرۆکەکانی عەرەب و دەزگای ڕاگەیاندنی عەرەبی و هێزە سیاسیەکانی عەرەبی و بە دەیان ملیون پارەی دەدانێ و بەو پارەیە گەلێکیانی کڕیبون، یا هیچ نەبێ بێدەنگی کردبون.

بێدەنگی ئەوانەی کڕیبو، پارەی دابو بە زۆر لە هێزە سیاسیەکان و دەزگا ڕاگەیاندنەکانی عەرەبی و ئەوانەی بەلای خۆیدا ڕاکێشابو.

سێیەم: سەدام عەبایەکی عەرەبی لەبەرکردبو، خۆی بە پارێزەری (بەوابە) ی رۆژهەڵاتی و گەلی عەرەب نیشان دەدا. هەروەها خاڵێکی تریش ئەوەبو، بۆچون و هەڵسەنگاندنی هەڵەی هێزە عەرەبییەکان بەرامبەر بە عێراق و سەدام درێژ بۆوە تا جەنگی عێراقی و ئێرانی، ئەوەبو زوربەی هێزە فەلەستینیەکان پشتگیری عێراقیان کرد، ئەمە لە کاتێکدا کە کۆماری ئیسلامی ئێرانی پشتگیری تەواوی مەسەلەی فەلەستینیان کرد و هاوکاری زۆریانکردن.

*** راستی مەسەلەی (ئومەی عەرەبی) چەندە، ئایا (ئومەی عەرەبی) هەیە، یان (گەلانی عەربی) هەن؟**

- بەرەئی من گەلانی عەرەبی هەیە، لەناو دەوڵەتەکانی عەرەبیدا گەلانی عەرەبی و غەیری عەرەبیش هەیە، تۆ لە جەزائیر و مەغریبەوە تەماشا بکە، لەناو

گەلانی جەزائیر و مەغریبدا گەلی بەربەر هەیە، کە ئەوانە گەلێکی جیاوان لە عەرەب و عەرەب ئینکاریان دەکات.

لە خواروی سودان گەلانی جیاواز دەژین لە عەرەب، لە سوریا و عێراق کورد هەیە، بۆیە بەرای من بەو مانا ئەورووپییەی کە (ئومەی عەرەبی) یەک ئومە بێت و هەمو خاسێتەکانی تێیدابێت و خەملٚیبێت، ئەوە ناتوانین بلٚێین بەو شێوەیە هەیە، بەلٚام دەتوانین بلٚێین کە گەلانی عەرەبی هەیە، واتا ئەو گەلانەی کە خۆیان بە عەرەب دەزانن و دەیانەوێ یەک نەتەوەبن، دەتوانین وەک گەلی عەرەب ناویان ببەین.

*** کێشەی فەلەستین و ئیسرائیل بەرەو کوێوە دەچێت؟**

– کێشەی فەلەستین و ئیسرائیل بەرەو ئالٚۆزی دەچێت، سیاسەتی هەلٚەی رێکخراوە فەلەستینییەکان بەرەو هەلٚدێرانیان دەبات، ئەو برا فەلەستینیانە لە یەک شت نەگەیشتون، ئەمرۆ سەردەمی چەکداری و تێکدان نەماوە، ئەمرۆ سەردەمی چارەی سیاسی و دیبلۆماسییە، چارەی سیاسی و دیبلۆماسیش بە ئەمەریکا دەکرێت. ئەوانە لەجیاتی ئەوەی ئەمەریکا بەرەو خۆیان ڕابکێشن، ئەوکارانە دەکەن کە ئەمەریکا لە خۆیان دوردەخاتەوە و بەکردارەکانیان وادەکەن خزمەتی سیاسەتی ئیسرائیل بکەن.

بۆ نمونە، (ڕاپەڕینی قۆچەقانی)، ڕاپەڕینی بە بەرد، زۆر زۆر سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا و پشتگیریەکی جیهانی بۆ مەسەلەی فەلەستین پەیداکرد، بەلٚام دوایی کە کردیانە ڕاپەڕین بە چەک و کلاٚشنکۆف و خۆتەقاندنەوە، بە زیان بۆیان گەڕایەوە، بۆ نمونە، کاتێ پاسێک دەتەقێننەوە ژن و مندالٚ و خەلٚکی سیڤیل تێیدا دەکوژرێت، ئەوە عەتف بۆ ئیسرائیلیەکان زیاددەکات و بە زیان بۆ فەلەستینیەکان دەگەڕێتەوە.

بەمشێوە خەباتەی ئێستا، زیانێکی زۆر لە مەسەلەی خۆیان ئەدەن و مەسەلەکەی خۆیان دواتر دەخەن، تا ئەو ڕۆژەی هێزێکی فەلەستینی ژیر پەیدادەبێت، کە بتوانێ جەماوەری فەلەستین لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و بە خەباتی سیاسی و دبلۆماسی داخوزیەکانیان بێنێتەدی.

جگە لەوە، پێویستە ئەو ڕاستییەش بلٚێین، لە دەولٚەتی ئیسرائیل کەسانی توندڕەو و توندوتیژی ئەوتۆی تێیدایە، لە بنەڕەتدا باوەڕیان بە بونی گەلی فەلەستین و داخوازیەکانیان نیە، پێیان وایە فەلەستین هەموی خاکی ئیسرائیلە و

دەبێت گەلی فەلەستین لەوێ دەرکرێن و بێنە رۆژهەڵاتی ئوردون، ئەو وڵاتە تەنها هی ئەوانە، ئەو هەڵوێستە توندڕەوانە لە هەردولاوە مەسەلەکەی ئاڵۆزتر کردوە.

*** واتا داخوازی دو میللەت (عەرەب و ئیسرائیل) لەسەر یەک پارچە زەوی، کێشەکەی ئاڵۆزکردوە؟**

– بەڵی وایە، دو میللەت لەسەر زەوییەک شەڕ دەکەن و هەردوکیان بەهی خۆیانی دەزانن. یەکێکیان بە مێژو و ئەوەی تریان بە جوگرافیا.

## ئێران

*** مێژوی پەیوەندی تۆ لەگەڵ ئێراندا بە گشتی بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟**

– من دەمەوێ پرسیارەکەت بکەمە دو بەشەوە، یەکێکیان مێژوی پەیوەندی لەگەڵ هێزە شۆڕشگێڕەکانی ئێران و بەشێکیان پەیوەند لەگەڵ حکومەتی ئێران.

لە شۆڕشی ئەیلولدا کۆمیتەی سەرکردایەتی لەسەر داوای مەلا مستەفا بریاریدا کە پەیوەندییەک دروست بکات لەگەڵ ئێران، بە مەرجێ ئەو پەیوەندییە لەگەڵ دەسکەوتەکانی گەلانی ئێراندا بگونجێت. لەناو هەڤاڵاندا دو کەس بە نابەدڵی دەنگیان بۆ ئەو مەسەلەیەدا، حیلمی عەلی شەریف و من.

هەرچۆنێ بو پەیوەندی دروست بو لەگەڵ ئێران و زۆری نەخایاند، ناکۆکییەکان تەقینەوە لەناو بزوتنەوەی کوردی دا.

وەک لە شوێنێکی تری ئەم چاوپێکەوتنەدا باسم کردوە، باڵی مەکتەبی سیاسی ناچاربون بچنە دیوی ئێران. ئەوەی ڕاست بێت، من نەم دەویست بچم بۆناو ئێران، بریارمدا یان لەناو شارەکاندا یان لە شاخ بمێنمەوە. مانەوە لە شاخ مومکن نەبو، بەڵام لە شارەکان مومکن بو.

برادەران فشارێکی زۆریان بۆهێنام و وتیان هیچ نەبێت وەرە هەتا دادەمەزرێین، لەوبەر و دوایی هەمومان بەڵێنت دەدەینێ، بتنێرین بۆ دەرەوە، من لە شوێنێکی تری ئەم چاوپێکەوتنە باسی ئەو قۆناغەم کردوە.

بەو شێوەیە، چوین بۆ ئێران کە چوین بۆ ئێران، ماوەیەک وەکو پەناهەندە وەریانگرتین، داوامکرد یەکسەر بڕۆم بۆ ئەوروپا. هەر ئەمڕۆ و سبەینێیان پێدەکردین تا گەیشتینە ئەوەی دو مانگێکی پێچو، وەڵام نەبو، منیش ناچار مانمگرت لە نانخواردن.

پێویستە لێرەشدا شتێک بڵێم، شەمسەدین موفتی زۆر یامەتیدام لە مەسەلەی چونە دەرەوەدا، ئەو ئامادەبو لە ئێران بمفرێنێ بۆ دەرەوە، لاوێکی تریش زۆر یارمەتیدام، ئەویش سەردار جافە. ئەو ئەرکی ئەوەی خستە ئەستۆی خۆی، چو بۆلای جەلال بەگی جاف کە خۆی زو لە عێراق بو، وێنەی بۆ بردم و پاسپۆرتێکی عێراقی لە جەلال بەگەوە بۆ هێنام، ئیتر پاسپۆرتیشم دەستکەوت و بەو پاسپۆرتە ئەمتوانی سەفەر بکەم.[٢]

چەند ڕۆژێک دوای مانگرتنەکەم، بینیان کە بەڕاستمە و بەردەوامم، ئێوارەیەک کاربەدەستانی ئێرانی هاتنە لام و گوتیان: "ئێمە ڕێت دەدەین بچیتە دەرەوە و پاسپۆرتی خۆمانت دەدەینێ و حەز بە دۆستایەتی ئێوە دەکەین، بەڵام نامانەوێ تۆ بە دڵ ڕەنجاوی بڕۆیت، لەبەرئەوە بەڵێنت دەدەینێ ئێمە پاسپۆرتیشت بۆ بکەین و بشتنێرینە دەرەوە، بەڵام تۆ وەرە دەعوەتێکی ئێمە قبوڵ بکە و چەند ڕۆژێک دەت بەینە سەروی ئێران و لەوێ با کەمێ ماندوبونەکەت بحەسێیتەوە".

منیش داوەتەکەیانم قبوڵکرد، ئەوەبو منیان برد و ماوەیەک گەڕاندیانم لە سەروی ئێران. کە گەڕامەوە، پاسپۆرتێکی ئێرانیان بەناوی (جعفەری تەڵۆعی) بۆ ئامادەکردبوم ئەوەبو پێی هاتمە دەرەوە بۆ ئەوروپا. ئەوە یەکەم چونم بوە بۆ ئێران.

لەو ماوەیەی لە دەرەوە بوم، پەیوەندییەکم لەگەڵ چەپەکانی ئێران پەیداکرد، بەتایبەتی جەماعەتی سازمانی ئینقیلابی حیزبی تودەی ئێران، تازە لەسەرەتای دامەزراندندا بون، بەو هیوایەی ڕۆژێک لە ڕۆژان بتوانین یارمەتی یەکتربدەین. لەوکاتەوە وردە وردە لەگەڵ لایەنی خەڵکی ئێران، پەیوەندیمان دروستکردوە و بەهێزمان کردوە.

*** تۆ باسی ساڵی ١٩٦٤ دەکەیت، واتا کاتی ناکۆکی نێوان مەکتەبی سیاسی و بارزانی، ئایا پێش ئەوکاتە، تۆ وەکو مام جەلال هیچ پەیوەندییەکت لەگەڵ ئێراندا هەبوە؟**

– نەخێر، من هەر لایەنگریی پەیوەندیش نەبوم، من پەیوەندیم لەگەڵ ئێراندا پێباش نەبوە، ئێمە لە مەکتەبی سیاسی وردە وردە پەیوەندیمان لەگەڵ هێزەکانی

چەپی ئێران پەرەیسەند، جگە لە سازمانی ئینقیلابی لەگەڵ بەرەی میللی ئێران، بەهۆی حەسەنی ماساری دروست بو، ئەوکاتە نوێنەری ئێرانییەکان بو لە دەرەوەی وڵات.

*** ئایا شای ئێران رۆڵی هەبو لە ناکۆکی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی لە ١٩٦٤ دا؟**

– ناتوانم بڵێم زۆر دەوری دیاری هەبوە، بەڵام بێگانە دەستیان هەبو لەو ئینشیقاقەدا، ئینجا ئایا بێگانە هانی مەلا مستەفای ئەدا کە گوایە مەکتەبی سیاسی جەماعەتێکی شیوعین، ئەوە زۆر روننیە؟ واتا ئەو کەسانەی دەهاتنە کوردستان، پێموایە هەندێک لە نوێنەرانی ئێران، یاخود هەندێ لەو کەسانەی کە بەناوی ئەمەریکاوە دەهاتن، باسی ئەو مەسەلانەیان بۆ مەلا مستەفا دەکرد. ئەگەر تۆ کتێبەکەی (ئادەم شمید) بخوێنیتەوە، لەوێ باسی ئەوە دەکات، کە مەکتەبی سیاسی شیوعین و سەر بە روسن و ئەمەریکاش پێی باش نیە، کۆمەڵێکی شیوعی سەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردی بکات. واتا شتێکی وایان خستبوە مێشکی مەلا مستەفاوە، ئەگەر ئەو لە مەکتەبی سیاسی رزگاری بێت، ئەوا یارمەتی و هاوکاری دەرەوەی مسۆگەر دەبێت.

بەڵام دڵنیام لە سەرێکی تریشەوە ئەوانەی دوژمنانی خەڵکی کوردبون، پێیان خۆشبو ناکۆکی دروست بێت و پێیان خۆش نەبو، جوڵانەوەیەکی رزگاریخوازی کوردی یەکگرتو بە سەرکردایەتی حیزبێکی سیاسی یەکگرتو هەبێت.

من شتێکت بۆ بگێڕمەوە، شەمسەدین موفتی ئاگای لێیەتی. کوردێک لەوانەی لە تاران ئیشی دەکرد و هەستێکی کوردایەتی هەبو، ئێستاش هەرماوە بۆی گێڕاینەوە، گوتی: "شا لە کوردستاندا پشتگیری مەلا مستەفا دەکات و ئەوی پێباشترە لە مەکتەبی سیاسی، هۆکەشی ئەوەیە، دەڵێ، مەلا مستەفا یەک کەسە، کاتێ لەگەڵ ئەو رێکەوتم، ئەوا دەتوانم بگەمە ئەنجامێک و دەتوانم بزانم چەند دەڕوات، بەڵام جەماعەتی مەکتەبی سیاسی، ئەوان حیزبن، ئەمڕۆ لەگەڵ مەکتەبی سیاسی رێک دەکەوین، بەڵام بۆ رۆژی داهاتو لیژنەی مەرکەزی، یان ئەنجومەنێکی سیاسی نوێ هەڵدەبژێرێت و دەڵێ من بەو رێکەوتنەی ئەوان رازی نیم، هەروەها ئەمانە حیزبن و فکر و بیروباوەڕیان هەیە، شتێکیان لە خەیاڵە بۆ کوردستان، مەلا مستەفا شەخسیەتێکی نەتەوەییە و لە هۆز و عەشیرەتەوە هاتووە وەکو ئەوان نیە".

جگە لەوەی، ئێمە کاتی خۆی کە رۆژنامەی خەباتمان لە بەغدا دەردەکرد، حەملەیەکی زۆر توندوتیژمان کردبو لەسەر شای ئێران و پشتگیری کوردەکانی

ئێرانمان دەکرد، بۆیە پێموایە دەستی ئێران هەبو لە ناکۆکی نێوان پارتیدا، بەڵام نازانم تا چ ڕادەیەک.

*** بۆچی شای ئێران بە خێرایی و بە ئاسانی، ڕێکەوتنامەی جەزائیری لەگەڵ سەدام مۆرکرد؟**

– چونکە ئاواتەکانی هاتەدی، ئاواتی شا ئەوەبو شەتول عەرەبی بدرێتەوە و عێراق دان بەوەدا بنێت، شەتول عەرەب هی ئێرانە. هەروەها عێراق بەڵێن بدات، هیچ دەستێوەردانێک لە کاروباری ئێراندا ناکات و ئەو یارمەتی و هاوکاریانەی پێشتر ئەیدا بە هێزەکانی بەربەرەکانی ئێرانی ڕابیگرێت، ئەوە هەمو ئاواتەکانی شای ئێرانی هێنایەدی.

*** بەڵام ئەوەبوە هۆکاری شکستهێنانی گەورەترین بزوتنەوەی سیاسی و پێشمەرگایەتی کوردیی، دژی حکومەتی عێراق؟**

– بەڵێ بەراستە، بەڵام ئەو نەیدەویست ئەو بزوتنەوەیەی دژی عێراقە بەردەوام بێت. ئەو یارمەتی ئەو بزوتنەوەیەی دژی عێراقی ئەدا، تەنها بۆئەوەی بە ئاواتی خۆی بگات. نازانم تۆ پرسیارەکەی محەمەد حەسەنێن هەیکەلت خوێندۆتەوە لە شای کردوە دەربارەی ئەم مەسەلەیە؟ شا لە وەڵامی هەیکەلدا دەڵێت، "من ئاواتەکانم هاتەدی، لەبەرئەوە دەبێ ئەوە بکەم پێویستە. جوڵانەوەی کورد گەیشتبوە ڕادەیەک، کە بە تەنها بەهێزی خۆی ناتوانێ دەوام بکات، جوڵانەوەکە ئەوەندە گەورەبو، نەیئەتوانی بەوشێوەیە دەوام بکات، ناتوانێ دەوام بکات دەبێت من هێز بنێرم بۆی، منیش ئامادەنەبوم بەشداری شەڕێک ببم، بە تایبەتیش کاتێکیش کە ئاواتەکانم هاتونەتەدی[٣]

ئەمانە هەموی بڕوبیانو بون، بەرای من هۆ سەرەکیەکە ئەوەبو، کە شا لە سەرەتادا نەیدەویست جوڵانەوەیەکی کوردایەتی کوردستانی هەبێت و داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بکات.

هەروەها شا لەو بارەیەوە دەڵێت: "جوڵانەوەیەکی کوردی هەبو، بە پێویستم زانی کە ئەو جوڵانەوەیە بۆ سودی خۆم بەکاربهێنم، لەوەی لە دژم بێت، هەم بۆئەوەی پەکی چالاکی سیاسی کوردی ئێرانی پێبخەم، هەم لە عێراق ئاواتەکانی خۆمی پێبهێنمەدی کە ئاواتەکانم هاتەدی ئیتر پێویستم بەو بزوتنەوەیە نەما و بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەو بزوتنەوەیە بمایا، لە دوارۆژێکدا دەبو بە مەترسی لەسەر ڕژێمی شا".[٤]

*** هۆی چی بو دوای هەرەسی ۱۹۷٥ و دروست بونی یەکێتی، ڕژێمی شا گیروگرفتی سیاسی و سەربازی بۆ یەکێتی نیشتمانی دروست دەکرد، بەڵام لە هەمانکاتدا هاوکاری قیادەی موقەتەی دەکرد؟**

- ئەزانی چیە؟ من دەمەوێت شتێک بڵێم، شای ئێران پێی خۆش نەبو عێراق ئارام و هێمن و بێدەنگ بێت کاتێ مەلا مستەفا فەرمانیدا بە هێزەکانی کە بڕۆنەوە ماڵی خۆیان و پارتی حەل کرد و دامودەزگاکانی شۆڕشی هەڵوەشاندەوە، بە بیانوی ئەوەی ئەو بە تەنها خۆی ناتوانێت وەک جاران سەرکردایەتی ئەو شۆڕشە بکات، هەروەها نەی ئەتوانی بە گوڕ و تەوژمی لاویتیەوە لەم شاخ بۆ ئەو شاخ و لەو دۆڵ بۆ ئەو دۆڵ بڕوات.

پێویستە ئەو ڕاستیە ڕەچاوبکرێت کە شای ئێران پێی خۆش نەبو، بە تەواوی دەسەڵاتی عێراق وازیادبێت بەسەر کوردستانی عێراقدا، بەڵکو پێی خۆش بو جوڵانەوەیەک هەبێت بۆئەوەی هەم فشار لەسەر عێراق کۆتایی نەیەت و هەم عێراق پاشگەز نەبێتەوە لە ڕێکەوتنامەی جەزائیر.

بۆیە پێموایە کاتێ ئێمە جوڵانەوەکەمان هەڵگیرساند، لە سەرێکەوە پێیان ناخۆشبو کە هێزێکی چەپی کوردی هاتوە و دژایەتی ئێران و دژایەتی ئیمپریالیزم دەکات. پێیانوابو نەدەبو ساحەکە بۆ ئێمە چۆڵ بکرێت، لەبەرئەوە دەبوایە یارمەتی قیادەی موئەقەت بدرێ، بەرامبەر بە ئێمە و بۆئەوەی جێگاکە پڕبکاتەوە.

شا نەی دەویست لەگەڵ ئێمەدا توشی شەڕبێت و نەیدەویست دوژمنایەتی لەگەڵ ئێمە وا تۆخ بکات، ببینە دژمنی، ئەو و ئێمەش لەناو ئێراندا دوژمنایەتی بکەین، بەڵکو دەیویست جۆرێک سازشیش بکات، واتا هەندێک چاوپۆشی دەکرد لە هاتوچۆی ئێمە بەناو خاکی ئێراندا، بەڵام پشتیوانییەکی تەواوی قیادەی موئەقەتەی دەکرد.

دوای شۆڕشی ئێران، کۆمەڵێک بەڵگەمان دەستکەوت، چۆن ئێران یارمەتی قیادەی موئەقەتەیان دا بۆ هاتنەوە کوردستانی عێراق و چۆن شا ویستویەتی، عێراق نا ئارامبێت و پێی خۆش نەبوە بە یەکجاری عێراق ئاسودە و هێمن بێت.

*** ئایا یەکێتی هیچ ڕۆڵێکی ئیجابی هەبو لە شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا؟ یاخود ئایا هاوکاری خومەینی کرد لە ئامادەکردنی ئەو ڕاپەڕینەدا؟**

- ڕاستیەک هەیە پێویستە بوترێت، ئەویش ئەوەیە، ڕاپەڕینی گەلانی ئێران ڕاپەڕینێکی ناوخۆیی بو. ڕاپەڕینێ بو هەڵچونی خەباتی گەلانی ئێران بو. تورەییان

گەیشتبوە ئاستێک چیتر ئەو بارە نالەبارەیان پێ تەحەمول نەدەکرا و تێکۆشان و فیداکاریان گەیشتبوە ئاستێک، تەقیەوە و هەمو گەلانی ئێران ڕاپەڕین.

ئێمە بەپێی توانا هاوکاریمان کردن و وەکو لە پرسیارێکی تردا بۆم باسکردیت، بوم بەهۆی ناساندنی جوڵانەوەی ئیمام خومەینی بە لیبیەکان، ئەنجامەکەی ئەوە بو لیبیەکان چەندین ملیۆن دۆلاریان دانێ. لە هەمانکاتدا بوم بەهۆی ناساندنی هاوڕێیانی ئیمام خومەینی، بە حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی باڵی عێراق لە سوریا، ئەوانیش زۆر هاوکاریان کردن.

بۆ نمونە، سەردەمێک عبدولجبار کوبەیسی ماڵەکەی خۆی کردبو بە بارەگای هێزە ئێرانیەکان و لە ماڵی ئەو دەنوستن و یارمەتی دەدان و چەکی بۆ پەیدادەکردن و بۆیانی دەنارد بۆ ئێران.

هەروەها ئێمەش بەپێی توانا یارمەتیمان دان و نامەمان بۆ ئیمام خومەینی نوسی کە ئێمە ئامادەین چی لە دەستمان دێت بیکەین بۆ سەرکەوتنیان، هەتا گوتمان: "ئەگەر بتانەوێت ئامادەین هێزی پێشمەرگەتان بۆ بنێرین".

کە شۆڕشەکە پەرەیسەند، ئێمە ئەو پەیوەندییەی هەمان بو لەگەڵ کوردی ئێران، بەو شێوەیەمان بەکارهێنا کە پشتیوانی ئەو شۆڕشە بکەین و لەو ڕاپەڕینەدا بەشدارین و هەوڵ بدەن بەرەو ڕێبازێکی دیموکراتی و پێشکەوتووخوازی بەرن.

هەروەها لە ڕاپەڕینی گەلانی ئێراندا، کارێکی وامان نەکرد کە حکومەتی مەرکەزی نیگەران بێت. بۆ نمونە، دەمانتوانی زۆر شوێن بگرین و چەک و پارەمان دەست بکەوێت، بەڵام ئێمە ئەوەمان نەکرد، ئەویش لەبەر خاتری ئەوەی حکومەتی ئێرانی تازە بەهۆی ئێمەوە توشی گیروگرفت نەیەت. دەتوانین بڵێین ئێمە بەپێی توانای خۆمان هاوکاری شۆڕشی ئێران بوین.

*** یەکێتی چەند توانی سود لە سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران وەربگرێت؟**

- یەکێتی توانی هەندێ سود لە شۆڕش وەربگرێت، بەڵام نەک وەک ئەوەی کە پێویست بو، چونکە هەر لە سەردەمی سەرکەوتنی شۆڕشی ئێرانەوە توشی ناکۆکی و جیابونەوە هات لەو سەردەمەدا کە تازە شۆڕشی ئێران لە سەرکەوتن دابو، ڕەسوڵ مامەند و دکتۆر مەحمود لێمان جیابونەوە، ئەو جیابونەوەیە توشی ناکۆکی و گیروگرفتی ناوخۆیی کردین.

ئەو برادەرانە کەوتنە دژایەتیمان و هێرشکردنە سەرمان لای ئێرانییەکان، ئەو هەڵوێستەی ئەوان، بوبەهۆی ئەوەی وەکو پێویست نەتوانین بەیەک ریزی و

یەکگرتو، بچینە لای شۆڕشی ئێران و کەڵکی لێوەربگرین.

بێگومان ئێمە دۆستایەتیمان لەگەڵ هەندێک لە باڵەکانی شۆڕشی ئێران و لەگەڵ کاربەدەستانی حکومەتی تازەدا هەبو، بەڵام دو کۆسپمان لە پێش بو، نەیهێشت زۆر کەڵک لەو پەیوەندیە وەربگرین بێجگە لەو ناکۆکییەی ناو خۆمان، کۆسپێکی تر، ناکۆکی بو لەناو حکومەتی تازەی ئێراندا کۆمەڵی کەسانی کۆنە پەرست هەبون، وەک یەکەم: سەرۆک وەزیران مەهدی بازرگان، ئێمەیان بە هێزێکی چەپ و مونتەڕیف دەزانی و نەیان دەویست پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی تازە ئاسایی بکەین و ئێسکمان قورس بو لەلایان.

دوەم: لەناو سوپادا، لە لەشکری ئێرانی شاهنشاهیدا، کۆنە ساواکیەکان هەمو ڕقیان لە ئێمە بو، زۆر شتیان بۆ هەڵدەبەستین کە ناومان لای دەسەڵاتدارانی کۆماری ئیسلامی بزڕێ و ناشیرین بێت، تەنانەت تۆمەتی زۆر ناراستیان ئەدایە پاڵمان.

*** ئایا لەناو دەسەڵاتدارانی ئێراندا ئێوە هیچ دۆستێکتان هەبو؟**

- بەڵی دۆستمان هەبو، لەوانە ئایتوڵای عوزما حسێن عەلی مونتەزەری و ئایاتوڵا تەڵەقانی. من نمونەیەکت بۆ دێنمەوە بۆ دژایەتی هەندێ کاربەدەستی ئێرانی: من لە مانگی ڕەمەزاندا لەوێ بوم و چوم بۆ زیارەتی ئیمام خومەینی و لە ماڵی ئایاتوڵا حسێنی مونتەزەری دابەزیبوم، زۆر دۆستمان بو، ئەو ئێمەی زۆر خۆش دەویست. لەوێ دانیشتبوین و کابرایەک هات سەلامی کرد و پرسیاریان لێکرد کە "لە کوێ بویت"؟، گوتی: "لە جیهاد بوم"، گوتیان: "لە کوێ لە جیهاد بویت"؟ گوتی: 'چوم بۆ سەنەندج بۆئەوەی دژی ئەو یاخیانەی کورد بجەنگێم، لەوێ باسیانکرد، جەلال تاڵەبانی لێیە و بە خۆیو دوسێ هەزار کەسێکەوە هاتون بۆ دیوی ئێران بۆ ئاژاوەگێران و لەوێ شەڕی دەکرد، ئێمە چوین بۆ ڕزگارکردنی ناوچەکە لە جەلال تاڵەبانی".

محەمەدی مونتەزەری لێی پرسی: "تۆ خۆت لەوێ دێیتەوە"؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: "ئایا جەلال تاڵەبانی لەوێ بو"؟ گوتی: "بەڵێ بەڵێ، من بەچاوی خۆشم پیشانیاندام گوتیان ئەها ئەوە جەلال تاڵەبانیە و لە دورەوە بینیم"، ئیتر ئەویش تورەبو، گوتی: "ڕوت ڕەش بێت ئەمە جەلال تاڵەبانیە، دانیشتووە لێرە"، کابرا وەکو سەتڵێک ئاوی ساردی بەسەردا بکەیت!! گوتی: "ئەئەمەتا جەلال تاڵەبانی! ئەوە چوار ڕۆژە لە ماڵی ئێمە دانیشتوە و لێرەیە"!.

ئینجا ئەوەی بۆ باوکی گێڕایەوە، گوتی باوکە بەوجۆرە بوختان هەڵدەبەستن بۆ تێکدانی بەینی ئێمە و یەکێتی.

هەروەها وەزیری بەرگری جاران، دکتۆر چەمران دەستی گرت بەسەر کۆمەڵێک چەک و تەقەمەنی ئێمەدا، لە ڕێگای سوریاوە بۆیان ناردبوین لە سەرەتادا بەڵێنیان داینێ چەکەکانمان بدەنەوە، ئەوەبو بە شێوەیەکی ناشیرین تەفسیری هێنایەوە بۆ دەست بەسەرا گرتنی ئەوکاتە عەسکەر و پاسداران پێیان خۆش نەبو کورد چەکی بەدەست بێت.

هەر ئەو کۆمەڵە، جارێکیان بە عبدولحەلیم خەدامیان گوتبو، نەیان زانیبو کە عبدولحەلیم سونییە، گوتبویان: "ئەم کوردانە سونەن، چەکیان مەدەنێ، لە دەمانچە زیاتریان مەدەنێ، نەیەڵن کلاشنکۆف و ڕەشاش و چەکی لەوجۆرەیان دەست بکەوێت"!.

*** ئەڵێن لای ئێرانی، یان لای شیعە، هەمو ئامرازێک بە ڕەوا دەزانرێت بۆ گەیشتن بە ئامانج، چۆن ئەتوانرێت لەگەڵ هێزێک لەو جۆرەدا هاوکاری بکرێت؟**

- من ناتوانم ئەو تەعمیمە بکەم و بڵێم لای ئێرانی وایە، لای هەمو میللەتێک بیری جیاواز و بۆچونی جیاوازی تێیدایە، بەڵام ئەو دامودەزگایەی کە دوای ڕوخاندنی شا لە ئێران هاتە سەرکار، ئەو سیاسەتەی گرتەبەر بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، کاتێ کە سودی لە شەڕدا بو لەگەڵ ئێمە، شەڕی کردین و کاتێ سودی لە دۆستایەتیدابو، دۆستایەتی کردین و بەوشێوەیە.

*** هۆی دروستبونی چەند ناوەندێکی بڕیار لە ئێران بۆ چی دەگەڕێتەوە؟**

- دروستبونی چەند مەرکەزێکی بڕیار، دەگەڕێتەوە بۆ باڵە جیاجیاکانی ئێرانی کە بەشداریانکردوە لە شۆڕشدا، شۆڕشی ئێران تەنها یەک هێز سەرکردایەتی نەکردوە، بەڵکو شۆڕشێکی جەماوەری زۆر فراوان بوە، لەو شۆڕشە جەماوەریە گەورەیەدا زۆر کەس بەشداری تێیداکردوە، لەوپەڕی چەپەوە، هەتا ئەوپەڕی ڕاست، لە پیاوانی ئاینیەوە، تا کەسانی عیلمانی و مولحید.

لەناو دەزگاکانی ئێراندا پیاوی ئاینیی خاوەن بیروبۆچونی جیاجیا هەیە، هەر لە کۆنەوە یەکێتی زانایانی ئاینی ئێرانیەوە هەیە، هی کاتی ئیمام خومەینیە، ئەمانە دو بەشن، بەشێکیان باڵی چەپ و بەشێکیان باڵی ڕاست. هەروەها گروپی جیا جیا لەناو حکومەت و دەرەوەی حکومەت هەیە، هەر گروپە بۆ چەسپاندنی

بیروباوەڕی خۆی کاردەکات و لە هەوڵی بەهێزکردنی باڵەکەی خۆیدایە و دەزگایەکی گرتۆتە دەست، ئەو دەزگایەی بەوشێوەیە بەڕێوەدەبات، بە کەڵکی دێت.

*** کۆماری ئیسلامی ئێران هاوکاری کوردی عێراقی زۆرکردوە و داڵدەی هەزارەها خێزانی ئاوارەی داوە و یارمەتی پێشکەشکردون، بەڵام لە هەمانکاتدا دژایەتیشی کردون و سەردەمێ لەگەڵ یەکێتیدا لە شەڕی هەمە جۆردا بوە، هۆی گرتنەبەری ئەم دو ڕێگا جیاوازە چیە؟**

– ئەو سیاسەتە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جیاوازییەی لەناو پێکهاتەی دامودەزگای کۆماری ئیسلامیدا هەیە. بۆ نمونە من لەسەرەتای شۆڕشی ئیسلامی ئێران و سەرەتای ناکۆکی لەگەڵ خەڵکی کوردستان، نامەیەکم بۆ مونتەزەری نوسی و تێیدا رونمکردبۆوە کە: "ئەو شەڕە لە نێوان کورد و حکومەتی ئێراندا هەیە، کارێکی خراپە، بەشکو جەنابت هیمەتێک بکەی بۆئەوەی موسڵمان، موسڵمان نەکوژێت و چارەیەکی ئاشتی بدۆزرێتەوە بۆ ئەو کێشەیە و من ئامادەم ناوبژی بکەم".

ئەویش بڕوای بە چارەی ئاشتیانەی کێشەکە هەبو، بۆیە چوبوە لای ئیمام خومەینی ئاگاداری کردبو، نامەیەکی لە منەوە دەربارەی کێشەی کوردی پێ گەیشتوە و ئیمام خومەینیش پێشنیازەکانی من بۆ ناوبژی قبوڵ دەکات.

کەوتمە ناوبژی لە نێوان کوردی ئێران و حکومەت و چەندین کۆبوونەوەمان ڕێک خست، لە نێوان هەیئەتی نمایندەی خەڵکی کوردستان و نوێنەرانی دەوڵەتی ئێران، بریتی بون لە (داریوشی فروهەر) وەزیری کار و کاروباری کۆمەڵایەتی کە لەهەمان کاتدا نوێنەری سەرۆکی حکومەت بو، بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد و دو وەزیری تریشی لەگەڵدا بو (عزت الله سحابی) کە جێگری سەرۆک وەزیران، مەهدی بازرگان بو، ئەوەی تر (هاشمی سباغیان) ، کە وەزیری ناوخۆ بو لەگەڵ (عەلی فەلاحیان) کە سەرۆکی ئەرکان بو.

ئەوان هاتنە سەردەشت و لە سەردەشت هێنامن بۆ گوندی (بەنوخەلەف)، لەوێ لەگەڵ مامۆستا شێخ عزەدین و سەلاحی موهتەدی و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕیی زەحمەتکێشانی کوردستان و سازمانی چریکی فیدایی ئێران (شاخەی کوردستان) گفتوگۆیان کرد.[٥]

ئێمە توانیمان ڕۆڵێک ببینین بۆ ئاشتکردنەوە و ئاشتییەک کە لە سودی هەمو گەلانی ئێران بێت و هێمنی و ئارامی دابینبکات، بەڵام بەداخەوە ئەو ئاشتیە زۆری نەخایاند.

باڵە شەڕخوازەکەی ناو پاسداران و کۆنەپەرستەکانی ناو حکومەتیش ئاشتیان

زۆر پێ ناخۆش بو، بۆیە کەوتنە دژایەتی ئێمە و منیان بەوە تاونبار دەکرد، شۆڕشی کوردم ژیاندۆتەوە، بۆیە بە خەستی دژمنایەتییەکی زۆی منیان دەکرد، بەتایبەتی دوای ئەوەی گفتوگۆکە سەری نەگرت و شەڕ و پێکدادان دەستی پێکردەوە.

بێگومان ئەوە لە کاتێکدا بو، پەیوەندی نێوان ئێمە و برایانی پارتی و حیزبی سۆسیالیستی کوردستان بەرەو خراپی دەڕۆیشت و ئەوانیش بۆ ئێمەیان تێدەچاند و ئەوەندەی بۆیان بکرایە، لەلای ئێرانییەکان زۆر بە خراپی لەسەرمان ئەدوان.

هەروەها راستیەکی تر هەبو پێویستە بیڵێین، ئەویش ئەوەبو ئێمە پشتیوانیمان لە شۆڕشی کوردستانی ئێران دەکرد و بەناوی هێزی پشتیوان ناسرابوین، دیارە ئەوەش پاسدارانی زۆر تورەکردبو، لەبەرئەوە ئەوانیش هەوڵیانئەدا دژی ئێمە کاربکەن و خەڵکیان ئەنارد بۆناو کوردستانی عێراق، بۆ دژایەتی ئێمە و لەگەڵ حیزبە کوردییەکانی تر هاوکاریان لە دژی ئێمە دەکرد و ئەوە بو هەژدە کەسمان لێ بەندکردن.

*** حکومەتی ئێران، حکومەتێکی ڕەگەز پەرست نیە و سیاسەتی پاکتاوکردنی ڕەگەزی دژی گەلی کورد بەڕێوەنەبردوە و حکومەتی تەنها گەلی فارس نیە، بۆچی ئەو حکومەتە ناتوانێ داخوازییەکانی گەلی کورد جێبەجێ بکات؟**

- حکومەتی ئێران ڕاستە وەکو تۆ گوتت حکومەتی تەنها میللەتی فارس نیە و ئێران ناوی خۆی بە خۆیەوەیەتی، ناوێکە کە هەمو گەلەکانی ئێران دەگرێتەوە. ڕاستە پاکتاوی نەژادی لە ئێراندا ناکرێت، بەڵام لە ئێران دو مەسەلە هەیە، کە دەبێت ڕەچاوبکرێت، یەکێکیان مەسەلەی مەزهەبیە: بەشێکی زۆری کوردی ئێران سونەن، هەندێ لە کاربەدەستانی ئێرانی شیعەگەری دەکەن و بەچاوی (سونە) سەیری کورد دەکەن. دوەمیان: ئێرانیەکان چارەسەری خۆیانیان هەیە بۆ مەسەلەی میللیی و بەپێی بیروبۆچونی خۆیان سەیری کێشەی کورد دەکەن، بریتیە لەوەی، هەمو موسڵمانین و براین و یەک دینمان هەیە. مەسەلەی نەتەوەیی لە بیری زوربەیاندا نیە، بەڵام هەندێک لە کەسانی ئاینیی رادیکاڵیان ئەو بۆچونە دەزانن، کێشەی کوردی، مەسەلەیەکی میللیە و پێویستە چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە.

هەروەها چەند هۆیەکی تر هەیە، پێویستە ڕەچاوی بکەین، بۆچی تاکو ئێستا مەسەلەی کورد چارەسەر نەکراوە:

یەکەم: من پێموایە جوڵانەوەی کوردستانی ئێران لەو هاوپەیمانێتانەی لە ئێران کردویەتی سەرکەتو نەبوە، واتا جوڵانەوەی کوردستان چو لەگەڵ چەپەکان و لەگەڵ حیزبی تودە و لەگەڵ گروپی وەک مەنسور حیکمت و ئەوانە هاوکاریانکرد، ئەو هاوکاریە زیاتر کاربەدەستانی ئێرانی لێهارکردن و زیاتر کوردی دورخستەوە لە تاران.

دوەم: حکومەتی ئێران چارەسەری میللیی بەشێوەی دینی تەرح دەکات، نەک بە شێوەی میللی، ئەوەش هۆیەکە رێگرە مافی میللی بەشێوەی ئاسایی خۆی چارەسەربکرێت.

سێیەم، ئەوان وا بیردەکەنەوە ئەگەر مافی میللیان بۆ کورد سەلماند، ئەوا پێویستە بۆ میللەتانی تری ئێرانیش بسەلمێنن، وەک ئازەر و عەرەب و بلوج. بۆیە حکومەت بە ئاسانی سەیری ئەم کێشەیە ناکات.

ئەگەر بتەوێت مەسەلەی میللی لە ئێراندا چارەسەربکەیت، ئەوا پێویستە ئێران ببێتە وڵاتێکی فیدراڵ، ئەگەر ئێران نەبێتە فیدراڵ، ئەوا چارەسەری مەسەلەی میللی و لەوانە مەسەلەی کورد ئاسان نابێت، چونکە ناکرێ کێشەی میللەتێک چارەسەربکەیت و ئەوەی تریان نەکەیت.

ئێستا لە ئێران خەڵک و گروپ هەیە داوای فیدراڵ دەکات و باس لەوەدەکات کە فیدراڵ چاکترین سیستەمە بۆ ئێران. بەتایبەتی هەندێک لەوانەی شارەزای مێژوی ئێرانن و دەزانن ئێران بە درێژایی مێژو یان فیدراڵ، یان کۆنفیدراڵ بوە.

ئێران شاهەنشایی هەبوە واتا شای شایان، واتا چەندین شا لە ئێراندا هەبوە و ئێران دابەشبوە بەسەر چەندین وڵاتدا و هەر وڵاتە شایەکی هەبوە، بەڵام شای شاهانیش هەبوە کە شای هەمو ئێرانی کۆکردۆتەوە.

ئێران لە کۆن زەمانەوە رژێمی فیدراڵی، یان سیستەمێکی نزیک لە فیدراڵیەوە بەخۆیەوە بینیوە، جگەلەوە هەندێک لە موسوڵمانەکان دەڵێن، خیلافەتی ئیسلامیش یەک حکومەتی مەرکەزی نەبوە، لە خیلافەی ئیسلامی ویلایەتی ئیسلامی هەبوە و ویلایەتی ئیسلامی ئەو دەسەڵاتەی هەیانبوە، لەناو چوارچێوی دەوڵەتی ئیسلامیدا زۆر زۆرتربوە لە فیدراڵ.

بۆ نمونە، ویلایەتی ئیسلامی مافی دروستکردنی سوپای خۆی هەبوە و ویلایەتی ئیسلامی مافی ئەوەی هەبوە هەمو شتەکانی لەدەستی خۆیدابێت و تەنها لە نوێژی هەینیدا، ناوی خەلیفە بێنێت و سکەیەکی هاوبەش هەبێت و باجیش بدات بە حکومەتی مەرکەزی و لەکاتی جەنگیشدا، بچێت هاوکاری حکومەتی

مەرکەزیکات. وەکوتر کارەکان هەمو بەدەست ویلایەتەکە خۆی بوە و هەندێک دەڵێن ئەو سیستەمە زۆر گونجاوە بۆ ئێران و هەندێکیش دەڵێن، نەخێر ئێران ئەگەر ئەو سیستەمەی هەبێت ئەوا پارچە پارچە دەبێت، بۆیە دەسەڵاتدارانی ئێرانی نەیان توانیوە هەتا ئێستا مەسەلەی میللی چارەسەربکەن.

*** لەم ڕوانگەیەوە، پێویستە کوردی عێراق یاخود یەکێتی نیشتمانی، چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو گروپە جیاوازانەی ناو ئێران بکات؟**

- من پێم باشە ئێمە سیاسەتێکی مەبدەئی بگرینە دەست، سیاسەتەکە بریتی بێت لە:

یەکەم: سیاسەتی (بە ئاشتی پێکەوە ژیان) (التعايش السلمي) واتا سیاسەتی پێکەوە ژیان بگرینەبەر.

دوەم: سیاسەتی دەست نەخستنە ناو کاروباری ناوخۆی یەکتر (عدم التدخل في الشؤون الداخلية).

سێیەم: دۆستایەتی ئەوەدەکەین، دۆستایەتیمان دەکات و دژی ئەوەین کە دوژمنایەتیمان دەکات (نصادق من يصادقنا ونعادي من يعادينا).

چوارەم: ئێمە ڕەچاوی ئەو ڕاستیە بکەین، سنورێکی دورودرێژمان لەگەڵ ئێران هەیە و جوغرافیا ئێمەی بەیەکەوە بەستۆتەوە و مێژوی هاوبەشی زۆرمان هەیە، بۆیە پێویستە ئێمە هەوڵبدەین، پەیوەندی باشمان لەگەڵ ئێراندا هەبێت و هەوڵبدەین لە کاروباری ناوخۆدا نەبینە تەرەف و دۆستایەتی بەشێک لە دژی بەشێکی تر نەکەین، بەڵکو لەگەڵ هەمو ئێرانییەکان دۆستایەتی دروست بکەین، بە ڕەچاوکردنی دەسکەوتی میللەتی کورد لە کوردستانی عێراق ڕەچاوی ئەوەش بکرێ کە ئەوانیش بەرژەوەندی خۆیان هەیە.

*** هەمو هێزە کوردییەکانی ئێران، لەوانە هەردو کۆمەڵە و حیزبی دیموکرات، لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتییدان، چۆن مانەوەی ئەم هێزانە لەگەڵ دۆستایەتی یەکێتی لەگەڵ ئێراندا یەک دەگرێتەوە؟**

- ئێمە توانیومانە ئەو وەزعە بگونجێنین، ئەو هێزانەی باستکردن، هەم لە ناوچەکانی ڕزگارکراوی ئێمەن و هەم ڕادیو و ڕۆژنامە و شتی خۆیان هەیە، هەمیش توانیومانە لەگەڵ ئەوانە بەخۆشی و هێمنی بژێین و ئێرانیش ڕازی بکەین.

پێموایە دو سێ خاڵ یارمەتی داوین بۆ ئەو پێکەوە ژیانە:

یەکەم: هەڵوێستی ژیرانەی ئەو حیزبانەیە، بەڵێنیانداوە چیتر لەلای ئێمەوە هێزی چەکدار نەنێرنەوە بۆناو ئێران و لەوێ کاری چەکداری بکەن و جارێکی تر بێنەوە عێراق. ئەمە خۆی لە خۆیدا دەسکەوتێکی گەورەش بو بۆ ئێران، چونکە حکومەتی ئێران ئەوانی لە کوردستان بێهێزکردوە، هێزی چەکداریان لەوێ نەمابو، واتا سنورەکانی ئێران پارێزراو بو، ئاسایشی ئێران لە مەترسیا نەبو.

دوەم: ژیری هەندێ لە سەرکردەکانی حکومەتی ئێران کە تێگەیشتن، سودیان لە شەڕی یەکێتیدا نیە، یەکێتی ئاسایشی سنورەکانی بۆ دابینکردون، بێگومان ئەویش بە هاوکاری برا کوردەکانی ئێران، بەدەنگ داخوازیەکەمانەوە هاتن.

سێیەم: ئێمە لەگەڵ ئێران دوژمنی هاوبەشمان هەبو، حکومەتی عێراق بو، دوژمنی هەردولا بو.

چوارەم: ئێمە دۆستایەتی و هاوکارییەکی پتەومان لەگەڵ برا شیعەکان و بەتایبەتی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی بە سەرۆکایەتی محەمەد باقر سەدر هەبو، زۆر یارمەتی ئێمەیدا و زۆر لە ڕاستییەکانی ئێمەی لای ئایەتوڵا سەید عەلی محەمەدی خاتەمی و خامەنەیی و لای شێخ ڕەفسەنجانی و دەسەڵاتدارانی تر رونکردەوە و قسەی باشی بۆ دەکردین و ڕاستییەکانی ئێمەی پێڕاگەیاندن.

*** یەکێ لەو گروپانەی کە گیروگرفتی زۆری بۆ یەکێتی دروستکرد، ئەنسار ئیسلام بو، ئەوان هەتا مابون ئێران هاوکاری دەکردن، کاتێک کە تێکشکان، زۆربەی لێپرسراوەکانیان ڕایانکرد بۆ ئێران، چۆن ئەتوانین لەم سیاسەتەی ئێران تێبگەین کە هاوکاری گروپێکی تیرۆرستی بەو شێوەیە ئەکات؟**

- هەندێ لە پرسیارەکانی تۆ تەعمیمی تێدایە، من ڕازی نیم لەسەر ئەو تەعمیمە. من پێموانیە هەمو حکومەتی ئێران، هەمو کاربەدەستەکانی ئێرانی یارمەتی ئەنسار ئیسلام دەدەن. پێموایە لەناو ئێراندا تاقمێک هەیە یارمەتی ئەنسار ئیسلام دەدات و ئەو تاقمە لەناو پاسدارانە و لەناو ئەواندا دەسەڵاتدارن، واتا ئەوەی یارمەتی ئەوان ئەدات، کەسێکی بچوک نیە و کاربەدەستێک نیە لە خوارەوە بێت. ئەو تاقمەی یارمەتی ئەنسار ئیسلام دەدا، پێموایە بە پێچەوانەی ئامۆژگارییەکانی سەرۆک کۆماری ئێران و حکومەتی ئێرانەوە کاردەکات.

لێپرسراوان پێیان خۆش نیە گێچەڵیان بۆ دروست ببێت، پێیان خۆشە، لەدەرەوە توشی گیروگرفت نەبن لەگەڵ هیچ کەس و گروپێک ئەنسار ئیسلام لە راستیدا دژی ئێرانیشن و دژی کۆماری ئیسلامین، چونکە ئەوانە کۆمەڵێکن

بەستراون بە قاعدە و تالیبانەوە، ئەوانە دژی کۆماری ئیسلامین.

ئەنسار ئیسلام، شیعە بە کافر دەزانن و پێیان دەڵێن (خوارج)، بەڵام ئەنسار دەیانویست ئەو باڵەی کە لەناو پاسداراندا هەیە، دژی ئەمەریکا و ئێمە بەکاربهێنن و سەرئێشە بۆ ئێمە دروست بکەن و نەیەڵن کوردستانی عێراق ئارام بێت. لەبەرئەوە هەتا ئەمەریکا نەهاتبوە کایەوە، بەئاشکرا یارمەتیان ئەدان، ئەو هەمو چەک و تەقەمەنیەی لێمان دەگرتن، دیاربو کە هی دەستی قاچاغچی نەبوە و بەڵکو یارمەتی ئەو گروپەی پاسداران بو بۆئەوان.

بەڵام کە ئەمەریکا هاتە ناوچەکە، ئەو هاوکاریە کزبۆوە و نەیانوێرا ڕوبەڕوی ئەو بارودۆخە تازەیە ببنەوە، بۆیە لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا بە هاوکاری هەمو لایەک ئەنسارمان لە کوردستان دەرکرد، دەرمان کردن چونە لای ئەو باڵەی ناو ئێران کە هاوکاریان دەکردن و ئەوان گرتنیانە خۆیان.

ئێستا ئیعترافاتی ئەوان لای ئێمە هەیە، یەکەمجار چونەتە ئەودیو ئێران، ویستویانە بیانگرن، بەڵام دوایی بیریان گۆڕیوە و پارەیان داونەتێ و هاوکاری تریان کردون و ڕێکیان خستون و پێیان گوتون، کە بگەڕێنەوە بۆ کوردستانی عێراق، ئەوەبو جارێکی تر هاتنەوە و ئەمجارەش دەرمان کردونەوە.

ئەو باڵەی لەناو پاسداراندایە زۆر یارمەتی ئەنسار ئیسلام دەدا، ئێمە دەیان کەسمان گرتوە یا هاتوونەتەلامان و ئیعترافیان کردوە کە چۆن ئەو دەزگایە لە ئێران یارمەتی و هاوکاری کردون.

بێگومان لەو ماوەیەدا ئەو باڵەی ناو پاسداران، هەندێ لەو ئەنسار ئیسلامانە بەکاردێنێ لە دژی ئەمەریکا و دەیاننێرێتە ناو عێراق و شارەکانی فەلوجە و ڕۆژئاوای بەغدا بۆ دژایەتی ئەمریکا.

ئێمە لەگەڵ برا ئێرانیەکانی کە دۆستمانن، بە ڕونی و ئاشکرا قسەمان لەگەڵ کردون و پێمان سەلماندن کە "ئەو گروپە هاوکاری و یارمەتی لە دەزگایەکی ئێرانی وەردەگرن و ئەوە دژمنایەتی ئێمەیە، ئەگەر دژمنایەتی ئێمە دەکەن پێمان بڵێن و ئەگەر دۆستایەتمان دەکەن دەبێ ئەوانە بگرن، بماندەنەوە بۆ دادگای کردنیان".

دۆستەکانمان لە ئێران، بەڵێنیانداوە ئەو ئەنسار ئیسلامانەی لە ئێرانن، بیانگرن و تەسلیممانی بکەنەوە، بەڵام نازانم ئەو بەڵێنە چەند جێبەجێ دەکرێت، چونکە ئەوانە چەند جارێک هەمان بەڵێن ئەدەن و جێبەجێی ناکەن. ئێستا دەڵێن گوایە سیاسەتی پێشوی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئێرانی ئەوەبو، ئەوانە دەرکرێن

لە ئێران و بڕۆن بۆ هەر جێیەک دەچن، بەڵام ئێستا دەڵێن نەخێر سیاسەتەکەمان ئەوەیە ئەوانە بگیرێن و بدرێنەوە ئێمە. جا ئەگەر ئەوە ڕاست بێت، ئەوا کارێکی زۆر باشە و تاوانباران بە سزایی یاسایی خۆیان دەگەن. بێگومان ئەوانیش ترساون لەوەی کە ئەمەریکا لە عێراق مجاهدین و هێزی بەربەرەکانی ئێرانی لە دژی ئێران، بجوڵێنێت و لە دژی ئێران هاوکاری و یارمەتیان بدات.

# تورکیا

*** کەی یەکەمجار چوی بۆ تورکیا و بۆچی؟**

- یەکەم سەفەری من بۆ تورکیا ساڵی ١٩٧٧ بو، ئەوکاتەبو کە لە سوریاوە بە نهێنی چومە ئەستەمبوڵ و لەوێشەوە گەڕامەوە بۆ کوردستانی عێراق بۆ بەشداریکردن لە شۆڕشدا.

*** بۆچی حکومەتەکانی تورکیا لەکاتی عوسمانیەوە هەتا ئێستا، دۆستایەتی مەسەلەی کوردیان نەکردوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بوە؟**

- پێموایە تێکەڵاو کردنێک هەیە لە نێوان تورکیای عوسمانلی و تورکیای کۆماری. تورکیا لە سەردەمی عوسمانلیدا، بەتایبەتی پێش ئەوەی جەماعەتی جۆن تورک (تورکیای لاو) دەسەڵات وەربگرن، کاریان واکردوە هەمویان خۆیان بە عوسمانلی زانیوە و ئەو جیاوازیە نەبو لە نێوان نەتەوەکانی کە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانلیدا ژیاون.

کورد، یەکێک بو لەو نەتەوانەی لەوکاتەدا لە پێشەوە بو و پیاوی گەورەی تێیدا هەڵکەوتوە. وەزیری دەرەوە و سەدری ئەعزەم و سەرۆکی لیژنەی ئەعیانی هەبوە، ژمارەیەکی زۆر ئەفسەری پلە بەرزی هەبوە لە سوپادا. بۆیە کاتێک جۆن تورک، وەک کۆمەڵێکی تۆرانی نەژاد پەرست، کاریان گرتە دەست، هەوڵیاندا نەتەوەکانی تر بتوێننەوە، ئەوەبو کوردەکانیش هەستی نەتەوایەتیان جوڵا و لێیان هەڵگەڕانەوە.

*** هەڵوێستی ڕاستەقینەی ئەتا تورک بەرامبەر بە مەسەلەی کورد چۆن بوە؟**

- ئەتاتورک دو هەڵوێستی هەبوە، لە سەرەتادا ویستویەتی دۆستایەتی کورد بکات و گوتویەتی "ئەم وڵاتە وڵاتی کورد و تورکە و ئەم کۆمارە کۆماری کورد و تورکە"، کەڵکی لە هێزی کورد وەرگرتوە بۆ دەرپەڕاندنی یۆنانییەکان.

لەو دو دەورەیەی پەرلەمانی تورکی کە لە ئەنقەرە بەستویەتی، نوێنەرەکانی کوردستان ناویان لەسەر دیواری ئەنجومەنی نیشتمانی تورکی تۆمارکراوە، واتا بەڵێنی بە کورد داوە و گوتویەتی "ئێمە ئۆتۆنۆمیەکتان دەدەینێ کە زیاترین لەوەی لە پەیمانی سیڤەر ناوی هاتوە". بەڵام دوای ئەوەی پیاوە دیندارەکانی کورد ڕاپەڕینیان دژی ئەتاتورک کرد، دیارە هەڵوێستی ئەویش گۆڕاوە.

گرنگە بەوردی لەو قۆناغە بکۆڵرێتەوە، چونکە من پێموایە ئەو ڕاپەڕینانە دو بەشن، بەشێکیان کورد ویستویەتی مافێکی نەتەوایەتی دەست بکەوێت، جا ڕێگای هەڵە، یان ڕاستی گرتبێت، ئەوە شتێکی ترە.

بەشێکی تریش، کاریگەری دین بوە، مستەفا کەمال ئەتاتورک دژی خەلیفە بوە و کوردەکان بەرگریان لە خەلیفە کردوە دژی ئەو هەڵساون، بۆیە ئەوانە لە بەرچاوی ئەتاتورک هەم کۆنەپەرست بون کە بەرگریان لە خەلافەت کردوە و نەیان ویستووە تورکیا ببێتە وڵاتێکی مۆدێرن، هەم شەڕیان لەگەڵ کردوە.

کەمال ئەتاتورک وایزانیوە کوردەکان بەفیتی ئینگلیز هەستاون ڕاپەڕین دەکەن، بە ڕاستی ئنگلیز دەستی تێیدابوە و ئەوە بۆتەهۆی ئەوەی ئەتاتورک هەڵوێستێکی توند لە دژیان وەربگرێت.

لە پاشاندا ئەتاتورک فکرەی ئەوەی دروستکرد، یەک نەتەوە دروست بکات، واتا یەک نەیشن (Nation) بە مەفهومی ئەوروپی، واتا هەمو ئەفرادەکانی ناو تورکیا بتوێنێتەوە لە یەک نەتەوەدا، ئەو نێشنەشی کرد بە تورک.

بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، وای لێهات کە خەڵک (تەتریک) بکات، واتا بیانکات بە تورک، ئەو سیاسەتەی پەیڕەوکرد، بەڵام ئەو سیاسەتە سەری نەگرت، کاتێک ئەوان لە ساڵی ١٩٢٤ - ١٩٢٥ دەستیان کرد بە (تەتریک)، دەیانگوت ملیۆن و نیوێک کورد لە تورکیا دەژی، بەڵام پاش حەفتا ساڵ، هاتن و گوتیان دوانزە ملیۆن کورد لە تورکیا دەژی، واتا هەشت بەرامبەر کورد زیادی کرد نەک تواوەتەوە. ئەوە جگە لەوەی کورد خۆی دەیگوت، ژمارەم زیاترە لەو دوانزە ملیۆنە.

*** لە شەستەکان، تا ناوەڕاستی هەشتاکان لە تورکیا کاتی کودەتاکان بو، لە دوای ناوەڕاستی هەشتاکان هەتا ئێستا هیچ کودەتایەک ڕوینەداوە، ئەو هێمنیە سیاسییە بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

- وەڵاهی سەلاحەدین من شارەزای کاروباری تورکی نیم، بۆیە بەڕاستی ناتوانم تەقیمێکی باشی ئەو قۆناغانە بکەم، بەڵام حەفتاکان هەمو ساڵانی ئینقیلابات نەبوە، هەر لە حەفتاکاندا ماوەیەکی زۆر ئەجەوید بە ناوی حیزبی شەعبی جمهوریەوە دەسەڵاتداربو، سەرەرای ئەوەی ئینقیلابیشی تێیدابو.

لە هەشتاکاندا دوای ئەوەی سوپا یاسایەک و دەستورێکی تازەیاندانا، ئیتر ئینقیلابات کەمبۆوە، رەنگە هۆیەکی تریش ئەوەبێت، تورکیا دەیەوێت بچێتە ناو یەکێتی ئەوروپاوە، ئەوروپا ئینقیلابی عەسکەری پێناخۆشە. هەروەها هۆیەکی تر رەنگە ئەوەبێت، ئەمەریکا چیتر پشتیوانی لە ئینقیلاباتی عەسکەری ناکات.

هەروەها عەسکەرییەکانی تورکیا ئەتوانن ئەوەی کە جاران لە رێگای ئینقیلاباتەوە بەدیاندەهێنا، ئێستا ئەتوانن بە فشاری سیاسی بەدەستی بهێنن، بۆ نمونە سوپا توانی لە رێگای فشاری سیاسیەوە ئەو حکومەتەی، حیزبی رەفا سەرکردایەتی دەکرد، لایبەرن و هیچ پێویستی بە ئینقیلاب نەکرد.

*** بۆچی لەناو حیزبەکانی تورکیادا کەم حیزب هەیە، باوەڕی بە چارەسەری مەسەلەی کورد هەبێت، یان زوربەی هەرە زۆری حیزبەکان بە پێشکەوتوخواز و شۆفینی و نەتەوەییەکانەوە، هەڵوێستیان شۆفینانەیە بەرامبەر بە کێشەی کورد لە تورکیا هەیە؟.**

- لەناو تورکیادا زۆر کەس باوەڕیان بە (نێشن)ی تورکی هەیە، واتا باوەڕیان بە (نەتەوەی تورک) هەیە و باوەڕیان بەوە هەیە، تورک یەک نەتەوەیە، لەبەرئەوە هەوڵ ئەدەن کە مەسەلەکە بکەن بە گشتی و وای لێبکەن هەمو تورکێک بەو شێوەیە بیردەکاتەوە.

من پێموانییە هەمو حیزبەکان شۆڤێنین، بۆ نمونە حیزبی (ئاک پارتی)، حیزبێکی شۆڤێنی نیە (ئاک پارتی) حیزبێکی نەتەوەپەرست نیە، حیزبێکە میولی دیموکراتی و ئیسلامی هەیە و حیزبێکە ئەوەندە لیبراڵە، جێگری سەرۆکەکەی، کوردە و چەندین لێپرسراوی کوردیان هەیە.

بۆ نمونە، سەرۆکی حیزبی (جەهەپە)، پشتگیری سیستەمی فیدراڵی لە عێراق دەکات لەسەر بناغەی ویلایەت و پێیباشە کوردیش لەژێر سایەی ئەو سیستەمەدا جێگای خۆی وەربگرێ، واتا ئەو تەعمیمە بەو شێوەیە دروست نیە.

لە تورکیا دو بەرە هەیە، بەرەی حیزبە ناسیۆلیستەکان، لە هەڵبژانی ئەم دواییەی پەرلەماندا شکان و هیچیان نەیانتوانی بچنە پەرلەمانەوە، بەڵام بەرەی حیزبە دیموکرات و مۆدێرنەکان توانیان بچنە پەرلەمانەوە. لە تورکیا کەسانێک هەن، داوای مافی کورد دەکەن و پێیانوایە دەبێت چارەیەک بۆ مەسەلەکە بدۆزرێتەوە، بەڵام تاکو ئێستا ئەو دەنگانە زۆرکزن.

*** تۆ لەومو پێش باسی تورگۆت ئوزال و رۆڵی ئەوتان بۆ کردین بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد، ئایا بۆ لە تورکیا ئوزالێکی تر دروست نەبو؟**

- وەڵاهی سەلاحەدین ئەوەش نازانم، ئەوە دەبێ دیراسەتی تورکیا و کۆمەڵگای تورکی بکرێت، بۆچی ئوزالێکی تری دروست نەکردوە.

*** ترسی تورکیا چیە لەسەر سەربەخۆی کوردستانی عێراق؟**

- ترسەکەی ئەوەیە، ئەگەر کوردستانی عێراق سەربەخۆ بو، ئەوا کوردستانی تورکیاش داوای سەربەخۆیی دەکات و رەنگە بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی کوردی لێجیاببێتەوە.

*** بۆچی تورکیا رێی بە هێزی ئەمریکی نەدا پێش پرۆسەی رزگاری عێراق، لە رێگای خابورەوە بێتە ناو عێراقەوە؟**

- تورکیا پێیوابو بەبێ ئەوان ئەمەریکا شەڕی پێ ناکرێت، تورکیا شەڕی عێراقی پێ خۆش نەبو، چونکە دڵنیا نەبو کە سەدام دەروخێت و لادەچێت. تورکیا پێیوابو ئەگەر سەدام روخا کورد باڵادەستدەبێ و کوردستان رزگاردەبێت، لەبەرئەوە هاتنی ئەو بارودۆخە تازەیەی پێ خۆش نەبو، هەروەها پێشی وابو ئەگەر ئەو رێگا بە ئەمەریکا نەدا لەشکرەکەی بنێرێ بۆ عێراق، ئەوا شەڕەکە رونادات، بەڵام کاتێ زانی کە ئەمەریکا شەڕەکەی کرد و بردییشەوە، ئیتر پەشیمان بۆوە و ئێستا ئەنگوستی پەشیمانی دەگەزێ و رەنگە بڵێن بریا رێگامان بدانایە.

***دوای ئەوەی ئەمەریکا بنکەی سەربازی خۆی لە عێراق دروستکرد، گرنگی تورکیا بۆ ئەمەریکا چی دەبێت؟**

- نازانم ئایا ئەمەریکا بنکەی سەربازی لە عێراق دروست دەکا یان نا، بەڵام بێگومان تورکیا گرنگی خۆی هەر هەیە بۆ ئەمەریکا لەبەر چەند هۆیەک:

یەکەم: تورکیا بەهۆی (زمان)ەکەیەوە گرنگی خۆی هەیە بۆ وڵاتانی ناوەڕاستی ئاسیا.

دوەم: تورکیا کاریگەری خۆی هەیە لەسەر ناوچەی دەردەنیل و ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

سێیەم: تورکیا دەوڵەتێکی ئیسلامی عیلمانییە، لە بەرامبەر تەیاری ئیسلامی وەستاوە و گرنگی خۆی هەر ئەمێنێ، بەڵام رەنگە وەکو جاران نەمێنێ. بۆ نمونە جاران گرنگیەکی تری هەبو کە وەکو هێزێکی سەربازی دژی روسیای سۆڤیەتی وەستابو، بەڵام ئێستا ئەوە نەماوە، دەنا لایەنەکانی تری گرنگی تورکیا هەر دەمێنێت.

بێگومان ئەگەر عێراقێکی دیموکراتی دۆستی ئەمەریکا دروست ببێت، هەندێک لە گرنگی تورکیا کەمدەبێتەوە بۆ ئەمەریکا.

*** چۆن ئەتوانرێت ئەو گرژیەی لەنێوان چەند لایەنێکی سیاسی لە کوردستانی عێراق و تورکیادا هەیە، چارەسەربکرێت؟ بە تایبەتیش تورکیا ترسی لە دوارۆژی عێراق و پێگەی تورکمانەکان هەیە؟**

- بە ئاسانی چارەدەکرێت، ئەویش بەوەی رێگای گفتوگۆ و دانوساندن بگرینەبەر، ئێمە و کاربەدەستانی حکومەت دەمانەوێت دۆست بین و دەمانەوێت ناکۆکییەکانمان بە خۆشی چارەسەربکەین.

بە رای من، ئێستا کاتێکی باشە بۆئەوەی ئێمە لەگەڵ تورکیا ئەو گرژییە نەهێڵین، بەتایبەتی ئێمە ئێستا چەند شتێکمان سابیت کرد کە جاران تورکیا لێی دەترسا، هەرچەندە چەندەها جار بۆمان رونکردونەتەوە کە ترسی ئەوان لە کوردی عێراق ترسێکی نا مەشروعە.

هەندێ لەو ترسانەی کە هەیان بو، بریتی بون لە:

یەکەم: ئەیان گوت، ئەگەر سەدام روخا، ئەوا کوردستانی سەربەخۆ دروست دەبێت، بەڵام ئەوا سەدام ڕوخاو کوردستانی سەربەخۆش دروست نەبو، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئێمە چوینە بەغدا و دەمانەوێ کوردستان لەگەڵ عێراق یەک بخەینەوە.

دوەم: ئەوان دەیان گوت، لە کاتی هەڵگیرساندنی شەر و ڕوخاندنی سەدامدا، هەزارەها پەناهەندە ڕودەکاتە تورکیا، بەڵام دەرکەوت تاقە نەفەرێکیش ڕوی نەکردە تورکیا.

سێیەم: دەیان گوت، لە کاتی ڕوخاندنی سەدامدا، تورکمانەکان لەناو دەبرێن و دەکوژرێن و قەڵاچۆ دەکرێن، بەڵام ڕاستیەکەی دەرکەوت، خوێن لە لوتی یەک تورکمان نەهاتوە، ئەوە هەموی بۆچون و پروپاگەندەی ناڕاست دەرچو.

بە پێچەوانەوە ئێستا گرنگی کورد لە بەغدا و ڕۆڵی کورد لە مەجلیسی حوکم زیادی کردوە، بۆیە من پێموایە زەمینەیەکی زۆر باش دروست بوە بۆئەوەی، دۆستایەتی لەگەڵ تورکیا نوێ و پتەوتر بکرێتەوە لە جاران زیاتر.

## سوریا

*** کەی یەکەمجار چویتە سوریا و بۆچی؟**

- ساڵی ١٩٥٥ یەکەمجار چومە سوریا بۆئەوەی لەوێوە برۆم بۆ وارشۆ، بۆ بەشداریکردن لە فیستڤاڵی لاوان و خوێندکاراندا.

*** چۆن مام جەلال توانیویەتی وەکو چەپێکی کورد و وەکو سیاسەتمەدارێکی کوردستانی، لەگەڵ سوریای نەتەوەپەرستی عەرەبیدا پەیوەندییەکی باش و درێژ و جێگیر دروست بکات؟**

- یەکەم، حەز ئەکەم بزانی، ئەو سوریایەی من دۆستایەتی دەکەم، خۆی بە چەپ و خۆی بە سۆسیالیست دەزانێ و زوربەیان باس لە سۆسیالیستی و دژایەتی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم دەکەن. پێموایە ئەوەی وایکردوە من لەگەڵ ئەو برادەرە سوریانە دۆستبم، هەڵوێستی منە لە گەلی عەرەب، واتا ئەوان دەزانن کە من کوردێکم لەو کەسانەی خەبات دەکەم و باوەڕم بە برایەتی کورد و عەرەب و یەکێتی تێکۆشانی کورد و عەرەب هەیە و دەمەوێت یەکێتی عێراق پارێزراوبێت و لەسەر بنەمایەکی نوێ دروست بێتەوە.

هۆیەکی تری ئەو پەیوەندییە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەیوەندیەی کە لەگەڵ عەبدولناسر پەیدامکردبو. ئەوکاتە کاربەدەستانی سوریا، لاو بون و وەک بۆیان گێڕاومەتەوە، هەندێکیان کە منیان دەدی دەیان گوت زۆرمان پێ خۆش بوە کە تۆ چویت بۆ لای عەبدولناسر و ناوت لە ڕۆژنامەکان دەخوێنرایەوە، جەلال تاڵەبانی

چاوی بە عەبدولناسر کەوتوە. بۆ نمونە، جارێکیان سەرۆک حافز ئەسەدم بینی و باسی ئەوەی کرد و وتی: "من مقدم بوم لە هێزی ئاسمانی، کاتێ کە تۆ چویت بۆلای عەبدولناسر و لە ڕۆژنامەکاندا خوێندمەوە، تۆ دۆستی عەرەبیت و حەز لە برایەتی کورد و عەرەب دەکەیت، ئەو کارانە کاریگەریەکی باشیان هەبو لەسەر پەیوەندی کوردی عەرەبی".

هەروەها هەڵوێستی سیاسی و ڕێبازی سیاسی خۆشمان، کاریگەری هەبوە لەسەر ئەو پەیوەندییەی کە هەمانە لەگەڵیاندا. لەپاشاندا ئێمە لە هیچ کاتێکدا دوژمنایەتی سوریامان نەکردوە و هیچ کاتێک دەستمان لە کاروباری سوریا وەرنەداوە.

*** کەی یەکەمجار حافز ئەسەدتان بینی و چۆن تەقیمی ئەسەدتانکرد؟**

- یەکەمجار کە بینیم، هەروا بینینێکی بەسەرپێوە بو، ئەویش ساڵی ١٩٦٧ بو، بەڵام یەکەم دانیشتنم لەگەڵ حافز ئەسەد ساڵی ١٩٧٠ بو، من بە ڕێگای سوریادا دەچوم بۆ بەیروت و لەسەر خاڵی پشکنینی سنور، وتیان قەدەغەیە تۆ بچیتە ناو خاکی سوریاوە و نەیان هێشت بچمە ناوەوە، منیش دەمویست بچم بۆ بەیروت، تکام لێکردن تەنها ڕێگای (ترانسێت)م بدەنێ، بەڵام هەر ڕازی نەبون، گوتیان تا بەیانی بمێنەوە و دوایی پێویستە بگەڕێتەوە بۆ عێراق.

لەوکاتەدا ئۆتۆمبێلێکی ڕێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینی (فەتح)، بەوێداهات و دکتۆرێکی تێیدابو، منی دەناسی و هات سڵاوی لێکردم، وتی: ئەوە چیە بۆ لێرەدا وەستاویت، منیش مەسەلەکەم بۆ باسکرد.

تازە حافز ئەسەد سەرکردایەتی بزوتنەوەی ڕاستکردنەوەی (الحركة التصحيحية) کردبو، بوبو بە سەرۆک وەزیران. من نامەیەکم بۆ نوسی، لەوکاتەدا هیچم پێنەبو لەسەری بنوسم، پاکەتێکی جگەرەی جمهوریم پێ بو، وەرەقە سپیەکەی ناویم دەرهێنا و لەسەر ئەوە نوسیم، پاش سڵاو نوسیم: "ببورە من هەر ئەوەندە کاغەزم دەست کەوتوە کە ئەم چەند دێرەتان بۆ بنوسم" و باسی حاڵەکەی خۆمم بۆ کرد، لەسەر سنور گلیان داومەتەوە و پێش چەند ساڵێک (ممنوع دخول)م هەبوە، بەڵام ئێستا من دەبێ بچم بۆ لوبنان و هیوادارم فەرمان دەربکەی ئەم قەدەغەیەم لەسەر لابچێ.

وەڵا سەلاحەدین، ئەوە لە بەیانیەوە من لەوێمە هەتا دوای نیوەڕۆ نانیشم نەخواردوە و پیاسەم دەکرد و نەیان دەهێشت لە ژورەوە لای ئەوان دابنیشم و جانتاکەم لەوێ کەوتبو، لەپڕ کابراکەی کە زۆر بە لوتبەرزی قسەی لەگەڵدا

دەکردم، هاتە دەرێ و بانگی کردم (استاذ جلال طالباني) منیش لە دڵی خۆمدا گوتم، بەخوا دیارە شتێک ڕوی داوە و خۆم قورس کرد، گوتم: بەڵێ فەرمون، گوتی فەرمو وەرە ژورەوە، لەوکاتەدا نانی بۆ هاتبو، گوتی: نانم لەگەڵدا بخۆ، گوتم سوپاست دەکەم نان ناخۆم، وتی سەرۆک وەزیران فەرمانی دەرکردوە، ڕێگات پێبدرێت و سەفەرەکەت بکەیت و فەرمانە کۆنەکەی هەڵوەشاندۆتەو و گوتویەتی با چاوەڕێ بکات، من خۆم ئۆتۆمبێلی بۆ دەنێرم.

ئەوەندەی پێنەچو، مارسیدسێک هات و منیان برد بۆ ئوتێل سەمیرەئەمیس لە شام و لەوێ ئاگادارکرابون، میوانی سەرۆک وەزیرانم. بۆ سبەینێ بردمیان بۆلای خۆی و سوپاسمکرد و گوتی: چەند ڕۆژێک لێرەبە، منیش بۆم باسکرد بە پەلەمە و لەوکاتەوە بوین بە ناسیاو و دۆست و من سوپاسگوزاریی ئەو چاکی و پیاوەتیەی ئەو بوم.

من حافز ئەسەدم وەک مرۆڤێکی زیرەک و دوربین و هەمە لایەنە و پانۆراما فراوان ناسیوە، پیاوێکی بەتوانا و نەبەز و ئازا و بە ئیقدامبو، بە گوڕ و تەوژم بو. کابرایەک بو مرونەتی هەبو، کراوەبو، بە حوکمی ئەوەی لە تایفەیەکی ستەم دیدەی عەلەوییە، مێشکی لەچاو سەرکردە بەعسییەکاندا زۆر کراوەبو، واتا بە بۆچونی خۆم، هیچ گیانی شۆڤینی لە دڵ و دەرونیا نەبو. دژایەتی حیزبەکانی تر لە دڵ و دەرونیا نەبو، لەبەرئەوە هەر کە دەسەڵاتی وەرگرت، یەکسەر بەرەیەکی نیشتمانی پێکهێنا و حیزبەکانی هەمو کۆکردەوە.

کۆمەڵێک گۆڕانی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە سوریا ڕویدا و گوشاری سیاسی زۆریش لەسەر کورد کەم بوبوەوە. هەرچەندە چارەی مەسەلەی جنسیە و پشتێنی عەرەبی (الحزام العربی) نەکرد، بەڵام نەیهێشت زیادیش بکات. کوردەکانی سوریا جۆرێک لە ئازادییان وەرگرت، زوربەی حیزبە کوردیەکان بە نیوە ئاشکرا کاریان دەکرد، بەڵام بە ڕەسمی ئازادی نەبو.

جگە لەوە، حافز ئەسەد، بیرێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی زۆری هەبو، گرنگی مەسەلەی کوردی لە ڕۆژهەلات دەزانی، بۆیە پشتیوانی هەم لە ئێمە دەکرد لە عێراق و هەم پشتیوانی لە کوردی تورکیا دەکرد. بە ڕاستی ئەو دو فەزڵەی هەیە لەسەر نەتەوەی کورد.

لەو هاوکاری ئەو کێشانەی پەیوەندیان بە ئێمەوە هەبو، زۆر مهرەبان و دۆست بو، یەکێتی لەسایەی ئەو لە سوریا دامەزرا و ئەگەر ئەو نەبوایە و شۆڤێنێتی عەرەب لە سوریا دەسەڵاتداربوایە، بە هیچ جۆرێک ڕێگەیان نەدەدا ڕێکخستنێک بە

ناوی کورد و کوردستانەوە دروست ببێت و کاربکات و چالاکی هەبێت. جگەلەوە لە سەرەتادا بەپێی باری ئابوری سوریا یارمەتیداین، ڕەنگە پارەی کەم دابینێ، بەڵام لە چاوخۆیدا یارمەتییەکی زۆربو. هەروەها چەکی زۆری داینێ، هەتا لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، چەکی بە فرۆکەی تایبەتی خۆیان لە ڕێگای ئێرانەوە بۆ ناردین بۆ تاران. بەڵام دکتۆر مستەفا چەمرانی وەزیری بەرگری جارانی ئێران، دەستی بەسەر چەکەکاندا گرت و خواردی و نەیداینێ.

من دەمەوێ بڵێم، حافیز ئەسەد دۆستی میللەتی کورد بو، لە بواری شەخسیدا، لەگەڵ مندا بوبوین بە دۆست و زۆر لوتف و مەحەبەتی هەبو. هەرجارێک دەچوم هەواڵی منداڵەکانیشی دەپرسی، دەیزانی قوباد و باڤێلم هەیە و هێرۆ لە کوێیە و چی دەکەن و چ پێویستیەکمان هەیە و دەیپرسی کە چ کارێک هەیە بەو بکرێ و بیکا.

*** بەم پەیوندییە و تێڕوانییەی تۆ دەربارەی سوریا، چ کاریگەریەکی هەبوە لەسەر شۆڕشی کوردا تا ١٩٧٥؟**

- سوریا بە چەند قۆناغێکدا ڕۆشتوە، کاتێ کە بەعسیە عەفلەقیەکان لە حوکم بون، ئەوان دژی شۆڕش بون، لە حوزەیرانی ١٩٦٣ فەهد شاعریان بەهێزێکەوە نارد بۆ شەڕ لە دژی شۆڕشی کوردستانی عێراق. کە ئینقیلاب لەسەر میشێل عەفلەق کرا و چەپەکان هاتن، ئەوان وایان نیشاندا لایەنگری مافی کوردن، هەروەها فەزلێکی تری حافز ئەسەد ئەوەیە، لە یەکەم کۆنگرەی بەعس، دوای حەرەکەی تەسحیحی گیرا، تێیدا مافی کوردی کوردستانی عێراق سەلمێنرا و حوکمی زاتی بۆ کوردستانی عێراق قبوڵکرا.

پێش حافز ئەسەد، باسی مافی میللی کوردی عێراق دەکرا، دەیانگوت ئەوە جیاکردنەوە و دابەشکردنی عێراقە و دژمنایەتی نەتەوەی عەرەبە، بەڵام ئەو بۆچونە وەک باسمکرد لە یەکەم کۆنگرەی حیزبی بەعس گۆڕا.

دیارە هەندێک لە بەعسیە چەپەکانی عێراقیش کە لە سوریا بون، ڕۆڵیان هەبو لە ڕونکردنەوەی کێشەکاندا، گەلی کورد ڕاستیەکی مێژوییە و بارودۆخی عێراق وەکو سوریا نیە.

## پەراوێزەکان:

١- تالیب شەبیب، لە ١٩٦٣/٢/٨ بو بە وەزیری دەرەوەی عێراق، ئەوکاتە گەنجترین وەزیری دەرەوەی جیهان بو، تەمەنی تەنها ٢٧ ساڵ بو، ئەو تا ١٩٦٣/١١/١٧ لە پۆستەکەی مایەوە.

٢- جەلال بەگ، سەفیری عێراق بو لە ئەفغانستان.

٣- گفتوگۆی هەیکەل لەگەڵ بارزانی لە ٦ ئەیلولی ١٩٧٥، ئەنجامدراوە، لەژێر ناوی (مقابلة مع صقر عجوز من کردستان).

هەروەها هێنری کیسنجەر لە بیرەوەریەکانی خۆیدا دەڵێت: (داخوازییەکانی بارزانی ئەوەندە قورس بون بە ئێمە جێبەجێ نەدەکرا، داوای چەند سەد ملیۆنێك دۆلاری دەکرد، کۆنگرێس ئامادە نەبو بماندات، داوای هێزی دەکرد ئێمە ئامادەنەبوین بینێرین) (هنری کسنجەر، سنوات التجدید .ل. ٥٢٤-٥٢٥).

٤- (لە ١٩٧٥/٣/٨ باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران، ریچارد هێلمز، لە پەیامێکدا بۆ وەزارەتی دەرەوە دەنوسێ: (سەر لە ئێوارەی ئیمڕۆ لەگەڵ شا دیدارم کرد و ئەویش باسی وتووێژەکانی بۆ کردم کە لەگەڵ سەدام حسێن لە جەزائیر کردبووی، هەروەها وتی: پێش سەفەرەکەم پەیامێکم لە ژەنراڵ بارزانیەوە پێگەیشتوە، وتبووی ئیتر ممکین نیە کوردەکان بتوانن لەم بارودۆخەدا لەگەڵ هێزەکانی عێراق شەر بکەن و ئەگەر شتێك نەکرێت، خەڵکی کورد کۆمەڵ کوژ دەکرێت).(مێژووی پەیوەندیەکانی کورد و ئەمریکا — ئامادەکردنی وریا رەحمانی، چاپی یەکەم -٢٠١٢ ل.١٨٧).

٥- ئەم کۆبونەوانە لە نێوان نوێنەرانی کورد و رژێمی ئێراندا، لە ناوەڕاستی تشرینی یەکەمی ١٩٧٩ دەستیپێکرد و رادیۆی تاران لە ٢٩ هەمان مانگدا، ڕاگرتنی شەری لە کوردستان ڕاگەیاند.

# پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراق

*** ئامادەکارییەکانی بۆ ڕزگارکردنی عێراق، چۆن و لە کوێوە دەستی پێکرد؟**

- لە نیسانی ۲۰۰۲ مەسعود بارزانی و من بانگهێشت کراین بۆ ئەمەریکا، لەوێ چاومان بە وەفدێکی ئەمریکی گەورە کەوت، نوێنەری هەمو دەزگاکانی تێیدابو، لەوانە نوێنەرانی کۆشکی سپی، پەنتاگۆن، وەزارەتی دەرەوە و CIA. لە کۆبونەوەکاندا ئاگادارمان کردنەوە، ئێمە ئامادەین هاوکاریتان بکەین، بەو مەرجەی عێراقێکی دیموکراتی فیدراڵ دابمەزرێت، ئێمە باسی فیدراڵیمان بۆ کردن و ئەوان مەسەلەکەیان قبوڵکرد.

هەر دوای ئەو سەردانە، لە ئابی هەمان ساڵدا، لەگەڵ وەفدێکی عێراقیش چوین و لەوێ هەمان باسمان بۆ کردن، هێزی بەربەرەکانی عێراقی ئامادەی هاوکاریە و ئامادەیە، بەیەکەوە خەبات بکەین بۆ ڕوخاندنی ڕژێم و ئێمەش لەگەڵتاندا بەشداردەبین، لە ڕاپەراندنی گەلی عێراقدا.

لە پاشاندا گوتمان ڕزگار کردنی عێراق زۆر ئاسانە، چونکە سەدام بێهێزە و زو دەڕوخێ، بەڵام حکومڕانی لە دوای ڕوخاندی سەدام، زەحمەت و قورسە و تەنها بە ئەمەریکا ناکرێت، پێویستە هێزە عێراقیە ڕەسەنەکان هاوکاریتان بکەن، ئەو هێزانەی لەناو عێراقدان بونیان هەیە.

ڕوداوەکانی دواییش ڕاستی بۆچونەکانی ئێمەی دەرخست، بە تایبەتی دوای ڕوخاندنی سەدام و دامودەزگای بەعس، بەڕێوەبردنی عێراق تەنها بە ئەمەریکا ناکرێت.

*** چ مەسەلە و بابەتێک هۆکار و پاڵنەربو بۆ ئەمریکییەکان بۆئەوەی ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس بکەنە ئامانج، ڕۆڵی گەڕان بەدوای چەکی کیمیاویدا، چی بو؟**

- خۆی کاک سەلاحەدین، سەرۆک جۆرج بۆش بەرنامەی هەڵبژاردنی ئەوەبو کە پشتیوانی لە INCای بکات و پشتیوانی لەو قانونە بکات، کاتی خۆی کۆنگرێس

پشتگیری کردبو، بۆ هاوکاری هێزە بەرهەڵستکارەکانی عێراقی، بۆ ڕوخاندنی ڕژێم، هەروەها گلەیی لە دیموکراتەکان کردبو، ئەوان پشتگیری ئەو قانونە ناکەن.

مەسەلەی چەکی کیمیاوی و بایلۆجی و مەسەلەی شەڕ فرۆشتنی عێراق بە دراوسێکانی و بە گەلی خۆی، هەموی بۆ ئەوەبو ڕژێمی سەدام لە پێش چاوی گەلی ئەمەریکا وا لێبکات، شەڕ دژی ئەو ڕژێمە ڕەوایە و گەلی ئەمەریکا والێبکات، ئەو جەنگە قبوڵ بکات، بۆیە من پێموایە ئەوان هەدەفی سەرەکیان ڕوخاندنی ڕژێمی دیکتاتۆری بو.

*** واتا ڕوخاندنی بەعس لە ستراتیژی سەرۆکی ئەمریکادا هەبو، بەڵام مەسەلەی چەکی کیمیاوی تەنها بیانوبو؟**

– من ناڵێم گەڕان بەدوای چەکی کیمیاویدا تەنها وەسیلە بوە، ئەو ناوەی لێنانێم، ئەوان پێیان وابو هەرکاتێک کە سەدام نەما، ئەوا چەکی کیمیاویش نامێنێ. کە سەدام نەما، چەکی بایۆلۆجی نامێنێت، سەدام نەما ئەوا یارمەتی عێراق بۆ گروپی تێرۆرستی جیهانی نامێنێت. واتا پێیان وابو، سەدام سەرچاوەی کۆمەڵێک مەترسیە بۆ خەڵکی عێراق و دراوسێکانی و ویلایەتە یەکگرتوەکان و هەمو جیهان، بۆیە بە نەمانی ئەو ڕژێمە، مانای نەمانی ئەو مەترسیانەشە.

*** ڕۆڵی یەکێتی چی بو لەم جەنگەی هاوپەیمانانددا دژ بە ڕژێمی سەدام؟**

– یەکێتی چەند ڕۆڵێکی بینی، لەوانە:

یەکەم: یەکێتی پێش دەستپێکردنی جەنگ، هاوکاری تەواوی لەگەڵ ئەمەریکادا هەبو. یەکێتی پەیوەندیکرد بە ئەفسەرە ئازادەکانی ناو عێراقەوە و هانیدان بۆ هاوکاری لەگەڵ ئەمەریکا و بۆ کۆکردنەوەی دەنگوباس و زانیاری ورد و زۆر بە نرخ و بە بایەخ، لەسەر عێراق و لەسەر سوپای عێراق و بارودۆخی عێراق.

دوەم: ئێمە هاوکاری ئەمەریکامان کرد، بۆ هێنانی چەندین وەفدی ئەوان بۆ کوردستانی عێراق و لای یەکێتیەوە میوانداری کران. لێرەوە پەیوەندیان لەگەڵ ئەفسەرانی ناو سوپای عێراقی کرد و دەنگوباسیان کۆکردەوە و ئەوان زۆر سوپاس و یارمەتی و هاوکاری ئێمەیان کرد.

لە پاشاندا، بەیەکەوە هاوکاریمان کرد لە دژی گروپی ئەنسار ئیسلام. ئەوان

زۆر ڕازی بون لە هەمو چالاکیە هاوبەشەکان و لە پاشاندا، هاوکاریمانکردن بۆ زگارکردنی کەرکوک و موسل وخانەقین و شوێنەکانی تر و ئێمەش زۆری ئەو شوێنانە خۆمان گرتمان، بەڵام دامانە دەست ئەوان بۆئەوەی ئیدارەی بکەن و بەڕێوەی بەرن.

واتا دەتوانم بڵێم و خۆشیان دەڵێن، لەناو موعارەزەی عێراقیدا، کورد هاریکاریی زۆر باشیان کردون و لەناو کوردیشدا، یەکێتی نیشتمانی دۆستی سەر ڕاستیان بون و ئەو هێزەبون کە هیچ دو دڵی نەبوە لە دژایەتی کردن، ڕژێمیش دوژمنی سەرسەختی بوە، کلکگرێدانی نەبوە لەگەڵ ڕژێم و بەسەر ڕاستی و بەهەمو جدیەوە دوژمنایەتی کردوە و بەو گیانەوە لەگەڵ ئەمەریکا هاوکاریکردوە بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی سەدام.

*** ئایا پێش دەستپێکردنی جەنگی دژ بە بەغدا، هیچ ڕێکەوتنێک لە نێوان ئەمەریکا و یەکێتی و پارتیدا هەبوە، دەربارەی چارەنوسی کورد لە عێراقی تازەدا؟**

- بەڵێ ڕێکەوتنامە هەبوە، هەم لە کۆبوونەوەکەی نیسانی ٢٠٠٢ دا و هەم لە کۆبونەوەکانی لەندەن و سەلاحەدیندا. ئەمەریکا هەمو بریارەکانی کۆنگرەی لەندەن و سەلاحەدینی قبوڵکرد، بە ڕەسمی و ئاشکرا چارەی مەسەلەی کوردی تێیدایە بە شێوەی فیدراڵ، ئەوانە لە کۆبوونەوەی دو قۆڵی و سێ قۆلیشماندا بەڵێنیاندا کە پشتیوانی لە خەباتی ئێمە دەکەن، بۆ عێراقێکی دیموکرات و فیدراڵ.

*** ئایا مام جەلال چاوەڕێی ئەکرد, ڕژێمی سەدام وا بەخێرایی و بە ئاسانی بروخێت؟**

- بەڵێ، کاتێ کە رامسفیلد پرسیاری لە من کرد، ئایا ماوەی ڕوخاندنی سەدام چەندە، پێم گوت: "لە نێوان دو تا سێ هەفتەیە"، برادەر هەبو ماوەی کەمتری ئەدایە، بەڵام من گوتم: "لە نێوان دو تا سێ هەفتە سەدام دەڕوخێ و بەرگری پێناکرێت" و هۆکەشم ئەوەبو، دەمزانی لەشکری عێراق ورەی نەماوە و ژمارەیەکی زۆری هەڵهاتوە، ئەگەر شەڕیش بکات بەشێکی زۆری دەچێتەوە ماڵی خۆی و هەڵدێت.

ئەوەبو هەر کە شەڕەکە دەستپێکرد، لە سەدا حەفتای هێزی چەکداریی هەمە جۆرەی عێراقی، شوێنەکانی خۆیان بەجێهێشت و چونەوە ماڵی خۆیان.

*** ئایا هاوپەیمانەکان پرۆژەیەکیان هەبو بۆ دوای ڕوخاندنی ڕژێمی عێراق؟ ئەگەر نەیان بو بۆ نەیان بو؟**

- وەڵا نازانم بۆ نەیان بو؟ ئەوە لە خۆیان بپرسە، بەڵام پێموابو نەیان بو.

*** بۆچی دوای ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس، لە ناوەراست و خواروی عێراقدا بەربەرەکانی دژی ئەمەریکا رۆژ بە رۆژ گەشە دەکا و لە زیادبوندایە؟**

- من لەگەڵ ئەو بۆچونە نیم ، بوترێت بەربەرەکانی گەشە دەکا و لە زیادبوندایە، من پێموایە ئەو بەربەرەکانیە چەند سەرچاوەیەکی هەیە، یەکێکیان ئەنسار ئیسلامە، دوەمیان جەماعەتی قاعیدەن، سێهەمینیان وەهابییە موتەتەریفەکانن، چوارەمینیان پاشماوەکانی سەدامن. ئەوانە زوربەیان یەکدەگرن و هاوکاری یەکتردەکەن، تۆ سەرنج بدە، لە یەک زاویە ، لە یەک سێ سوچ ئەو بەرگرییە دەکەن ، سێ سوچی سونی پێ دەڵێن، لە سامەڕاوە درێژدەبێتەوە بۆ بەلەدی ڕۆژئاوای بەغدا و لەوێ دەچێتەوە بۆ فەلوجە و ڕومادی، لە جێگەکانی تر ئەو شەڕ و بەرگرییە نیە.

ئەو کارانەی ئەوانیش دەیکەن، لە کاری تێرۆریستانە زیاتر هیچی تر نیە و هیچ پەیوەندیشی بە بەرگری گەلی عێراقەوەنیە، بەڵکو گریانە بە شوێن ڕژێمی سەدامدا و ئەو دەسەڵاتەی لە دەستیان چوە، رق و کینەشە بەرامبەر بە ئەمەریکا و هاوپەیمانەکان.

*** بۆچی کورد لە ٢٥ ئەندامی مەجلیسی حکوم، تەنها پێنج ئەندامی بەرکەوت؟ ئایا ئەوە کەمتر نیە لە ڕێژەی گەلی کورد لە عێراقدا؟**

- بەڵێ وایە، ئێمەش لەسەر ئەوە ئیعترازمان گرتوە. مەسعود بارزانی و من نامەمان نوسی بۆ برێمەر کە دەبوایە ئێمەی کورد شەش نوێنەرمان هەبێت، بەڵام بۆ زانیاریت کورد وەکو (کورد) پێنج نوێنەری نیە لە مەجلیسی حوکمدا، بەڵکو شەش نوێنەرە، واتا ئەگەر سەیری ئەندامان بکرێت کە سەر بە چ نەتەوەیەکن، ئەوا سەرۆکی حیزبی ئیسلامی عێراقیش کوردە (د.موحسین عەبدولحەمید)، بەڵام ئێمە پێنج کوردمان بۆ دانرابو لە کۆی ٢٥ نوێنەر.

*** بۆچی تۆ و مەسعود بارزانی بەشداریتانکرد لە مەجلیسی حوکمدا و نوێنەرتان دەستنیشان نەکرد؟**

– لەسەر داوای ئەمەریکییەکان بو، ئەوان گوتیان بۆئەوەی گرنگی بە مەجلیسی حوکم بدرێت و هەیبەت و رێزی هەبێت، باش دەبێت کە ئێمە بەشداری بکەین.

*** بۆچی یەکێتی و پارتی هەریەکە بە دو وەزارەت رازی بون و داوای زیاترتان نەکرد؟**

– پێنج وەزارەتیان دابو بە ئێمە، پێنج وەزارەتەکە بەم شێوەیە دابەشکرابو، دوی بۆ پارتی دوی بۆ یەکێتی و یەکێکی تریشی بدرێت بە یەکێکی تر. ئێمە هەردوکمان رامان وابو، کورسییەک بدەین بە حیزبی ئیسلامی، بۆئەوەی تەعادلێک دروست بکەین لەناو مەجلیسدا لە نێوان شیعە و سونەدا.

*** بۆچی لەو وەزارەتانەی کە بەر کورد کەوتوە، پارتی وەزارەتە گرنگەکانی بەرکەوت، بە تایبەتی وەزارەتی دەرەوە؟**

– وەڵا من ئەو شتانەم پێ گرنگ نیە، من پێموایە ئەو دو وەزارەتەی یەکێتیش زۆر گرنگن، پارتی پێی خۆشبو وەزارەتی دەرەوەی بدەینێ و ئێمە لاریمان نەبو. بەلای منەوە زۆر گرنگ بو کە پۆستی وەزارەتی دەرەوە بۆ کورد بێت، پۆست وەرگرتنیش بۆ هەمیشە نیە.

*** مەسەلەی پێکەوە ژیانی دوارۆژی کورد و عەرەب لە عێراقێکی ئازاددا چۆن ئەبینی؟**

– ئەگەر هەردولا پێکبێین لەسەر ئەوەی بە ئارەزو و لەسەر بناغەی مافی چارەی خۆنوسین بگەینە سیغەی فیدراڵێکی باش، ئەوا پێموایە پێکەوە دەژین، ئەگینا پێموایە ئەگەر وانەبێت ژیانیان پێکەوە زۆر زەحمەتە.

*** چۆن لە مەسەلەی فیدراڵ تێگەیشتون؟ ئایا مەبەستان لە فیدراڵە لەسەر بناغەی جوگرافیە؟**

– من واتێگەیشتوم، فیدراڵ مانای ئەوەیە کوردستانی عێراق بە سنورە جوغرافییەکەی کە لە درێژایی چیای حەمرینەوە درێژ دەبێتەوە تا دیجلە، لەوێوە دەڕوات هەتا کۆتایی دیجلە، ئەو ناوچەیە کوردستانە بخرێتە ژێر دەسەڵاتی حکومەتێکی کوردستانی، لەلایەن خەڵکی کوردستانەوە هەڵبژێرراوبێت و هەمو کارەکانی ناوخۆی بە دەست بێت، تەنها کاروباری سەرۆکایەتی و سوپا و پەیوەندی

دەرەوە و دارایی گشتی بدرێ بە مەرکەز، ئەوەی تر هەموی لە دەسەڵاتی ئەو حکومەتە فیدراڵەدا بێت، من وا لە مەسەلەکە گەیشتوم.

*** کورد لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی داهاتوی عێراقدا چ ڕۆڵێک دەبینێ؟**

- کورد چەند ڕۆڵێک دەبێت لەوانە:

یەکەم: نوێنەرانی خۆی لەو شوێنانە هەڵدەبژێرێت کە لێیەتی.

دوەم: لەو شوێنانەی کە کوردی زۆری لێنیە، لەو شوێنانە ڕۆلی ئەوە دەبێت، لایەک سەربخات بەسەر لایەکی تردا. بۆ نمونە، لە زۆر شوێنی خواروی بەغدا، ژمارەی کورد زۆرە، بۆیە ڕۆڵیان هەیە لە تەرازووی هێزەکاندا.

سێیەم: لە پەرلەماندا ڕۆڵیان دەبێت، لەوەی لەگەڵ کێ ڕێککەون و کێ سەرخەن و دەنگ بە کێ بدەن، یان نەدەن.

*** مەسەلەی کەرکوک و ئاسۆی چارەسەرکردنی لە عێراقی داهاتودا چۆن دەبینی؟**

- من پێموایە کەرکوک شارێکی کوردستانیە و بەبێ کەرکوک فیدراڵی کوردستان زۆر ناتەواوە، بەڵام من لەو بۆچونەنیم، کەرکوک شارێکی تەنها کوردیە، واتا من پێموایە دو، سێ دروشمی شۆڤێنی هەیە یەکێکیان هی کوردە و دەڵێ کەرکوک شارێکی کوردانە، با لێی دەرچێ بێگانە. یەکێکیان هی تورکمانە، دەڵێ: کەرکوک شارێکی تورکمانیە، یەکێکیانیش دروشمێکی عەرەبیە. دەڵێت: کەرکوک شارێکی عەرەبیە.

کەرکوک شارێکی کوردستانیە، بەڵام شاری کورد و تورکمان و عەرەب و ئاشور و کلّدانە و کەوتۆتە کوردستانەوە، بە مێژو راستی کوردستانیەتی کەرکوک دەرکەوتوە. بۆ نمونە، سەیری ئەو کتێبەی ئەدمۆنس نوسیویەتی، خۆی ئەندامی لیژنەی (عصبة الامم) بوە، ئەوکاتە کەرکوکیان خستوەتە ناو سنوری کوردستانەوە.



لەگەڵ هێرۆخان،
هاوڕێ و هاوسەر



ئەحمەدی دادی لە نێوان مام جەلال و هێرۆخان، ناوزەنگ ١٩٨٢



لەگەڵ قوباد و بافل



سەیرانێکی خۆماڵی لە کۆماری چیک - ١٩٩٠/٥/١١



۱۹۹۱/۹/۲۹ کۆبەنەوەیەکی جەماوەری لە هەولێر



۱۹۹٤/٤/۲۳ - ئیتالیا، لەگەڵ نوێنەرانی پارتیزانانی دێرینی ئیتالیا



له کۆنگرەی سۆسیال دیموکراتی جیهانی
١٩٩٢/٩/١٢ بەرلین



له کۆنگرەی سۆسیالیستی جیهانی





۱۹۹۸/٦/۱۸، بەشێ لە سەرکردایەتی پێشوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان



بەشێکی زۆری پێشوی مەکتەبی سیاسی یەکێتی



٢٠٠٢/١/٢١ لەگەڵ کابینەی سێهەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان
بە سەرۆکایەتی د.بەرهەم ساڵح



لەگەڵ ئامادەکاری ئەم دیدارە

# مام جەلال و هەندێ پرسیاری گشتی

*** تۆ لەکەیەوە ناوت مام جەلالە و بۆچی؟**

– من هەر لە منداڵیەوە ناوم مام جەلالە، پێش ئەوەی لەدایک ببم باوکم مامێکی هەبوە ناوی مام جەلال بوە و شێخ جەلالیان پێیگوتوە، ئەو مامەم زو بە گەنجێتی عەمری خوای کردوە، پێش ئەوەی من لەدایک ببم، باوکم ئەو مامەمی لە خەویا دیوە و سێوێکی داوەتێ، مەلای گوندەکەی خۆمان، منی لێ لەدایک بوم، خەونەکەی لێک داوەتەوە و گوتوێتی کوڕێکتان دەبێ، باوکم گوتویەتی، کە کوڕمان بو ناوی دەنێم (مام جەلال)، بەناوی مامە جەلالەوە. ئیتر دوای لەدایک بونم، بەناوی مامەکەمەوە ناونرام (مام جەلال).

هەر لە منداڵیەوە ناوم مام جەلالە، واتا وەکو یەکێک ناوی عەبدولکەریمە، من ناوم مام جەلالە. ئەو ناوە هیچ پەیوەندی بە سیاسەت و نیشتمان پەروەریەوەنیە، لە منداڵیەوە باوکیشم پێی وتوم (مام جەلال).

*** ئەگەر بتەوێت سەدام حسێن بە چەند دێڕێک باس بکەیت، چی دەنوسیت؟**

– ئاسان نیە، سەدام بە چەند دێڕێک باس بکەیت. سەدام حسێن، ئەگەر بتەوێت باسی بکەین ئەبێ کتێبێکی لەسەر بنوسیت. سەدام حسێن، کابرایەکە منداڵییەکەی قۆناغێکە، ژیانی حزبییەکەی جۆرێکی ترە و پێش هاتنە سەر حوکم شتێکە و دوای وەرگرتنی دەسەڵاتی سیاسی شتێکی ترە. سەدام حسێن، لە کۆتاییدا وەکو جەلادێکی دیکتاتۆری بێ وێنە هاتەکایەوە، باکی هیچی نەبو، نە باکی گەل، نە باکی سەروەتی وڵات و نە باکی سەریەخۆیی هەبو، تەنها و تەنها باکی مانەوەی خۆی هەبو. مەبەستی ئەوەبوە خۆی لەسەر حوکم بمێنێتەوە و کابرایەکی مرۆڤ کوژی بێ وێنەیە لە مێژودا کە لاری نەبوە سەدان هەزار کەس زیندە بە چاڵ بکات. من پێموایە هیتلەریش شتی واینەکردووە لەگەڵ گەلی خۆی، وەک ئەوەی سەدام کردویەتی بە گەلی عێراق.

**※ ئەگەر تۆ سیاسەتت نەکردایە چ پیشەیەکت هەڵدەبژارد، یاخود لە چ بوارێکدا کارت دەکرد؟**

– پێمخۆش بو ببومایە بە مامۆستای زانکۆ، من خەوم بەوەوە دەدی دکتۆرا وەربگرم و ببم بە مامۆستای زانکۆ.

**※ لە سەرەتای ژیانی سیاسیتدا تۆ کابرایەکی چەپ بویت، بۆ نەبویت بە ئەندامی حیزبی شیوعی؟**

– من یەکەم کارم کە لە سیاسەتدا دەستم پێکرد، کارکردن بو لە شانەیەکی لایەنگیرانی حیزبی شیوعیدا، فاتح رەسوڵ مامۆستامان بو، بەڵام ئەو منی لە حیزبی شیوعی دورخستەوە، بەوەی کە دەیگوت کورد نەتەوەنیە و هەروەها کورد مافی چارەنوسی نیە، منیش پێموابو، کورد هەم نەتەوەیە و هەم مافی چارەنوسی هەیە.

**※ تۆ لە کاتی خوێدا و تا روخاندنی سۆڤیەت، سەردانی زۆر لە وڵاتانی سۆسیالیستت کردوە و ئەو واقعەی ئەو وڵاتانەت بینیوە، ئایا بارودۆخی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی ئەوکاتەی ئەو وڵاتانە هیچ کاریگەریەکی لەسەر تۆ بەجێ نەهێشت؟**

– بێگومان، هەر لەبەرئەوەش بو، من لایەنگری خەتی چینی بوم، نەک خەتی سۆڤێتی. لە سەرەتای پەیدابونی ناکۆکی نێوان سۆڤیەت و چین، من خەتی چینیم پێ باش بو، نەک خەتی سۆڤیەت. ئەوەی زۆر سەرنجی منی راکێشابو ئەو فەسادەبو کە لە روسیا بینیم و منی توشی شۆککرد، چونکە من ئەو وڵاتەم بە بەهەشتی سەر زەمین و بە وڵاتی مەلائیکە دەزانی، ئەو بارودۆخە زۆر کاریتێکردم.

**※ ئایا دڵداریت کردوە؟ نامەت بۆ کچ نوسیوە؟ چ چیرۆکێکی دڵداریت هەیە؟**

– وەڵا دڵداریشم کردووە و نامەشم بۆ کچ نوسیوە و هەمو ئەو شتانەشم بۆ هێرۆ گێڕاوەتەوە. بۆ زانیاری خۆت، من لە ژیانمدا دو، سێ جار توشی دڵداری بوم، بەڵام لە هیچیاندا سەرکەوتنم بەدەست نەهێناوە. یەکێک لەوانە کچێک بو کە دڵداریشم لەگەڵ کردبو، نامەشم بۆ نوسیبو، بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت، حەزی لە کورێکی تر کردوە و ئەو کورەش هات بۆلام پێیگوتم: "هاتویت یەکێکت خۆش دەوێت کە من خۆشم ویستوە و پەیوەندیمان هەبوە، تۆ هاتوی لێمی

داگیربکەیت"، بەڕاستی ئەو قسەیە زۆر تەئسیری لێکردم، بۆیە گوتم: "مادام ئێوە پەیوەندیتان هەبوە و واتێدەگەیت کە من داگیرمکردوە، ئەوا من وازم لێهێنا و کشامەوە لەو مەسەلەیە".

سەلاحەدین، دڵداریی زەمانی ئێمە وەکو دڵداری ئێستا نەبو، دڵداری زەمانی ئێمە سیفەتێکی رۆحانی پاکی هەبو، نابێ لە تەوقە زیاتر لەگەڵ دڵدارەکەت بکەیت. من لەگەڵ کچێکی تر لە زانکۆ ناسیاویم پەیداکردبو، یەکترمان خۆش دەویست و دەشمویست بیهێنم، بەڵام ئەو زۆر لەژێر کاریگەری باوکیدا بو. ئەو پێیوابو باوکی چی بڵێت دەبێت وابکات، جارێکیان هەتا من چومە سەفەرێک و هاتمەوە، باوکی بەشویدابو. تەنها ئەو دوجارە دڵداریم بەراستی کردوە، ئەگینا کچی تر هەبوە، من خۆشم ویستوە و ئەو نەیویستوە، یاخود ئەو منی خۆشویستوە من ئەوم خۆشنەویستوە، یاخود تەجاوبم نەبوە لەگەڵی.

*** کەی و چۆن هێرۆخانت ناسی کەی مارەتکرد؟**

- هەمزە عەبدوڵڵا لە زیندان بەربوبو، من چو بوم بۆ زیارەتی، ئەوکاتە هێرۆ بچکۆلە بو، لە ماڵی هەمزە عەبدوڵڵا بو، ئەوە یەکەمجاربو، هێرۆم بینی، بەڵام منداڵێکی بچکۆلە بو دوای ئەوە ساڵێکیان من لە کەرکوک بوم، ئەوان ماڵیان لە کەرکوک بو، هەر دیسان دەمبینی. دوایی کە هاتنە بەغدا دیسان هەر دەهات، دەمبینی، بەڵام وەکو کچی مامۆستا ئیبراهیم لای هەمومان رێزێکی تایبەتی هەبو.

کە گەیشتمە بیرکردنەوە لە ژنهێنان، هەزار رەحمەتی لێبێت حیلمی عەلی شەریف هات جیای کردمەوە، وتی: "مام جلال من ئەمەوێت قسەیەکت لەگەڵ بکەم، وتی بۆچی تۆ هێرۆ ناهێنیت؟" وای باس کرد کە ئێمە وەک خێزانێک واین و پێکەوەین و کاری سیاسیش پێکەوە دەکەین، هەروەها مامۆستا ئیبراهیم تەمەنی بەرەو گەورەیی دەڕوات و پێویستە هەمومان چاودێری مناڵەکانی بکەین و چاومان لێیانبێت.

لە ڕاستیدا من بۆچونەکانیم بەدڵ بو، هەروەها ڕەوشت و عەقڵ و زیرەکی هێرۆشم زۆر بەدڵ بو، لەبەرئەوە لە دانیشتنێکدا بە ئامادەبونی ئەحمەدی دزەیی و عومەر دەبابە و حیلمی شەریف بڕیارمدا، من هەوڵ بدەم هێرۆ بهێنم، ئەوانیش گوتیان: "جا ئەوەی پێی ناوێت، ئێمە سبەینێ دەچین داخوازی دەکەین". ئەوەبو ئەو برادەرانە بۆ رۆژی داهاتو چون و داخوازیان کردو و مامۆستا ئیبراهیم پێی خۆشبو، وا بزانم سەرەتای نیسانی ١٩٦٧ بو.

*** هێرۆخان جگە لە خێزانت، چیترە بۆ تۆ؟**

– هێرۆخان جگە لە خێزانم، چەند شتێکی تریشە:

یەکەم: وەک دکتۆرە بۆ من، بەڕاستی زۆر ئاگای لە سیحەتمە و وەکو دکتۆرەیەک لەگەڵمایە.

دوهەم: وەکو ڕاوێژکاریشە، لە زۆر شتدا راوبۆچون، ئاڵوگۆڕ دەکەین و پرسی پێدەکەم.

سێهەم: مشورخۆرمە، ئەو مشوری زۆر شتی ڕۆژانەی ژیانم بۆدەخوات.

چوارهەم: هاوڕێمە و بەڕاستی هەڤاڵە، هێرۆ خۆی شەخسیەتی خۆی هەیە و لە شەخسیەتی مندا نەتواوەتەوە، هەربۆیە ناوەکەشمی هەڵنەگرتوە، ناوی (هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد)ە نەک (هێرۆ تاڵەبانی) هەروەها گەلێکجار جیاوازیشمان دەبێت لەسەر سیاسەت و ئەو ڕێگایەک دەگرێ و من ڕێگایەکی تر.

*** ئایا پەیوەندی تۆ و مامۆستا ئیبراهیم وەکو دو سیاسەتمەدار، یان وەکو دو هاوڕێ، یان وەکو خەزور و زاوا بوە؟**

– ناوەڵا، ئەوەی کە نەبوبێ وەکو زاوا و خەزور بوە، بێگومان مامۆستا ئیبراهیم لە جیلی ئێمە نەبوە، من لە دورەوە یەکێک بوم لە معجبەکانی مامۆستا ئیبراهیم، بەهۆی گۆڤاری گەلاوێژ و نوسینەکانی لەناو گەلاوێژدا، من یەکێک بوم لە وانەی کە زۆر پێی موعجیب بوم. هەروەها کاتی گەنجی لە کۆیە، ئەو کەسانەی کە ئێمە ئیشمان لەگەڵ دەکردن، یان لێیانەوە شت فێردەبوین، وەک سەمەد مەنجەڵ، عومەر دەبابە و عەلی عەبدوڵڵا، ئەوانە زۆر مەتحی مامۆستا ئیبراهیمیان دەکرد. هەروەها مامۆستا لە زیندانیشدا خۆڕاگر و وەک پارێزەرێکیش لە دادگادا، قسەی نەستەق و نیشتمانپەروەرانەی زۆر دەکرد و بە هەڵوێست بو. من سەردەمێک ئاواتم ئەوە بو کە بیناسم، ئەوبو یەکەمجار لە کۆنگرەی دوی پارتی کە لە ماڵی عەلی حەمدی گیرا، لەوێ ناسیم.

*** ئەگەر گیروگرفتێکی شەخسیت هەبێ بۆ کێی باسدەکەیت؟ ئایا هاوڕێی وات هەیە شتی زۆر تایبەتی خۆتی بۆ باسبکەیت؟**

– بەڵێ هاوڕێی وام هەیە، من ئەگەر گیروگرفتم هەبێ ئەوەڵجار لەگەڵ هێرۆ باسی دەکەم، ئەگەر گیروگرفتی سیاسیم هەبێ، لەگەڵ نەوشیروان مستەفا باسی دەکەم. ئەگەر لێمەوە نزیک بێت، یەکێکە لەو کەسانەی کە دڵی خۆمی بۆ

دەکەمەوە، باوەڕم بە عەقڵ و هەڵوێستەکانی هەیە، ئەوە ئەو دو کەسانەن کە دڵی خۆمیان بۆ دەکەمەوە. برادەری تریشم هەیە، هەر کەسە لە مەجالی خۆیدا، دڵی خۆمی بۆ دەکەمەوە.[1]

*** وەک خێزان لەسەر تەریقەی نەقشەبەندین، یان قادری؟**

– ئێمەی تاڵەبانی قادرین، قادری تەکیەی هەیە، هەر تەریقەیەک کە تەکێ هەبو یەعنی قادری. هەرچی خانەقای هەبو، واتا نەقشی. ئێمە وەکو تەریقە، باوکم شێخی تەریقەی قادری بوە لە کۆیە.

*** لە گەنجێتیدا کاریگەری کێت لەسەربوە و بە کێ زۆر سەرسام بویت؟**

– مەبەستت خەڵکی کورد یان لە عەرەب یان جیهانی؟

*** بە گشتی!**

– من لە سەرەتای ژیانمدا، ئەگەر لە کۆیەوە دەست پێبکەم زۆر بە عومەر دەبابە موعجیب بوم، هەروەها بە یەکێک لە مامۆستاکانم، ناوی حەمەدئەمین معروف بو، هەروەها بە مامۆستایان موختار سەعید و مەجید نورەدین.

لەسەر ئاستی کوردستان، ئەوکاتە معجب بوم بە قازی محەمەد و مەلا مستەفا، وەک دو شەخسییەتی خۆشەویست و گەورەی کورد. لە ئاستی عێراقدا زۆر معجب بوم بە جەواهیری و عەزیز شەریف و کامیل چادرچی، بە هەندێکیان معجب بوم بێ ئەوەی بیانناسم.

لەناو بزوتنەوەی کۆمۆنیستی جیهانیدا، موعجیب بوم بە ستالین و ماوتسی تۆنگ و هۆشی مینە و دیمیترۆف.

*** کەی بەشیر مشیرت ناسیوە و یادگارت لەگەڵیدا هەیە؟ ئایا بەناوی ئەوەوە هیچ وتارێکت بڵاوکردۆتەوە؟ سەردانی دوکانەکەیت کردوە؟**

– بەڵێ، بێگومان! کە من چومە بەغدا بەشیر موشیرم وەک پیاوێکی سادە و کورد پەروەر ناسی کە لە دوکانەکەی لە حەیدەرخانە زۆر دادەنیشتین و بوبوین بە ناسیاو، زۆر باوەڕی بە سێ کەسمان هەبو: بە جەمال نەبەز و شەمسەدین موفتی و من. ئەم سێ کەسە جێی باوەڕی بوین، هەتا کە دەرۆشت دەغیلەکەشی تەسلیم دەکردین، بێگومان ئێمەش کە لەوێ دادەنیشتین، دیارە مەدحیشمان

دەکرد و من وتارم بۆ دەنوسی.

لە بیرمە، جارێکیان مامۆستا بەشیر وتارێکی لەسەر توتن نوسیبو، وەک وەڵامێک بۆ نوسینێکی ئەحمەد رەفیق، شارەزایەکی توتن بو، بەڵام نوسینەکە زۆر حەلەق و مەلەق بو، حیلمی عەلی شەریف لە رۆژنامەی خەباتدا بۆی بڵاونەکردبۆوە، بۆ رۆژی دوەم رۆژنامەی خەباتی ناردەوە بۆ چاپخانە و گوتی: "ئەم ئەحمەد ئیبراهیمە نایەوێت پیاوێک لە کوردا پەیدا بێت، دکتۆر عیزەدین چوبو مشاغەبەی کردبو کە ئەوان بە ئەنقەست وتارەکەت بۆ بڵاوناکەنەوە"!

من چومە لای و دڵنیام کرد، کە وتارەکەی نەگەیشتۆتە رۆژنامەکە، ئەگینا وتاری تۆ چۆن بڵاوناکرێتەوە، سبەینێ سەیری خەبات بکە، بزانە وتارەکەتی تێدایە یان تێدانیە!! کاک عیزەدین هاتوە ئەو قسانەی کردوە! ئەویش گوتی، نێ ئەو پێی گوتم: "منیش وتم مامۆستا باوەڕ بەو مەکە، ئەو شیوعیە و دژی ئێمەیە".

منیش وتارێکم بە ناوی بەشیر موشیرەوە لەسەر توتن نوسی، ئەگەر وتارێکت لەسەر توتن لە خەباتدا بەرچاوکەوت، ئەوە من نوسیومە!

هەروەها جارێکی تر، وتارێکم بە عەرەبی بەناوی بەشیر موشیرەوە نوسی، دەربارەی هەندێ رونکردنەوەی وەزیری دەرەوەی ئێران، تێدا نوسرابو، ئەسلی کورد فارسە، منیش نوسیبوم: دراساتی فیلولوجی و لێکۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆجی رونیکردۆتەوە ئەسلی فارس کوردە، بۆیە هەقە فارسەکان قسە نەکەن.

وتارەکەی مامۆستا بەشیر کە من بۆم نوسیبو، دەنگیدایەوە. بۆ رۆژی دوایی، حاجی مەلا سەعید دەچێتە دوکانەکەی و دەڵێ "مامۆستا وتارەکەتم خوێندەوە و وتارێکی زۆر جوان بو"، مامۆستاش ئەڵێ: "من هەر شتی جوان دەنوسم"، مەلا سەعید دەڵێ: "بەڵام دو وشەی تێدابو، من تێینەگەیشتم"، مامۆستا دەڵێ: "مەلا ئەوە حکومەت تێی دەگات"! مەلا سەعیدیش دەڵێ: "ئاخر مامۆستا من لە رۆژنامە کاردەکەم و قوتابی کولیەم، نابێ یەکێکی وەک من تێیبگات"؟ ئیتر مامۆستا بەشیر تورە دەبێت و ئەڵێ: "ئەمین جەڵەبی نانوسم تا ئەتۆ تێبگەیت، ئەمین بۆ حکومەت دەنوسم"!

جارێکیان دکتۆر عیزەدین، چوبو بۆلای بەشیر موشیر و گوتبوی: "کە عەبدولکەریم قاسم لە ئیبراهیم ئەحمەدی پرسیوە، ئایە عەونی یوسف بکەمە وەزیر یا بەشیر موشیر"؟ ئیبراهیم ئەحمەدیش گوتویەتی وەڵا عەونی یوسف بە توانا ترە! ئیتر مامۆستا بەشیر دیسانەوە لەسەرئەوە تورەبو، رۆژنامەی خەباتی

ناردەوە بۆ چاپخانە و وتی من رۆژنامەی وا نا فرۆشم! منیش چومەلای تورە بوبو ئەیوت کە "ئەو ئەحمەد ئیبراهیمە نایەوێ کورد پیاوی لێهاتوی هەبێ و دەیەوێت هەر خۆی ناوی دەربچێت".

منیش گوتم: "مامۆستا ئەوە قسەی ئەونیە، ئەوە عزەدینی مەلا مستەفا دروستی کردوە، ئەوانە مەبەستم شیوعیەکان بو، چونکە عیزەدین شیوعی بو، تۆیان خۆش ناوێت، ئەگەر راست دەکەن، با موکەرەم تاڵەبانی ئاموزای خۆم (ئەویش شیوعی بو) کە بەرێوەبەری گشتی توتنی عێراقە، ئەگەر تۆیان خۆش دەوێت با بە ئەندامی لیژنەی توتن داتبنێت"!.

کە چوینە لای موکەرەم، مامۆستا بەشیر قسەی بۆکرد، بەڵام کارەکە نەئەکرا و موکەرەم نەیتوانی بۆیبکات، ئیتر مامۆستا بەشیریش بروایکرد کە شیوعیەکان کارەکەی بۆناکەن، هەر بۆ سبەینێ رۆژنامەی (ئازادی) ناردەوە. من بیرەوەری زۆرم لەگەڵدا هەیە..[٢]

*** تۆ زۆر سەسام بویت بە شیعری جەواهیری، کەی ئەوت ناسی و پەیوەندیت لە گەڵیا چۆن بو؟**

- من گەنج بوم و هێشتا باش عەرەبیم نەئەزانی، قەسیدەیەکی جەواهیری کە بۆ جەعفەری برای نوسیبو، بڵاوبۆوە و باسی کوردی تێداکردبو، ئەو قەسیدەیە سەرنجی منی راکێشا، بۆئەوەی چۆن شاعیرێکی عەرەبی گەورە باسی کورد بکات!.

ساڵی ١٩٤٨، من لە ناوەندی کۆیە هەڵبژێردرام بە نوێنەر بۆ کۆنگرەی گشتی یەکێتی قوتابیانی عێراقی، هەر دوای کۆتایی کۆنگرەکە، کۆنگرەیەک لە ساحەی سیباع گیرا و ئەو کۆنگرەیەش بە (کۆنگرەی سباع) ناوی دەرکرد. لەو کۆبونەوەیەدا جەواهیری هات و ئەو قەسیدە بەناوبانگەکەی (یوم الشهید) ی خوێندەوە. دوای ئەوەی لێبۆوە، ئێمە چوین تەوقەمان لەگەڵ کرد و وێنەمان لەگەڵیا گرت.

من هەر لە دورەوە معجب بوم بە شیعرەکانی و دەمم خوێندەوە، تا چومە کولیەی حقوق، لەوێ برادەرێکم هەبو ناوی زێوەر خەتاب بو، ئەویش زۆر موعجب بو بە جەواهیری، ئەو گوتی: "بۆ نایەیت سەردانی جەواهیری بکەین"؟ ئەوکاتە جەواهیری رۆژنامەی دەردەکرد و لە بارەگای رۆژنامەکە لە حەیدەرخانە سەردانیمان

کرد و چوین بۆلای و خۆمان پێناساند، دو لاوی کوردین و هەردوکمان لە کولیەی حقوقین و موعجبین بە جەنابت، ئەویش پێی خۆشبو.

ئەو پەیوەندییە تا ١٩٥٨ بەو شێوەیە مایەوە، دوای شۆرشی تەمموز کە ئێمە لە بەغدا رۆژنامەی خەباتمان دەردەکرد، لە چاپخانەکەی ئەو چاپمان دەکرد، ئیتر دۆستایەتیمان لەوکاتەوە خەستتربو، بوین بە ناسیاوی زۆر نزیک. هەروەها پاشی ئەوە، من هەڵبژێردرام بە ئەندامی لیژنەی ئیداری نەقابەی رۆژنامەنوسانی عێراقی، ئەویش ئەوکاتە سەرۆکی نەقابە بو، ئەوانە هەموی هۆبون، پەیوەندی دۆستانەمان زیادبێت.

* سەعید قەزاز چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟

– سەعید قەزاز، کەڵە پیاوێکی کوردی کۆنەپەرستی خاوەن عەقیدەی خۆیی و خاوەن بیروباوەڕی کۆنەپەرستانەی خۆی بوە، بەڵام دلێر و جوامێر بوە و پیاوێکی خۆرسکی خۆپەروەردە، واتا خۆی خۆی پێگەیاندوە. ڕاستە تۆفیق قەزازی مامی لە هەمو ڕویەکەوە یارمەتیداوە، هەتا لە ژیانی و گوزەرانی شەخسی یارمەتیداوە، بەڵام خۆی لە بواری کاری سیاسی و کۆمەڵایەتیدا خۆی پەروەردە کردووە.

من پێم وایە، سەعید قەزاز نە جاسوس بوە، نە نۆکەری بێگانە، بەڵام باوەڕی بەوە هەبوە بێ ئینگلیز هیچ ناکرێت، وە کورد لە ناوچاوانی نوسراوە کە نابێتە دەوڵەت، لەبەرئەوە پێیوابو دەبێت کورد بخوێنێت و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لە رێگای خوێندنەوە بەدەست دێت.[٣]

* ئایا هیچ یادگاریەکت لەگەڵیدا هەیە؟

– لەبیرم دێت، ساڵێکیان ئێمە دورخرابوینەوە بۆ موسڵ، ئەوکاتەش سەعید قەزاز موتەسەریفی ئەوێ بو، ئێمە چوین بۆلای ئەو بۆ شکاتکردن، چونکە مافی خۆمانیان نەئەداینێ، وابزانم مافمان هەبو یەکی رۆژی دو پەنجاییمان بدەنێ. لە وەفدەکەماندا کە چوین، پیاوێکمان لەگەڵدا بو، ناوی قادری حاجی حسێنی نانەوابو. کە چوینە بەردەرگای موتەسەریف، کابرایەکی کوردی گێل لەبەردرگابو، وەستابو گوتی: "راوەستن راوەستن، جەنابی موتەسەریف سەفیری تورکی لایە"، یەکسەر قادری حاجی حسینیش پێی گوت: "برۆ پێی بڵێ سەفیری کوردستان هاتوە"! وەڵا ئەویش گێلۆکەبو، چوە ژورەوە گوتبوی: "قوربان گیان جەماعەتێک

هاتون، یەکێکیان دەڵێت من سەفیری کوردستانم"، سەعید قەزازیش پێدەکەنی و ئەڵێ باشە با ڕاوەستن.

کە سەفیری تورک ڕۆیشت، ئێمەیان کردەژورەوە و ئەویش بەخێرهاتنی کردین، گوتی: "کامەتان سەفیری کوردستانن"؟ قادر حسێن گوتی: "قوربان منم"! گوتی: "تۆ کێیت"؟ گوتی: "قوربان من قالە حاجی حسێنم! چۆن نام ناسیت"، ماڵەکەی خۆیانی لە سلێمانی بۆ هەڵدا کە لە کوێیە، ئینجا سەعید قەزاز گوتی: "ئا قالە! کاکەی کرێکاری پارتی" (ئەوکاتە، کاکەی فەلاحی شیوعی هەبو) چۆن ناتناسمەوە!

گوتی: کامتان عومەر دەبابەن؟ عومەر دەبابە لە پێشەوەبو گوتی منم، جا ئەو ئیشەکانی بۆ کردین، گوتی: "من دەزانم ئێوە دوای کلاوی بابردو کەوتون! کوردستان قەد نابێت بە دەوڵەت! ئەگەر ببوایە بە دەوڵەت، ئەوا من لە پێش ئێوەوە کوردایەتییەم دەکرد، بەڵام ئێوە ئەو ڕێگەیەتان گرتوە و چی لە دەستمبێت بۆتان دەکەم و هاوکاریتان دەکەم"، یەکسەر تەلەفونی کرد پارەکەیان بۆ سەرفکردین .

ئینجا گوتی، دەبا هەندێ قسە بکەین، روی کردە عومەر دەبابە و گوتی: "عومەر وا من ئەوەم بۆ کردن، ئەگەر ئێوە بێنە سەر حوکم چیم لێدەکەن"؟ عومەر دەبابە کەمێک وەستا! ئەویش گوتی: "عومەر راستیەکە بڵێ و مەترسە"! گوتی: "قوربان راستییەکە بڵێم، وەڵا دەتدەینە مەحکەمەی شەعب"، ئینجا دوای ئەوەی سەعید درا بە مەحکەمەی شەعب، بە عومەر دەبابەیان گوت، بێت شایەتیی بدات، وتی من شایەتی نادەم و ئەو کاتی خۆی پیاوەتی لەگەڵ ئێمە کردوە.

لەو کۆبونەوەیەدا، منیش لەسەرەوە دانیشتبوم و سمێڵێکی گەورەم دانابو، وتی ئەو سمێڵ ستالینییە کێیە؟ عومەر دەبابە گوتی: ئەوە جەلالی شێخ حوسامەدینە، ئەویش گوتی جەلال وەرە، بیریهاتەوە، کاتی خۆی کە موتەسەریف بو، هات بۆ کۆیە و من لە پۆلی چوار یان پێنجی سەرەتایی بوم و هاتە پۆلەکەمان، مامۆستاکەمان پرسیاری دەربارەی ئیسلاحاتی مەدحەت پاشا والی بەغدای لێکردم، منیش چاکم وەڵام دابۆوە، سەعید قەزازیش پرسیبوی، ئەو قوتابیە کێیە؟ پێیان گوتبو کە ناوی جەلال و کوری شێخ حوسامەدینی تاڵەبانیە، ئەویش تەعلیقێکی دابو، گوتبوی: "تاڵەبانی دو بەشن، یان زۆر زیرەکن وەکو ئەم کوڕە، یان زۆر کەرن" (ناوی کابرایەکی هێنابو).

ئینجا ئەو بیرەوەریەی لەبیرمابو، گوتی: "وەرە ئەو سمێڵە ستالینییەت لێی

تێکدەم"::! منیش گوتم: "ئەو سمێڵە هی ستالینی نیە، بەڵکو سمێڵی کوردییە و هی یەزیدییە"! گوتی: "رۆڵە دەبرۆ سمێڵی کوردی کەی وایە"؟

زۆر رێزی لە ئێمە گرت و قسەی خۆشی بۆ کردین و قسەکانی لە پیاوی حکومەت نەئەچو، بۆ نمونە گوتی: "کاتێ کە هەمزە عەبدوڵلا موختەفی بو، بە موختەفیەتی نامەی بۆ نوسیوم کە سالحی خالۆزای بە سەرۆکی کرێکاران بۆ تەعین بکەم، بەمەرجێ دەوام نەکات و معاشیش وەربگرێ، منیش لەبەر خاتری هەمزە تەعینم کرد".

*** ئاخرجار کەی گریاویت و بۆچی؟**

– ئاخرجار بۆ سەید محەمەد باقیر ئەلحەکیم گریاوم کە شەهیدکرا، پێم زیانێکی زۆر گەورە بو لە عێراق و لە کورد و لە هەمومان کەوت.

*** حەز لە شیعر دەکەیت، ئەگەر حەزی لێدەکەیت هی کام شاعیر؟**

– وەڵا زۆر حەز لە شیعر دەکەم، بەڵام زۆرتر حەز لە شیعری کلاسیکی دەکەم، شیعرەکانی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و فایەق بێکەس و پیرەمێردم زۆر پێ خۆشن.

لە شیعری نوێدا ڕەنگە هەر شیعری شێرکۆ بێکەسم پێ خۆشبێت، ئەگینا بە گشتی لایەنگیری شیعری کلاسیکیم. بێگومان لە عەرەبیدا شیعری جەواهیرم زۆر پێ خۆشە، لە دوای جواهیری، شیعری کازم سەماوی.

*** ئایە خۆت هیچکاتێک شیعرت نوسیوە؟**

– وەڵا جارێکیان هەوڵم داوە دو سێ بەیت بنوسم، ئیتر وازم لێهێنا، بۆم نەهات!

*** بەینت لەگەڵ مۆسیقا و گۆرانی چۆنە، حەز لە دەنگی کێ دەکەیت؟**

– لەگەڵ مۆسیقا و گۆرانیشدا من کۆنەویستم، لە کوردیدا حەزم لە دەنگی سێوە و مریەم خان و حەسەن زیرەک و عەلی ئەسغەری کوردستانی و تایەر تۆفیق و حەیرانەکان و چەند دەنگ خۆشێکی تریش.

لە هی عەرەبدا حەزم لە دەنگی ئوم کەلسوم و عەبدولوەهاب و فەیروز و سەباحە..

*** لە منداڵیدا قەد شەڕت کردوە و سەرت شکاوە؟**

- ئەرێ وەڵا شەڕم کردوە، جارێکیان شەڕە گەرەکمان دەکرد، بەردێکیان کێشا بە سەرماو سەرم شکا.

*** کام ڕەنگت پێ جوانە؟**

- سور.

*** کام وەرزت لا خۆشە؟**

- بەهار.

*** کەی ئاخرجار چوی بۆ سینەما یاخود شانۆ؟**

- ئەگەر باسی ئەوەت بۆ بکەم، ڕەنگە پێم بڵێیت کۆنەپەرستی!! من هیچ بەینم نەبوە لەگەڵ سینەما و لە هەمو تەمەنی خۆمدا پێنج، شەش فیلمم بینیوە و دەتوانم بۆت بڵێم. بۆ نمونە، چومەتە فیلمی (سقوط برلین) (كيفاح مارشال تيتو في جبال يوغوسلافيا) (القلب له وحدى- صباح) (دنانير- ام كلثوم). ئیتر باوەڕ ناکەم شتی دیکەم بینیبێت، چەند جارێک لەگەڵ هێرۆ چوم بۆ سینەما، من دەنوستم و ئەو فیلمەکەی دەبینی.

*** هەستت چی بو کە باڤێل و قوباد ژنیان هێنا، ئایا پێش ئەوە پرسیان بە تۆ کرد؟**

- بەڵێ پرسە خەسوانەیان پێکردم، با بۆت بگێڕمەوە، پرسەکانیان چۆن بو: ڕۆژێکیان باڤێل هات گوتی: کاکە (پێم دەڵێ کاکە)، با بچینە ژورێک، ئیشێکی تایبەتیم پێتە، منیش وتم ژورێی بۆ چیە؟ وەرە دانیشە، وتی ئاخر ئیشی تایبەتیە! منیش گوتم بۆ ڕۆڵە بە تەمای ئینقلابی؟ وتی نەخێر، گوتم ئەی ئیشی تایبەتی چیتە؟ وەرە دانیشە کە دانیشت، گوتی ئەمەوێت ژن بهێنم، گوتم ئەی پیرۆزت بێت، گوتی ئەوەی دەمەوێت بیهێنم کوردە، گوتم باشتر! گوتی لاڤەیە! گوتم وەڵا کەیفی خۆتە، تۆ خۆت بۆ خۆت ژن دەهێنیت، بەڵام دەزانم کچی مەلا بەختیارە و پێمخۆشە، باڤێل ئەوەندە پرسی پێکردوم.

قوبادیش لە مێژە حەزی لە کچێک کردبو، ئەویش هەر ئەوەندە پرسی پێکردم، وتی کاکە بیهێنم؟ وتم ڕۆڵە کەیفی خۆتە، ئەوە شتێکە، بەندە بە ژیانی تایبەتی خۆتەوە. من لاریم نیە، ئەگەر خۆت پێت باشە پیرۆزت بێت.

*** قەد گۆرانیت لەناو خەڵکدا وتوه !؟**

- ئەرێ وەڵا! کە قوتابی بوم زۆرجار سرودی نیشتمانیم گوتوە. لە ناوزەنگ هەندێجار، بە تایبەتی لە یادەکاندا، بۆ نمونە، یادی سەری ساڵمان دەکردەوە، گۆرانیان پێ دەگوتین و منیش دەمگوت، بەڵام دەنگم خۆش نیە!!

*** زەوقت لەگەڵ هەڵپەرکێ چۆنە؟**

- بە گەنجێتی زۆرم حەز لێدەکرد و زۆریشم لێدەزانی، ئەو ساڵەی کە چوم بۆ میهرەجانی وارشۆ، لەوێ زۆر هەڵپەرکێم کرد، بەڵام لە پاش ئەوەوە لێ چوومەتەوە، ئێستا هەڵپەرکێ نازانم.

*** حەز لە لەبەرکردنی جلی کوردی دەکەیت، یان چاکەت و پانتۆڵ؟**

- کاتێ کە لە شاخ بوم، جلی کوردی و کاتێکیش لە شاربوم چاکەت و پانتۆڵ.

*** شێخ جەنگی چی تۆیە؟**

- شێخ جەنگی کاکمە، ئێمە لە دایکەوە براین، شێخ جەنگی کاکی منە، یەکێکە لەو کەسانەی کە چاکەی لەسەر من هەیە. کاتێک من باری ئابوریم باش نەبوە یارمەتی داوم، وەختێک کە گەنج بوم، دەستی گرتوم و کاتێک زیندانی کراوم هاتوە بە دەنگمەوە و هەوڵی بەردانی داوم و پێمەوە ماندوبوە.

*** کەواتە تۆ تاقە کوڕی باوکتی؟**

- بەڵێ من تاقە کوڕی باوکمم.

*** رۆژێ چەند کات سەیری تەلەفزیۆن دەکەیت و کام پرۆگرام زۆرتر دەبینی؟**

- لەگەڵ تەلەفزیۆنیشدا بەینم نیە، زۆرتر کاتی دەنگ و باس سەیری دەکەم، سەیری کوردسات دەکەم و ناوبەناو مراقەبەی ئیستگەی دەنگی گەلی کوردستان دەکەم بۆئەوەی بزانم چۆن دەڕوات، بەڵام ناکرێت بڵێت، سەیرکەری هەمیشەیی تەلەفزیونم. من زیاتر حەز لە خوێندنەوە دەکەم و ئەگەر کاتم هەبێت، ئەوا دەخوێنمەوە یان دەنوسم .

*** شۆفێری دەزانیت؟**

- نەخێر نازانم .

*** ئەگەر بۆ دورگەیەک دورت بخەنەوە و ڕێگات پێ بدەن، تەنها سێ کتێب لەگەڵ خۆت بەریت، چی دەبەیت؟**

- دیوانی جەواهیری، موختاراتی ماوتسی تۆنگ و کتێبێک لەسەر کورد.

*** یاداشتەکانت نوسیوەتەوە؟**

- بەڵێ.

*** لەو کاتەوەی لە کاری سیاسیدایت، چ ساتێک بە ساتی خۆشی و سەرکەوتن و هەڵچوونی خۆتی دائەنێیت؟**

- من پێم وایە لە سەرەتای ژیانمەوە، وەکو خەتی شەمەندەفەر دو خەتم گرتوە و لێی پەشیمان نیم. یەکێکیان ڕێگای خەباتی ڕزگاریخوازی کوردستانیە، خۆم پێی دەڵێم کوردایەتی، واتا خەباتی ڕزگاری نیشتمانی دیموکراتی خەڵکی کوردستان، دوەم بیروباوەڕی چەپ و بیروباوەڕی سۆشیالیستی. ئەم دو خەتە لە تەمەنی خۆمدا، هەمیشە لەسەری ڕۆیشتوم. ئینجا ئەوە بایاندابێتەوە هەوراز و نشێویان کردبێ وەکو خەتی شەمەندەفەرێ کە دەڕوا. بەڵام ئەو دو خەتە، لێی پەشیمان نیم، لەسەریان دەڕۆم.

*** چ کاتێک هەیە لە ژیانتا کە بە کاتی خۆشی و سەرکەوتنی دائەنێیت، یاخود بە پێچەوانەوە چ ساتێک لە ژیانتا تاڵ بوە و لەبیرت ناچێتەوە و ئەڵێی خۆزگەم ئەو ڕۆژە نەیەتەوە؟**

- ئەو ڕۆژەی هی دوەمت وەڵام ئەدەمەوە، ئەوە ڕۆژی ڕوخاندنی کۆماری مهاباد بو، بیستمان کۆمارەکە ڕوخاوە و من تازە چوبومە ژیانی سیاسیەوە، بەڕاستی ڕۆژێک بو، یەکجار ناخۆش بو لە ژیانما. دوهەم ڕۆژی کە زۆر ناخۆش بو لە ژیانما ئەو ڕۆژە بو کە برادەران بڕیاریاندا بچینە ئێران، ئێمە لەسەر سنوربوین و منیش ڕازی نەبوم لە چونمان بۆ ئێران، لەوکاتەدا گریانم بۆهات، ئەوە یەکەمجارە لە ژیانم کە لە کارێکی سیاسیدا دەگریەم، ئەوە ساڵی ١٩٦٤ بوو.

بێگومان ڕۆژانی ئاشبەتاڵیش زۆر بە ڕۆژانێکی ناخۆش دێتە بەرچاوم.

*** هەموو یەکێک لەژیان دا چەند خۆزگەیەکی هەیە، جگە لە خۆزگەی سیاسی، ئایا چ خۆزگەیەکی ترتان هەیە؟**

- ئومێد و ئاواتی خۆم ئەوەیە، میللەتەکەم لەو ناخۆشیەی ئێستا تێیدایەتی رزگاربێت، دوای ئەوە تەقاویت بم و لە جێیەک دانیشم، بۆخۆم جەوێکی خۆشم هەبێت بنوسمەوە و بکەومە سەر کاری فکری .

## بە ڕستەیەک، یان بەچەند وشەیەک، ئەم ناوانەم بۆ پێناسە بکە:

*** بارزانی**

- بارزانی شەخسییەتێکە لە مێژوی کوردا دروست بوە، لایەنی سەلبی و ئیجابی هەیە و قۆناغی جیاوازی هەیە لە ژیاندا، ناتوانم بە دو رستە باسی بکەم و من ئەو قابیلییەتەم نیە، رەنگە هەندێ کەس هەبن بتوانن بە دو رستە باسی خەڵک بکەن، بەڵام من ناتوانم، هەتا لە نوسینیشدا ناتوانم زۆر بە کورتی باسی مەسەلەکان بکەم. ئەو مەسەلانە لێپرسینەوەی مێژویی تێیدایە، ناتوانم ئەو شەخسە بە دو رستە باس بکەم، بە رای من کەسایەتی بە دو وشە باس ناکرێت (با چوار جوملە بێ) ئاخر پێم ناکرێ، ناڵێم توانام نیە ئەوە کەسایەتیانە باس بکەم.

*** مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد**

- پیاوێکی زۆر هۆشیار و خوێندەوارێکی گەورەی کورد و چاکترین نوسەری کورد بو، بەڵام چەند سەرنجێکم هەیە لەسەری و لەسەر شێوەی سەرکردایەتی و لەسەر سستی لە بەرهەمەکانیدا.

مامۆستا ئیبراهیم، یەکێکە لە باشترین شاعیری کورد لە ١٩٣٤ەوە، بەڵام لەو شەست ساڵەدا، شەست پارچە شیعری نیە!! ئەگەر تاکو کۆچی دوایی، ساڵی

شیعرێکی بنوسیایە، ئێستە یەک دیوانی قەشەنگی لە تیپی ئەو شیعرە نایابانەی کە هەیەتی دروست دەبو. مامۆستا ئیبراهیم چاکترین نوسەری کوردە، بەڵام تاکو ئێستا سێ چیرۆکی هەیە، یەک چیرۆکی بڵاوکراوەتەوە (کوێرەوەری) و دو بەرهەمی تری هێشتا بڵاونەکراونەتەوە، لەبەرئەوە ناتوانم بە یەک ڕستە باسی مامۆستا ئیبراهیم بکەم!.

* **عەبدولرەحمان قاسملو**

- یەکێکە لەو کەسایەتیانەی کە لایەنی باش و خراپی هەبوە.

* **عەزیز محەمەد**

- وەکو ئینسان، تا بڵێی پیاوێکی خۆش مەعشەرە، وەکو سیاسی پیاوێکی تێکۆشەرە و تەمەنی خۆی داناوە بۆ ئەو کێشەیە، بەڵام کۆمەڵێ هەڵەی کردووە لە ژیانیا، ناتوانرێت چاوی لێ بپۆشرێت.

* **ئیمام خومەینی**

- یەک شەخسییەتی ئیسلامی گەورە و یەک شەخسییەتی ئیسلامی گەورەی ئینقیلابی بو، یەک شیعەی سەرسەختی راستەقینە، سیاسەتەکەشی دوژمنی سەرسەختی ئیمپریالیزم و شای ئێران بو. هەمو کارەکانیشی کە کردوێتی دژی کورد و دژی هێزە دیموکراتییەکانیش، کە کاری خراپن ئیدانە دەکرێن، بەڵام ئەوە بەشێکە لە تەبیعەتی ئەو مەزهەب و ئەو دینەی ئەو لەسەری رۆیشتوە.

* **حافز ئەسەد**

- حافز ئەسەد، پیاوێکی زیرەکی عەلەوی بو، سیاسەتمەدارێکی فەردی بو، دەیویست دەسەڵاتی خۆی درێژە پێ بدات، تا ئەو رۆژەی کۆچی دوایی کرد، بەڵام پیاوێکی بە هەیبەت و حەزی خێری تێیدابو. رای لەسەر میللەتی کورد باشبو، ئەگەر بیوێرایە و لە حیزبەکەی نەترسایە، جونکە سوننەکانی سوریا شۆفێنین، بەڵام عەلەویەکان شۆفێنی نین. بەعسیە سونەکانی سوریا شۆفێنین، بگرە لە ناحییەی شۆفێنی بوونەوە وەحشییەت و دڕندایەتیەوە لە بەعسی عێراقی شۆفێنی ترن.

*** موعەمەر قەزافی**

– سەرۆکێکی خوێن گەرمی عەرەبی موسوڵمانی خەیاڵیە، کۆمەڵێک بیروباوەڕی هەیە پێی وایە، خێری ئینسانییەت و عەرەب لەوەدایە، بەداخەوە ئەو ئەفکارانە لەگەڵ روداوەکانی ئیمرۆ ناگونجێ. تاقە سەرۆکی عەرەبیە، بە ئاشکرا پشتگیری لە مافی چارەنوسی کورد کردوە.

*** ئەگەر بمانەوێت ئیمرۆ، تەعریفی مارکسیزم بکەین، چۆن تەعریف دەکرێت؟**

– من پێم وایە، مارکسیزم فەلسەفەیەکی عیلمیە، عیلمێکی باشە بۆ لێکدانەوەی کۆمەڵایەتی و مەتریالیزم و دیالێکتیک، مارکس دایناوە بۆ شیتەڵکردنەوەی چینەکانی کۆمەڵ و ئابوری و سیاسی. دو رێگە و بۆچونی زۆر باشن و پێموایە مارکسییەت سەرەڕای هەمو ئەو شکستانەی بەسەر ئەو وڵاتانەدا هاتوە، مارکسیەت هێشتا ترۆپکی فکری شۆڕشی شۆڕشگێرانە و سۆسیالیستی دنیایە.

مارکسیزم عیلمە، بەڵام بەداخەوە لەلایەن پەیڕەوەکانییەوە کرا بە دین، کرا بە دۆگما، ئەو گیانە زیندوەی پێویست بو تێیدابێت، نەهێڵدرایەوە. لەجیاتی ئەوەی ئەو گیانە زیندوەی مارکسیزم وەکو عیلمێک گەشەی پێبدرێت و پێش بخرێت بۆ پێشەوە، کرا بە دۆگماو بە کلێشە و ئەو شکستانەش لەوەوە دەبینم.

*** ئەی ماویزم**

– ماویزم، بە رەئی من جێبەجێکردنی مارکسیزم لینینیزم بو لە کۆمەڵگای چیندا و دەورێکی زۆر گەورە و گرنگی بینی لە سەرکەوتنی شۆڕشی چین و دامەزراندنی کۆماری چیندا، بەڵام دو سەرنجم هەیە لەسەری، یەکەمیان: ئەو گشت بینیەی دەرباری هەمو جیهان دروست نەبو، چونکە ئەوە جێبەجێکردنی مارکسیزم لینینزم بو لەسەر بارودۆخی چین، نەک دەربارەی هەمو جیهان، دوەم: لە کۆتاییدا ئەو تاک پەرستیە بۆ ماوتسی تۆنگیش کارێکی خراپ بو.

*** جەلالییەت**

– جەلالییەت، ئەوە ناوێکی ناڕاست و نارەوابو، بۆ ئەو باڵەی مەکتەبی سیاسی، ئەگەر بەڕاستی بگوترابایە، دەبوایە بگوترایە پارتی دیموکراتی کوردستان باڵی مەکتەبی سیاسی، ئەگەر بە ناوی شەخسێکەوە ناوبنرایە، ئەبوایە بەناوی مامۆستا ئیبراهیمەوە هەڵبدرێ و بیانگوتبایە (ئیبراهیمییەت)، چونکە من بەڕاستی نە

شەخسی یەکەم بوم لەو بزوتنەوەیەدا، نە ئەو کەسە بوم کە لایەنگری تێکدان بوم لەگەڵ مەلا مستەفادا. من تا کۆتاییش بە ئیعتیرافی مەلا مستەفا خۆشی، ناوبژیکەر و مام ناوەنجی بوم لە نێواندا، لەبەرئەوە زۆر بە ناهەق ئەو ناوە بەسەر ئەو جوڵانەوەیەدا سەپێندرا.

*** واتا ئاراستە و رێرەوێک نیە بەناوی جەلالییەتەوە؟**

- بەڕای من نیە! بە رای من، غەدرە ئەگەر ناوی سیاسی لێبنێین، ئەبێ بڵێین باڵی مەکتەبی سیاسی و نابێت ناوی شەخسی لێبنێین، ئەبێ بڵێین باڵی ئیبراهیمییەت نەک جەلالییەت. من بڕوا ناکەم جەلالییەت هەبێت، ئەگەر هەشبێ، یان هەبووبێ لە حەفتاکاندا، ئەوا تەواوبوە.

*** کەواتە ئێستاش خەڵک بە هەق، یان بە ناهەق باسی ئەوە ئەکا، جەلالییەت وەکو فکرەیەک، یان وەکو تەیارێک هەبێت؟**

- بە رەئی من شتی وا نیە و وجودی نیە، شتێک نیە ناوی جەلالییەت بێت، من وەکو خۆم فکرێکم نیە تەرحم کردبێت و خەڵک لە دەوری کۆ بووبێتەوەنە شێوەیەکی تایبەتی خەباتم داهێناوە و نە رێگایەکم هەیە و نە دروشمێکی تایبەتیم هەیە، لەبەرئەوە جەلالییەت شتێک نیە وجودی هەبێت لەناو جوڵانەوەی کوردایەتی و میللەتی کوردا.

*** پێش راپەڕین، تەیارێک دروست بو، نە کۆمەڵە بو، نە شۆڕشگێران و پێیان ئەوت شەرمەڵە! باسدەکرا کە شەرمەڵە کەم و زۆر دەستی تۆی تێیدابوە، باسدەکرا، کە مام جەلال دەوری سەرەکی تێدا ئەبینی، باسدەکرا کە مام جەلال دەیەوێت تەییار نەمێنێت، چونکە خۆی نە کۆمەڵەیە و نە شۆڕشگێرانە، بۆ ئەوەی ئەگەر رۆژێک لە رۆژان گیروگرفتێک دروست بو، ئەو رێکخستنێکی هەبێت؟**

- بەڵێ ئەوە کارێکی هەڵە بو، چونکە من خۆم تەییارێکی زۆر گەورەم هەبو کە هێڵی گشتی بو، خۆم ئەو تەییارەم تەشویق کرد، ئەوەی ئەیویست ببێت بە کۆمەڵە، ببێ بە کۆمەڵە، ئەوەی تر لەگەڵ شۆڕشگێڕان بو، ئەوەی مابۆوە، ئەو کەسانەی تر کە نە کۆمەڵە و نە شۆڕشگێڕان بون و قبوڵیان نەدەکرد کە نە ببن بە کۆمەڵە و نە ببن بە شۆڕشگێڕان، و ژمارەیان لەناو شۆڕشدا دیاربو، نەدەکرا دەریانکەین، وەکو ئەورووپا نەبو، پازدە بیست کەس بێن بڵێن کێ نایکا جیابێتەوە!

هەزاران کەس هەبون هاتبونە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە، نەکۆمەڵە و نە شۆڕشگێڕان بون، ئەوانە جیابونەوە و ڕێکخستنی خۆیان دروستکرد. هەتا خەڵکانی واهەبون کۆمەڵە بون و گوتیان کاکە ئێمە ناچینە ناو ئەو کۆمەڵەوە، چونکە مارکسیە، یان هەبون دەیانگوت من ناتوانم لەگەڵ شۆڕشگێڕان ئیش بکەم، بەڵام وەک یەکێتی دەمێنمەوە.

لەبەرئەوە ئەو تەعریفە هەڵەبو، پێموایە ئەوە حەقیقەتێکە لە کۆمەڵگای کوردیدا کە خەڵک هەموی ناتوانێ بچێتە ناو بزوتنەوەیەکی دیاریکراوەوە، ناتوانرێت هەمو خەڵک ڕێکبخرێن. ئەگەر بارودۆخێکی ئیرهابی و تەسک دروست ببوایە، خەڵکی کەم کۆدەبێتەوە، بەڵام لە وەزعی شۆڕش و هەڵچوندا، ئەوا خەڵکی زۆر کۆدەبێتەوە.

لە بارودۆخێکدا ئەگەر ئەو تەیارەتانە بمانایە و لە بارودۆخێکی دیموکرات و ئازاددا، بتوانرایە چالاکی سیاسی بکرێت، ئەوا ئەوە کەسانەی کە کۆمەڵەن و ئەو کەسانەی کە شۆڕشگێران بون، زۆر زۆر کەمتر دەبون لەو جەماهیرە زۆرەی خەڵک، یەکێتین و نە کۆمەڵە دەبون و نە شۆڕشگێڕان.

من خۆم هەم بە کۆمەڵە زانیوە و هەم بە شۆڕشگێڕان، واتا هیچ کاتێک خۆم بە جیا نەزانیوە لە کۆمەڵە و لە شۆڕشگێڕان. ئەگەر ڕۆژێک هاتبێت و وتبێتیان تەرازوەکە بەلای کام لادا دەشکێنیت، بێگومان من زۆر تری بەلای کۆمەڵەدا دامشکاندوە. خۆم و هەر برادەرێکی تر، تەسەور دەکەی، پشتیوانی و لایەنگرانی خۆمم لەناو کۆمەڵەدا بینیوە و خۆم زیاتر لەوێ بینیوە، هەتا لەناو هێڵی گشتی و لەناو خەڵکانی تردا[٤].

## پەراوێزەکان:

١- نەوشیروان مستەفا لە کتێبی پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، دیوی ناوەوەی رووداوەکانی کوردستان عێراق ١٩٧٩-١٩٨٣ لە لاپەرە ١٥٦ بەم شێوەیە باس جارانی پەیوەندی خۆیی و مام جەلال دەکات: (من هەمیشە پەیوەندیم لەگەڵ مام جەلال باش بوە، هەمیشە زۆر رێزی زۆری بیر و بۆچونەکانی منی ئەگرت، بە درێژایی تەمەنی درێژی برایەتیمان لە هیچ بۆنە و کات و شوێنێك دا بەگژ من دا نەهات بو. زۆر جار بیر و بۆچونەکانمان دژی بیر و بۆچونی یەکتر بوە بەڵام هەگیز دەممان لەیەك نەگیراوە، لەیەکتر عاجز ئەبوین و زو پێك ئەهاتینەوە.

٢- بەشیر موشیر، لە ساڵانی هەشت سەدەکاندا لەدایك بوە و ١٩٦٣/٦/٣٠ لە بەغدا کۆچی دوایی کردوە، مامۆستا بەشیر، کەسایەتیەکی کوردی ناوداربوە، لە بەغدا، دوکانی خەیاتی هەبوە لە حەیدەرخانە و دوایی کردویەتی بە شوێنی دانیشتن و یەکگرتنی کەسایەتیە ئەدەبی و سیاسی و حکومیەکانی کورد و کەم کەس هەیە لەو کاسایەتیانەی ئەو سەردەمەی کە لە بەغدا بوین. سەردانی دوکانەکەی ماۆستایان نەکردبێت. ژمارەیەك نوسینی سیاسی و ئەدەبی لە رۆژنامە کوردیەکان بڵاوکردۆتەوە، زوربەی هەر زۆریان هاورێ و دۆستەکانی بەشیر بۆیان نوسیوە، لە دوکانەکەدا مامۆستا بەشیر، رۆژنامە و گۆڤاری کوردیشی دەفرۆشت .

٣- سەعید قەزاز، لە ساڵی ١٩٠٤ لە ناحیەی خورماتو لەدایك بوە، لە تەموزی ١٩٢٤دا بوە بە کاتب لای (کاپتن لاین) موفەتیشی ئیدارەی ئینگلیز لە سلێمانی، هەتا شۆرشی چواردەی تەموز. کۆمەڵێك وەزیفەی ئیداری بینیوە، لەوانە بەرێوەبەری ناحیەی تانجەرۆ، قایمقامی هەڵەبجە و زاخۆ و متصەریفی هەولێر، کوت، کەرکوك، موسڵ و وەزیری ناوخۆی عێراق، لە ١٩٥٩/٢/٤دا مەحکەمەی سەورە، بریاری هەڵواسینی بەسەردا چەسپاند و وتە بەناوبانگەکەی دوترێتەوە، کاتێ بەرەوە داری قەنارە هەنگاو دەنێت و مردن نزیك بۆتەوە، ئەو چەندەها کەس لەژێر پێیەوە دەبینێت ئیستحقاقی ژیانیان نیە. سەعید قەزاز، سەر بە هیچ پارت و گروپێکی سیاسی نەبوە و تەنها بەهۆی لێوەشاوەیی خۆی، ئەو پۆستانەی وەرگرتوە.

٤- (یەکەمین کۆبونەوەی سەرکردایەتی شۆرشگێران لە ٣ تشرینی یەکەمی ١٩٨٢ ئەنجامدرا، تیایدا جەلال تاڵەبانی بە سکرتێر دیاریکرا، ئەمەش لەلایەن سەرکردایەتی کۆمەڵە جێگای نیگەرانی بو، لەبەرئەوە پێیان وابو نابێت تاڵەبانی لە یەك کاتدا هەم سکرتێری یەکێتی، هەمیش هی شۆرشگێرانیش بێت، بۆیە سێ پێشنیاریان خستە بەردەمیەوە:

- تاڵەبانی واز لە سکرتێری یەکێتی بێنێت و لە کۆنگرەیەکدا سکرتێر هەڵبژێرێت.

- پۆستی سکرتێری گشتی دەوری بێت و هەر شەش مانگ یان هەر ساڵی جارێك لە نێوان سکرتێری کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان ئاڵوگۆڕ بکرێت.

- تاڵەبانی واز لە پۆستی سکرتێری شۆڕشگێڕیێنێت.

- دواتر تاڵەبانی ڕازی بوو دەست لە شۆڕشگێڕان هەڵبگرێت).

(ڕەوتی چەپ لە باشووری کوردستان.ل. ١٨٣.)

# سەرچاوەکان

١. عرفان قانيعی فەرد –دوای شەست ساڵ، ژیان و بیرەوەرییەکانی جەلال تاڵەبانی. بەرگی یەکەم. موسسة العرفا للطباعە و النشر– بیروت، لبنان ٢٠١٣).

٢. زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی – بیرەوەریەکانم لە ساڵانی ١٩٤٣–١٩٦٧، چاپخانەی رەهەند، سلێمانی – ٢٠٠٢.

٣. مێهفان محەمەد حسێن رەشید بامەڕنی، "سياسة الاتحاد السوفيتي تجا الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان الجنوبية ١٩٤٥–١٩٦٨، موسسة موكرياني للبحوث و النشر- مطبعة خاني، دهوک، ٢٠٠٨.

٤. د.وليد حمدی – کورد و کوردستان "لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا"، وەرگێرانی لە عەرەبیەوە، موحەمەد نوری تۆفیق، دەزگای سەردەم، چاپخانەی ئۆفیسی تیشک، سلێمانی ١٩٩٩.

٥. ديفيد أدمسن، "الحرب الكردية وانشقاق١٩٦٤"، ترجمة جرجيس فەتح الله، دار آراس للطباعة و النشر، ٢٠١٢.

٦. الحركة التحررية الكردية، أيوب بارزاني.

٧. نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، دیوی ناوەوەی رووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩–١٩٨٣، بەرلین ١٩٩٧.

٨. صلاح خرسان، التيارات السياسية في كردستان العراق، مؤسسة البلاغ– بيروت لبنان ٢٠٠١.

٩. دانا ادەمز شمدت، رحلة الى رجال الشجعان في كوردستان، ترجمة جرجيس فتح الله، دار آراس للطباعة و النشر، آربيل، ١٩٩٩.

١٠. (مێژووی پەیوەندیەکانی کورد و ئەمریکا – ئامادەکردنی وریا رەحمانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات، هەولێر – چاپی یەکەم ٢٠١٢.

١١. ئیبراهیم جەلال، خواروی کوردستان و شۆرشی ئەیلول، بنیاتنان و هەڵتەکاندن ١٩٦١–١٩٧٥، بەرلین، ١٩٩٨.

١٢. عەلی کەریمی، ژیان و بەسەرهاتی عەبدولرەحمان زەبیحی (مامۆستا عولەما)، بنکەی چاپەمەنی زاگرۆس، گوتنبێرگ–سوید ١٩٩٩.

١٣. ئەحمەد بانیخێڵانی، یادەوەرییەکانم، سلێمانی ٢٠١٤ – چاپخانەی کارۆ.

١٤. شلومو نكديمون، الموساد في العراق و دول الجوار، انهيار الآمال الإسرائيلية و الكردية، ترجمة: بدر عقيلي، دار الجليل للنشر عمان، ١٩٩٧.

١٥. جوناثان راندل، أمه في شقاق، دروب كردستان كما سلكتها، ترجمة فاري حمود، دار النهار للنشر، بيروت ١٩٩٧.

١٦. د.سنان صادق حسين الزيدي، سياسة الولايات المتحدة الامريكية تجاه العراق في عهد الزعيم عبدالكريم قاسم, ١٩٥٨–١٩٦٣، دار المرتضى–٢٠١٣.

١٧. د. فائق بطي، الموسوعة الصحفية الكردية في العراق، تاريخها و تطورها، دار المدى للثقافة و النشر، ٢٠١١.

١٨. گۆران ئیبراهیم سالّح، دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندیەکانی ئەمریکا و عێراقدا، ٦ ئازاری ١٩٧٥– ٢/ئابی ١٩٩٠، ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، سلێمانی. ٢٠١٣.
١٩. کەریم حیسامی، کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران، ١٩٧١، بنکەی پێشەوا.
٢٠. ئەحمەد حەمە ئەمین ئۆمەر، ڕەوتی چەپ لە باشوری کوردستان، کۆمەڵە وەک نمونە ١٩٧٠–١٩٨٨، تێزی دکتۆرا لە زانکۆی سەلاحەدین. ٢٠١٤.
٢١. کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین، ناوەندی مێژوویی "ی.ن.ک." سلێمانی ٢٠١٢،
٢٢. (ڕۆژنامەی هاوڵاتی ژمارە ٤١٢ی ٩/٤/٢٠٠٨).

٢

١. مەلا بەختیار، چۆن چەپکێک و کام مێژووی کۆمەڵە؟، خوێندنەوەیەکی مێژوویی بۆ چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپ و بەخشی حەمدی، شوباتی ٢٠١٢.
٢. عەلی بچکۆل، کوانوی بەرگری – بیرەوەریەکانم لەگەڵ خاڵە شیهاب و هاوڕێکانیدا، لە بڵاوکراوەکانی خەندان بۆ پەخش و وەشاندن، ٢٠٠٨.
٣. (هەژار موکریانی، چێشتی مجێوەر، چاپی یەکەم، خانی شەرەفکندی، پاریس ١٩٩٧.
٤. جەنگیز چاندەر. و.زریان ڕۆژهەلاتی، شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا، گەشتێکی مێژوویی، چاپخانەی کارۆ، چاپی دوەم، سلێمانی، ٢٠١٥.
٥. نەشیروان مستەفا ئەمین، لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، دیوی ناوەوەی ڕوداوەکانی کوردستانی عێراق، ١٩٧٥–١٩٧٨. بەرلین ١٩٩٧.
٦. (یەکێتی نیشتمانی کوردستان – دامەزراندن و دەستپێکردنی شۆرش – ١٩٧٥–١٩٧٦ سەروەر عەبدولرەحمان.
٧. موحسین عەلی ئەکبەر، چەپێکی ژاکاو لە مێژویەکی هەڵبستراو، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، ٢٠١٢.
٨. ئینسکلۆپیدیای یەکێتی نیشتیمانی کوردستان. چاپی دووەم. ٢٠١٤.
٩. پشکۆ نەجمەدین، ئەزمون و یاد، ئاڵای شۆرش و حیکایەتەکانی زێندان، چاپی دووەم. بەرگی یەکەم ١٩٧٨–١٩٨٣ و بەرگی دووەم ١٩٨٣–١٩٨٩، چاپخانەی ڕەنج،
١٠. فریتس زیتە Fritz Sitte، من لای کوردەکان بوم" Ich war bei den Kurden. ١٩٨٠، ڤینا.
١١. نەوشیروان مستەفا، خەون یان مۆتەکە، خەون یان مۆتەکە! دیوی ناوەوەی ڕوداوەکانی کوردستانی عیراق، ١٩٩٢–٢٠٠٢.
archive.sbeiy.com/ku/article_detail.aspx?ArticleID=1539&AuthorID=36
١٢. حمیدة نعنع، طاریق عەزیز، رجل وقضیة، المؤسسة العربیة للدراسات و النشر، بیروت ٢٠٠٠.
١٣. بهادین نوري– مذکرات، الطبعة الاولى، تشرین الثاني ١٩٩٢، کرستان العراق.
١٤. هنری کسنجەر – سنوات التجدید، نقله إلى العربیة د.هشام الدجاني، کلمه و العبیدکان ٢٠١٠.



لەگەڵ عەبدولرەحمان قاسملو



لەگەڵ شەرەفکەندی لە کۆنگرەی سۆسیال دیموکراتی جیهانی ١٩٩٢/٩/١٣



لەگەڵ عەبدوڵڵا ئوجەلان



لای ڕاست؛ ئەندام پەرلەمانی تورکیا و کەسایەتی کوردی ناسراو ئەحمەد تورک،
مام جەلال، سکرتێری گشتی سۆسیال دیموکراتی جیهانی، لویس ئایالا



لەگەڵ سەید محەمەد باقر ئەلحەکیم



لەگەڵ کۆمەڵێک سەرکردەی کورد و عێراقی



لەگەڵ مەلیکی پێشوی ئوردن. حسێن



لەگەڵ جێنشینی پێشوی مەلیکی ئەردەن. حەسەنی برای مەلیک حسێن



لەگەڵ سەرۆک کۆماری پێشوی میسر، ئەنوەر سادات



لەگەڵ نایف حەواتما و چەند سەرکردەیەکی فەلەستینی



لای راستەوە؛ سەرۆکی سودان، عومەر حەسەن بەشیر، سەرۆکی میسری پێشو
حوسنی موبارەک، سەرۆکی یەمەنی پێشو، عەلی عەبدوڵڵا ساڵح لەگەڵ مام جەلال




لای راستەوە؛ مام جەلال، مەلیکی سعودیەی پێشو، عەبدوڵای کوری عەبدولعەزیز و
سەرۆکی پێشوی فەنزویلا، هوگۆ چاڤیز و سەرۆکی پێشوی کۆماری ئێران ئەحمەدی نەجات



لای راستەوە؛ عەلی خامنەئی، ڕابەری کۆماری ئیسلامی، مام جەلال و
سەرۆک کۆماری ئێرانی پێشو ئەحمەدی نەجات



لەگەڵ سەرۆک کۆماری پێشوی ئێران ئەکبەر هاشمی رەفسەنجانی



لەگەڵ سەرۆک کۆماری پێشوی تورکیا، تورگوت ئۆزال



لەگەڵ سەرۆک کۆماری پێشوی تورکیا سلێمان دیمیرێڵ





لەگەڵ سەرۆک کۆماری تورکیا، ڕەجەب تەیب ئۆردوگان

لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی پێشوی تورکیا، تانسۆ چیلەر



لەگەڵ سەرۆک کۆماری پێشوی تورکیا، عەبدوڵڵا گول



لەگەڵ سەرۆکی پێشوی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، بیل کلنتۆن



لەگەڵ جێگری پێشوی سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا - ئەل گۆر



لەگەڵ سەرۆکی پێشوی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای، جۆرج بوش



لەگەڵ سەرۆک پێشوی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، بارەک ئۆباما



وەزیری دەرەوەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای پێشو، هینری کسنجەر



لەگەڵ وزیری دەرەوەی پێشوی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، مادلین ئۆلبراید



لەگەڵ وەزیری بەرگری پێشوی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، دۆنالد رامسفێڵد



لەگەڵ وەزیری دەرەوەی پێشوی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کۆلن پاول



لەگەڵ راوێژکاری ئاسایشی پێشوی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، کۆندالیزا رایس



لەگەڵ حاکمی پێشوی کاتی عێراق، بۆڵ برێمەر



لەگەڵ جێگری سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا, دیک چینی



لەگەڵ وەزیری دەرەوەی پێشوی ئەمریکا, جێمس بێکەر لەگەڵ وەفدی ئۆپۆزیزسۆنی عێراقی



لەگەڵ سەرۆک کۆماری چینی پێشو، هو جینتاو



لەگەڵ سەرۆکی ڕوسیا، ڤلادمیر پۆتین



لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی پێشوی ئوستralیا، جۆن هاوەرد



لەگەڵ سەرۆک کۆماری پێشوی چیک، براتسلاڤ هاڤل



لەگەڵ سەرۆک کۆماری فەرەنسای پێشو، جاک شیراک



لەگەڵ سەرۆک کۆماری فەرەنسای پێشو نیکۆلاس سارکۆزی



لەگەڵ خانمی یەکەمی جارانی فەرەنسا، مادام میتەراند



لەگەڵ وەزیری دەرەوەی پێشوی فەرەنسا و دۆستی دێرینی کورد بێرنارد کوشنەر



لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی پێشوی ئینگلتەرا، تۆنی بلێر



لەگەڵ وەزیری دەرەوەی
ئینگلتەرای پێشو،
جاک سترۆ



لەگەڵ باڵیۆزی پێشوی ئینگلتەرا کریستۆف بەرنس لە عێراق و
وەزیری دەرەوەی پێشوی هەمان وڵات دێڤید میلیبەند



لەگەڵ سەرۆک حکومەتی (موستەشار) پێشوی ئەڵمانیا ڤیلی براند

ئەم دیدارە لە ماوەی ١٥ ساڵدا تۆمارکراوە و ئەنجامدراوە. لە ١٩٩٠ دەست پێ دەکات تا ٢٠٠٥.

ئەم دیدارە وەك تۆمارکردنی بیرەوەرییەکانی مام جەلال وایە و لەشێوەی پرسیار و وەڵام. هەر لەو روانگەیەشەوە، مام جەلال پێشتر لە چەند شوێنێك و لای چەند کەسێك باسی لەوە کردوە، کە بیرەوەریەکانی نوسیوەتەوە.

مێژوی هاوچەرخی کورد و نەوەی نوێ پێویستی بەم شایەتیەی و زانیاریانەی لای مام جەلال هەیە هەر لەبەر ئەوەش بڵاوکردنەوەیم بە گرنگ زانی.ئەم دیدارە وەك ئەمانەتێکی مێژویی و ئەخلاقی گرتۆتە ئەستۆ، هەروەها لەوەش زۆر دڵنیابوم کە روناکیەك دەخاتە سەر بەشێ لە مێژوی خەباتی گەلی کوردستان و دەبێتە گۆشەیەکی جیاواز بۆ بینینی رابردو، سەرئەنجام ئەم دیدارە نەبەمەبەستی دژایەتی لایەنێك یان کەسایەتیەك یان بە بەرژەوەندیان، ئەنجام نەدراوە، بەڵکو تەنها باسی دوێنێیە وەك ئەوەی مام جەلال بینیویێتی و تێدا ژیاوە.

سەلاح رەشید

# Mam Jelal

successive interviews

from youth to the presidency